# له شه‌ریعه‌ته‌وه بۆ حه‌قیقه‌ت

سه‌رهه‌ڵدانی سۆفیگه‌ری له پانتاییی کوردیدا



د. حه‌یده‌ر له‌شکری





## خانەی موکریانی بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە

- **لە شەریعەتەوە بۆ حەقیقەت (سەرهەڵدانی سۆفیگەری لە پانتایی کوردیدا**
- **د. حەیدەر لەشکری**
- **نەخشەسازی ناوەوە:** گۆران جەمال رواندزی
- **بەرگ:** ریَمان
- **نرخ:** ٥٠٠٠ دینار
- **چاپی یەکەم ٢٠١٣**
- **تیراژ:** ١٠٠٠ دانە
- **چاپخانە:** موکریانی (هەولێر)
- **لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی(٨٣٥)ی ساڵی (٢٠١٢) پێدراوە.**

**زنجیرەی کتێب (٧١٧)**

**ماڵپەڕ:** www.mukiryani.com
**ئیمەیل:** info@mukiryani.com

سۆفیگەری ژیانی بێ مەرگە ...

مەرگی بێ ژیان...

"بابا تاهیری هەمەدانی"

## پێرست


| بابەتەکان | ژ. لاپەڕە |
|---|---|
| **پێشەکی** | ٩ |
| **دەروازە:** ناساندنی سۆفیگەریی ئیسلامی | ١٩ |
| یەکەم: ماناکانی سۆفیگەری -- لە قەیرانی لێکۆڵینەوەوە بۆ قەیرانی ناسنامە | ٢١ |
| دووەم: زوهدگەری وەك پاشخانی سەرهەڵدانی سۆفیگەری | ٢٨ |
| سێیەم: سۆفیگەری وەك کایەیەکی ئایینی سەربەخۆ | ٣٣ |
| **بەشی یەکەم: زەمینەی ئایینی سەرهەڵدانی سۆفیگەری لە پانتایی کوردیدا** | ٣٩ |
| دەروازە: گرنگیی شەریعەت لە سەرهەڵدانی سۆفیگەری | ٤١ |
| یەکەم: ئیسلامی خەواریجی لە نێو کوردان و قەیرانی لە زوهدی شۆڕشگێڕانەوە بۆ زوهدی سۆفییانە | ٤٥ |
| دووەم: ڕەوتە شیعییەکان و پەیوەندییە نهێنییەکانیان بە هزری سۆفیگەری لە وڵاتی کورداندا | ٥١ |
| سێیەم: ڕەوتی سوننی و سنوورە شەرعییەکانی سۆفیگەری لە وڵاتی کورداندا | ٦٧ |
| **بەشی دووەم: جوگرافیای سەرهەڵدانی سۆفیگەری لە پانتایی کوردیدا** | ٧٥ |
| یەکەم: سەرەتاکانی سۆفیگەری لە نێو کوردان-- ئاوێتەبوونی خەیاڵ و واقیع | ٧٧ |
| دووەم: قەیرانی دیاریکردنی سنووری جوگرافی دیاردەی سۆفیگەری | ٨٦ |
| سێیەم: سۆفیگەری لە ڕۆژئاوای هەرێمی چیا(الجبال) | ٨٩ |
| چوارەم: مەڵبەندەکانی سۆفیگەری لە هەرێمی جەزیرە (نصێبین و سنجار) | ١٣١ |
| پێنجەم: سۆفیگەری لە شاری ورمێی هەرێمی ئازربێجان | ١٣٦ |
| **بەشی سێیەم: پەرەسەندنی سۆفیگەری — لە ڕەوتی دژە باوەوە بۆ ڕەوتی سەربەخۆ** | ١٤١ |

| | |
|---|---|
| دەروازە: ڕەوتگەری لە هزری سۆفیگەریدا | ١٤٣ |
| یەکەم: ڕەوتی حەلاجیی و دژە حەلاجیی لە پانتایی کوردیدا | ١٤٥ |
| دووەم: ئەبوبەکری کوڕی یەزدانیاری ورمێ و دامەزراندنی ڕەوتی سەربەخۆی سۆفیگەری | ١٨٣ |
| **بەشی چوارەم: گەشەسەندنی سۆفیگەری لە نێوان حەقیقەت و شەریعەتدا** | ٢٠٧ |
| یەکەم: سۆفیگەری وەك حەقیقەتی شاردراوەی عارف | ٢٠٩ |
| دووەم: هەژموونی شەریعەت و پاشەکشەی سۆفیگەریی هزرییەکان | ٢٣٣ |
| سێیەم: ڕێگرە کوردەکان نیوەی دووەمی سەدەی پێنجەم | ٢٤٩ |
| **بەشی پێنجەم: جێکەوتە کۆمەڵایەتییەکانی سۆفیگەری لە پانتایی کوردیدا** | ٢٦٩ |
| یەکەم: جێکردنەوەی سۆفیگەری لە چوارچێوەی کۆمەڵایەتی | ٢٧١ |
| دووەم: قەبوڵکردنی جڤاکی کوردی بۆ دیاردەی سۆفیگەری | ٢٨٦ |
| ئەنجام | ٣٠٧ |
| سەرچاوەکان | ٣١٣ |
| فەرهەنگی چەمك و ناوەکان | ٣٥٩ |
| پاشکۆکان | ٣٨٥ |

# پێشەکی

## گرنگی خوێندنەوەی مێژووی سۆفیگەری لە پانتایی کوردیدا

سۆفیگەری (التصوف) وەك دەرکەوتەیەکی ژیانی رۆحانی لە مێژووی بیروباوەڕی ئایینیدا، لەسەر ئاخاوتنێکی دیار و نادیاری کۆمەڵە مرۆڤێك لەگەڵ دەروونی خۆیان، لە پەیوەندییان بە خودایەتیی دامەزراوە. لە زۆربەی ئایینەکاندا بۆتە شێوازێکی بیرکردنەوە لە خودا و جۆرێك لە رەفتاری پەیوەست بەو بیرکردنەوەیە و گوزارشتە لە ئەزموونێکی تاکەکەسییانەی دەخوازێ هەبوونی تاکەکە لە نێو ئەو جیهانە باوەڕدارییەی تێیدا دەژی لە رێگەی پەیوەندییە خوداییەکەوە شرۆڤە بکات. ئیدی هەر لەو روانگەیەوە کەسی سۆفی ئەم هەبوونە و تەواوی دەوروبەرەکەی بینیوە و ویستوویەتی تێگەیشتنێکی جیاواز لە هی کەسانی تری باوەڕدار و ئامادە لە نێو هەمان سیستەمی کولتووری — ئایینیدا، بەرهەم بهێنێ.

لە چوارچێوەی ئایینی ئیسلامیشدا، دەرکەوتنی سۆفیگەری بە خاڵی وەرچەرخانی ئەزموونی رۆحانی دادەنرێ، لێرەدا هزرەکە جەختی لەسەر پرۆسەی ناسینی خودا و ئەو حەقیقەتە دەکردەوە، کە لە میانەی ئەو پرۆسەیە و لەرێگەی بڕینی چەندان قۆناغی رۆحانی(حال و مەقام) و خوێندنەوەی جیاواز بۆ پەیوەندیی مرۆڤانە و خودایانە(فەنابوون، ئیتحاد، حلول...هتد) سۆفی پێی دەگات، بێگومان ئەمەش خستنەڕووی تێڕوانینێکی ناباوی ئایینەکە و لێکدانەوەی بووە لە رێگەی فەرهەنگێکی تایبەت لە چەمك و دەستەواژەی ئەوتۆ کە پێشتر لە دووتوێی گوتاری گشتی ئاییندا ئاوا نەناسێنرابوون، لەلای ئەوانەیش کە وەك بەرپرسی راڤەی ئایین و دەستنیشانکاری سنوورە شەرعییەکانی گوزارشتەکانی پێناسی خۆیان دەکرد، بە چەمك و دەستەواژەی نامۆ و جاروباریش بە ناجۆر و نەشیاو وەسفدەکران. لەبەرامبەردا سۆفییان هەوڵی کەمکردنەوە_یان دروستتر بڵێین_شێوەگیرکردنی ئەو شەریعەتەیان دەدا کە ژیانی جڤاکی ئیسلامیی لەسەر دامەزرابوو، خۆ گۆڕانە گەورەکانی سیستەمی دەسەڵات و بونیادی ئابوری و بەرفرەبوونی پەیوەندییەکان و دواجار وەڵامدانەوەی جڤاك بۆ گۆڕانەکان، وای کردبوو چیدی ئەو شەریعەتە پەتییە مرۆڤی باوەڕدار لە رووی رۆحییەوە تێرنەکات، تەنانەت وایکردبوو دابڕانێك لە نێوان جیهانی مرۆڤایەتی و جیهانی

خودایەتی دروست ببێ و پەیوەندیی نێوانیان تەڵخ ببێ و لە مانا حەقیقەتییەکانی بەتاڵ ببێتەوە، بەمەش خوداپەرستی وەك ئەرکێکی کۆمەڵایەتی ببینرێ، نەك لەخۆیدا. بۆیە سۆفی دەیەوێ مانا بەو پەیوەندییە ببەخشێتەوە و بەجۆرێك دایبڕێژێتەوە، کە مرۆڤی باوەڕدار لە حاڵەتی خوداپەرستیی رووکەشیانەوە بپەڕێتەوە بۆ حاڵەتی خوداناسینی کرۆکیانە.

هەرچۆنێك بێت، سۆفیگەری هەر لە سەدەی دووەمی کۆچی/ نۆیەمی زایینی، وەك ناوێك بۆ ئەو جۆرەی مرۆڤی باوەڕدار دەرکەوتووە و لەو دەستپێکەدا زیاتر خۆی لە دوورەپەرێزی و گۆشەگیریی دەبینییەوە، دواتریش لە سەدەی سێیەمدا وەك کایەیێکی ئایینی سەربەخۆ و جیاواز لە کایەکانی تر، داهێنەر و پەیڕەوکاری خۆی هەبووە و لەمیانەی ئەم دەستەبژێر(الخواص)ە ئایینییەوە خۆی نواندووە. بەڵام چیدی سۆفی نەیدەتوانی لە سنووری ئەزموونە رۆحانییەکەیدا بمێنێتەوە و بۆ هەمیشە دوورەپەرێزیی ناونیشانی خۆی و هزرەکەی بێ، چونکە لەلایەك زەمینە کۆمەڵایەتییەکە پەرۆشی ئەوەبوو بزانێ ئەو دیاردە نوێیە چییە و چەندە دەتوانێ وەڵامدانەوەیەك بێ بۆ داخوازییەکانی ئەو و رەوشە داتەپیوەکەی چارەبکات. لەلایەکی تریشەوە، بەرەبەرە سۆفی — بە ویستی خۆی بێ یاخود بە ناچاری و بۆ رێگەگرتن لە هەر بە هەڵە تێگەیشتنێکی بیروراکانی — لەو سنوورەی دەهاتە دەرەوە و هەر بەخۆی ئەو بیروڕایانەی بەیان دەکرد، لە یاوەرە سۆفییەکانی کۆدەبۆوە و بە یەکەوە هزرەکەیان لە تاکگەراییەوە دەگواستەوە بۆ باوەڕێکی دەستەجەمعی و ئەلقەی سۆفییانیان فراواندەکرد و بەرەو سیستەمێکی رێکخراوی ئەوتۆیان دەبرد، کە بتوانێ پێداویستییە ئایینییەکانی تەواوی کۆمەڵگا پڕ بکاتەوە.

بەمەش دیاردەی سۆفیگەری پەیوەست دەبوو بەو فرەجۆرییەی لە پانتایی ئیسلامیدا، لە رووی کۆمەڵایەتی و ئایینییەوە لە ئارادابووە، تێزەکانی ئەوانیش لە تێزی سنووربەندی نێو بنەما شەرعییەکانەوە، بۆ تێزی کاریگەر بە ئەزموونە عیرفانی و رۆحانی و تەنانەت فەلسەفییە ئیسلامی و نائیسلامییەکان، دەردەکەوتن. لەرووی کۆمەڵایەتییەوەش هزرەکەیان دەبووە دیاردەیەکی کراوە بەسەر گرۆ و رەگەز و دەڤەرە جیاوازەکانی جیهانی ئیسلامیی. هەریەك لە بونیادە کۆمەڵایەتییەکانیش بەپێی تایبەتمەندێتی سیستەمە کولتوورییەکانی خۆیان، کە جۆری باوەڕداریی و پرۆسەی بەرهەمهێنانی پیرۆزیی رەنگرێژ دەکرد، خوێندنەوەی خۆی بۆ کەسێتی سۆفییەکان و بیروباوەڕەکانی بەگشتی هەبووە، تەنانەت رەنگە لە

بەرهەمهێنانەوە میللییەکەیدا هەندێك لە خەسڵەتەکانی ئەو سیستەمەیان خزاندبێتە نێو تێز و دەرکەوتەکانی دیاردەکە.

لە کوردستان و لە پانتایی کوردیدا (ئەو مەودا جوگرافییەی رەگەزی کوردیی تێدا زاڵە)، وەك بەشێکی پانتاییە گشتییەکە، لە هەندێك ناوچە و شاری ئەو هەرێمانەی وڵاتەکەی لەخۆگرتبوو (بەتایبەت "هەرێمی چیا - إقليم الجبال"، "هەرێمی جەزیرە- إقليم الجزيرة"، "هەرێمی ئازربێجان - إقليم اذربيجان")، کەسانێك دەرکەوتوونە، هەر لە قۆناغی سەرهەڵدان و جێگیربوونی کایەکەدا، گیرۆدەی بوونە و بوونەتە مورید و سۆفی، لەو ناوچە و شارانەدا تێز و بیروبۆچوونەکانی تاوتوێدەکەن و بەشداری داڕشتنی هەندێکیان دەکەن. خۆ ئەگەر لە دەستپێکدا چەند تاکێکی پەرتەوازە، بەهۆی ئەزموونی تایبەتی یاخود پەیوەندییان بە گەورە سۆفییانی دەستەی یەکەم، بە سۆفیگەری ئاشنادەبن، ئەوا دواتر گەشەدەسێنێ و لە چەند شوێنێکدا وەك دیاردەیەکی ئایینی بەربڵاو دەردەکەوێ، کە تەنانەت دەبێتە ناسنامەیەکیش بۆ هەندێك لەو شوێنانە. سۆفییەکانی ئەوێش، ئەگەرچی بە کاریگەریی سۆفییانی جیهانی ئیسلامی دەرکەوتوون، بەڵام ئەوانیش توانیویانە کەسێتی خۆیان بەسەر بوارەکەدا بسەپێنن و هەندێکیان ببنە سەنتەرێك و رێنیشاندەرێك بۆ ئەوانەی دەیانویست ببنە سۆفی. تەنانەت کەسانێکیان توانیویانە رێبازی سەربەخۆی سۆفییانەیان هەبێ و لە بواری هەمەچەشندا تایبەتمەندییان بە هزرەکە بەخشیوە، کە لەلای کەس و رێبازەکانی تر بەرچاوناکەوێ. لەلایەکی ترەوە بەرەبەرە دیاردەکە پەیوەست بووە بە گەشەسەندنی ئایینی وڵاتەکە و هەوڵیداوە وەڵامی ئەو پرسیارانە بداتەوە، کە پێشڤەچوونە باوەڕییەکان لە پانتایی گشتی ئیسلامیدا دەیانوروژاند و بەدوای شێوەیەکی نەگۆڕی باوەڕداریی دەگەڕان و تەواوی دراوەکانی هزری ئایینیان جێگیردەکرد.

سۆفیگەریی ئیسلامی لە کوردستان لەم قۆناغە زووەوە، هەردوو رۆڵی ئایینی و کۆمەڵایەتی گێڕاوە؛ هەم لە چەسپاندنی تێگەیشتنێك بۆ ئایینەکە، هەمیش لە گونجاندن و پەیوەندیی نێوان ئیسلامەتی و بیروباوەڕە نێوخۆییەکانی ئەوێ، ئەمە سەرباری خۆگونجاندنی لەگەڵ بونیادی کۆمەڵایەتی کوردی و چێکردنی پەیوەندییەکی تەواوکاری لە نێوان تایبەتمەندییەکانی خۆی و هەندێك لە دەرکەوتەکانی شوناسی هەمەگیری لە چەند سەدەی یەکەمی دوای هەژموونی باوەڕی نوێ بەسەریاندا. لەم روانگەیەوە وەك رەنگدانەوەی دەرکەوتەیەکی جیاوازی ئایینەکە لەو پانتاییەدا خۆی دەنوێنێ، بۆیە دەشێ قۆناغێکی

ناسینی باوەڕەکە بێت لەسەرەتاکانی گەڵاڵەبوونی شوناسی ئیسلامییانەی بەشێکی سەرەکی جڤاکی کوردی، کە جیهانبینییەکی نوێی لە چوارچێوە کۆمەڵایەتییەکەدا هێناوەتە ئارا و لەوێ بەدواوە دەبێتە ڕەگەزێکی بنەڕەتی بیری ئایینی کوردیی.

لێرەوە بابەتێکی وەك "هزری سۆفیگەریی ئیسلامی لە کوردستان"، لە پێنج سەدەی یەکەمی کۆچی، کە قۆناغی سەرهەڵدان و جێگیربوونی دیاردەکە بوو، گرنگی خۆی دەبێ، چونکە لە چەندان تەوەرەدا گەشەسەندنە دیار و نادیارەکانی بیروباوەڕی ئایینی لەو زەمینە جوگرافییەدا شیدەکاتەوە: لە تەوەرەیەکدا کە سۆفیگەری پێناسەی خوداناسیی مرۆڤی ناو ئەو جڤاکەی کردۆتەوە و سنوورەکانی ئەو ناسینە و حەقیقەتەکانی پشتی دەستنیشان کردووە. لەو تەوەرەیەشدا کە گوزارشت لە دەربڕینێکی ئایینی دەکات، کە لە وڵاتەکەدا جێگیردەبێ و کەسانێکی تێدا دەردەکەون لەدەرەوەی باوەڕی هەمەگیرانە و فەرمییەوە دەخوازن ئەو گوزارشتە بکەن، تەنانەت لە هەندێ باردا کاربکەن بۆ گۆڕینی ئەو باوەڕە هەمەگیرەش و مانایەکی تر بە باوەڕداریی و کردەی پیرۆزی ببەخشن. ئیدی سۆفیگەری بە گشتی کاری کردووە بۆ بونیادنانی کەسێتییەکی ئایینی خودان ڕەفتار و هەڵسوکەوتێکی سەربەخۆ، لەوەتەی دەرکەوتووە و تا ئێستا دەستی لەو ئەرکەی خۆی هەڵنەگرتووە و "سۆفیبوون" بۆتە ناسنامەی هەندێك تاك و گرۆی کۆمەڵایەتی کوردی و جێکەوتەی ئایینی و کۆمەڵایەتی و سیاسی و فەرهەنگی و...هتد ی دوور مەودای هەبووە و دەبێ. هەر بۆیە ناکرێ ئەوەی دەیەوێ لە مێژووی بیروباوەڕی پانتاییەکە ڤەکۆڵێ و شوناسە ئایینییەکان، چ لە چوارچێوەی شوێنکاتی مێژوویی دیاریکراوەوە بێت یاخود سەرووی ئەم شوێنکاتەوە، فەرامۆش بکات و وێنەیەکی دروستی ئەو مێژووەمان بۆ بنەخشێنێ.

## چوارچێوەی لێکۆڵینەوە و چەند تێبینییەك لەبارەی میتۆدەوە

### ماوەی مێژوویی لێکۆڵینەوەکە:

بۆ ئەوەی بتوانین بەسەر جومگە بنەڕەتییەکانی بابەتەکە رابگەین دەستنیشانی ئەو ماوە زەمەنییەمان کردووە، کە لە چوارچێوەیدا لە سۆفیگەری دەدوێین، ئەویش قۆناغی سەرهەڵدان و جێگیربوونی دیاردە ئایینییەکەیە لە پانتایی کوردیدا؛ قۆناغێك کە – لایەنی کەم – ڕەنگە

سەرەتاکەی بگەڕێتەوە بۆ سەدەی دووەمی کۆچی/ سەدەی هەشتەمی زایینی بەدواوە، کۆتاییەکەشمان بە کۆتایی سەدەی پێنجەمی کۆچی/سەرەتای دوانزەی زایینی دیاری کردووە. ڕەنگە بەهانەمان بۆ دەستپێکی قۆناغەکە روون بێت؛ لەوێدا کەسانێك دەرکەوتوونە لە نێو جیهانبینیی سۆفییانەدا گوزارشتیان لە خۆیان کردووە و وەك سۆفی – بەمانا فراوانەکەی – ناسراون. بەڵام کۆتایی قۆناغی توێژینەوەکە، ئاماژە نییە بۆ کۆتایی دیاردەکە، ئەوەندەی پشت بەستنە بە کۆمەڵێك خاڵی تایبەت بە پەرەسەندن و دەرکەوتەکانی هزرەکە، کە هەندێکیان راستەوخۆ پەیوەستن بە ئاستە نێوخۆییەکە(پانتایی کوردی) و هەندێکیشیان بە ئاستی گشتی(جیهانی ئیسلامی)؛ تا ئەو قۆناغە سۆفیگەری پتر دیاردەیەکی ئایینی تایبەتمەندە، لەلایەن دەستەبژێرێکەوە پەیڕەوی لێ دەکرێ، کە هەر خۆیان بەرهەمی دەهێنن یان لایەنی کەم چوونەتە نێو ئەو ئەلقانەی ئەم کارە دەکەن، بەمەش سۆفیگەری وەك هزرێکی خاوەن جیهانبینییەکی تارادەیەك سەربەخۆ خۆی دەنواند. بەڵام لەوێ بەدواوە، بەتایبەت لەسەدەی شەشەمی کۆچی هێندێك لە کۆڵەگە بنەڕەتییەکانی ئەو تایبەتمەندییەی لە دەست دەدا و دەپەڕێتەوە بۆ قۆناغێکی جیاواز و خۆی لە چوارچێوەی سیستەمێکی ڕێکخراودا دەبینێتەوە، ئەویش ئەو سیستەمی تەریقەتەیە کە تائێستا بەشی سەرەکی ناسنامەی دیاردە ئایینییەکە پێکدێنی و زێتر جەخت لەسەر داڕشتنی پەیوەندییە نێوخۆییەکانی گەلی سۆفییان دەکاتەوە.

هەروەها لەو قۆناغەی باسی دەکەین هێشتا سۆفیگەری خەریکی داڕشتنی یەکە پێکهێنەرەکانی شوناسەکەیەتی نەیتوانیوە بەتەواوی پێگەی خۆی لەنێو قەوارەی ئایینیدا جێگیر بکات. بەپێچەوانەی قۆناغی دواتر کە بەشێوەیەکی گشتی وەرچەرخانێکی گرنگی بە خۆوە بینیوە، وایکردووە چیدی لەلایەن دەستەبژێری ئایینی وەك تەنێکی نامۆ لە نێو جەستەی ئایینی موسڵماناندا چاوی لێ نەکرێ؛ چەند زانایەکی هەژموونگەر بەسەر باوەڕداری، وەك ئەبوحامدی غەزالی (٤٥٠- ٥٠٥ك/١٠٥٨-١١١١ز)، ئەو دیاردەیە لەچوارچێوە بەرتەسکەکە دەردەهێنن و وەك وەڵامدانەوەیەکی پێداویستییە ئایینی – کۆمەڵایەتییەکاندا دەیخەنەڕوو، وەك دەزانین غەزالی بە کولتووری سۆفیگەریدا دەچێتەوە و تێزەکانی دەخاتە نێو پرۆسەیەکی ووردی هەڵاوێردکرن و داڕشتنەوە تا لەگەڵ بواری شەریعەتیی، ئەو شەریعەتە سوننەگەرایەی خۆی باوەڕی پێی هەبووە، بگونجێنێ. ئیدی ئەو و پەڕەوکارانی وایان کردووە لە سەدەی شەشەمی کۆچییەوە سۆفیگەری سوننیی لە پانتایی ئیسلامیدا باڵا دەست بێ و

مێژوویەکی جیاوازی دیاردەکە دەست پێ بکات. لە هەمان کاتدا، هەر لەو سەردەمە جیاوازەدا، ئاراستەیەکی نوێی سۆفیگەری سەرهەڵدەدا، کە دەیەوێ لە ڕەهەندێکی فەلسەفییانەوە و بە بەکارهێنانی چەمك و تێڕامان و تێزەکانی ئەو کایەیەوە ناسنامەی خۆی دابڕێژێتەوە، وەك لە کارکردنی سۆفییەکی وەك شەهابەدین یەحیای سوهرەوەردی کوژراو (م٥٨٩ك/١١٩٣ز) دیارە، بەمەش تا ڕادەیەکی زۆر لەو قاڵبە دەردەچێ کە لەم قۆناغەی دەسـ ـنشانمان کردووە پێی ناسرابوو.

هەموو ئەوەی گوتمان، وەرچەرخانی ڕیشەیی بوون لە پێگەی سۆفیگەری لە پانتایی ئیسلامی، لە ڕووی ناوەڕۆك و دەرکەوتەکانیدا گۆڕانی ئەوتۆی بەسەردا دێ کە وادەکات خەسڵەت و تایبەتمەندیی نوێ لە خۆ بگرێ و لە قۆناغی پێشوو کە ئێمە ئیشی لەسەر دەکەین جوێی بکاتەوە.

### قەیرانی میتۆد یاخود میتۆدی پێکهاتەیی – بەراوردکارییانە:

ڕەنگە پڕ قەیرانترین جۆری توێژینەوەی مێژوویی، بەتایبەت لە زەمینەی ڕۆشنبیری – ئاکادیمی کوردی، ئەوەیان بێ کە لە مێژووی هزر دەکۆڵێتەوە، ئەو مێژووەی سەرقاڵی خوێندنەوە و تێگەیشتنی زەینی مرۆڤەکان و کۆمەڵگاکانە، نەك ئەو ڕووداو و هەڵسوکەوتانەی دەینوێنن و ڕەنگدانەوەی ئەو زەینەن، ئەگەر ڕووداویش لە شوێنێکی دیاریکراو و لە مەودایەکی زەمەنی شێوەگیر دەبێ، ئەوە دەشێ کاریگەرییەکانی لە ئاکامی جەنجاڵی ڕووداوگەلی دوای خۆی و بەرتەسکی یادەوەری تاك و دەستەجەمعی کاڵ ببنەوە، کەچی گۆڕانەکانی نێو زەین و بیرکردنەوە سنووردارتر و هێواشترن، پێویستیان بە هۆشێکی زۆری مێژوویی هەیە بتوانێ وردەکارییەکانیان تۆمار بکات، هەروەها کەمتر دەتوانرێ لە سنوورێکی دیاریکراوی شوێن و ماوەیەکی دەستنیشانکراوی کاتییەوە بەرجەستە بکرێ. جا چ جای مێژووی ئایینی کە چەندین ڕوخساری دیار و نادیاری هەیە و سنووربەندکردنی بە کات و شوێنەوە جەربەزەییەکی مەعریفییە و مەرج نییە وەڵامی تەواوی پرس و گرێمانە باوەکان بداتەوە و ئاکامەکانی لە دووتوێی میتۆدێکی ناسراو و باوی توێژینەوەدا بەرجەستە بێن.

بێگومان کارکردن لەسەر ئەو مێژووە، بەتایبەت کە مێژووی میللەتێك بێ کولتووری مێژووی نوسراوی بە بەراورد لەگەڵ مێژووە زارەکییەکەی لە ئاستێکی سەرەتایی بووبێ و زۆرترینی مێژووە ئاساییەکەی نەك هزریەکەی لەلایەن "ئەوانیتر" و لە چوارچێوەی

وێناکانیانەوە دەرکەوتبێ و تا ئێستاش قۆناغە تاریکەکانی لە قۆناغە ڕووناکەکانی زیاتر بێ، پێویستی بەوە دەبێ چەندان میتۆدی جیاوازی لەسەر جێبەجێ بکرێ؛ یەکێك لەو میتۆدانەش میتۆدی پێکهاتەییە کە ئەمەش پەیوەستە بە شێوازی خستنەڕووی سەرچاوە کلاسیکییەکان بۆ سۆفییان و هزرەکەیان: لەمەدا هەوڵمانداوە ئەو هزرە لەو پارچەپارچەییە ڕزگار بکەین کە لە بنەڕەتدا تێیدایە، چونکە نوسەرانی بواری سۆفیگەری بەپێی چەمك و دەستەواژەکان پەرشیان کردۆتەوە و کەمتر هەوڵیانداوە پەیوەندیی نێوان وتەکان لە ڕێگەی نێوەندگیریی کەسێتیی سۆفی و شوێن و زەمینەی دەرکەوتنی باس بکەن، ئەمە بە ئاشکرا لەو جۆرە نوسینە دیارە کە نوسەرەکانیان بەگشتی ویستوویانە بەسەرهاتی سۆفییان بنوسنەوە و لەژێر ناوی "الطبقات الصوفية"دا جێگەیان دەکرێتەوە، ئەمانە ئەوەندەی بەدوای دەرخستنی ڕەهەندە سۆفییەکانی کەسایەتییەکانن، ئەوەندە خۆیان سەرقاڵ نەکردووە بە کێشانی وێنەیەکی گشتگیر بۆیان، کە دەشێ هاوکارمان بێت لە خوێندنەوەی دروستی پەرەسەندنە هزرییەکانیان، هەر لە چۆنییەتی گەڵاڵەبوونی ئەو هزرەوە تا پێگەیشتنی و دواتر بەیانکردنی. خۆ دراوەکانی کەسێتی سۆفییانە بەپێی ئەو سەرچاوانە سنووردارە بە چەند بوارێکەوە: ناوی سۆفی، ئەو سۆفییانەی یاوەرێتی کردوون، ئەو زانستانەی لێی شارەزا بووە، ئەگەر هەبێ شوێن و ساڵی مردنی، دواتریش گێڕانەوەی گرنگترین ئەو وتانەی لەنێو ئەلقەی سۆفیاندا جێگەی باس بووە. بەڵام زۆرجار مەبەستی مێژوونوسی سۆفی پتر گێڕانەوەی وتەکانە، نەك بینینی پەیوەندیی نێوانیان و نیشاندانی تەواوی ئەو گوتارەی سۆفی دەیخوازێ یان توانیویەتی بەرهەمی بهێنێ. بۆیە، ئەوەی ئەو سەرچاوانە بخوێنێتەوە هەندێکجار وای دێتە بەرچاو خودان بیروبۆچوونی پەرش و بڵاون و تاکە شتێك تێزەکانی بەیەکەوە بەستبێتەوە ناوی سۆفییەکەیە.

لەبەرامبەر بەمە، ئێمە هەوڵمانداوە وتەی ئەو سۆفییانە وەك چەند یەکەیەکی جیاواز بەیەکەوە پەیوەست بکەین و ئەو گوتارە بخەینەڕوو کە دەشێ لە پشت پەرش و بڵاویەکەدا خۆی حەشار دابێ، ئەمەش وا دەخوازێ — جگە لە پرۆسەی گرێدانی دەقە جیاوازەکان — هەوڵبدەین لە میانەی گوتاری هەمەگیری سۆفیگەری تێزەکان ڕوونتر بکەینەوە و لەوێدا بونیادی مێژوویی چەمك و تێزەکان و ئاستەکانی بەکارهێنانیان دەستنیشان بکەین.

بێگومان زۆرجار ئەو پرۆسە پێکهاتەییە کارێکی ئەستەم دەبێ، ئەمەش لەبەر سنوورداری وتە و بۆچوونی سۆفییەکانی پانتایی کوردی لەڕووی چەندێتییەوە، هەروەها پرۆسەی هەڵاوێردکردن و هەڵوێستی پێشینەی نوسەرانی کلاسیك لە خستنەڕووی وتەکاندا. بۆیە

راگەیشتن بەسەر ئەو بونیادە کارێکی ئەستەم و بڕێك جاریش دەرچوون دەبێ لە میتۆدی ڕەخنەیی – شرۆڤەکاریی و ناچاری گەڕانەوەمان دەکات بۆ ئەو میتۆدە گێڕانەوەییەی مێژووی ڕووداوی پێ دەنوسرێتەوە، ئەمە بەتایبەت لە هەردوو بەشی یەکەم و دووەمی توێژینەوەکە بە ڕوونی دیارە و لەبەشەکانی تریشدا لێرە و لەوێ هەمان میتۆد خۆی بەسەر ناوکۆی توێژینەوەکە سەپاندۆتەوە. بێگومان نەبوونی توێژینەوەی تر کە بەو میتۆدە گێڕانەوەییە کاری کردبێ، ئەو ناچارکارییە تۆختر دەکاتەوە و وەك پێویستییەکی زانستی لێ دەکات بۆ ڕێگەخۆشکردنی – ئەگەر کەمێکیش بێ – بۆ میتۆدە ڕەخنەییە شرۆڤەکارییەکە.

دەبێ لێرەدا تێبینی ئەوە بکەین کە کۆکردنەوەی وتەکان مانای بە حەکایەتکردنیان نییە یان نەمان ویستووە بەمجۆرە دەربچێت، ئەگەرچی لە هەندێك شوێنی توێژینەوەکەدا وا دێتە بەرچاو، بەڵکو کارکردنە بۆ دۆزینەوەی بونیادی هاوبەشیان، بەڵام دواتر بەپێی پەیکەری توێژینەوەکە جارێکی تر دابەشکراونەتەوە، کە لەبەر کەمی زانیارییەکان، ناچار بووینە هەندێك لەو زانیارییانە لەم شوێنە جیاوازانەدا دووپات یان چەند بارە بکەینەوە، بەجۆرێك ئەو سۆفییەی لە بەشێکی دیاریکراودا ئیشی لەسەر کراوە، وازمان لێی نەهێناوە و دەشێ لە چەندان بەشی تریشەوە گەڕابینەوە سەری، دیارە لەمەشدا مەبەستمان دەستنیشانکردنی هەریەك لە تایبەتمەندی کەسێتیی و هاوبەش بوونییەتی لەگەڵ ئەوانیتری هەمان پانتایی جوگرافی، لە هەندێك بابەت و وێستگەی گەشەسەندن و دەرکەوتەی سۆفیگەریدا.

لەلایەکی ترەوە، نوسینەوەی مێژووی بیروباوەڕی ئایینی پێویست بەوە دەکات سەرەدەری لەگەڵ ماوەی درێژی مێژوویدا بکەی، چونکە دیاردەی ئایینی وەك سۆفیگەری، مەرج نییە لە شوێن و کاتێکی دیاریکراودا خۆی بهێڵێتەوە، بەڵکو دەبینین کە ئەگەرچی بەرهەمهێنەرەکانی لەنێو مێژووی واقیعی و بەرجەستەدا وندەبن، بەڵام هەم کەسایەتی و هەمیش هزر و بۆچوونەکانیان مەرزەکانیان بڕیوە و چوونەتە دەرەوەی سەردەمی خۆیان و وەك کەسایەتی "سەروو مێژوویی – Meta history"، چ لە ئاستی دیاردەی سۆفیگەری بێ یاخود بیروباوەڕی ئایینی نێوخۆیی یانیش ئاستی کۆمەڵایەتی، دەردەکەون. هەر بۆیە، وەك پێداویستییەکی زانستی، ناچار بووین هەڵوەستە لەسەر ئەو دەرکەوتە سەروو مێژووییانەش بکەین و جێکەوتەی بەرهەمهێنەرانی هزرەکە لەودیو شوێنکاتەوە دەربخەین، لەو کارەشدا پەیڕەوییمان لە میتۆدێکی بەراوردکارانە کردووە تا بتوانین بەهۆیەوە وێنەی دروست لەگەڵ

وێناکراوی ڕەمزە سۆفییەکان بە یەکدی بناسینەوە یاخود لە یەکتریان جویێ بکەینەوە یانیش تەنانەت وەك تەواوکەری یەکتر بخەینە ڕوو.

لەم گۆشەنیگایەوە، ئەو بۆچوونە بە دروست دەزانین و کاری پیێ دەکەین، کە پێی وایە توێژەری بواری مێژووی ئایینەکان هەر ئیش لەسەر ڕاستییە مێژووییەکان ناکات، بەڵکو — بە کاریگەریی تایبەتمەندێتییەکانی ئایین خۆی — بەردەوام لەبەرامبەر بە ڕووداوگەلێکدا دەبینێتەوە دەچنە سەرووی ئەو ڕاستییانەوە یاخود بە تێگەیشتنی نامێژووییانەوە گوزارشتی لیێ دەکەن، ئەو گوزارشتکردنەش لە سیستەمی باوەڕداری و پرۆسەی بەرهەمهێنانی پیرۆزیدا ئامادەییەکی بەهێزیان هەیە و لە ناوەندە کۆمەڵایەتییە — ئایینییەکەدا بەرچاون، کە دەشێ ئەمەش بە خەیاڵدانی ئایینی دابنێین؛ ئەو خەیاڵدانەی دەیەوێ پیرۆزیی لە هەموو ئەو کەس و هزرانە ببینێتەوە کە پێکیان هێناوە، بەمەش ئەو کەس و هزرانە نا سروشتییانە دەخوێندرێنەوە نەك وەك ڕاستییەکی پەتی، بەڵکو زۆرجار ئەو ڕاستییە نکۆڵی لیێ دەکریێ یاخود لەبەردەم هەژمونی پرۆسەی پیرۆزکردندا پەردەپۆش دەکریێ و وێنا ئایینییەکان پتر پشتیان پیێ دەبەستریێ و لە ژیانی ڕۆژانەدا بەرجەستە دەکرێن، بەتایبەت کە باوەڕبوون بەو خەیاڵدانە پابەندبوونێکە بە پیرۆزی و بۆتە بەشێك لە باوەڕداری گشتی و وەك ئەرکێکی ئایینی وایە. لێرەوە، ئەگەر توێژەر دەیەوێ خوێندنەوەیەکی دروستی هزر و بیروباوەڕی ئایینی لە پانتاییەکی دیاریکراوی جوگرافیی — کۆمەڵایەتییدا بکات، دەبیێ هەوڵبدات هەم بونیادە مێژووییەکەی و تایبەتمەندییە نێوخۆییە — واقیعییەکەی بخوێنێتەوە، هەمیش دەرکەوتەکانی دواتری لە نێو خەیاڵدانەکەدا لەبەرچاو بگریێ، جا دەرکەوتەی ئاسایی بن یان نا ئاسایی. ئەگەر وانەبیێ ئەوا بەسەر خوێندنەوەی هەمەکییانەی بیروباوەڕی ئایینی پانتاییەکە ڕاناگات و ئەو بەردەوامییتییەی دەشیێ لە نێو بیروباوەڕە جیاوازەکاندا هەبن نابینیێ. بێگومان ئەمەش جۆرێکە لە جەربەزەیی و ڕەنگە — بەهۆی قوڵنەبوونەوەی میتۆدەکە و کەڵەکەنەبوونی ئەزموونی کارپێکردنی — سەر نەگریێ. لەگەڵ ئەوەشدا هەوڵدراوە لە توێژینەوەی دیاردەی سۆفیگەری پیادە بکریێ، مەرجیش نییە دەرەقەتی میتۆدەکە هاتبێتین.

## یەکەم: ماناکانی سۆفیگەری – لە قەیرانی لێکۆڵینەوەوە بۆ قەیرانی ناسنامە:

سۆفیگەریی ئیسلامی لە چەندان روو و ئاراستەی جیاوازەوە خوێندنەوەی فرەجۆری بۆ کراوە و هەتا بڵێی جێگەی گرنگی پێدان بووە، جا چ لە رووی سەرچاوە و سەرهەڵدان و گەشەسەندن و پێگەیشتنەوە بێت، یان لە رووی چییەتی ئەو هزرەی لە پشت ئەو کایەوە هەیە، لەگەڵ رەهەند و جیهانبینییە ئایینییەکەی، یانیش لە بوارە کردەکییەکەی و جێکەوتەکانی لە زەمینە کۆمەڵایەتییە – ئایینییە هەمەچەشنەکاندا. ئەو گرنگیدانە هەم لەو پانتاییەی سۆفیگەری تێدا بووە(جیهانی ئیسلامی خۆی)، هەمیش لە دەرەوەی(جیهانی رۆژئاوا) بووە؛ لە زوویەکەوە وەك دیاردەیەکی ئایینی ناباو کە پەیڕەوکارانی خودان بیروباوەڕ و سرووت و هەڵسوکەوتی تایبەتمەندن، بینراوە و تێزەکانی و کەسایەتییەکانی سەرنجی زۆرترین رۆژهەڵاتناسی بۆ لای خۆی راکێشاوە و نزیکەی تەواوی وردەکارییەکانی تاوتوێ کراون[1]، هەر بۆیە ئەوەی لە ئێستادا دێتە سەر ئەو بابەتە و دەخوازێ لێی بکۆڵێتەوە، وای دێتە بەرچاو کە زۆربەی رەهەندەکانی کایەکەدا بینراون و نادیارییەکی ئەوتۆی تێدا نەماوەتەوە خوێندنەوەی نوێ لەخۆ بگرێ و بایی ئەوە بێ بە گوتارە باوەکەی بچێتەوە و لە چوارچێوەی رەهەندی تری ئەو سیستەمە کولتوورییەی پێکی هێناوە بیخاتەڕوو.

لەگەڵ ئەوەشدا، تێڕامانێکی وردی ئەو بەرهەم و بۆچوونانەی لەسەر سۆفیگەری هەن، دەمانخەنە بەردەم قەیرانی خوێندنەوەوە؛ قەیرانێك کەوا زۆربەی ئەوانەی خۆیان بۆ بوارەکە تەرخانکردووە رووبەڕووی بوونەتەوە، تەنانەت هەندێکیان رۆڵیان هەبووە لە بەرفرەکردنی مەوداکانی و پاشانیش بووەتە پەردەیەك کرۆکی سۆفیگەریمان لێ پەنهان دەکات و ناچار بە خوێندنەوەی رووخسارە دەرەکییەکەیان دەکاتەوە. ئەو قەیرانەش لەوەوە سەرچاوە دەگرێ کە زۆرترینی ئەو توێژینەوە و خوێندنەوانەی هەن دەخوازن لە دەرەوەی ئەو سیستەمەی سۆفیگەری خۆی کاری پێ دەکات ببیننن و لە دووتوێی کایەی هاوشێوە و ئامادە لەو گۆڕەپانەی ئەوی تێدا سەرهەڵداوە، تێگەیشتنێکی وێناکارییانەی لەسەر بەرهەمبهێنن و دەستنیشانی پێگەکەی لە ئاستی هەمەگیرانەی کولتووری ئیسلامیدا بکەن.

---

(١) لە بارەی سەرەتاکانی ئەو گرنگیدانە و ئاراستەکانی بگەڕێوە بۆ: آنا ماري شيمل: أبعاد صوفية للإسلام, ترجمة: عيسى علي العاكوب, دار الملتقى, حلب, ٢٠٠٦, ص ص٣٢-٣٩.

روونتر بڵێین، قەیرانی سەرەکی گوتاری بەرهەمهێنراو لەمەڕ سۆفیگەری، چ لەلای ئەوانەی سەر بە هەمان زەمینەی کایەکەن یان بەتایبەت ئەوانەی لە دەرەوەی کولتورەکە چاودێری دەکەن (ڕۆژهەڵاتناسان)، لە دەستنیشانکردنی روانگەی شرۆڤەکردنی ئەم هزرەیە لە رووی سەرهەڵدان و سەرچاوەکانییەوە. ئەمەش زیاتر لە ناساندنەوەی سۆفیگەری بە دەرەوەی خۆی یان بە رەگەزە پێکهێنەرەکانی دەردەکەوێ، لێرەدا تێز و بۆچوونی جیاواز خراونەتە روو؛ لەو تێزە باوانەش جەختکردنەوە لە سەر ئامادەیی رەگەزی هیندی(هیندۆسی و بودایی) لە ژیانی زاهیدانەی سۆفییان و بیرکردنەوەیان و برێك لەو چەمکانەی بونیادی هزرەکەی لەسەر داڕێژراوە. هەروەها ئاماژەدان بە کاریگەریی کولتووری ئایینی دوانەیی(زەردەشتی، مانی، مەزدەکی) لە پێگەیشتنی دیاردەکەدا، لە رێگەی ئەو سۆفییانەی لە بنەڕەتەوە خودان پاشخانێکی زەردەشتی یان سێکتەکانی تر بوون. ئەمە سەرباری پێداگیری کەسانێکی تر لەسەر کاریگەریی کولتووری گریکی بەسەر داڕشتنی رەهەندی فەلسەفییانەی سۆفیگەری بە گشتی. هەروەها گرنگیدانی زۆری هەندێکیش بە لەیەکچوونی حاڵی سۆفییانە و شێوەژیانیان لەگەڵ سیستەمی رەبەنێتی مەسیحی و هاوشێوەیی کردەی چەپاندنی دەروونیی مەسیحییانە و سۆفییانە و...هتد[٢].

لەلایەکی ترەوە گروپێك لە توێژەران، بەتایبەت ئەوانەی خۆیان سەر بە پانتایی ئیسلامین، یان بابڵێین لە روانگەیەکی ئیسلامییەوە چاو لە سۆفیگەری دەکەن، لەپاڵ تەرخانکردنی توانایەکی زۆر بۆ رەتکردنەوەی بۆچوون و تیۆرەکانی ئەوانی پێشوو، وێڵی دوای رەسەنی ئیسلامییانەی تەواوی تێز و دەرکەوتەکانی کایەکەن و لە چوارچێوەیەکی گشتگیرەوە جێی دەکەنەوە و بەدوای ئەو رەوتە مێژووییە نێوخۆییەی بیروباوەڕەکە دەگەڕێن کە رێگە بە دەرکەوتنی ئیسلامی سۆفییانە دەدات، ئەمەش لە دووتوێی دەقە بنەڕەتیەکانەوە (قورئان، فەرموودە) و کاروکردەوەی کەسە پیرۆزکراوەکانەوە(یاوەران، ئیمامەکان)، قسە لەسەر رەهەند

---

(٢) لێرە لەم دەروازە کورتەدا بەپێویستی نازانین نموونە لەبارەی هەریەك لەو ئاراستانەی خوێندنەوەی سۆفیگەری بهێنینەوە, بۆیە بۆ تێگەیشتن لە تایبەتمەندیەکانی هەریەکەیان و ئەوانەی کاریان لەسەر کردووە بگەڕێوە بۆ: محمد عبد الله الشرقاوي: الإتجاهات الحديثة في دراسة التصوف الإسلامي(مصادره و آثاره), دار الفكر العربي, القاهرة, ١٩٩٣, ص ص ٣١-٩٢.

و روخساری سۆفییانه دەکەن و لەیەکچونی هەندێك لە هەڵسوکەوت و بیروبۆچوون و رووداو دەکەنە بەهانەی هەبوونی ریشەی مێژوویی - ئایینیانەی کایەکە[٣].

دیارە ئەو خوێندنەوانە بێ سوود نین لە راگەیشتن بەسەر پرۆسەی گەڵاڵەبوونی گوتاری سۆفیگەری، ئەگەرچی ئەمە زێتر خوێندنەوەی کاریگەریی و کارتێکردنە لە میانەی گەڕان بەدوای خاڵە هاوشێوە و لێکچووەکان یاخود جیاوازەکانەوە، لەو روانگەیەوە بەگەڕخستنی هەموو ئەو کولتوورە فرەچەشنانە مانای خۆی دەبێ، بەتایبەت لە چوارچێوەی تێگەی سۆفییانە و ئەرکی چەمك و دەستەواژەکان، بەپێی ئەو "حاڵ و مەقام – الحال و المقام"انەی گوزارشت لە رەوشی سۆفی لە هەردوو ئاستی تیۆری و کردەکیدا دەکەن. بەڵام خۆ ئەمە بینینی هزرەکەیە لە دەرکەوتەکانی نەك لە "چییەتی – الماهیة"دا؛ ئەمە تێگەیشتنێکە بۆ رووخسارەکانی و زیاتر پشت بە زنجیرەبەندیەکی مێژووییەوە دەبەستێ، ئەوەندەی بەدوای ماقوڵبوونی لە زەمینەی سەرهەڵدانیدا دەگەڕێ ئەوەندە خستنەرووی ماناکانی لە خۆیدا نییە. ئیدی، بە بڕوای ئێمە، ئەو توێژینەوانە لە خوێندنەوەی ئەم چییەتیە و راڤەی هزرەکە بۆ سەرچاوە و دەرکەوتەکانی خۆی کورتیان هێناوە، کە دەشێ بەدەر لە هۆکارەکانی سەرهەڵدان شتێك هەبێ پێی بڵێین "جیهانبینی سۆفییانە"، ئەوەی لە سەرووی هۆکاری سەرهەڵدان و سەرچاوە و پێگەی هزرەکە لە نێو سیستەمی کولتووریی ئیسلامییەوە، تێگەیشتنێکی سەربەخۆی بۆ خۆی و هەموو ئەمانەشەوە هەبێت، بەمەش وەك کایەیەکی ئایینی لە سنوورەکانی خۆی و بەپێی سیستەمی چەمکەکانییەوە مانا ببەخشێ نەك تەنیا لە رێگەی خوێندنەوەی دەرەکییەوە.

رەنگە ئەوەی رێگە بە راڤەی جیاواز و تەنانەت دژ بەیەك دەدات و ئەو قەیرانی خوێندنەوەیە دێنێتە ئاراوە، ناسینی سۆفیگەری بۆ خۆی بێت؛ ئەو کایەیە، بە بەراورد لەگەڵ کایە زانستی و ئایینییەکانی تر، یەك پێناسە بۆ خۆی ناکات، بەڵکو لە دووتوێی کۆمەڵێك وتە و ئاماژە و دەستەواژەی سەربەخۆ و لێکدابڕاوەوە وەسفی خۆی دەکات، بۆیە کاتێك سۆفییان دەخوازن حاڵی خۆیان یان هزرەکەیان بناسێنن، بە ئاراستەی جیاجیا و بە سەدان

(٣) لەمبارەوە دەشێ بگەڕێیەوە بۆ: محمد بن الطيب: إسلام المتصوفة, دار الطليعة للطباعة والنشر, بيروت, ٢٠٠٧, ص ص١٣-١٧. هەروەها بڕوانە: محمد عبد الله الشرقاوي: الإتجاهات, ص ص١٥١- ١٧٥.

گوزارشتی هەمەچەشن و تەنانەت هێندێك جار دژ بەیەك دەدوێن[٤]. ئەو پەرش و بڵاوییەی لە هەوڵی پێناسەکردندا سەرچاوەی گرتووە، پەیوەستە بە تایبەتمەندی هەرە وردی کایەکەوە، بەجۆرێك کە تا ئەو کاتەی سۆفیگەری وەك ناساندنی ئەزموونی رۆحانی و سەربوردەی پێگەیشتنی کەسی سۆفییە، هەروەها بڕینی کۆمەڵێك قۆناغی هەستەکی و رۆحییە کە بە هۆیەوە ئەو کەسە بە پلەوپایەی دیاریکراو دەگات و دەشێ لەگەڵ پلەوپایەی سۆفییەکی تر هاوشێوە یاخود جیاواز بێت، تا ئەوکاتە ئەستەم دەبێ لەو چوارچێوە خودگەرییەوە دەری بهێنین و ئەزموونەکان هەمەگیرانە ببینین و پێناسەیەکی گشتگیرمان چنگ بکەوێ.

ئەوەی بە وردی لە دەقە سۆفییەکان رابمێنێ، بۆی دەردەکەوێ کە وەك هزرێك لە خودی سۆفی(بەرهەمهێنی هزر) دانەبڕاوە و وەك ئەزموونێکی تاکەکەسییانە دەمێنێتەوە و ناسینی پەیوەستە بە حاڵی سۆفییەکە خۆیەوە[٥]. بەمەش سۆفیگەری دەچێتە دەرەوەی ئەو بازنەیەی کایە ئیسلامییەکانی تر، بەتایبەت ئەوانەی دەخوازن وەك بەرهەمهێنی هزریی تەماشا بکرێن، کاری پێ دەکەن و بانگەشەی ئەوەیانە لەسەر بنەمای دابڕینی "خود" لە "بابەت" سنوورەکانی خۆیان دیاری کردووە. بەدەستەواژەیەکی تر، سۆفیگەری لەسەر خوێندنەوە و بە بابەتکردنی ئەزموونی بیرکردنەوە لە کایەیەکی دیاریکراو دانەمەزراوە ئەوەندەی گوزارشت لەو حاڵەتی بیرکردنەوە و کاریگەرییەکانی دەکات کە بابای سۆفی خۆی تێدا دەبینێتەوە، وەك بایەزیدی بسطامی دەڵێ: (( تەصەوف خستنەڕووی دەروونە لەنێو بەندایەتیدا، یان بەندی دڵە بە خودایەتی، پەیڕەوکردنی رەوشتی بەرزە و تەماشاکردنی خودای گەورەیە لە هەمەگیرییەکەیدا))[٦]؛ کەواتە ئەو هەر تەنیا هزرێکی سەربەخۆ و دابڕاو بەرهەم ناهێنێ، بەڵکو هەوڵێکیشە بۆ تێگەیشتن لە حاڵی سۆفیبوون(چۆنییەتی بەرهەمهێنان) خۆیەوە. بۆیە سۆفی ناتوانێ خۆی لە جیهانبینییەکەی دابڕێ و مانایەك بە دەرەوەی خۆی ببەخشێ، کە بەشێك لە ماناکانی ئەزموونە رۆحانییەکەی تێدا نەبێ.

---

(٤) لەمبارەوە بڕوانە: الخركوشي: تهذيب الأسرار في أصول التصوف, أعتنى بە: إمام سيد محمد علي, دار الكتب العلمية, بيروت, ٢٠٠٦, ص ص ١١-٢٣. السهروردي: عوارف المعارف, بتحقيق: عبد الحليم محمود و محمود بن الشريف, دار المعارف, القاهرة, ١٩٩٣, ج١, ص ص١٣٨-١٤٣.

(٥) بۆ نموونە بگەڕێوە بۆ: القشيري: الرسالة القشيرية في علم التصوف, تحقيق و تعليق: عبد الحليم محمود, دار الخير, دمشق- بيروت, ٢٠٠٣,

(٦) الخركوشي: تهذيب الأسرار, ص١٤.

سۆفییەکان خۆیان درکیان بەو قەیرانی تایبەتمەندی و جیانەبوونەوەیە کردووە و وەك حەقیقەتی کایەکەیان خستویانەتە روو، سۆفی و نووسەری بەناوبانگ ئەبو نەصری سەڕاج (م٣٧٨ك/٩٨٨ز)، لە میانەی گەڕانی بەدوای ڕەوایی و ناڕەوایی کایەکە بەپێی پێوەرە شەرعییەکان، رایدەگەیەنێ قەیرانی ناساندنی ئەو گرۆیە ئایینییە لەوەوە سەرچاوە دەگرێ، کە ئەوان لە رووی بەرهەمهێنانی زانستە ئایینییەکانەوە پەیوەست نەبوون بە بوارێکی دیاریکراوەوە، وەك چۆن بۆ نموونە "فەقیه" پەیوەستە بە زانستە فیقهییەکانەوە. بەڵکو هەوڵیانداوە خۆیان لە هیچ بوارێکی زانستی دانەبڕن و ئیش لەسەر تەواوی زانستەکان بکەن، تەنها "روخسار – الظاهر"ی دیاردەی ئایینی نەبینن بەڵکو بچنە ئەودیوی روخسار و لە "کرۆك – الباطن"ەکەشی بگەن. بەهەمان شێوە لە رووی حاڵی سۆفییانەشەوە لە سنووری یەك "حال" یاخود "مەقام"نەوەستاون و ویستوویانە سەرباری پابەندبوون بە بنەما رەوشتیەکان، کە بێگومان دەستنیشانی پایەی هەبوونی ئەوان لە نێو جیهاندا دەکات، لە پایەیەکی رۆحانییەوە بۆ پایەیەکی تر پەڕیونەتەوە. هەر بۆیە یەك پێناسە و یەك مانای ناویش نەیتوانیوە ئەوان لەخۆ بگرێ[٧].

هەرچۆنێك بێت، ئەو قەیرانی ناساندنە لە بنەڕەتی ناوەکەی (التصوف) بە زەقی دەردەکەوێ. وەنەبێ ئەو قەیرانەش نادیار بووبێ بەڵکو هەر دوای دەرکەوتن و جێگیربوونی کایەکە درکی پێکراوە و لە ناوەندی سۆفی و غەیرە سۆفیدا بۆچوونی جیاواز سەری هەڵداوە و لە دیدی فرەجۆرەوە شرۆڤەکراوە، لە گرنگترین ئەو بۆچوونانە ئەوەیانە کە ئەبو رەیحانی بەیرونی( م٤٤٠ك/١٠٤٨ز) باسی کردووە و وشەکە بە مانا هەمەگیرەکەی دەبەستێتەوە، کە ئاماژەیە بۆ زانین و دانایی، پێی وایە ناوەکە لە وشەی (sofia)ی گریکییەوە هاتووە و بە مانای حیکمەت و دانایی دێت[٨]، ئەمەش لەو روانگەیەوە کە سۆفی بەدوای حیکمەت

(٧) اللمع, تحقيق: عبد الحليم محمود, مكتبة الثقافة الدينية, بور سعيد, ٢٠٠٢, ص٤٠. هەروەها بڕوانە: منصور بن اردشير عبادي: مناقب الصوفية, بە كوشش: محمد تقى دانش پژوه و ايرج افشار, چاپخانه گيلان, تهران, ١٩٨٦, ص٣١-٣٢.

(٨) تحقيق ما للهند من مقولة مقبولة في العقل او مرذولة, مطبعة مجلس دائرة المعارف العثمانية, حيدر آباد الدكن, ١٩٨٥, ص٢٤.

دەگەڕی، ئەوە نەبێ ئەو حیکمەتەی دەیخوازێ حیکمەتێکی خوداییە و بەشێکیشە لە هەوڵی "ناسین – المعرفه"ی خودا خۆی.

بەشێکی زۆریشیان وشەکەیان بە رووخساری دەرەکی و خودی حاڵی سۆفییانە و ئەو جل و بەرگەی لەبەریان دەکرد، پەیوەست کردووە، کە زیاتر لە "صوف" دروستکرابوو[9]، پێیان وابوو پۆشینی ئەم جۆرەی جل و بەرگ ئاماژەیە بۆ هاوشێوەییان لەگەڵ مرۆڤە رۆحانییەکان، بەتایبەت "پێغەمبەران و راستگۆیان - الأنبیاء و الصدیقین"، ئەوانەی دونیا و خۆشییەکانیان بەهەند وەرنەگرتوە و لە دەرەوەی پێداویستیە ژیانییەکانەوە خۆیان ناساندووە[10]. بێگومان ئەو راڤەیەی ناوەکەش جێکردنەوەیەتی لە چوارچێوەیەکی تەواو رەمزی کە دەخوازێ گوزارشت لە خۆ تەرخانکردنی رەها بۆ خودا و بێباکی لە هەمبەر بوونیان لە نێو جیهان بکاتەوە.

هەندێك لە سۆفییانیش هەوڵیانداوە لە چوارچێوەی گوتاری ئیسلامییەوە مانای وشەکە بدۆزنەوە، بۆیە رایدەگەیەنن ناوەکەیان لە "پاکیی - الصفاء" هاتووە و بارگاوییە بە مانا ئایینییەکانی ئەو چەمکە و ئاماژەیە بۆ پاك بوونەوەی دڵ و گیانی سۆفی لە هەموو خراپەیەکی رەوشتییانە و ئافاتە دونیاییەکان و لەوێشەوە خۆتەرخانکردنەوەیە بۆ خودا[11]، هەندێکیش دەڵێن وشەکە خودان پاشخانێکی مێژوویی – ئایینییە و بەستوویانەتەوە بە قۆناغی دامەزرانی قەوارەی ئیسلام بەگشتی، بەتایبەت بەو گرۆیەی یاوەرانی پێغەمبەر کە "اهل الصُفة"یان پێ گوتراوە، ئەو هەژار و دەست کورتانەی "کۆچکەران – المهاجرون"یان دەگرتەوە، کە لە ئاکامی جێهێشتنی مەککە ماڵ و حاڵێکیان نەماوەتەوە و لە شاری مەدینە لە مزگەوتی پێغەمبەردا ژیاون[12]، سەربوردەی ژیانیان لەو شێوە ژیانە هەژارە نزیکە کە

---

(٩) الكلاباذي: التعرف لمذهب اهل التصوف, تقديم: يوحنا الجيب صادر, ط ٢, دار صادر, بيروت, ٢٠٠٦, ص١٣. القشيري: الرسالة, ص٤٢٦. السهروردي: عوارف, ج١, ص١٤٤-١٤٦. ابن خلدون: مقدمة ابن خلدون, تحقيق: علي عبد الواحد وافي, ط ٣, دار نهضة مصر, الفجالة – القاهرة, د.ت, ج٣, ص١٩٧.

(١٠) السراج: اللمع, ص٤٠-٤١.

(١١) الكلاباذي: التعرف, ص١٣. الهجويري: كشف المحجوب, دراسة و ترجمة و تعليق: إسعاد عبد الهادي قنديل, دار النهضة العربية, بيروت, ١٩٨٠, ج١, ص ص٢٢٧-٢٣٠.

(١٢) السهروردي: عوارف, ج١, ص١٤٦-١٤٧. ابن خلدون: شفاء السائل و تهذيب المسائل, تحقيق: محمد مطيع الحافظ, دار الفكر المعاصر و دار الفكر, بيروت – دمشق, ١٩٩٦, ص٥٢-٥٣.

سۆفییان کردبوویانە ناونیشانی خۆیان. لە هەمان چوارچێوەدا هەندێکیان دەڵێن ناوەکە لە وشەی "ریز — الصف"ەوە هاتووە و گوایە ئەوان لە ریزی یەکەمی باوەڕدارانن[١٣]. ئەمە سەرباری هەبوونی چەند رایەکی تری هاوشێوە لەبارەی رەسەنی ووشەکە.

بێگومان ئەو چەند بۆچوونەی دوایی هەوڵدانە بۆ دۆزینەوەی رەسەنی "تصوف" و زێتر دەچێتە نێو پرۆسەی بەخشینی رەوایی ئایینی و خۆپێناسەکردنە لە سنووری باوی ئایینداری و جەختکردنەوەی جەماوەری سۆفییانە لەسەر پابەندییان بەو خەیاڵدانە ئایینییەی لە نێو جیهانی ئیسلامیدا باڵادەستە و رەوایەتی و ناڕەوایەتی هەبوونی گرۆیەکانی پێ دەپێورێ، تا وەك گرۆیەکی نامۆ و ناپابەند تەماشا نەکرێن و لە شوێن و کاتی جیاوازەوە رەوایی بە ئامادەیی خۆیان و بەردەوامێتی بە رێبازەکەیان بدەن، ئەگەرنا وەك قوشەیری دەڵێ لە رووی زمانەوانییەوە داڕشتنی ناوەکە لەم وشانە نەگونجاوە و شێوەی گۆکردنی هەڵە دێتەوە[١٤]. بۆیە ئاساییە ئەگەر ببینین لەلایەن ئەوانەی بەو دیاردە ئایینییە رازی نین و پێیان وایە لە زۆر لە تێز و حاڵەکاندا دەرچوونە لە گوتاری باو و فەرمی و کارپێکراوی ئایینییەوە، بە پلە یەکیش فەقیهەکان، رەخنە ئاڕاستەی ئەو ناسنامە ئیسلامییانەی ئەوان — بەتایبەت خۆ گێڕانەوە بۆ سەر "أهل الصفة" — بکەن و بە رەسەنێکی هەڵبەستراوی دابنێن[١٥].

بەهەرحاڵ، جگە لە وشەی "صوفی"، ئەم گروپە بە چەندان ناوی لاوەکی و ناوچەیی ناسراون، کە هەم رەنگدانەوەی ئەو جیاوازیەی بیروبۆچوونەیە و هەمیش حاڵی ئەوان و ئەو پانتاییە جوگرافییەی کە تێیدا دەردەکەون، هەر لە ناوی "هەژارەکان — الفقراء"وە دیارە کە ئاماژە بۆ شێوەی ژیانی ئەوان و بێبەریبوون لە موڵکداری و خۆ تەرخانکردن بۆ خودا دەکرد[١٦]. بەهەمان

(١٣) الكلاباذي: التعرف, ص١٣. الأدفوي: الموفي بمعرفة التصوف و الصوفي, حققه: محمد عيسى صالحية, مكتبة دار العروبة للنشر, الكويت, ١٩٨٨, ص٣٩.

(١٤) الرسالة, ص٤٢٧-٤٢٨.

(١٥) بۆ نموونە بڕوانە: ابن الجوزي: تلبيس ابليس, حققه: ادم ابو سنينة, دار الفكر للنشر, الأردن, د.ت, ص ص١٨٨-١٩٠. ابن تيمية: فقه التصوف, تهذيب و تعليق: زهير شفيق الكبي, دار الفكر العربي, بيروت, ١٩٩٣, ص١١.

(١٦) القشيري: منثور الخطاب في مشهور الأبواب, ضمن: اربع رسائل في التصوف, تحقيق: قاسم السامرائي, دار الوراق, بيروت, ٢٠٠٨, ص٩٨. هەروەها بڕوانە: ابن تيمية: اهل الصفة و احوالهم, دراسة و تحقيق: مجدي فتحي السيد, دار الصحابة للتراث, طنطا, ١٩٩٠ , ص٥٠.

شێوه بەپێی ناوچەش ناوی تریان لێ نراوه، وەك "برسییەکان – الجوعية" وەك لەلای خەلکی وڵاتی شام وایان پێ دەگوترا[١٧]، یانیش "ئەشکەوتییەکان – شکفتیه" وەك لە خوراسان بەم ناوە دەناسران[١٨]، چونکه لەوێ لەناو ئەشکەوتەکان دەژیان، کە ئاماژەیەکیشه بۆ دوورەپەرێزیی و جێهێشتنی زەمینه کۆمەڵایەتییەی تێیدا ژیاون. ئەمە سەرباری ناوی "لۆمەکاران – الملامتية" کە هەر لەوێدا باو دەبێ و وەك خۆیان دەڵێن لەوەوە دێ ئەوان لە خوداناسیدا لە لۆمەی کەس ناترسن[١٩]. بێگومان ئەو جۆرە ناوانەش دەچنه ناو هەمان پرۆسەی بەرجەستەکردنی حاڵی سۆفییان و گوزارشتکردن بەپێی دەرکەوتەکانی حاڵەکه و نواندنی لەلایەن سۆفییانی پانتاییەکی سنورداری جوگرافی لە سەردەمێکی دیاریکراودا.

لێرەوە دەشێ بڵێین جێگیر نەبوونی سۆفییان خۆیان لەسەر سەرچاوەی ناوەکەیان، وادەکات بەڕاست دانانی هەرکامێکیان جۆرێك بێ لە سەرکێشی و وامان لێ بکات بەسەر ئەو مانایانه رانەگەین کە رەنگه راڤەکانی تر بیبەخشن. چونکه ئەوەی لەو فرە سەرچاوەییە دروستبێ، هەوڵی سۆفییه بۆ دۆزینەوەی ئەو وشانەی کەم تا زۆر لە ناوه مێژووکردەکەی ئەو نزیکن و دەکارێ لایەنێك یان چەند لایەنێکی تایبەتمەندیه کردەکیی و تیۆرییەکەی کایەکه شرۆڤە بکەن.

## دووەم: زوهدگەری وەك پاشخانی سەرهەڵدانی سۆفیگەری

لە دەرەوەی ئەو قەیرانەی ناساندن و دەستنیشانکردنی مەرزەکانی، سۆفیگەری وەك مێژووی گەشەسەندنی ئەزموونی رۆحانی لە پانتایی ئیسلامیدا دەمێنێتەوە، ئەزموونێك کە دەشێ بەپێی کات و شوێنەوە گوزارشتی جیاواز و دەرکەوتەی نا هاوشێوەی هەبووبێ، ئەگەرچی لە نوسینەوەی ئەو مێژووەدا وەك ئەزموونێکی کەڵەکەبوو و چەندان ئەلقەی تەواوکەری یەکتر تەماشای دەکرێ. ئەو جۆرە نوسینەوەیەش تا ئەوکاتە راست دەبێ کە ئەزموونی رۆحانی لە ئامادەیی ئەزموونکاران(زاهید، سۆفی، عارف، وەلی و...هتد) لەنێو جیهاندا چڕ بکەینەوە، لەو کاتەشدا

---

(١٧) الكلاباذي: التعرف, ص١٩.

(١٨) الكلاباذي: التعرف, ص١٩. السهروردي: عوارف, ج١, ص١٤٧.

(١٩) الخركوشي: تهذيب, ص ص٢٤-٢٦. بۆ زانیاری زیاتر لەبارەی ئەو گروپه و خەسڵەت و تایبەتمەندیەکانیان بڕوانه: السلمي: الملامتية و الصوفية و أهل الفتوة, تحقيق: ابو العلا عفيفي, دار إحياء الكتب العربية, القاهرة, ١٩٤٥, ص ص ٨٨-١٢٠.

دەبێ — بەهەمان میتۆدی توێژەرانی پێشوو — لە شێوە بەراییەکانی ئەو ئەزموونە لە نێو کولتووری ئیسلامیدا بگەڕێین. دیارە لەمەشدا مەبەستمان قۆناغی دوای رۆژگاری پێغەمبەرییە، ئەوکاتەی ئیدی کەسی باوەڕدار، لە پەیوەندیی بە خوداوە خۆی بە تەنیا لەگەڵ دەقی ئایینی دەبینێتەوە، چیدی ئەو بەریەککەوتنە راستەوخۆیەی بە خودایەتی نەماوە تا بتوانێ لە سنووری پەیوەندییەکە لە نێو ئەو دەوروبەرە گۆڕاو و ناجۆرەی قۆناغی نوێدا خۆی بناسێنێ. بۆیە ناچارە خۆی کاری ئەو پێکبەستییە بکات، ئەمەش بەوە دەبێ پەیوەندییە خوداییەکە لە دەرەوەی ئەو ناوەندەی تێیدایە دابڕێژێتەوە و ژیانێکی دوورەپەرێزانە هەڵبژێرێ.

رێك ئەمەش دەمانباتە سەر قۆناغی "زوهدگەری — التزهد"ی ئیسلامی، کە وەك پاشخانێکی گەڵاڵەبوونی هێندێك لە خەسڵەت و تایبەتمەندییەکانی سۆفیگەریی ئیسلامی دەخوێنرێتەوە. ئەو قۆناغە لەڕووی کاتەوە دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای سەدەی دووەمی کۆچی/ هەشتەمی زایینی، لەڕووی شوێنەوەش پەیوەستە بە کۆمەڵێك بنکەی ئاوەدانی تازە دامەزراوی ئیسلامییانەی وەك بەصرا و کوفە و دواتریش بۆ تەواوی بەشەکانی جیهانی ئیسلامی دەگوازرێتەوە، بەتایبەت بۆ خوراسان[٢٠].

ئەوەی لەو مێژووەدا گرنگ بێ ئەوەیە، کە زوهدگەرایی وەك رێبازێکی ئایینی دەبینرێ، کە لە ئاکامی هەڵوەستەکردنی کەسانێکی باوەڕدار بووە لەبەرامبەر بە گۆڕانەکانی ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتی جڤاکی ئیسلامی؛ هەڵوەستەکردن لەبەرامبەر نەگونجانی ئەو بنەما ئایینیانەی کەسێتی باوەڕدارانەی خۆیان لەسەر بونیادناوە، لەگەڵ ئەو بنەما رەفتاریانەی بەرەبەرە لە نێو سیستەمی کولتووری جڤاکدا بەرجەستە دەبێ و دەستەبژێری فەرمانڕەوا دەیەوێ بیکاتە مۆدێلی باوی پەیڕەوکراو و ئەوانیش لە هەڵسوکەوت و تێزەکانیان، پتر ناڕاستەوخۆ، دژایەتی ئەم پرۆسەیە دەکەن[٢١]. بەڵام ئەگەر ئەوان ئەوەندە نەبوونەتە گروپێکی کار و توانای گۆڕینی رەوتی پێشڤەچوونی کۆمەڵایەتیان نییە، ئیدی ئیش لەسەر کەسێتی خۆیان دەکەن تا سنوورە باوەڕپێکراوەکان نەبەزێنێ، بۆیە لە هەنگاوی یەکەمدا بە چەپاندنی جەستە و ئازاردانی دەست پێ

(20) A. J. Arberry: Sufism – An account of the Mystics of Islam, 3nd cdition, George Aleen & Unwin LTD, London, 1963 p.35-36.

(٢١) الأعرابي: كتاب فيه معنى الزهد و المقالات و صفة الزاهدين, تحقيق: خديجة محمد كامل, مطبعة دار الكتب المصرية, القاهرة, ١٩٩٨، ص٦٦, ٩٧.

دەکەن[22]، ئەمەش بە هۆی دوو پاڵنەرەوە؛ یەکەم تا چیتر کەسی باوەڕدار ئەو هەژموونە دونیاییەی بەسەر دەروونی نەمێنێ و ئەو دەروونە بۆ خوداپەرستیی خاڵی بێت، دووەمیش تا بەتەواوی لەو دەورویەرەی تێیدا بووە نامۆ ببێ و نەکەوێتە ژێر باری ئەو شێوە ژیانەی کە قەبوڵی نەدەکرد و ڕەتی دەکردەوە.

ئەو نامۆبوونەی کەسانێك لە پانتایی ئیسلامییدا خۆیان تێدا بینیوەتەوە، لە ئاکامی دابڕانێك بووە لە نێوان ئەوان و سیستەمی سیاسی – کۆمەڵایەتی، کە ئەوانی بەرەو ژیانی زاهیدانە دەبرد. ئەمە نامۆیی بوو بەرامبەر بە سیستەمێك، کە ئەگەرچی بانگەشەی ئایینگەرایی دەکرد و پێویست وابوو لەسەر بیری سیاسی ئایینی تیۆکراسییانەوە ڕەوایی بە خۆی دابێ، بەڵام تەواو دونیایی ببۆوە و هەوڵی سەپاندنی تێڕوانینە هەنووکەییە – سەرووشەرعییەکانی بەسەر جڤاکی ئیسلامیدا دەدا، نەك دامەزراندنەوەی ئەو جڤاکە بەپێی ئەوەی ئەو کەسە (باوەڕدارانە) پێیان وابوو دەبێ وا بکرێ. بێگومان، ئەو جۆرەی بیری سیاسی، کە لەلایەن دەسەڵاتی خەلافەتەوە پەیڕەوی دەکرا، لە ئاستی کۆمەڵایەتیداجێکەوتەی ئاوای دەبوو کە هەرگیز بە دڵی ئەو کەسایەتییانە نەدەبوو؛ جۆرێك لە بزاوتی کۆمەڵایەتی(الحراك الأجتماعی) ڕوویدەدا و ڕەوشت و هەڵسوکەوتی فەزای گشتی گۆڕانی ئەوتۆی بەسەردا دەهات کە بەلای ئەوانەوە وەك لەڕێ لادان دەبینرا[23]. ئیدی کە ئەوانیش نە دەشیان قەبوڵی ئەو ڕەوشە کۆمەڵایەتییە بکەن و نە دەیانتوانیش بیگۆڕن، بە ناچاری لاتەریك و دوورەپەرێزانە سەرقاڵی خوداپەرستی خۆیان دەبوون.

لەلایەکی ترەوە، وا پێدەچێ دابەشبوونەکانی نێو باوەڕی ئیسلامی و دەرکەوتنی ڕەوتی ئایینی جیاواز، کە خەسڵەتی سیاسی و ڕاڤەی فرەچەشنی ڕۆڵی سیاسی – ڕێکخەرییانەی ئاین بوو، تەنانەت ئایینەکە لە خۆشیدا، بەسەریاندا زاڵبوو، ئەو تەرزە کەسانەی خستبووە باری ئەوەی لە هەوڵی دۆزینەوەی ڕێگایەك بن، ئەوان بە سەرەتای ئیسلامەوە ببەستێتەوە، ئەمەش لە میانەی وێناکردنی پێغەمبەر و ژمارەیەك لە یاوەرانی وەك زاهید و تەرکەدونیا و بێباك لە ڕووداوەکان و

(٢٢) البیهقي: الزهد الكبیر, حققه: عامر احمد الحیدر, دار الجنان و مؤسسة الكتب, بیروت, ١٩٨٣, ص ص١٣١-١٨٨.

(٢٣) لەم بارەوە بڕوانە: رینولد نیكلسون: دراسات في التصوف الإسلامي, ترجمة: ابو العلا عفیفي, لجنة التألیف و الترجمة و النشر, القاهرة, ١٩٤٧, ص٤٦.

پشتبەستن بەو فەرموودانەی لەم بارەدا دەگێڕدرانەوە[٢٤]. بەهەمان شێوە کاتێك لە چوارچێوەی ئەو جیاوازیانەدا ڕەوت و ڕێبازی باڵادەست و ژێردەستە سەریان هەڵدەدا، لە نێو ئەوانەی دواییدا ئارەزووی گۆشەگیری و ژیانی دوورەپەرێزیی برەوی دەسەند؛ ئەمەش هەم بۆ خۆ پارستن و هەمیش بۆ پابەندیی بەو بیروباوەڕەی هەیان بوو. ڕەنگە ئەمەش شرۆڤەی ئەو پەیوەندییەمان بۆ بکات کە لەسەرەتاوە لە نێوان بزاڤی زوهدگەری و ڕەوت و ڕێبازە شیعییەکاندا هەبووە[٢٥].

ئەوەی تا ئێرە گوتمان ئەو شرۆڤە مێژووییەیە، کە بۆ دەرکەوتنی بزاوتی زوهدگەری لە نێو ئیسلامدا دەکرێ و دەیبەستێتەوە بە گۆڕانە بابەتییەکانی ڕوتەختە کۆمەڵایەتی – سیاسی - ئایینییەکەوە، بەڵام گەر بمانەوێ وەك ئەزموونێکی تاکەکەسییانە بیخوێنینەوە، ئەوا دەشێ بڵێین هەستکردن بە نامۆیی لەلایەن ئەو زاهیدانەوە، چوارچێوەیەکی بۆ هەڵوێستی کەسیی و تێڕامانی ئایینیان داناوە. بەر لە هەموو شتێك وایکردووە لە ڕووی دەروونییەوە کەسایەتییەکی ترساو و دڵتەنگیان هەبێ، دیارە کە مەبەستمان ترسانە لە بەرامبەر خودا، ترس لەوەی مەرگ فرسەتیان پێ نەدات و نەپرژێنە سەر پاکبوونەوەی ڕۆحانی، بۆیە هەمیشە دڵتەنگن بەرامبەر بە نزیکبوونەوەی ڕۆژی قیامەت[٢٦] ڕووداوە دونیاییەکانیش ئەوەندە ئاڵۆز و تێکچڕژاو و مەترسیدارن، کە دەشێ ئاماژەبن بۆ ئەم نزیکبوونەوەیە. ئیدی ئەو ترسە دەبێتە پاڵنەرێکی سەرەکی ژیانی ئایینی ئەوان و لە سنووریدا گوزارشت لە تێگەیشتنی باوەڕییانەی خۆیان دەکەن[٢٧]. خۆ هەر ئەو ترسەیە وا دەکات زێدەڕۆیی لە ئەنجامدانی سرووتە ئایینییەکاندا بکەن، بەڵکو ئەمە ڕێگەیەکی دروستی ڕازی

---

(٢٤) هەر بۆ نموونە بگەڕێوە بۆ: الكوفي: كتاب الزهد, حققه: عبد الرحمن بن عبد الجبار الفريوائي, دار الخلفاء, الكويت, ١٩٨٥, ج١, ص ص ٣١٣-٣٥١. ج٢, ٣٥٣-٣٩٨. الشيباني: كتاب الزهد, تحقيق: عبد العلي عبد الحميد حامد, ط٢, دار الريان للتراث, القاهرة, ١٩٨٧, ص١٥بەدواوە.

(٢٥) بۆ وردەکارییەکانی ئەو پەیوەندییە بگەڕێوە بۆ: كامل مصطفى الشيبي: الصلة بين التصوف و التشيع, ط ٢, دار المعارف, القاهرة, ١٩٦٩, ص ص ٢٣٧بەدواوە.

(٢٦) هەر بۆ نموونە بڕوانە: ابو نعيم: حلية الأولياء في طبقات الأصفياء, دار الكتب العلمية, بيروت, ١٩٨٨, ج٢, ص١٣٢. ابن الجوزي: صفة الصفوة, أخرج احاديثه: محمد عيادي و احمد شعبان, مكتبة الصفا, القاهرة, ٢٠٠٣, ج٣, ٧١.

(٢٧) بەراورد بکە لەگەڵ:

Reynold Nicholson: Studies in Islamic Mysticism. Cambridge University press. London, 1921, p23.

کردنی خودا بێ. ئەو زێدەڕۆییەش ئەوانی خستۆتە نێو بارێکەوە کە پێشتر ئەوەندە باوی نەبوو، ئەویش بریتی بوو لە خوداپەرستیی وەك تەواوی ژیان، هەروەها ژیانی هەژارانە و دوور لە خەڵك وەك شێوەی قەبوڵکراوی بژێوی[٢٨].

ئەمانە دەبنە گرنگترین خەسڵەتەکانی زوهدی ئیسلامیی و لە قۆناغی دواتر روونتر دەبنەوە و، بۆ ئەو کەس و خەڵکانەی لەو زاهیدانە کۆدەبنەوە و سەرسام دەبن پێیان و رێگەی ئەوان بە راستەرێی ئایینداری دەزانن، پەیڕەویان لێ دەکرێ. لێرەوە زاهیدەکانیش پێویستیان بەوە بووە پێناسەی ئەو حاڵەی خۆیان بکەن و رەهەندەکانی زوهدگەری بۆ خۆیان و بۆ ئەوانیتر ئاشکرا بکەن، تا حاڵەکەیان وەك دەرچوون لە رەوشی باو و وەك جیابوونەوەیەکی ئایینی - سیاسیی چاوی لێ نەکرێ. هاوکات دەبێ ئەوە بزانین کە ئەگەر ئەمجارە زاهید لە پانتایی کۆمەڵایەتیی - ئایینیدا ئامادەیی هەبێت، ئەوە بە مانای دەستهەڵگرتن نییە لەو شێوە ژیانەی هەڵیبژاردوە، ئەوەندەی دەخوازێ شێوە ژیانەکەی هەمەگیر بکات، یانیش لەو پانتاییەدا خۆی بە خوێندن و لێکۆڵینەوەی زانستە ئایینییەکانەوە خەریك بکات، یاخود هەر کارێکی تر کە لەگەڵ گەوهەری زوهدگەریدا بگونجێ، ئەمەش وایکردووە ئەوان لە چوارچێوەی بزاڤێکی دیاریکراودا کۆ نەبنەوە و بە ئاراستە و رەنگی جیاواز خۆیان بنوێنن[٢٩]. ئیدی نەیانتوانیوە، رەنگیشە نەیانویستبێ، وەك گروپێکی ئایینی - سیاسیی دەربکەون لە شێوەی گروپە باوەکانی تر، بەڵکو چالاکی خۆیان لە سنووری ئامۆژگاری کۆمەڵایەتیدا هێشتۆتەوە و خستویانەتە چوارچێوەی ئەو رێسا ئایینیانەوە کە دەشێ جڤاکێکی خودان رەفتاری ئایینی دروست دابرێژێ، بەتایبەت ئەو رێسایەی کە ئاماژە بۆ "فەرمان بە چاکە و نەهی لە خراپە - الأمر بالمعروف و النهي عن المنكر" دەکات[٣٠].

تا ئێرە بۆمان دەردەکەوێ، کە زوهدی ئیسلامی بریتی نییە لە بەرهەمهێنانی کۆمەڵێك چەمکی نوێ و بەگەڕخستنی لە نێو گوتارێکی دیاریکراوی ئایینیدا، ئەوەندەی جەختکردنەوە بوو لەسەر هەندێ رەهەندی نێو گوتاری باو و کارپێکراو، هەروەها کارا کردنی ئەو چەمکانە بوو کە لەگەڵ تێڕوانینی ئەوان دەگونجا و رەوشەکەیانی دەردەخست، بۆیە دەشێ کارەکەیان وەك

---

(٢٨) الأعرابي: معنى الزهد، ص٦٢، ٧٣.

(29) Ahmet. T. Karamustafa: Sufism – The formative period, Edinburgh University Press. Edinburgh, 2007, pp.1-2.

(٣٠) بۆ زانیاری زیاتر لەسەر ئەرکەکانی زاهید، لە پانتایی ئیسلامیدا دەشێ بگەڕێیەوە بۆ:
Christopher Melchert: The Ḥanābila and the Early Sufi, Arabica, 2001. V. 48, p.354.

خوداپەرستییەکی رەها بخوێنرێتەوە، کە کەمترین خەمی بیرکردنەوە و تێڕامانی لە پەرستراو لەگەڵدا بووە، بەمەش زاهید نەیتوانیوە یان نەیخواستوە ناسنامەیەکی سەربەخۆ لەسەر پاشخانێکی هزریی تایبەتمەندەوە دابمەزرێنێ، ئەوەندەی دەقە بنەڕەتییەکانی نێو ئایینی بەو پاشخانە داناوە، بۆیە لەگەڵ زوهدی ئیسلامیدا هزرێکی سەربەخۆ نابینین، بەڵکو لەبەردەم چەند رووخسارێکی کردەکیانەی بیروباوەڕە ئایینییەکەداین، ئەمەش وامان لیٚ دەکات هەڵوەستە بکەین لە بەرامبەر بەوەی سۆفیگەری لە قاوغی زوهدگەریدا چڕ بکەینەوە.

## سێیەم: سۆفیگەری وەك کایەیەکی ئایینی سەربەخۆ

ئەوەی لە گوتاری سۆفییان رابمێنیٚ، بۆی دەردەکەویٚ ئەوان بەتەواوی دەستبەرداری زوهدی ئیسلامیی نەبوونە، بە مانای جێهێشتن و واز لیٚ هێنانی، بە پێچەوانەوە پێیان وابووە زوهد یەکێکە لە مەقامە شکۆمەندەکان و هەنگاوی یەکەمە لە رێگەی ئەوانەی دەخوازن لەگەڵ خودا دابن[٣١]، بۆیە لە قۆناغی شێوەگرتنی سۆفیگەریدا بە ئاسانی دەخزێتە نێو بونیادی هزریی کایەکە و لەلایەن زۆر لەوانەی لە بارەیەوە دەدوێن وەك رێبازی ژیانی سۆفییانە دەخرێتە روو[٣٢]، تا وایلیٚدێت لە نێو سیستەمی هزریاندا دەبێتە ئەو مەقامە جێگیرەی دەستنیشانی مەقامەکانی دوای خۆی و راستی شتەکان دەکات، دەرکەوتەی ئەو مەقامەش لە هەڵوێستی سۆفی لە نێو جیهان خۆی دەبینێتەوە:(( خۆشویستنی دونیا سەرچاوەی هەموو گوناهێکە، زوهدیش لە دونیا سەرچاوەی گشت چاکە و گوێڕایەڵییێکە))[٣٣]. کەواتە سۆفییەکان لە کرۆکدا هەمان ئەو مانایانە بە زوهدی خۆیان دەدەن کە پێشتر هەبووە و وەك حاڵەتی پاکانەکردن لە دونیا دەیخوێننەوە، بە جۆرێك کە نە سوێیان لە نەبوونیی و دەستکورتی خۆیان دەبێتەوە و نە شادومانن بەوەی کە هەیانە، بێگومان ئەمەش لە رێگەی دوورکەوتنەوە لە حەرامکراوەکان و پاراستنی دڵ لە خەڵك و کاریگەریەکانیانەوە دەبیٚ[٣٤]. ئیدی زوهدی سۆفییانە بریتی دەبیٚ لە پشتبەستنی تەواو بە خودا و

---

(٣١) السراج: اللمع, ص٧٢.

(٣٢) بگەڕێوە بۆ: الكلاباذي: التعرف, ص٦٥. المكي: قوت القلوب في معاملة المحبوب, ضبطه: عاصم ابراهيم الكيالي, ط٢, دار الكتب العلمية, بيروت, ٢٠٠٥, مج١, ص ص٤٠٩ – ٤١٦.

(٣٣) السراج: اللمع, ص٧٢.

(٣٤) بۆ نموونە بڕوانە: القشيري: منشور الخطاب, ص٨٩.

رازی بوون بەو پشکەی کە خودا بۆ بژێویان دابینی دەکات، هەروەها پێداگیری لەسەر بێ ویستیی مرۆڤەکان لەبەرامبەر بە ویستی خودایی[٣٥]، تا چیدی سۆفی پێویستی بە خەڵك نەمێنێ و نەکەوێتە ژێر باری رەوشتێکی ئاواهی کە بەو خەلکەی پابەند بکات و ناچار بە ناسینیان بێت، چونکە دەشێ بەمە لە ناسینی رەها کە خوداناسیە سەرقاڵ بێ و بە مەقام و پایە رۆحانییە باڵاکان نەگات.

لەگەڵ ئەوەشدا ئەگەر زوهدگەرایی لە ئاستە بابەتییەکەدا کاردانەوەیەکی کۆمەڵایەتی — سیاسییەوە سەرچاوەی دەگرت و خوێندنەوەیەکی نێوخۆی ئیسلام بوو، ئەوا لەگەڵ سۆفیگەریدا ئەو پەرچەکردار و خوێندنەوەیە رەهەندێکی کایە ئایینییەکە پێکدێنن نەك تەواوی کایەکە؛ کاردانەوە بەرامبەر بە رەوشی باوی ژیان و هەڵبژاردنی رێگەی گۆشەگیری و ترس لە مەرگ و خۆتەرخانکردن بۆ خودا هەر ماوەتەوە، بەڵام کۆمەڵێك رەهەندی تریش زێدە بوونە و لە میانەی چەمکانێکی تازە و تایبەتمەندەوە (وەك: ناسین، خۆشەویستی...هتد) دەردەکەون، کە زاهیدان بەو شێوەیە خۆیان لە قەرەی نەدابوو، ئەگەر واشیان کردبێ ئەوە، وەك گومان، لەخۆگرتنی تێزە باوەکانی ناوەندی هەمەکی ئیسلامی بووە. بەڵام کارکردن و تێڕامانی سۆفییان لەسەر ئەو رەهەندانە قوڵبوونەوەی زیاتری پێوە دیارە، تەنانەت هەندێکجار وا دێتە بەرچاو روگەی سۆفییانە لە دەرەوەی تێگەیشتن و باوەڕی ئیسلامیدایە. هەر بۆیە لە هەندێك قۆناغی مێژووی سۆفیگەری — وەك لە بەشەکانی تری توێژینەوەکەدا دەبینین — لەلایەن ئەوانەی خۆیان بە بەرپرسی فەرمی باوەڕەکە دەزانن(فەقیه و ئوسوڵییەکان) وەك لاساریی و دوورکەوتنەوە لە باوەڕی دروست لەقەڵەمدراوە و هەندێك لە سۆفییانی دوچاری چەرمەسەری و تەنانەت لەناوچوون کردۆتەوە. لەگەڵ سۆفیگەریدا لەبەردەم هزرێك داین کە نەك هەر لەدەرەوەی مانا ئایینییە پێشینەکانەوەیە، بگرە دەخوازێ سەرلەنوێ تەواوی دیاردەی ئایینیش شرۆڤە بکاتەوە. بە جۆرێك کە وەك توێژەرێك بۆی چووە سۆفیگەری وەك بزاوتێکی رێکخراو دێتە بەرچاو کە پەیڕەوکارانی لە دەوروبەرەکەیان جیاوازن و قەوارەکەیان لە سەر بنەمای راهێنانێکی کردەکی و هزرێکی تیۆری دامەزراوە[٣٦].

---

(٣٥) الخركوشي: تهذيب, ص ص٩٧-١٠٠. السلمي: المقدمة في التصوف، تقديم و تحقيق: يوسف زيدان، دار الجيل، بيروت، ١٩٩٩, ص٩٩.

(٣٦) كامل مصطفى الشيبي: صفحات مكثفة من تاريخ التصوف الإسلامي, دار المناهل, بيروت, ١٩٩٧, ص٩٩-١٠٠.

لێرە بەدواوە سۆفیگەری جیاواز لە زوهدگەریی دەناسرێ، بەتایبەت لە ناوەڕاستی سەدەی دووەمی کۆچییەوە بەرەبەرە کەسانێك دەردەکەون بە "سۆفی — الصوفي" ناودەبرێن، ئەمەش هەر لە شارەکانی وەك بەصرا و کوفە بەرچاوە[٣٧]، ئیدی لە حالەتی نادیاری و ناجێگیرییەوە دەربازیان دەبێ و پەیڤەکەش وەك ئاوەڵناوێکی مانادار دەخرێتە گەڕ، هەڵگرانیشی وەك پەیڕەوکار و بەرهەمهێنەری کایەیەکی ئایینی نوێ دەناسرێن.

بۆ چەسپاندنی ناسنامەکەی خۆی، دەبوو کایەکە دەستنیشانی ئەو بابەتە بنەڕەتییانە بکات کە دەی ووروژاندن و بونیادە هزرییەکەیان پێکدەهێنا، هەروەها وا پێویست بوو لە یەك کاتدا جیاکاری لە نێوان بواری کردەکیی و بواری تیۆریی لەلایەك و پەیوەندییە تەواوکارییەکەی نێوانیان لە لاکەی تر بکاتەوە؛ تا ئەوکاتەی سۆفیگەری پەیوەست دەبوو بە پاشخانە مێژووییەکە و وەك بەرجەستەکاری حالەتی زوهدیی خۆی دەنواند و جۆرێك لە رەفتار و هەڵسوکەوتی دەخستە روو، ئەوا رووخسارە کردەکییەکەی زاڵ دەبوو و پەیڕەوکارەکانی پێ دەناسرایەوە، ئەمە بە ئاشکرا لە شرۆڤەی رەسەنی ناوەکەیان و بەستنەوەی بە حاڵی ئەوان لە رووی جۆری پۆشاك و هەڵسوکەوتەوە دەبینرا. بەڵام ئەوەی جێگەی تێبینی بێ ئەوەیە کە ئەوانیش دەیانویست ئەم چەشنە رەفتارانە بکەنە بەشێکی بابەتەکانی کایەکە و تیۆریزەی بکەن تا وێنەی ئەوان وەك زاهید و پابەند بە سرووتە ئایینییە گشتییە — کردەکییەکان لە زەینی دەستەجەمعیدا بچەسپێ[٣٨]، لە نێو خۆشیاندا راڤەی تایبەتیان بۆ رەفتار و سرووتەکان هەبوو تا لەو نێوەندە کۆمەڵایەتییە — ئایینییەی تێیدا گوزەریان دەکرد، بەروونی بناسرێنەوە و لە ئەوانیتر — جا هەر کێیەك بن — جوێ بکرێنەوە.

هەرچۆنێك بێت، واپێدەچێ گەلی سۆفیان کەمتر مەبەستیان جیاکاری کۆمەڵایەتی بووبێ و زیاتر ئارەزوویان لە جیاکارییە ئایینییەکە بوو، بێگومان نەك بەو شێوەیەی رێبازە ئایینییەکان(بۆ نموونە: خەواریج، شیعە، سوننە) بانگەشەیان بۆ دەکرد بەڵکو بە مانای خوێندنەوەی جیاواز بۆ چییەتی ئاییننداری و جۆری ئەو پەیوەندییە میتافیزیکییانەی لە نێویدا گەڵاڵە دەبێ، تا ئەو ئەزموونەی لە پرۆسەی بوونە سۆفیدا پێیدا تێدەپەڕین بە ئاڕاستەیەك بێت کە بە بوارە تیۆرییەکەی کایەکەیان ئاشنا بکات و تووشی سڵەمینەوە و نامۆبوونیان نەکات. لەو حاڵەتەشدا بواری کردەکیی لەگەڵ بوارە تیۆرییەکە یەکانگیر دەبن، بەتایبەت ئەو کاتەی زوهدگەرایی و ژیانی هەژارانە و ئەو

---

(٣٧) لە بارەی ئەو گۆڕانانە بگەڕێ: بۆ: کامل مصطفی الشیبي، الصلة، ص٢٦٩-٢٧٢.

(٣٨) بۆ نموونە بڕوانە: السراج: اللمع، ص ص٩٤ - ...

بنەما رەوشتییانەی لێیان دەردەچێ، دەبنە ئامرازی پێگەیشتنی رۆحانی تاك و راهێنانی لەسەر تێگەیشتن لە هەر پەیوەندییەکی ناباو و ئەزموون نەکراو لە نێوان ئەو تاکە و خوداوە[٣٩]، کە ئەمەش گوزارشت لە پرۆسەی ناسینی دروستی خودایەتیی لەلایەن مرۆڤەکانەوە دەکات.

پێشتر ئاماژەی پێدرا سۆفیگەری دەخوازێ خۆی وەك کایەی "ناسینی خودا – معرفة الله" بنوێنێ، لە راستیشدا هەر ئەمەش دەبێتە بابەتی بنەڕەتی بواری تیۆریی سۆفیگەری و بەشی سەرەکی هزری ئەوان و ئەو چەمك و دەستەواژانەی دایدەهێنن کە چەشنێکن لە رەمز و ئاماژە، لە دەوری ئەو بابەتە دەخولێتەوە و سۆفی گەرەکیەتی تەواو بە رەهەندەکانی ناسین ئاشنا ببێ و لە نێو ئەزموونی تایبەتی خۆیدا بیان دۆزێتەوە. لەو گۆشەنیگایەوە ئەوان پێناسەی ناسین دەکەن و وایدەبینن کە بەمانای راگەیشتن بەسەر خەسڵەتە بەرجەستەبووەکانی خودا نایەت، وەك لە کایە هزریی – ئایینییەکانی تری لە شێوەی "کەلامناسیی – علم الکلام" دا وایە و گەلی سۆفییان رەتی دەکەنەوە[٤٠]، بەڵکو ناساندنی زاتی خوداییە لە رێگەی سەلماندنی "یەکتابوون – التوحید"ی، پاشان خۆدابڕینی سۆفی لە هەر شتێك لەو ناساندنە وونی دەکات، ئینجا کارکردن بۆ قووڵکردنەوەی پەیوەندی لەگەڵ خودادا تا ئەو سنوورەی توانا رۆحانی و ئیلهامییەکانی سۆفی دەستنیشانی دەکات[٤١]. ئیدی سۆفیگەری خۆڕادەستکردنی خودایە و هەوڵی نەهێشتنی هەر نێوەندێکی نێوان سۆفی و زاتی ئیلاهیە[٤٢].

کاری سۆفیش – کە لە ئەزموونە رۆحانییەکەیدا هەیە – گەڕانە بەدوای "حەقیقەت"ەوە، جا چ ئەو حەقیقەتە ئاماژەی خودایی بێت[٤٣]، یانیش لە میانەی پابەندبوون بە "شەریعەت"ەوە جێبەجێ ببێ، کە دواجار ئەو دوو چەمکەش؛ "حەقیقەت" و "شەریعەت" جۆری پەیوەندی سۆفی بە خودا رەنگڕێژ دەکەن و رێگەی ناسینەکەی بۆ روناکدەکەنەوە. ئەوکاتەش کە سەرکەوتووانە ئەزموونەکە دەبڕێ چیدی وشەی سۆفی و سۆفیگەری ناتوانن ناتونن ببنە دەربڕی حاڵی ئەو و

(٣٩) الهروي: منازل السائرين, ط٢, مطبعة مصطفى البابي الحلبي, القاهرة, ١٩٦٦, ص٣بەدواوە.

(٤٠) الكلاباذي: التعرف, ص ص١٩-٢٥.

(٤١) الخركوشي: تهذيب, ص ص٣٠-٣١.

(٤٢) القشيري: الرسالة, ص٤٢٧-٤٢٨.

(٤٣) التوحيدي: ثمرات العلوم, شرح و تحقيق: انور محمود زناتي و محمد غالب بركات, دار نينوى, دمشق, ٢٠٠٩, ص٢٨.

ئاستی تێگە ئایینییەکەی، بەڵکو ئەمجارە ئەو دەبێتە "عارف" و لە نێو "عیرفان"ەوە بیر دەکاتەوە، کە ئەمانەش پایەی باڵان و کەم سۆفی پێیان دەگەن، بەتایبەت کە عارف تەواوی خۆی داوەتە دەست خودا و تەواوی دەوروبەریش بە رەهەندە دیار و نادیارەکانییەوە لە خودادا دەبینێ[44]، تاکە کاریشی هەر "عیرفان – خوداناسیی" دەبێ[45]. لە ناوکۆی توێژینەوەکە ئەم بابەتانە روونتر دەکەینەوە.

هەرچۆنێك بێت، خوداناسین لە نێو هزری ئایینی بەگشتی بابەتێکی هەستیارە و دەشێ شرۆڤەی جیاواز و ناباو کێشە بۆ شرۆڤەکاران بنێتەوە. وەك پاشتر نموونەی وای سۆفی بەرچاو دەکەوێ کە رەنگە لە هەموویان ناسراوتر مەنسوری حەلاج بێت، لەلای ئەوانەی خۆیان بە بەرپرسی فەرمیی خوێندنەوە و لێکدانەوەی چەمك و دەستەواژە ئایینییەکان دەزانی، بە گومڕا و لادەر تۆمەتبار دەکرێن. بۆیە هەندێك لە سۆفییان بۆ خۆدەربازکردن لەم تۆمەتانە، هەروەها لەپێناو دۆزینەوەی رەسەنێکی شەرعیش بۆ رەفتار و تێز و بۆچوونەکانیان– بە هەمان شێوەی پیاوانی سەر بە کایە ئایینییەکانی تر – دەگەڕانەوە سەر دەقە بنەڕەتییەکان(قورئان، فەرموودە). یان با بڵێین ئەگەر سۆفیگەری گەرەکیبوایە رەوایی بە جیهانبینییە ئایینییەکەی بدات و خۆی لە تۆمەتی "بیدعەکاریی" دەربازبکات، دەبووایە بگەڕێتەوە بۆ ئەو دەقانە، تا بتوانێ هەم پێناسەیەکی نزیکیی – شەرعییانەی خۆی بکات، وەك بۆ نموونە لە گێڕانەوەی ناوەکەیان بۆ "الصفاء" و "اهل الصفة" و...هتد دیاربوو، هەمیش ئەو جیهانبینییە تۆکمە بکەن و ئەوانیتر رازی بکەن دانی پیابنێن یان لایەنی کەم دژایەتی راستەوخۆی نەکەن، بۆیە دەیانبینین لە دەقی قورئانیی قووڵ دەبنەوە و راڤەی سورەت و ئایەتەکانی دەکەن[46]، بەڵام نەك بە چاولێکەریی غەیرەخۆیان، بەڵکو خوێندنەوە و راڤەیەکی عیرفانییانەی نوێباوی بۆ دەکەن، هەر بۆیە کایەکە کۆمەڵێك تایبەتمەندی بۆ خۆی بەدەستدەهێنێ، کە لە هزری عیرفانیی ئایینەکانی تر نابینرێن[47].

---

(٤٤) الکلاباذي: التعرف, ص ص١٠٠-١٠٣.

(٤٥) جاك شوفليي: التصوف و المتصوفة, ترجمة: عبد القادر قنيني, دار افريقيا الشرق, الدار البيضاء – بيروت, ١٩٩٩, ص١٠.

(٤٦) هەر بۆ نموونە بگەڕێوە بۆ: السلمي: تفسير السلمي وهو حقائق التفسير, تحقيق: سيد عمران, دار الكتب العلمية, بيروت, ٢٠٠١.

(47) Louis Massignon: Essai sur les origions du lexicque de la mystique Musulmane, Paris, 1954, p.104.

بە هەمان شێوە بەدوای ناسینی مۆرکی خودی پێغەمبەر دەگەڕێن و لە دووتوێی هەمان جۆری ڕاڤەکردنەوە بەرجەستەی دەکەنەوە[٤٨]. تەنانەت لە نێو یاوەرەکانیشیدا کەسانێك دەدۆزنەوە و وەك پاشخانێك بۆ بنەما ڕەوشتییەکانی خۆیان وێنایان دەکەنەوە و تەواوی کایەکە بە میراتی ئەوان دەزانن[٤٩].

گەڕانەوەی سۆفیان بۆ کولتوری ئایینی و دۆزینەوەی ڕەوایەتیی بۆ قەوارە ئایینییەکەیان زیاتر وەك جۆرێك لە هەڵاوێردکردنی دەقەکان دێتە بەرچاو، لە نێوان ئەوانەی لەگەڵ حاڵ و بنەماکانی کایەکە نەدەگونجان، وەك — بۆ نموونە — ڕەتکردنەوەی شێوە ژیانی ڕەبەنێتی لەلایەن پێغەمبەرەوە[٥٠]، کە دوورەپەرێزیی و گۆشەگیری سۆفییەکانی بەرجەستەی دەکرد، لەگەڵ ئەو دەقانەی پشتگیریان لە هەندێك ڕەگەز و بنەما پێکهێنەرەکانی دەکرد، لە سەرووی هەموویانەوە سەنتەرێتی ڕەهای خودا و پێداگیریی لەسەر نیشاندانی وەك تاکە حەقیقەت و ئەو "هەق - الحق"ەی تەواوی سۆفییەکان دەخوازن بیناسن و لە نێو گوتاری خۆیان دەیکەنە ناوی هەرە باوی خودا[٥١].

بێگومان ئەو ئیشکردنەی سۆفییان لەسەر کولتووری ئیسلام، دەبێتە هۆی ئەوەی هزرەکەیان بەرەبەرە وەك هزرێکی تایبەتمەند کە لەنێو پانتایی ئیسلامیدا سەقامگیر بێ و وەك تێگەیشتنێکی قەبوڵکراو سەرەدەری لەگەڵدا بکرێ، بەمەش بواری فراوان بوون و برەوسەندنی بۆ دەڕەخسێ.

---

(٤٨) السراج: اللمع, ص ص١٠٣ – ١٤٦.

(٤٩) الخركوشي: تهذيب, ص ص٢٠١-٢٠٦.

(٥٠) ((لا رهبانية في الإسلام))؛ ابن الجوزي: غريب الحديث, بتحقيق: عبد المعطي أمين القلعجي, دار الكتب العلمية, بيروت, ١٩٨٥, ج١, ص٤٢٢.

(٥١) لەمەدا پشت بە چەند ئایەتێکی قورئان دەبەستن وەك: ((أن الله هو الحق المبين)), سورەتی نور, ئایەتی(٢٥), ((ولو اتبع الحق أهواءهم)), سورەتی موئمینون, ئایەتی(٧١).

## دەروازە: گرنگی شەریعەت لە سەرهەڵدانی سۆفیگەری

بەر لەوەی بچینە سەر هەر باس و شرۆڤەکردنێکی رەوشی ئایینی کوردستان لە قۆناغی سەرهەڵدانی هزری سۆفیگەری بەگشتی، دەبێ ئاماژە بۆ ئەوە بکەین کەوا زێتر کار لەسەر زەمینەی " ئیسلامی" ئەو سەرهەڵدانە دەکەین، ئەوەش دەزانین زەمینە ئایینییەکانی تریش، بەتایبەت ئەو دوو کولتووورە ئایینییەی بەر لە هەژموونی ئیسلامی لە زەمینەی کوردیدا کارا بوون، ئەویش کولتووری زەردەشتی بە رێبازە لێ دەرچووەکانییەوە لەگەڵ کولتووری مەسیحی بە مەزهەبە جیاوازەکانییەوە، هەریەکە و لەسنووری جیهانبینی خۆیەوە مامەڵەی لەگەڵ هزری عیرفانی و ژیانی زوهدگەرایی بە مانا گشتییەکەی کردووە، لە رووی تیۆریەوە بەرهەمیان هێناوە و لە بواری کرداریەوەش پەیڕەویان لێ کردووە[٥٢]، بەڵام لەبەر ئەوەی ئەم کارە بە تێگەیشتن و بەرهەمهێنانی ئیسلامیانەی سۆفیگەری پەیوەستە، بۆیە تێڕوانینمان بۆ گەشەسەندنەکانی ئەم ئایینە لە پانتایی کوردی چڕ دەکەینەوە. بەتایبەت کە دەبینین هەر لەدوای پرۆسەی وڵاتگیریی عەرەبی ئیسلامییەوە ئایینە نوێیەکە — بەدەر لە رەوت و رێبازە جیاوازەکانی — بە فەرمی هەژموونی کردۆتە سەر زەمینەی باوەڕداری کوردستان، ئایینەکانی تریش هەم سنووردار کراون، هەمیش دوورایی دەرکەوتە عیرفانییەکانیان — لەگەڵ نەبوون یانیش دەگمەنی دەقی نوسراوی خۆیان - بە تەواوی نابینرێ و هەر هەوڵێك بۆ خوێندنەوەیان کورت دێنێ.

هەرچۆنێك بێت لێرەدا ناخوازین لە رێگەی زەمینەی ئایینییەوە چییەتی سۆفیگەری بخوێنینەوە، چونکە رەنگە ئەو چییەتییە زۆرجار دوای دەرکەوتنی بچێتە سەرووی

---

(٥٢) بەداخەوە لەمەڕ هزری عیرفانی و زۆر لایەنی تری ئەم دوو ئایینە لە کوردستاندا لێکۆڵینەوەیەکی ئەوتۆ لەبەردەستندا نییە بەتایبەتی بە زمانی کوردی, بۆیە ناچار ئاماژە بۆ چەند سەرچاوەیەکی گشتی دەکەین, ئەگەرچی رەنگە سەرچاوەکانی کولتووری مەسیحیی تایبەتمەندی خۆیان هەبێ؛ لەبارەی هزری عیرفانی زەردەشتی بڕوانە: بابك عاليخانى: بررسى لطايف عرفانى در نصوص عتيق اوستايى, انتشارات هرمس, تهران, ١٣٧٩. لەبارەی عیرفانی مەسیحیش لە ناوچەکە بڕوانە:

Margaret Smith: Studies in early mysticism in the near and middle east, Sheldon press, London, 1931, pp.26-33, 84-102.

منصور المخلصي: اصول الحركة الرهبانية – القرن الثاني الى العاشر, شركة الطيف للطباعة المحدودة, بغداد, ٢٠٠٥, ص ص١٨٢ ٢٠٣.

زەمینەکەوە، وەك دواتر لەهەندێ شوێنی ئەم توێژینەوەیە دەبینرێن، بەڵکو دەمانەوێ بەخوێندنەوە و خۆشکردنی زەمینەکە ئەگەری دەرکەوتن و بەردەوامیی سۆفیگەری لەوێدا وەك دیاردەیەکی ئایینی بخەینە روو. خۆ هەر چییەتی سۆفیگەریش دەریدەخات کە ناکرێ لە دەرەوەی سیستەمی باوەڕداریەوە چاو لە پرۆسەی سۆفیبوون بکرێ، چونکە سۆفیگەری بەگشتی لەسەر ئەو باوەڕبوونە دامەزراوە، کە پێشمەرجە بۆ گەیشتن بە حاڵەتی سۆفییانە.

ئەگەر ژیان لە سنووری تێگەیشتنی سۆفییانە بڕیار و ئەزموونێکی ناوەکی و خۆبەخۆی تاکە، ئەوا بێگومان ئەزموونێکی ئایینییە و زێتر بۆ ناسینی خودایە وەك باسکرا و چەقی باوەڕە لە جیهانبینی ئایینێکی یەکتاپەرستی وەك ئیسلام، بێ ئەوەی مەبەست ئەو جیهانبینییە ئایینییە بێت کە ئەوانیتری غەیرە سۆفی تێی گەیشتوون و ئەزموونی دەکەن، چونکە لەلایەك رەنگە سۆفی سنوورەکانی باوەڕداری باو و ئاسایی ببڕێ و ماناکانی بگۆڕێ و جیهانە دەقگرتووەکەی ئایینەکە بگۆڕێ[٥٣]، لەلایەکی تریشەوە - وەك هەندێك بۆی دەچن — سۆفیگەری لە قەید و پێوەندی ئەو تێگەیشتنە چەقبەستووەی ئایین ئازادە، ئەگەر وا نەبێ ئەوا خەسڵەتە گەردوونگەرایییەکەی دەکەوێتە مەترسییەوە[٥٤].

رەنگە ئەوەی زێتر هەست بەو حاڵەتە دەکات و وێنای دەکات باوەڕدارانی غەیرە سۆفی بن؛ ئەوانەی لە نێو سیستەمی جێگیر و کارپێکراوی کولتووری ئایینییەوە لە باوەڕ تێدەگەن و پیادەی دەکەن، خۆ لەوێشدا وەك لە دەروازەدا کەمێك باسمان کرد سۆفی کەوتۆتە نێوان ململانێی شەریعەت وەك رووخساری گشتگیری ئایین و سرووتەکانی بۆ رێکخستنی ژیانی تاکەکان، لەگەڵ حەقیقەت وەك رێسایەکی ناوەکی لەپێناو بینین و تاقیکردنەوەی راستی خودا. لێرەوە کاری سۆفی نەفیکردنی شەریعەت نابێ، بەڵکو راڤەی خۆی بۆ دەبێ جیاواز لەو راڤە فەرمییەی فەقیە و کەلامناسەکان چەسپاندوویانە[٥٥]. ئەو راڤەکردنەی سۆفیش یان قەبوڵکراوە و دەرکەوتەکانی جێگەی سەرسامیە و پەیڕەوی لێ دەکرێ بەتایبەت لە ئاستی میللیدا[٥٦]،

---

(٥٣) وەك لـەلای کەسـانێکی وەك حـەلاج (م ٣٠٩ک/٩٢١ز) و بایەزیـدی بـسطامی (م ٢٦١ك/٨٧٥ز)، و...هاوشێوەیان، گوزارشتی لێ کراوە. لەبەشەکانی تردا زیاتر ئاماژە بۆ ئەو بابەتە دەکەین.

(54) Martin lings: What is Sufism?, 2ndedition, Mandala books, London, 1981, p.17.

(٥٥) بەراوردی بکە لەگەڵ: جان شوفليي: التصوف, ص١٢.

(٥٦) بڕوانە بەشی پێنجەمی ئەو توێژینەوەیە.

یانیش سنوربەزێن و هەڵگەڕانەوەیە وەك زۆر جار لەلای ئەو باڵە فەرمیەی ئایین وا دەخوێندرێتەوە.

خاڵی گرنگ لەوەی گوترا بریتیە لە پێداگیری لەسەر حەتمییەتی باوەڕداری لە پرۆسەی بوونە سۆفیدا، خاڵێك کە بەگشتی هزری سۆفیگەری بەرهەمهاتوو لە پانتایی کوردی، هەر لە قۆناغی دەرکەوتنییەوە جەختی لەسەر دەکاتەوە. بەدەستەواژەیەکی تر پابەند بوون بە شەریعەت و پاراستنی بنەماکانی خەمێکی سۆفییانی ئەوێندەرە، ئەمە لە وتەی گەورەکانیاندا دەردەکەوێ کاتێك رایدەگەیێنن کردەوەی مورید — سەرباری بەجێهێنانی پێداویستییەکانی سۆفیبوون — پاراستن و بەجێهێنانی بنەما شەرعییەکانە[٥٧]، تەنانەت هەندێکیان رایدەگەیەنن دووان لەسەر خودا لەخۆوەڕا نابێت ئەگەر جەخت لەسەر یەکتایی خودا و سوننەتی پێغەمبەر نەکاتەوە[٥٨]، چونکە خوداپەرستی خۆی لە پەیڕەوکردنی "کتێب و سوننەت" و پابەندبوون بە بنەما شەرعییەکان دەبینێتەوە[٥٩]، هەروەها بەلای یەکێك لە سۆفییەکانی کوردستان شارەزابوونی وردی بنەما ئایینییەکان پێشمەرجە بۆ دانپیانان بە پێگەی کەسی سۆفی، با ئەو کەسە لە نێو کۆڕی سۆفییانیشدا زۆر دیار بێت[٦٠].

ئەو نموونانە و چەندانی دی دەماخەنە بەردەم پێویستی دەستنیشانکردنی ئەو زەمینە ئایینییەی لە پانتایی کوردیدا هەبووە و رێگەی بە سەرهەڵدان و نەشونماکردنی هزری سۆفیگەری دەدا. بۆ ئەم کارەش پێتڤیە بگەڕێینەوە بۆ سەدەی سێیەم و دەستپێکی سەدەی چوارەمی کۆچی/سەدەی نۆیەم و سەرەتای سەدەی دەیەمی زایینی، واتا ئەو قۆناغەی بەگشتی سۆفیگەری تێدا چەکەرەدەکات و لە پانتاییەکی جوگرافی وڵاتەکەدا برەودەسەنێ و دەبێتە دیاردەیەکی ئایینی کە جێکەوتەی هزریی و کۆمەڵایەتی دەبێ.

---

(٥٧) القشيري: الرسالة, ص٩٩. جامي: نفحات الأنس من حضرات القدس, تصحيح و تعليقات: محمود عابدی, انتشارات اطلاعات, تهران, چاپ چهارم,١٣٨٢, ص٩٣.

(٥٨) الأنصاري: طبقات الصوفية, مقابله و تصحيح: محمد سرور مولايى,چاپ دوم, انتشارات توس, تهران, ١٣٨٦هـ.ش, ص٣٧١. جامي: نفحات, ص ١٤٩.

(٥٩) السلمي: جوامع آداب الصوفية, حققه: ايتان كولبرغ, منشور ضمن: مجموعةء آثار ابوعبدالرحمن سلمي, گردآوري: نصرالله پورجوادی, مرکز نشر دانشگاهی, تهران,١٣٦٩, ج١, ص٣٩٤.

(٦٠) السراج: اللمع, ص٢١.

لێرە دەبێ ئاماژە بۆ ئەوە بکەین کە ڕەنگە لەبەر کەمی زانیاری لەسەر دەرکەوتە جیاجیاکانی ئیسلام، ئەستەم بێت بتوانین بە وردی نەخشی گەشەسەندنی باوەڕداری بکێشین، کێشەی سەرەکیش لەوەدایە سەرچاوەکانی بەردەست، ئەوانەی پرژاونەتە سەر ڕەوشی ئایینی، زێتر هی سەردەمی دوای دەرکەوتن و شێوەگرتنی سۆفیگەرین لە وڵاتەکەدا، بەتایبەت نوسینی گەڕیدە و شارناسان کە پتر لە کۆتایی سەدەی سێیەمی کۆچی و لەسەدەی چوارەمدا چالاك دەبن و بەو ناوچانە گوزەردەکەن و سەرنجی بیروباوەڕی خەڵکەکەی دەدەن و یاداشتی دەکەن، لە سەرووی هەموویانەوە گەڕیدە مەقدسی(م٣٨٠ك/٩٩٠ز) دێت کە لەوانی دی زێتر لە باوەڕی ئایینی خەڵکی هەرێمە جیاوازەکان دەدوێت.

کێشەیەکی تری ئەو دەستنیشانکردنە، بریتییە لە چۆنییەتی باسکردن و میتۆدی پەیڕەوکراو لە سەرەدەری کردن لەگەڵ دەرکەوتە باوەڕییەکان لە ئاستی میللیدا، تەنانەت لە نێو ئەو سەرچاوانەش کە تایبەت کراون بەو بوارە ( واتا سەرچاوەکانی ناسراو بە "الملل و النحل")، ئەوانە پتر هەمەگیرانە و لاگیرانە و بەپێی لۆژیکی سەلماندنی ڕاستی باوەڕی ئەو ڕەوتەی نووسەرەکە پەیڕەوی دەکات و بێبەهایی و بە هەڵگەڕاوە زانینی باوەڕی ڕەوتەکانی تر کار دەکات، بۆیە نەپرژاونەتە سەر ڕوگەی بڵاوبوونەوە و کاریگەرییەکانی ڕەوتە نەویستراوەکان، هەروەها بە هەڵوێستی زەمینەی کۆمەڵایەتی ئەم ڕەوتانە ئاشنامان ناکەن.

لەگەڵ ئەوەشدا دەشێ ئەو بڕە زانیارییەی لەبەر دەستدایە هاوکارمان بێت لە دیاریکردنی چەند خاڵێکی سەرەکی سەر نەخشەکە، یانیش ئاشناکردنمان بەو پێگەیشتنەی ئیسلام کە ڕێگە بەدەرکەوتنی هزری سۆفیگەری دەدات یان نایدات.

بەگشتی ئەوەی لەبارودۆخی ئایینی قۆناغەکە رابمێنێ، تێبینی دوو خاڵی سەرەکی دەکات: یەکەمیان ئەم قۆناغە قۆناغی ناجێگیری ئایینی و دیاردەی فرە مەزهەبیە، دووەمینیشیان قۆناغی پەڕینەوەیە بۆ شێوەگرتنێکی مەزهەبی جێگیر کەوا ناسنامەیەکی ئایینی دوورمەودا دادەڕێژێ، ئەمەش لەسەر حیسابی سنووربەندی ڕەوتە ئایینییەکانی تر دەبێ. بێگومان ئەو دوو خەسڵەتە تەواوکارە دەستنیشانی زەمینەی سەرهەڵدانی هزری سۆفیگەری لە وڵاتەکە دەکات لە ڕووی پانتایی جوگرافی دەرکەوتنی و پاشخانی ئایینی – مەزهەبی دەرکەوتنەکەوە، یان با بڵێین ئەو تێگەیشتنە ئایینییەی تیایدا سۆفیگەری پێناسەی خۆی دەبینێتەوە.

## یەکەم: ئیسلامی خەواریجی لە نێو کوردان و نەپەڕینەوە لە زوهدی شۆڕشگێڕانەوە بۆ زوهدی سۆفییانە

ڕەنگە باوترین شێوەی ئیسلام، کە لە سەروبەری سەرهەڵدانی هزری سۆفیگەریی لە نێو کورداندا برەوی سەندبوو، ئیسلامی خەواریجی بێت، ئەو شێوە ئیسلامە یاخییەی لەسەرەتای مێژووی ئیسلامەوە باوەڕی ئایینی لە سنووری هەڵوێستی سیاسیدا چڕ کردبۆوە[٦١]. خەواریج زۆر لە ناوچە کوردییەکان هەر لە "هەرێمی جەزیرە - اقليم الجزيرة"[٦٢]وە تا " شارەزوور - شهرزور"، پاشتریش "هەرێمی ئازربێجان — اقليم اذربيجان"[٦٣] و بەشێکی ڕۆژئاوای"هەرێمی چیا — أقليم الجبال"، کە لە ئێستادا زیاتر ڕۆژهەڵاتی کوردستان دەگرێتەوە[٦٤]، کردبوویانە مەیدانی تەراتێنی بزووتنەوە یەك بەدوای یەکەکانی خۆیان دژ بە سیستەمی باوی خەلافەت، هەر بۆیە لەسەرچاوەکاندا ئەو شوێنانە وەك ناوچەی خەواریجی دەناسێنرێن[٦٥]، بەتایبەت دەبینین لەسەدەی سێیەمی کۆچی تا سەرەتاکانی سەدەی چوارەم

---

(٦١) لەبارەی سەرهەڵدان و گەشەسەندنی خەواریج لە مێژووی ئیسلامیدا بگەڕێوە بۆ: نايف محمود معروف: الخوارج في العصر الأموي — نشأتهم, تاريخهم, عقائدهم, أدبهم, دار الطليعة, بيروت, ١٩٧٧.

(٦٢) لە ئێستادا بەشی زۆری باکوری کوردستان و ڕۆژئاوا و بەشێکی باشور دەگرێتەوە. لەبارەی مەرزەکانی ئەو هەرێمە و نیشتەجێبوونی کورد تیایدا بگەڕێوە بۆ: فائزة محمد عزت: الكرد في اقليم الجزيرة و شهرزور في صدر الإسلام(١٦-١٣٢هـ/٦٣٧-٧٤٩م) – دراسة في التاريخ السياسي, مطبعة خاني, دهوك, دون تاريخ, ص ص٢٦-٣١.

(٦٣) لەبارەی پێگەی کورد لەو هەرێمە بە گشتی, بگەڕێوە بۆ: حسام الدين علي غالب النقشبندي: آذربيجان – دراسة سياسية حضارية, اطروحة دكتوراه, كلية الآداب, جامعة بغداد , ١٩٨٤, ص ص١٣٢-١٤١.

(٦٤) لەم بارەوە بگەڕێوە بۆ: حسام الدين علی غالب نەقشبەندی: شارەزوور و لوڕستانی باکور لە سەدەکانی ناوەڕاستدا – لێکۆڵینەوەیەکی (مێژوویی و شارستانی)یە, وەرگێڕانی: ڕەنج نەبوبەکر محەمەد, چاپخانەی حەمدی, سلێمانی, ٢٠٠٨, ل٣٢-٣٤. نیشتمان بشير محمد: الأحوال السياسية و الإجتماعية و الإقتصادية لغربي اقليم الجبال خلال القرنين الربع و الخامس الهجريين, رسالة ماجستير, جامعة صلاح الدين, كلية الآداب, أربيل, ١٩٩٤, ص ص١٤-٣٤.

(65) المسعودي: مروج الذهب و معادن الجوهر, تحقيق: سعيد محمد اللحام, دار الفكر, بيروت, ٢٠٠٠, ج٣, ص١١٠. ابن حوقل: صورة الأرض, ط٢, منشوارت دار مكتبة الحياة, بيروت, ١٩٧٩, ص٣٠٧. ابن النديم: الفهرست, مطبعة الأستقامة, القاهرة, د.ت, ص٣٤٣.

چالاكییەكانیان زۆر بەرفراوانبووە و كاریگەریی بەسەر سیستەمی كولتووری كوردانی ناوچەكە و جیهانبینی ئایینی و تێگەیشتنیان لە ئیسلام بە ڕوونی دەردەكەوێ، هەروەها ئەو باوەڕە هەر لە ئاستی تاكێك و دوو تاك نەماوەتەوە، بەڵكو خێڵی كوردی هەن پەیڕەوی لێ دەكەن و لەپێناویدا شەڕدەكەن، تەنانەت باوەڕەكە هەر لە ئاستی پشتگیریی میللی نەوەستاوە، بەڵكو پەڕیوەتەوە بۆ ئاستی سەركردایەتی و تێبینی دەكەین لەلایەن هەندێك سەرۆك خێڵ و میرە كور ـانەوە ڕێبەرێتی بزوتنەوەكان لە ئەستۆگیراوە[٦٦].

ئەو تەشـەنەكردنەی باوەڕی خەواریجی تاڕادەیەكی زۆر هاوكاتە لەگەڵ سەرهەڵدان و شێوەگرتنی سۆفیگەری لە پانتایی ئیسلامیدا، بۆیە دەبێ بە وردی شرۆڤەی باوەڕی ئەم ڕەوتە و پەیوەندیی بە هزری سۆفیگەرییەوە بكەین، تا بزانین لە زەمینەی كوردیدا ئەو پەیوەندییە - بەدەر لە بەهێزی و بێهێزی - چ جێكەوتەیەكی هەبوو. بەر لەهەموو شتێك تێگەیشتنی خەواریجی لە باوەڕ زیتر لەسەر گەڕانەوە بۆ خودا وەك سەرچاوەی بنەڕەتی ئایینەكە دامەزراوە، لە هزری ئەواندا مەبەستی بوونی مرۆڤ لە جیهاندا بەرجەستەكردن و جێبەجێكردنی فەرمانی خوداییە، ئەمەش لە یەكەمین دروشمی ئەواندا "لا حكم إلا لله" بە ڕوونی گوزارشتی لێ كراوە[٦٧]، كەواتە پەیوەندیی مرۆڤ بە جیهان پەیوەندییە بە زاتی خودایی لە ڕێگەی قسەكانییەوە كە قورئانە و ژیانی مرۆڤی لەسەر بونیاد دەنرێ، هەر ئەمەش وای لە ڕۆژهەڵاتناسی دیار "مونتگمری وات - Montgomery Watt" كردووە بڵێ: ((ڕەنگە گرنگترین بەشداری خەواریجی لە گەشەپێدانی هزری ئیسلامی و شارستانییەتی ئیسلامی پێداگرتنیان بێت لەسەر ئەوەی دەبێ ژیانی جڤاك و بڕیاری فەرمانڕەواكانی لەسەر قورئان

---

(٦٦) لەبارەی ئەو پەیوەندییە و تایبەتمەندییەكانی بڕوانە: فائزة محمد عزت: الكرد, ص ص١٥٠-١٦٤. زرار صديق توفيق: الكورد في العصر العباسي حتى مجيء البويهيين – دراسة في تأريخهم السياسي, رسالة ماجستير غير منشورة, جامعة صلاح الدين, اربيل, ١٩٩٤, ص٩٢بەدواوە. عطا عبد الرحمن محي الدين: حركات الخوارج في بلاد الكورد و ما جاورها(٤١-٢١٨هـ/٦٦١-٨٣٣م), مركز الدراسات الكردية, السليمانية, ٢٠٠٧, ص ١٧٣بەدواوە.

(٦٧) الأسفراييني: التبصير في الدين و بيان الفرقة الناجية من الفرق الهالكين, تحقيق: كمال يوسف الحوت, عالم الكتب, بيروت, ١٩٨٣, ص٤٥. الشهرستاني: الملل و النحل, تخريج: محمد بن فتح الله بدران, منشورات الشريف الرضي, قم, ١٣٦٤هـ. ش, ق١, ص١٠٥-١٠٦.

بونیاد بنرێ. واچاوەڕوان دەکرێ لەڕووی تیۆریەوە زۆر لە موسڵمانان لەگەڵ ئەم بۆچوونە هاوڕابن، بەڵام خەواریجەکان ئامادەبوون لەپێناو داکۆکی کردن لەو بۆچوونەیان ڕووبەڕووی دەسەڵاتی فەرمانڕەوا ببنەوە))[٦٨].

لێرەدا وا دێتە بەرچاو تێزەکەی خەواریج لەمەڕ پێگەی باڵا و بێ هاوتای خودا لە نێو ناییندا، ڕێگە خۆشکەر بێت بۆ بەرهەمهێنانی عیرفانی ئیسلامی لەو زەمینە کۆمەڵایەتییەی تێیدا باڵادەستە، بە بەڵگەی ئەوەی خودا هۆی سەرهەڵدانییەتی و خوداناسین بابەتی بنەڕەتی هزری سۆفیگەریە، وەك پێشتر روون کرایەوە. ئەو دەقە پەرش بڵاوانەی هزری ئەوان کە لە نێو نوسینی نەیارانیاندا تۆمارکراوە کەمترین هاوکاریمان دەکەن لە خوێندنەوەی گەشەسەندنە نێوخۆییەکانی سیستەمی باوەڕدارییان، خۆ لەو نوسینانەدا ڕەهەندی نەیارێتی ڕەهەندەکانی تری بیروباوەڕیانی پەردەپۆش کردووە، لەوانەش ڕەهەندی زوهدگەرایی وەك پاشخانێکی سۆفیبوون، کە بابەتی توێژینەوەکەیە. نەبوونی سەرچاوەی خەواریجییش - بەتایبەت خەواریجەکانی ناوچە کوردییەکان — تا رادەیەکی زۆر دەروازەی هەر شرۆڤەیەکی دیاردەکەمان بە ڕوودا دادەخەن.

ئەوەی لەبەردەستە چۆنییەتی پیادەکردنی خوداپەرستییە، یان دەرکەوتەکانی قوڵبوونەوەی خەواریجەکان لە ناسینی خودادا، لە ڕێگای خۆتەرخانکردن و بەکەم تەماشاکردنی دونیا وەك خەسڵەتی بنەڕەتی حاڵەتی زوهدی، کە ئەمەش ئاماژەیەکی ڕاستەوخۆی چییەتی ناسینەکەیە. ڕەنگە دیارترین نموونەی حاڵەتی زوهدی لە نێو کوردە خەواریجەکان محەمەدی کوڕی خۆرزاد بێ، ئەو میرە کوردەی خەڵکی شارەزوور بوو و بەشداری و سەرکردایەتی یەکێك لە بزوتنەوە هەرە گەورەکانی خەواریجی لە سەدەی سێیەمی کۆچیدا کردووە ئەویش بزوتنەوەی مساوری کوڕی عەبدولحەمیدی شاری یە[٦٩]. زانیارییەکانمان لە بارەی کەسایەتی ئایینی کوڕی خۆرزاد تەنیا ئەوانەی ئبن ئەثیر(م ٦٣٠ك/١٢٣٣ز)ی مێژوونوسە کە لە ڕووداوەکانی نێوان ساڵانی (٢٦٣ك/٨٧٧ز) تا (٢٦٧ك/٨٨٠ز) تۆماری کردوون. ئەو مێژوونوسە ئاماژە بۆ

(68)Islamic philosophy and theology – an extended survey, 2nd edition, Edinburgh university press, Edinburgh, 1985, p.12.

(٦٩) لێرەدا بە پێویستی نازانین بەدرێژیی باسی ئەو بزوتنەوەیە بکەین, پێشتر لێکۆڵینەوەی زانستی لە بارەی تەواوی بزوتنەوەکە و ڕۆڵی محەمەدی کوڕی خۆرزاد کراوە, بگەڕێوە بۆ: زرار صدیق توفیق: الکورد, ص ص١٠٠-١٠٩.

"خوداپەرستی زۆر"ی ئەو کوردە دەکات[٧٠]، دواتریش دەستنیشانی رووخسارەکانی ئەم خوداپەرستیەی کردووە کە زێتر دەرخستنی حاڵەتی زوهدییە و دەڵێ: (( جلی سوفی زبری پینەپینەکراوی دەپۆشی و بێ رایەخ لەسەر زەوی دادەنیشت))[٧١]، پاشان بە "ژیان دژوار" وەسفی دەکات[٧٢].

لە رووکەشدا ئەم وێنەیەی محەمەدی کوڕی خۆرزاد لەگەڵ وێنەی باوی زوهدی ئیسلامی لێکچوونی زۆریان هەیە، چ لە پۆشینی جلو بەرگەوە بێت یانیش نواندنی رۆژانەی سرووتە ئاینییەکان، بەڵام بەراوردکردنی ووردی دوو حاڵەتەکە ئەوەمان بۆ دەردەخات کە لە کرۆکدا چەند جیاوازیەکی بنەڕەتی لەنێوان تێگەیشتنی ئەو سەرکردە کوردە و خەواریجەکان بەگشتی بۆ خوداپەرستی لەگەڵ تێگەیشتنی زوهدی - سۆفییانەدا هەیە، ئەگەر ئەوەی دوایان خۆی لە بەکەم تەماشاکردنی دونیا لە ڕێگەی دوورەپەرێزی کۆمەلایەتی و بێ هەڵوێستی لە بەرامبەر بە رووداوەکانی دەوروبەری لەڕێگەی هەڵبژاردنی ژیانێکی هێمنانە و دوور لە کێشمەکێشمەکانی دەبینێتەوە[٧٣]، ئەوا کوڕی خۆرزاد نەك هەر لەم حاڵەتە بەدەرە بەڵکو پێچەوانەیەتی، ئەو خۆی و خێڵەکەی لەنێو گرۆیەکی ئاینی تایبەتییەوە پێناسەی خۆیان دەکەن، بەشدارە لە بزاڤێکدا کە خاوەن هەڵوێستێکی یاخییانەی ئاینی – سیاسییە دژ بە دەرەوەی خۆی کە دەسەلاتی ناوەندی خەلافەتی ئیسلامیە، بنەما باوەڕییەکانی خۆی لەسەر ئەو بنەمایە دامەزراندوە. کاتێك ئەمەش گوتاری گشتیی خەواریجییە[٧٤]، ئاساییە لە بەرامبەر بە سۆفیگەری بە گشتی هەڵوێستێکی رەخنەییانەی هەبێت، بەوەی کە ملکەچی دەسەلاتدارن تەنانەت ئەگەر زۆرداریش بێت، هەروەها بەوەی کەوا پێیان وایە "نیاز"ی مرۆڤی

---

(٧٠) الكامل في التاريخ, تحقيق: خليل مأمون شيحا, ط٢, دار المعرفة, بيروت, ٢٠٠٧, ج٧, ص٣١٠.

(٧١) الكامل, ج٧, ص٣٦٠.

(٧٢) الكامل, ج٧, ص٣٦١.

(٧٣) بۆ نموونە بڕوانە: الخراز: الطريق الى الله او كتاب الصدق, حققه: عبدالحليم محمود, دار المعارف, القاهرة, ١٩٨٨, ص ص ٥٤- ٦٣. الأعرابي: معنى الزهد, ص٥٨.

(٧٤) لەمبارەوە بڕوانە:
Ignaz Goldziher: Mhamad and Islam, translated from German by: Kate Chambers Seelye, Yale university press, New Haven, 1917, pp.218-219.

باوەڕدار لە "کردار"ەکانی باشترە[٧٥]، هەر بۆیە ئەوان بە یەکەمین ئەو گروپە ئیسلامییانە دادەنرێن کە دژایەتی خۆیان بۆ سۆفیگەری راگەیاندوە.

ئەمە دەمانباتە سەر خاڵێکی تری بنەڕەتی لە جیاوازی نێوان هەردوو حاڵەتدا، ئەویش بریتییە لەوەی وەك بینیمان زوهدی پەیوەست بە مێژووی سۆفیگەری لەسەر بنەمای ترس و دڵتەنگی دامەزراوە، یان بابڵێین ترسان لەوەی هەموو ئەو خوداپەرستییە بابی رازیبوونی خودا نەبێت، کەچی لەوەناچێت کوڕی خۆرزاد و هاوڕێکانی لە کوردە خەواریجەکان هەمان حاڵەتی دەروونییان هەبووبێت و ترس ئیفلیجی کردبن. لایەنی کەم ئەو هیچ جۆرە ترسێك دەرنابڕێت وایلێکردبێ هەبوونی لە نێو ئەو جیهانەی تێیدا دەژیا نەرێنی بێت، بە پێچەوانەوە خوداپەرستی وی لە "خۆبەخشین لە پێناو خودا" چڕ بۆتەوە، خۆتەرخانکردن تەنها بۆ خودا لە پێناو هێنانەدی شەریعەتەکەی، ئەوەتا هەر ئیبن ئەثیر باس لە جەربەزەیی ئەو کوردە خەواریجییە دەکات و پێمان دەڵێ: ((سواری مانگا دەبوو تا لە شەڕدا هەڵنەیێت))[٧٦]، هەر بۆیە دەتوانین بڵێین ئەگەر زوهدی سۆفییانە بۆ رازیکردنی خودایە لە رۆژی پەسلاّندا، ئەوەی کوڕی خۆرزاد بۆ رازیکردنییەتی لە ئێستادا و لەسەر زەوی.

لەلایەکی ترەوە ناکرێ ئەو حاڵەتە زوهدییەی ئیسلامی خەواریجی لەکەسەکانی خۆیدا بەرجەستەی دەکرد، وەك بەکەم تەماشاکرنی دونیا بخوێنرێتەوە بەو جۆرەی لە هزری سۆفیگەرییانەدا ئامادەیە[٧٧]، بەڵکو دەشێ وا لێکبدرێتەوە بەکەم تەماشاکردنی دەروونە لەبەردەم گەورەیی داخوازیە دونیاییەکانی خودادا، ئەمەش بەهەمان دروشمە سەرەکییەکە " لا حکم إلا لله" گوزارشتی لێ دەکرێ. بەو مانایە ئەوان حاڵەتی خوداپەرستی لە گرنگی نەدان بە خۆشییەکانی ژیان و جلوبەرگ و...هتد، بەرجەستە دەکەن. نابێ ئەمەش وەك بێبەریبوونی مرۆڤ لە جیهان تەماشابکرێ ئەوەندەی هەوڵێکە بۆ گۆڕینی و گونجاندنی لەگەڵ بنەما باوەڕییەکان، کە لەوێدا خەواریج پەیڕەوکارانی خۆی لە شێوەی محەمەدی کوڕی خۆرزاد فێری

---

(٧٥) لەبارەی ئەو رەخنەیەی خەواریج لە سۆفیگەری بگەڕێوە بۆ: عبدالرحمن بدوي: تاريخ التصوف الإسلامي من البداية حتى نهاية القرن الثاني, ط٣, الشعاع للنشر, ٢٠٠٨, ص٧١.

(٧٦) الكامل, ج٧,ص٣٦١.

(٧٧) بۆ نموونە بڕوانە: الأعرابي: معنى الزهد, ص ص٦٩-٧٧.

پابەندی توندی بنەما چەسپیوەکانی ئیسلام دەکات[٧٨]، بەڵام بێ هیچ خوێندنەوەیەکی (باطنی) بۆ ئایینەکە و ئەو بنەمایانەی.

لە بەرامبەر بەو تێگەیشتنەی خەواریج، ئاساییە رەوتی باوی زوهدی ئیسلامی خوێندنەوەی خۆی هەبووبێ بۆ رەوتە ئایینییەکە و هەڵوەستە لەبەردەم باوەڕیان بکات. یەکێك لە گەورە زاهیدەکانی جیهانی ئیسلامی و رەمزێکی هەرگاڤ ئامادەی نێو کولتووری سۆفیگەری ئەو هەڵوێستەی بە روونی نواندووە، ئەویش حەسەنی بەصری(م ١٢٠ك/٧٣٨ز) یە، کەپێی وابوو تێگەیشتنی خەواریجی بۆ ئایین تێگەیشتنێکی دونیاییە و ئەوان خەڵکانێکن شەڕ لە پێناو دونیادا دەکەن نەك ئاخیرەت[٧٩]، هەربۆیە چاوەڕێی ئەوە ناکرێ زوهدی خەواریجی دەسپێکی هزری سۆفیگەرییانە بێت، رۆحی یاخیبوون و شۆڕشگێرانەیان بەربەستە لەبەردەم گەشەسەندنێکی ناوخۆیی باوەڕ بە ئاڕاستەی سەرهەڵدانی جۆرە هزرێکی لەم بابەتە.

بێگومان سنووربەندکردنی حاڵەتی زوهدی لەلای خەواریجەکان بەجۆرە و ئەو هەڵوێستە نەرێنییەیان لەبەرامبەر بە هزری سۆفیگەری، کاریگەریی راستەوخۆی بەسەر نەخشی هزرەکە لەو هەرێم و ناوچە کوردیانەی ئیسلامی خەواریجی تێیدا چالاك بوو هەبووە. بەتایبەت لە قۆناغی دەرکەوتن و دامەزرانیدا بۆتە بەربەستێکی گەورە لەبەردەم سەرهەڵدان و گەشەسەندنی، ئیدی سۆفیگەری لەوێدا — بە بەراورد لەگەڵ هەندێ ناوچەی تری وڵاتەکە - نابێتە دیاردە، بەتایبەت لە هەرێمێکی پان و بەرینی وەك هەرێمی جەزیرە، کە تا ناوەڕاستی سەدەی چوارەمی کۆچیش، واتا تا قۆناغی گەیشتنی سۆفیگەریی ئیسلامی بە لوتکەی پێگەیشتنی، تاك و تەرا نەبێ سۆفی تێدا نابینرێ[٨٠]. تەنانەت وەك دواتر لە بەشی داهاتوو باسیان لێوە دەکەین، زانیاری لەسەر ئەو سۆفییانەش پەرش و بڵاوە و بایی ئەوە ناکات لە

---

(٧٨) نايف محمود معروف: الخوارج, ص ١٩٦.

(٧٩) التوحيدي: البصائر والذخائر, بتحقيق: مصطفى ابراهيم, ط ٢, دار المعارف, القاهرة, ١٩٧٠, ص٢٣. هەروەها بڕوانە: نايف محمود معروف: الخوارج, ص١٩٧.

(٨٠) السلمي: طبقات الصوفية, بتحقيق: نورالدين شريبة, ط ٣, مكتبة الخانجي, القاهرة, ١٩٨٦, ص٢٩. الأنصاري: طبقات الصوفية, ص٣٥٤. ابن خميس: مناقب الأبرار و محاسن الأخيار في طبقات الصوفية, تحقيق و تقديم: سعيد عبدالفتاح, دار الكتب العلمية, بيروت, ٢٠٠٦, ج١, ص٥٧. ج٢, ص٢٥٧. ابن بزاز: صفوة الصفا, مقدمة و تصحيح: غلامرضا طباطبائي مجد, چاپ دوم, انتشارات زرياب, تهران, ١٣٧٦, ص٧٢.

بۆچوونەکانیان تێ بگەین و پێگەی دروستیان لە نێو هزری سۆفیگەریدا ببینین. بەهەمان شێوە دەتوانین نموونە لەسەر ئەو ناوچانەی هەرێمی چیاش بهێنینەوە کە بوونەتە بنکەی خەواریجی، وەك شاری "سوهرەوەرد - سهرورد"، کە تا ئەو کاتەی خەڵکەکەی ئەوێ — کە زۆربەیان کورد بوون — لە خەواریجەکان بوون[٨١]، جگە لە سۆفییەك کە لەدەرەوەی شارەکەدا چالاکە[٨٢]، ئاماژەیەکی ئەوتۆمان نییە لەسەر چالاکی سۆفییانە تیایدا، کەچی لەهەمان ئەو قۆناغەدا لەشارە کوردییەکانی تەنیشتی لە هەمان هەرێم، نەك هەر سۆفیگەری بە فراوانی دەرکەوتووە، بەڵکو هەندێکیان بوونەتە بنکەی سەرەکی سۆفیان لە رۆژهەڵاتی جیهانی ئیسلامیدا، وەك پاشتر دەیخەینە روو. ئەمە لەکاتێکدا ئەو شارە، لەقۆناغی دوای وازهێنان لە خەواریج، واتا دوای سەردەمی ئیبن حەوقەل(م ٣٦٧ك/٩٧٧ز)ی گەڕیدە کە دەستنیشانی رەوشی ئایینی شارەکەی کردووە، دەبێتە زێد و نازناوێك بۆ هەندێك لە گەورەترین سۆفییانی جیهانی ئیسلامی، کە کاریگەریی چارەنووسسازیان بەسەر رەوشی ئەو هزرە هەبووە[٨٣].

## دووەم: رەوتە شیعییەکان و پەیوەندییە نهێنییەکانیان بە هزری سۆفیگەری لە کوردستاندا

### ١- شیعەی ئیمامی

ئەگەر لە رووکەشدا چەمکی "شیعە" ئەوانە دەگرێتەوە کە، لەنێو یاوەرانی پێغەمبەردا، لایەنگری عەلی کوڕی ئەبو تالیب(م ٤٠ك/٦٦٠ز) بوون و بزوتنەوەیەکی سیاسی — ئایینیان لەسەر ئەو بنەمایە دامەزراندووە، ئەوا لە کرۆکدا خەڵکانێکن پەیڕەوی لە بیروباوەڕی "پێشەوا - الإمام"ەکان لە نەوەی عەلی دەکەن و گوێڕایەڵی تەواویان بۆ ئەو پێشەوایانە هەیە لە

---

(٨١) ابن حوقل: صورة, ص٣٠٧.

(٨٢) الأنصاري: طبقات الصوفية, ٣٦٩-٣٧٠. جامي: نفحات, ص١٤٨-١٤٩.

(٨٣) وەك: شێخی کوژراو شەهابەدین یەحیا سوهرەوەردی (م٥٨٩ك/١١٩٣ز) دامەزرێنەری فەلسەفەی ئیشراق, شێخ ئەبو نەجیب عەبدوقاهری سوهرەوەردی (م٦٣٠ك/١٢٣٢ز), هەروەها شێخ شەهابەدین عومەری سوهرەوەردی (م٦٣٢ك/١٢٣٤ز) خاوەن کتێبی ناوداری " عوارف المعارف" لەبواری سۆفیگەری و... چەندان سۆفی تر.

هەموو بوارێکی پەیوەست بە بۆچوونە تیۆرییە باڵاکان و راڤەی رۆحانی دەقی بنەڕەتی "قورئان" و تەنانەت لە ئەنجامدانی ئەرکەکانی ئایینی ئیسلامیشدا[٨٤].

شیعەگەری لەو قۆناغەی دەستنیشانمان کرد، بە بەراورد لەگەڵ هەریەك لە ئیسلامی خەواریجی و ئیسلامی سوننی، کەمتر توانیویەتی لە زەمینەی کوردیدا خۆی بدۆزێتەوە، رەنگە هۆکاری ئەمەش بەوە لێکبدرێتەوە کەوا لەگەرمەی چالاکی گروپە شیعییەکان لەسەردەمی عەبباسیی یەکەمدا ولاتەکە زیتر کەوتبووە ژێر هەژموونی باوەڕی خەواریجی، هەژموونێك وای لەو کوردانەی پەیڕەوی لێدەکەن کردووە بە ئاشکرا دژایەتی خۆیان بۆ ئەو سیستەمە باوەڕییە رابگەیەنن کە شیعەگەری هەیبوو، ئەمە لە هەڵوێستی ئەو کوردانە لە عەلی کوڕی ئەبو تالیب وەك رەمزێکی سەرەکی نێو ئەو سیستەمە - بە جیاوازی رێبازەکانی - بە ئاشکرا دیارە، ئەو هەڵوێستە لە پابەندبوون بە بنەمایەکی چەسپیوی نێو باوەڕی ئیسلامی خەواریجییەوە دیارە و بریتییە لە داماڵینی ئەو پیرۆزییەی کراوەتە بەر کەسایەتییەکە، بەڵکو بێبەریبوون لێی[٨٥]. ئەوەش تاوەکو سەرەتاکانی سەدەی چوارەمی کۆچیشدا، وەك بنەمایەکی کارێکراوی ناو کوردانی سەر بەو رەوتە دەمێنێتەوە[٨٦]. بۆیە ئاساییە ئەگەر ببینین گەڕیدەکان ئاماژە بۆ کەمی پەیڕەوکاری شیعی لە سنووری جوگرافیای بڵاوبوونەوە و باڵادەستی ئیسلامی خەواریجی بکەن[٨٧].

رەنگە هەر ئەو هەڵوێستەی کوردان هاوکاریمان بکات لە تێگەیشتنی هەڵوێستی پەرچەکردارییانەی رەمزێکی تری سەرەکی شیعە لە بەرامبەر بە تەواوی کۆمەڵی کوردی، ئەویش جەعفەری صادقە، کە لە زۆربەی رێبازە شیعییەکاندا پێگە و رێزی خۆی هەیە بەتایبەتی "شیعەی ئیمامی – الشیعة الإمامیة"، هەر بۆیە هەڵوێستی وی لە کوردان بۆتە هەڵوێستی ئەم رەوتەی شیعە و لە نێو دەقە نورسراوە باوەڕپێکراوەکانیاندا بە روونی رەنگی

---

(٨٤) هنري كوربان: عن الإسلام في ايران – مشاهد روحية و فلسفية, نقله الى العربية: نواف الموسوي, دار النهار, بيروت, ٢٠٠٠, ج١, ص٧٧.

(٨٥) (( وفي الأكراد مَنْ رأيهم رأي الخوارج و البراءة من عثمان و علي رضي الله عنهما))؛ المسعودي: مروج, ج٢, ص١٣٠.

(٨٦) بڕوانە: ابن الأثير: الكا٦مل, ج٥, ص١٢٣.

(٨٧) بگەڕێوە بۆ: المقدسي: أحسن التقاسيم إلى معرفة الأقاليم, علق عليه و وضع حواشيه: محمد امين الضناوي, دار الكتب العلمية, بيروت, ٢٠٠٣, ص١٢٩, ٢٨٥.

داوەتەوە، لەوەدەچێ کۆنترینی ئەم دەقانەش کتێبی بەناوبانگی "الکافي" بێت هی فەقیه و فەرموودەناسی شیعی کولەینی رازی(م٣٢٩ك/٩٤١ز)، ئەمەش کتێبێکی فەرموودەیە و بۆتە بەردی بناغەی دارشتنی زۆر لەبنەما و بڕیارە فیقهییەکانی ئیمامییەت، لەوێدا کولەینی ئاماژە بۆ ئەوە دەکات جەعفەری سادق داوای کردووە سنوورێك هەبێ بۆ تێکەڵ بوون لەگەڵ کوردان، بە بەڵگەی ئەو بۆچوونە ئەفسانەییە باوەی گوایە ئەو میللەتە لەرەسەندا جنۆکەن و خوا سەرپۆشی لەسەر لاداون[٨٨]. بەهەرحاڵ ئامانەوێ سەرچاوە و پاشخانە ئایدیۆلۆژیەکانی پشت ئەو بۆچوونە ئەفسانەییە بدۆزینەوە کە لە کولتووری عەرەبی – ئیسلامی لە خوێندنەوەی سروشتی کۆمەڵی کوردیدا رەواجی هەبوو[٨٩]، بەڵکو ئەوەی گرنگ بێت ئەو ئاکامانەن کە جەعفەری صادق پێی گەیشتووە، لە هەموویان دیارتر ئەوە دەبێ کە ژنهێنان لێیان پەسەند نەبێت[٩٠]، هەروەها مامەڵەکردن لەگەڵیاندا تەنیا بەزەبری شمشێر بێت[٩١].

بەهەرحاڵ هەندێك جار – تەنانەت لە ناو هەندێك لە شیعەکانیشدا – رەخنە لە کولەینی و راستی تەواوی گێڕانەوەکانی دەگیرێ، بەڵام دووبارەکردنەوەی بۆچوونەکانی ئەو پێشەوایەی شیعە لەلایەن زانا شیعییە باوەڕپێکراوەکانی دواتر جەخت لەسەر ئەو هەڵوێستەی رێبازەکە لە کوردان دەکاتەوە[٩٢]، بۆیە ئاساییە – راست بێ یان نا - میللەتەکە بە قڕکردنی شیعە تۆمەتبار بکرێن و وێنەیەکی ناجۆریان بۆ بکێشرێ[٩٣]، دواجار هەر ئەم هەڵوێستە لە

---

(٨٨) الكافي, تنظيم: صادق برزگر بفروئي, ط٣, مؤسسة أنصاريان للطباعة و النشر, قم , ١٣٨٥هـ.ش, ج٥, ص١٥٨.

(٨٩) لەم بارەوە بگەڕێوە بۆ: حيدر لشكري: الكُرد في المعرفة التاريخية الإسلامية, دار سپيريز, دهوك, ٢٠٠٤, ص ص١١٧-١٢٤.

(٩٠) الكليني: الكافي, ج٥, ص٢٩٦.

(٩١) الكليني: الكافي,ج٧,ص٢٩٦.

(٩٢) بۆ نموونە بڕوانە: الصدوق: علل الشرائع, قدم له: محمد صادق بحر العلوم, انتشارات كلمة الحق, قم, ٢٠٠٩, ج٢, ص٦٩٧. الطوسي: تهذيب الأحكام, نظمه: صادق برزگر بفروئي, ط٣, مؤسسة أنصاريان للطباعة و النشر, قم, ١٣٨٥هـ.ش, ج٧, ص٤٠٥.ج١٠, ص٢١١.

(٩٣) بڕوانە: الخوارزمي: رسائل ابي بكر الخوارزمي, تقديم: الشيخ نسيب وهيب الخازن, منشورات دار و مكتبة الحياة, بيروت, ١٩٧٠, ص ١٦٤. الحلبي: تقريب المعارف, تحقيق: فارس تبريزيان الحسون, مركز الأبحاث

خەیاڵدانی ئایینی شیعییدا دەخرێتە قالبێکی ترەوە و تیایدا کورد دەکرێتە رەگەزێکی دارشتنی بەسەرهاتی دەرکەوتنەوەی ئیمام و هاتنی قیامەت و تەنانەت بەکۆتا هاتنی دونیا[٩٤].

هەرچۆنێك بێت ئەم دوو خاڵە، واتا کاریگەریی ئیسلامی خەواریجی و هەڵوێستی جەعفەری صادق، تێکەڵ بە خاڵێکی تر دەبێت، کە پەیوەندیی بە هزری ئەوانەوە هەیە، ئەویش نهێنی بوونی بانگەوازی شیعیە بە گشتی، کە لەچوارچێوەی چەمکی بەناوبانگی "تەقیە - التقیة" دا جێگەی کراوەتەوە، چەمکێك ئەگەر لەرووکەشدا وادیتە بەرچاو بۆ پارێزگاری کردنە لە کەسی ئیمام، ئەوا لەهەمان کاتدا هەڵوێستێکیش بووە لەپێناو رێزگرتنی رەهای باوەڕە باڵاکانی شیعە و دانانی سنوورێك بۆ ناسینی راستی، تەنها ئەو کەسە دەتوانێ راستی بزانێ کە هۆشی هەبێ و شایستەی ناسینی بێت[٩٥].

بێگومان ئەو بڕیارە پێشینانەی شیعەگەری، سنوورێکی داناوە بۆ بەربڵاوبوونی رەوتەکە لەنێو کۆمەڵی کوردیدا، بەڵام ئەگەر شیعە دەیانەوێ قەوارەیەکی بەرفرەی ئایینی — سیاسیان هەبێ، دەبێ بچنە سەرووی ئەم جۆرە بڕیارانە، یانیش تا ئەوکاتەی دەبینین جۆرێك لەپێشوازی لە باوەڕەکەیان لە نێو کورداندا هەیە، بڕیارەکان پشتگوێ بخەن، بەتایبەت کە دەزانین رەوت و رێبازە شیعییەکان چەقبەستوو نەبوون، بەڵکو لە بزاوتی بەردەوام دابوون لەپێناو دامەزراندنی قەوارە و چەسپاندنی بوونی خۆیان. هەربۆیە ئەگەر سنوورێکیش بۆ شیعەبوونی کوردان دانرابێ، کەچی هەبوونی ئەم رەوتەی بنبڕ نەکردووە، بەڵکو لێرەو لەوێ لە وڵاتەکەدا قوژبنی شیعی هەر هەبووە، بەتایبەتی شیعەی ئیمامی کە لە قۆناغی زووی گەڵاڵەبوونی ناسنامەکەی چالاکی لەهەندێك ناوچەی کوردیدا نواندووە، نەخاسمە لە هەندێك لەشارەکانی رۆژئاوای

---

العقائدية, طهران, ١٤١٧هـ, ص٢٠٧. الطوسي: الإستبصار فيما أختلف من الأخبار, تحقيق: محمد جواد الفقيه, ط ٢, دار الأضواء, بيروت, ١٩٩٢, ج٤, ص١١٨.

(٩٤) الخصيبي: الهداية الكبرى, دار الفكر للطباعة و النشر, دمشق, ١٩٩٩, ص٣٩٣. النعماني: كتاب الغيبة, تحقيق: علي أكبر الغفاري, مكتبة الصدوق, طهران, ص١٤٨. بۆ زانیاری زیاتر لەسەر ئەو ئامادەییە نەرێنیانەی کورد لە خەیاڵدانی ئایینی شیعە بگەڕێوە بۆ: رانیا سلیمان: عجائب الأسرار للإمام علي بن ابي طالب عن علامات آخر الزمان, مؤسسة الخرسان للمطبوعات, بيروت, ٢٠٠٥, ص ص٣٦١-٣٦٦.

(٩٥) هنري كوربان: عن الإسلام, ج١,ص ٤٣٥.

هەرێمی چیادا، بەتایبەت لە دینەوەر و " کرماشان - قرمیسین"[96] و شارەزوور، توانیویانە جێپێیەك بۆ خۆیان بکەنەوە و خەڵکەکەی بچنە چوارچێوەی ئەو سیستەمەی رێبازەکەی شیعە کاری پێ دەکرد لە بەڕێوەبردنی کاروبار و پەیوەندیی گرێدان بە ئیمامەوە[97]. خۆ هەبوونی کەسێتی شیعی لە کورد و غەیرە کورد لەو سەردەم لەم شار و ناوچانەدا[98]، جەخت لەسەر ئەو تەشەنەکردنە دەکاتەوە.

بڵاوبوونەوەی شیعەی ئیمامی هەر لە چوارچێوەی سنووری شار یان بابڵێین وەك دیاردەیەکی پەیوەست بە فەزای شارەوە نەماوەتەوە، بەڵکو کەمێك درەنگتر بەرەبەرە دەتوانێ زەمینەیەکی کۆمەڵایەتیش، لەئاستی خێڵەکی، بۆ خۆی دابمەزرێنێ کە — بەدەر لە گەورەیی و بچووکی زەمینەکە - بەردەوامێتییەکی مێژوویی پێ دەبەخشێ، کاتێك دەبینین هەر لە سەدەی چوارەمی کۆچییەوە/ دەیەمی زایینییەوە لەهەرێمی چیا، لە نێو هەندێك ئەندامی چەند خێڵێکی ئەوێ چەکەرە دەکات[99]، دوای ئەم قۆناغەش لە نێو خێڵی بەناوبانگی جاوانی

---

(٩٦) ناوی ئەو شارە لە سەرچاوە عەرەبییەکاندا بە "قرمیسین" تۆمارکراوە, کە خوێندنەوەی عەرەبیانەی "کرمانشاهان" بووە؛ ابن الفقیه: کتاب البلدان تحقیق: یوسف الهادی, عالم الکتب, بیروت, ١٩٩٦, ص٤١٦. ئە ئێستاشدا "کرمانشاه" و "کرماشان"ی پێ دەگوترێ و ناوی ئوستانێکی رۆژهەڵاتی کوردستانە. عەبدوڵا غەفور: فەرهەنگی جوگرافیای کوردستان, سلێمانی, ٢٠٠٢, ل٩٠.

(٩٧) الطبري الصغیر: دلائل الأمامة, حققە: قسم الدراسات الإسلامیة, مؤسسة البعثة, قم, ١٤١٣هـ, ص٥٢٠-٥٢١. الصدوق: کمال الدین و تمام النعمة, صححه و علق علیه: علي اکبر غفاري, مؤسسة النشر الإسلامي, قم, ١٤٠٥هـ, ص٤٤٣.

(٩٨) الطبري الصغیر: دلائل, ص٥٢٠-٥٢١. الخصیبي: الهدایة, ص٣٠٣, ٣٠٨-٣٠٩. المسعودي: مروج, ج١, ص٢٢.. ابن خلکان: وفیات الأعیان و انباء ابناء الزمان, دار الکتب العلمیة, بیروت, ٢٠٠٧, ج١, ص ص٣٥١- ٣٥٣. هەروەها بڕوانە: نور علي الهي: برهان الحق, چاپ هشتم, انتشارات جیحون, تهران, ١٣٧٣هـ.ش, ص٣٧.

(٩٩) التنوخي: نشوار المحاضرة و اخبار المذاکرة, تحقیق: عبود الشالجي, د.م, ١٩٧٣, ج٢, ص٣٢٩. بۆ زانیاری زیاتر لەسەر بڵاوبوونەوەی شیعەگەری لە نێو ئەم هۆزە بڕوانە: حسام الدین علی غالب نەقشبەندی: شارەزوور, ل١٧٩.

برەودەسەنێ[١٠٠]، هەروەها لە نێو هەندێك لە میرانی خێڵی بەشنەوی لە هەرێمی جەزیرەش بڵاودەبێتەوە[١٠١]، ئەوە بەو مانایە دێت کەوا هەڵسوڕێنەرانی بانگەوازی ئیمامی رازیبوونە بە دابەزاندنی رێبازەکەیان بۆ ئاستی میللی و چەسپاندنی لە زەمینەیەکی کۆمەڵایەتی وەك زەمینەی خێڵە کوردییەکان. بۆیە تا قۆناغی زۆر درەنگتر لەنێو بەشێك لە کوردان و لە ناوەوە و دەرەوەی وڵاتەکەیان هەر پاشماوەی دەمێنێ[١٠٢]، تەنانەت تا ئێستاش پەیڕەوکاری ماوە.

بەهەر حاڵ نهێنی بوونی رێبازە شیعییەکان ئاستەنگێکی گەورەیە لەبەردەم هەر هەوڵێك بیەوێ پەیوەندیی ئەو رێبازانە بە هزری سۆفیگەری بە گشتی، بەتایبەت لە کوردستان لە قۆناغی سەرهەڵداندا ببینێ. ئەگەرچی هەندێك لە توێژەران بڕێك بنەمای گشتی ئەو پەیوەندییەیان لە ئاستی جیهانی ئیسلامیدا دەستنیشان کردووە، خاڵی هەرە سەرەکیش لەو پەیوەندییە مەسەلەی تایبەتمەندی خەسڵەت و بنەماکانی "وەلی" لە هزری سۆفیگەری و رێکهاتنەوەی لەگەڵ خەسڵەت و تایبەتمەندی "پێشەوا – ئیمام"ی شیعییە، ئەمە سەرباری گەڕان بەدوای مانا نادیارەکانی پشت دەقە ئایینییەکان و راڤەکردنیان، بەو پاساوەی هەر "رووخسار - الظاهر"ێك "کرۆك - الباطن"ێکی نادیاری هەیە و دەبێ بخوێندرێتەوە و کاری پێ بکرێ، ئەمە جگە لە هاوشێوەبوونی هەردوو کایە لە دەرکەوتە کردارییەکانیان، کە هەموو ئەو تەوەرانە پێشتر جێگەی لێکۆڵینەوەی ورد بوون[١٠٣]، بۆیە لێرە تەنها ئەوەندە دەڵێین گرێدانی هەردوو کایە زەحمەتترە لەوەی باسمان کرد و هەر تێزێك لەم رووەوە هەبێ زێتر

---

(١٠٠) آواز محمد علي عبدالكريم: الكورد الجاوانيون – دورهم السياسي و الحضاري في العصر العباسي, رسالة ماجستير غير منشورة, كلية الآداب, جامعة دهوك, دهوك, ٢٠٠٣, ص ص٩٥-٩٧.

(١٠١) ابن شهراشوب: معالم العلماء, نشره: عباس اقبال, چاپخانه فردين, طهران, ١٣٥٣هـ.ش , الأميني: الغدير, ط ٤, دار الكتاب العربي, بيروت, ١٩٧٧, ج٤, ص ص٣٤-٣٨.

(١٠٢) لەمبارەوە بڕوانە: حمد الله مستوفي: نزهة القلوب في المسالك و الممالك, بسعي و اهتمام و تصحيح: گای لسترنج, چاپخانه ارمغان, تهران, ١٣٦٢هـ.ش, ص٨٣. ابن بطوطة: رحلة ابن بطوطة المسمى تحفة النظار في غرائب الأمصار و عجائب الأسفار, علق عليه: محمد السعيد محمد الزيني, المكتبة التوفيقية, القاهرة. د.ت, ص٢٠١.

(١٠٣) هەر بۆ نموونە بڕوانە: كامل مصطفى الشيبي: الصلة , ص ص ٢٣٠-٢٤٠.
Seyyed Hosain Nasr: Sofi Esseys, George Alen & Union LTD, London, 1973, pp.123-135.

گشتگیری پێوە دیارە، بەتایبەت لە قۆناغی زووی سەرهەڵدان و شێوەگرتنی سۆفیگەریی ئیسلامیدا.

هەر بۆیە لە زەمینەی کوردیدا گرێدانی شیعەگەری و سۆفیگەری گەلێك ئەستەمە و بابەتەکە بە سانایی خۆی بەدەستەوە نادات، لەگەڵ ئەوەشدا ئاماژەدانی سەرچاوە شیعییەکان بۆ شیعەبوونی یەکێك لە کۆنترین ئەو کەسایەتییە کوردیانەی لە کولتووری سۆفیگەریدا ئامادەیە رەنگە کەمێك بابەتەکە رۆشنبکاتەوە، ئەویش عەکبەری کوردی یە کە هاوسەردەمی یەکێك لە دامەزرێنەرانی زوهدی ئیسلامی، کە ئەویش بشری کوڕی حارثی حافی (م٢٢٧ك/٨٤٢ز) بووە[١٠٤]، بەپێی نوسەری شیعی "محسن امین العاملی" ئەو کوردە یەکێکە لە میرانی شیعە لە عێراق و دوای خۆشی کوڕەکانی جێگەیان گرتۆتەوە[١٠٥]، بەڵام کەمی زانیاری لەمەڕ کەسەکە بە گشتی و بێدەنگیی سەرچاوە رەسەنەکان لەسەر شیعەبوونی ئەو پەیوەندییە بە لێڵی و نادیاری دەهێڵێتەوە.

لەپاڵ ئەمەدا نموونەیەکی ترمان لەبەر دەستە لەمەڕ پەیوەندیی نێوان شیعەی ئیمامی و هەندێك سۆفیانی کوردستان، ئەویش یەکێك لە گەورە سۆفییانی شاری دینەوەرە بەناوی ئەبولعەباس ئەحمەدی کوڕی محەمەد ناسراو بە "آستارە=ئەستێرە"[١٠٦]. ئەو ئەبولعەباسە لە نێو کولتووری سۆفیگەریدا کەسێکی لاوەکی نییە، بەڵکو بە زانایەکی گەورە و یەکێك لە باشترین شێخانی فەتوا دادەنرێ و رێبازە سۆفییەکەشی بە راست و دروسترین رێباز وەسفدەکرێ[١٠٧]، بەرامبەر بەمە بە پێی گێڕانەوەی شیعی لەوەدەچێ ئەبولعەباسی دینەوەری بانگەوازکارێکی بەرچاو و جێگەی متمانەی شیعەکان، لایەنی کەم هی شیعەکانی هەردوو شاری دینەوەر و کرماشان، بووبێ. بۆیە دەبێتە نوێنەریان لە گەیاندنی ئەو پیتاکەی

---

(١٠٤) المقدسي: كتاب التوابين، حققه: عبد القادر الأرناؤوط، مكتبة الشرق الجديد، بغداد، ١٩٨٩، ص٢٢٢-٢٢٣. ابن صصري: الدرة المضيئة في الدولة الظاهرية، عنى بتحقيقه: وليم م.برينر، جامعة كاليفورنيا، بيركلي، ١٩٦٣، ص٢٣١-٢٣٢. دواتر زێتر باس لە پێگەی ئەو کەسایەتییە کوردییە دەکەین.

(١٠٥) أعيان الشيعة، حققه: حسن الأمين، ط ٥، دار الكتاب العربي، بيروت، ١٩٧٢، ج١٢، ص١٢٤.

(١٠٦) الطبري الصغير: دلائل، ص٥٢٠.

(١٠٧) السلمي: طبقات، ص ٤٧٥. ابن خميس: مناقب، ج٢، ص١٩١.

کۆیانکردبۆوه بۆ دەستی دواین ئیمام[١٠٨]، ئەمەش لەو قۆناغە چارەنووسسازەی کە شیعەی ئیمامی ناوی دەنێن قۆناغی "ونبونی بچووك - الغیبة الصغری". ڕەنگە هەر بانگەوازکردنیش بێت وایلێدەکات لە شوێنێکی دیاریکراو، بەتایبەت لە شارەکەی خۆی جێگیر نەبێت و لە گەڕانی بەردەوام دابێت[١٠٩]، تەنانەت جێ گۆڕینی زووبەزووی جێگەی سەرنجی سۆفییانی هاوسەردەمی بووه، ئەوەتا دەگوترێ ئەو کاتەی دەچێتە نەیشاپور و، بەو توانا بەرزەی لە وتاربێژیی هەیبووه، شیاوه خەڵکی ئەوێ بۆ خۆی ڕاکێشێ، کەچی لەوێش دەردەچێ و دواجار لە سەمەرقەند دەگیرسێتەوه، تا لەوێ - لە دوای ساڵی (٣٤٠ك/ ٩٥١ز) - دەمرێ[١١٠].

هەرچۆنێك بێت ئەو کەسایەتییە نموونەیەکی هەرە ڕوونی پەیوەندی شاردراوەی نێوان شیعە و سۆفیگەریە بەگشتی و بە تایبەت لە کوردستاندا؛ سەرچاوە شیعییەکان کەباسی لێوە دەکەن هەرگیز باس لە رووخساری سۆفییانەی کەسایەتییەکەی ناکەن، لە چوارچێوەی مێژوونوسیی سۆفیگەریشدا دوور و نزیك باسێك لە شیعەتی ئەو و دوورابیە شیعییەکانی هزرە سۆفیگەریەکەی نییە. هەر بۆیە بۆ ئاشکراکردنی ئەو پەیوەندییە شاردراوەیە پێویستمان بە خوێندنەوەی ماناکانی ئەودیو وتە سۆفییەکانی ئەبولعەباسی دینەوەری و سۆفییانی تر هەیە تا رووی دیار و نادیاری پەیوەندییەکە ببینین، ئەوەتا لە پشت هەندێك لە وتەکانی ئەبولعەباسەوه ئاماژەی لێڵ بۆ باوەڕی شیعی، یان هاوڕابوون لەگەڵ شیعەدا، هەیە. ڕەنگە دیارترین تێزیشی لەمبارە ئەوەیان بێ کە سنوورەکانی "زانین — علم" دەکێشێ، سۆفی دینەوەری پێی وایە دووجۆرە زانین هەن: یەکەمیان زانینی ئەنجامدانی کارەکانی پەیوەست بە خوداوەیە لەلایەن بەندەوه، ئەوەی دووەمیشیان ئەو زانینە خوداییەیە لەبەندەدا دانراوه، ئەمەیان زانینێکی غەیبانییە و لە بەندەکانی خودا پەنهانە، تەنها کەسانێك هەندێك لایەنیان بۆ کەشف بووه، کە — بەقسەی وی - زێتر پێغەمبەرانن یاخود بژاردەی وەلییەکانن[١١١].

---

(١٠٨) الطبري الصغير: دلائل, ص٥٢٠.

(١٠٩) الأنصاري: طبقات الصوفية, ص٣٦٧. الشعراني: الطبقات الكبرى المسماة بلواقح الأنوار في طبقات الأخيار, تحقيق: سليمان الصالح, دار المعرفة, بيروت,٢٠٠٥, ص ١٨١.

(١١٠) السلمي: طبقات, ص ٤٧٥.

(١١١) ابن خميس: مناقب, ج٢,ص ١٩٢.

له پشت ئەو مانا سۆفییە دیارەی دەقەکە لەخۆی گرتووە و دەشێ لە سنووری هزری سۆفیگەریدا مانا ببەخشێ، رووبەکی تری هەیە رێك هاوشێوەی ئەو تێگەیشتنەیە کە شیعە لە بارەی پێگەی ئیمام و سنووری ئەو زانینەی پێی دراوە هەیەتی، ئەوان باوەڕیان وایە پێشەواکان تایبەتکراون بە زانینێکی خودایی کە مرۆڤە ئاساییەکان شتێکی لێ نازانن(١١٢).

لەلایەکی ترەوە هەر لە هزری شیعەی ئیمامیدا نازناوی "وەلی" تەنها بۆ دوانزە پێشەواکە بەکاردەهێنرێ، بۆیە ئەگەر ئەو دینەوەرییە لەنێو چەمکە سۆفییەکانەوە شیعییانە بیردەکاتەوە، ئەوا مەبەستیەتی جەخت لەسەر ئەو پێگە بێ هاوتایەی پێشەوا بکاتەوە، تەنانەت بیخاتە ریزی پێغەمبەرانەوە، بەمەش جارێکی تر گەڕاوەتەوە بۆ سەر بۆچوونە شیعییەکان لەبارەی پێگەی پێشەوا وەك میراتگری رۆحانی پێغەمبەرێتی(١١٣). بێگومان مەغزای ئەو بەسەرهاتەی سەرچاوە شیعییەکان دەیگێڕنەوە و تێیدا ئەبولعەباس کارەکتەرێکی چالاکە لەپاڵ "ئیمامی مەهدی – الإمام المهدی"، باوەڕبوونە بەو زانینە غەیبانییەی پێشەوا ئەکەسانی دی جوێ دەکاتەوە. هەروەها دەریدەخات چەندە سۆفیبوون دەشێ رەنگدانەوەی زەمینە شەریعەتییەکە بێت. ئەوە نەبێ سۆفی دەخوازێ لە چوارچێوەی بەرهەمهێنانی حەقیقەتەوە گوزارشت لەو زەمینەیە بکات نەك بە پێچەوانە، لە بەشەکانی تردا لە چەندان شوێن دێینەوە سەر ئەو پەیوەندییە.

### ٢- کورد و هزری عیرفانیی ئیسماعیلییەکان:

ئیسماعیلییەکان، وەك گروپێکی ناوداری شیعە، کاریان بۆ چەسپاندنی لێکدانەوەی باطنی ئایین دەکرد، ئەمەش لە رێگەی سیستەمێکی وردی بانگەوازکردنەوە لە پێناو رازیکردنی زۆرترین خەڵك بە جیهانبینی ئایینیانەوە.

پەیوەندیی کوردان بە بانگەوازی ئەم رەوتە دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتاکانی سەرهەڵدانی بانگەوازەکە. مەیمونی کوڕی دەیصانی قەدداح، وەك یەکێك لە یەکەمین بانگەوازکارانی ئیسماعیلی کە لە نیوەی یەکەمی سەدەی دووەمی کۆچی/ هەشتەمی زایینی ژیاوە، ماوەیەك

---

(١١٢) هەر بۆ نموونە بڕوانە: ابن شهراشوب: مناقب آل ابي طالب, منشور ضمن: الأمام و الأمامة عند الشيعة, اعداد و تحقيق: يوسف ايبش, دار الحمراء, بيروت, ٢٠٠٣, ص٥٧-٥٨.

(١١٣) بۆ درێژەی ئەو بۆچوونەی شیعە بڕوانە: هنري كوربان: عن الإسلام, ص ص٢٩١-٢٩٣.

له هەرێمی چیا و خوراساندا سووڕاوەتەوە و بانگەشەی خەڵکی بۆ سەر باوەڕەکەی کردووە[114]، پێدەچێ ناکامی ئەم کارەی ئەو و بانگەوازکارانی تری ئیسماعیلی قەبولکردنی ڕەوتەکە بووبێ لەلایەن هەندێك لە کوردانی هەرێمی چیا[115]، بەجۆرێك کە دەتوانین بڵێین ئەو کوردانە یەکەمین گروپێکن پەیڕەوییان لەو ڕێبازە نوێیە کردبێ.

لەوەدەچێ چالاکی بانگەوازکارە یەکەمینەکانی ئیسماعیلی هەر بەو هەرێمە نەوەستابێ، بەڵکو هەرێمی ئازربێجانیشی گرتۆتەوە[116]، بەهەمان شێوە لە هەرێمی جەزیرەشدا بانگەوازکارانیان هەبووە[117]. بەڵام زێتر چالاکیان لە هەرێمی چیا چڕ بۆتەوە کە وەك تازە گوتمان زەمینەیەکی کۆمەڵایەتیشی لەنێو کوردانی ئەوێ بۆ خۆی چێ کردووە، سەرچاوەکانیش ئاماژە بۆ بزاوتی بەرچاوی ئەوان - لەم قۆناغە و دواتر- لە هەردوو شاری سەرەکی ئەوێ هەمەدان و نەهاوەند[118] دەکەن[119].

ئەو ڕاستییە مێژووییانە وامان لێ دەکات پرسیار لە چۆنییەتی قەبولکردنی ئەو کوردانە بۆ باوەڕی ئیسماعیلی بکەین، یان با بڵێین ئەوە چییە وادەکات لەو زەمینە کوردیەدا پێشوازی لەو شێوەی ئیسلام بکرێ؟ دەشێ وەڵامی پرسیارەکە، بەر لەهەموو شتێك، بە چۆنییەتی بانگەوازی ئیسماعیلییەوە ببەستینەوە و لەوێوەش پەیوەندیی بە دیاردەی سۆفیگەرییەوە ببینین، شێوازێك کە لەلایەك لە چوارچێوەی ڕێکخستنێکی نهێنی ورد دەکرا، لەلایەکی ترەوە

(١١٤) الديلمي: بيان مذهب الباطنية و بطلانه - منقول من كتاب قواعد عقائد آل محمد, عنى بتصحيحه: ر. شتروطمان, ط٢ , مكتبة المعارف, الرياض, ١٩٨٢, ص٢٠.

(١١٥) البغدادي: الفرق بين الفرق, تحقيق: لجنة إحياء التراث العربي, دار الجيل و الآفاق الجديدة, بيروت, ١٩٨٧, ص٢٦٦. الأسفراييني: التبصير, ص١٤١.

(١١٦) ابن النديم: الفهرست, ص٢٨٠ , ٢٨٣.

(١١٧) ابن النديم: الفهرست, ص ٢٨٣.

(١١٨) دواتر باس لەو شارانە دەکەینەوە.

(١١٩) بڕوانە: ابن العمراني: الأنباء في تاريخ الخلفاء, تحقيق: قاسم السامرائي, لايدن, ١٩٧٣, ص٢٠٤. ابن الجوزي: المنتظم في تاريخ الملوك و الأمم, دراسة و تحقيق: محمد عبد القادر عطا و مصطفى عبد القادر عطا, دار الكتب العلمية, بيروت, ١٩٩٢, ج١٥, ص٤٣. بنيامين التطيلي: رحلة بنيامين, ت: عزرا حداد, المطبعة الشرقية, بغداد, ١٩٤٥, ص١٥٣.

لەوەدەچێ — وەك هەنگاوی دوای نهێنیبوون- بۆ ئاسانكاری خۆیان و بەر لە هەر هەوڵێكی بانگەوازكردن، خوێندنەوەیەكی باشی تێگەیشتنی ئایینی خەڵكیشیان كردبێ، ئەوەتا هەر مەیمونی كوڕی دەیصانی قەدداح — بەپێی وتەی دەیلەمی مێژوونوس (م٧١١ك/ ١٣١١ز ) - لەكاتی بانگەوازیدا لە هەرێمی چیا و خوراسان: ((جل و بەرگی سۆفییانی پۆشیبوو)) و واینیشاندەدا ئەو كەسێكی سەروو ئاساییە[١٢٠].

دەشێ ئەم قسەیەی دەیلەمی، بەدەر لەو شێوە تۆمەتباركردنەی پێی دەدوێ، لەچەند روویەكەوە شرۆڤە بكەین، لەو رووەی كەوا ئاماژەیەكە بۆ قەبوڵكردنی حاڵەتی سۆفییانە لەو زەمینە كۆمەڵایەتییەی بانگەوازەكەی لێ دەكرێ، هەروەها لەو رووەی ئەم قەبوڵكردنە لەلایەن گروپە ئایینییە جیاكانەوە پەی پێ بردراوە و سوودی لێ وەرگیراوە بۆ دۆزینەوەی جێ پێیەك لەو شوێنانەدا، دواجاریش لە رووی ئەوەی ئەو تێكەڵییە دەخاتە روو كە لەنێوان باوەڕی شیعەی ئیسماعیلی لەگەڵ سۆفیگەریی ئیسلامیدا هەیە، خۆ گروپێك لەو كەسانەی ئیسماعیلییەكان بۆ خۆیانیان راكێشاون كەسانی تەركە دونیا و خودا پەرست بوون[١٢١].

لەگەڵ ئەوەشدا سەرچاوەكان شتێكی ئەوتۆمان لەسەر پەیوەندی راستەوخۆی نێوان باوەڕی ئیسماعیلی و سۆفیگەری لەو ناوچانە پێ ناڵێن، ئەمە لە كاتێكدا لەهەمان قۆناغی چالاكبوونی ئیسماعیلییەكان، لە شارەكانی نەهاوەند و هەمەدان، گەشەسەندنێكی بەرچاوی هزری سۆفیگەری لەهەردوو شاردا هەیە بەتایبەت هەمەدان، كە دەبێتە بنكەیەكی سەرەكی دامەزراندنی فۆرمێكی ئەو هزرە و هێندێك لەو چەمكانەی كاری پێ دەكات لە كولتووری ئیسماعیلییدا ئامادەیی هەیە. خۆ ئیسماعیلییەكانیش لەم قۆناغەی دەركەوتنیاندا بەرجەستەكاری عیرفانیی شیعی بوون، بەتایبەت لە خستنەڕووی تیژی رووخساری خودایانەی ئیمامەت، هەروەها باوەڕبوون بە حەقیقەتی باطنی[١٢٢]. كاتێكیش، وەك دواتر دەبینین[١٢٣]، ئەم تێزە ئایینیانە و هاوشێوەیان لەلای سۆفییانی شار و ناوچەكە قسەی لەسەر دەكرێ و

---

(١٢٠) بیان،ص٢٠.

(١٢١) الدیلمي: بیان, ص١٩.

(122)Henry corbin: History of Islamic Philosophy, Translated by: Liadain sherrard with the assistance of philip sherrard, Kegan Paul international, London and New York, pp.74-75.

(١٢٣) بڕوانە بەشی چوارەمی ئەم توێژینەوەیە.

بابەتی هزریی لێ دەکەوێتەوە، ئەوکات دەبێ دەروازەی "کاریگەریی و کارلێکردن" بە ئاوەڵایی بهێڵینەوە، ئەگەرچی کارکردنی نهێنییانەی ئیسماعیلییەکان و بە پیرۆزکردنی پاراستنی نهێنییەکان، لەمپەرێکی گەورەن لەبەردەم بینینی راست و دروستی پەیوەندییەکان.

بەڵام دواجار نابێ زێدەڕۆیی بکەین لە دەستنیشانکردنی قەبارەی باوەڕی ئیسماعیلی لە زەمینەی کوردیدا، رەنگە سنووردابوونی چالاکیان لە قۆناغەکانی دواتر بە ناوچە چیاییەکان[١٢٤]، پاڵپشتی ئەو بۆچوونە بکات. لە سەرەتاشدا، لەبەر ئەوەی ئەوان لە چوارچێوەی رێکخستنێکی نهێنی – شۆرشگێڕانە کاریان دەکرد و بانگەوازەکەیان لەسەر دژایەتی کردنی رژێمی سوننەگەرای عەبباسی و زانا ئایینییەکانی و بەڵێندان بە هێنانەدی دادپەروەری لەژێر سایەی حوکمی ئیمامی ئیسماعیلی دامەزرابوو[١٢٥]، بۆیە چاوەڕێی ئەوە ناکرێ دەسەڵاتدارانی عەبباسی و لایەنگرانیان لە کوردستاندا لە هەمبەر چالاکییەکی هەستپێکراوی ئەم گروپە بێدەنگ بووبن[١٢٦]. بۆیە ئەگەر پاشماوەیەکیان بمێنێ ئەوا بێگومان لەو ناوچە چیاییە سەختانە دەبێت کە دەستی دەسەڵاتدارانی پێ ناگات.

دوورکەوتنەوەی ئەوان و نادیاری چارەنوسییان، توێژەرانی خستۆتە بەردەم کاری گەڕان بەدوای پاشماوەیان لە زەمینەی کوردیدا، رەنگە دیارترین توێژەرێکیش لەم بوارەدا کاری کردبێ، پسپۆڕی بواری لێکۆڵینەوە ئیسماعیلییەکان "و.ئیڤانۆڤا – W.Ivanow" بێت، ئەو پێی وابوو پاشماوەی ئەو ئیسماعیلییانە هەمان ئەو گروپە ئایینییەن کە ئەمڕۆ پێیان دەگوترێ (ئەهلی هەق – کاکەیی)[١٢٧]، ئەو توێژەرە وای بۆ دەچێ دەرکەوتە عیرفانییەکانی ئەم سێکتە ئایینییە لە زۆر رووەدا هاوشێوەی تێگەیشتنی ئیسماعیلییەکانە بەتایبەت رەهەندی خودایی پێشەوا و ئەوان لەهەمان ئەو شوێنەشدان کە پێشتر گۆڕەپانی چالاکی ئیسماعیلی بووە،

---

(١٢٤) الحنبلي: شذرات الذهب في اخبار من ذهب, حققه: عبد القادر الأرنؤوط و محمود الأرنؤوط, دار ابن كثير, دمشق, ١٤٠٦ك, ج٣, ص٤٠٠.

(١٢٥) فرهاد دفتري: الإسماعيليون في مجتمعات العصر الوسيط الإسلامية, ت: سيف الدين القصير, دار الساقي, بيروت, ٢٠٠٨, ص٣٧, ٤٣.

(126) الديلمي: بيان, ص٢٠.

(١٢٧) پیرەوانی راستی - یارانی کوردستان ((ئەهلی هەق)), وەرگێڕانی: ئاسۆ کەریم, وەزارەتی رۆشنبیری, هەولێر, ٢٠٠٣, ل١٠٥.

تەنانەت ناوی "ئەهلی هەق"یش پێشتر ئیسماعیلییەکان لە خۆیان ناوە[128]. ئەگەرچی توێژەری تر هەن لە ئێستادا ئەو بۆچوونەی ئیڤانۆڤا بەتەواوی وەرناگرن و پێیان وایە بەڵگەی تەواو لەسەر ئەو بەردەوامییە مێژووییە و پەیوەندییە تەواوکارییە نییە[129]، بەڵام ئەو لێکچوونەی لە نێوان هەردوو سیستەمی کولتووریدا هەیە، ئەگەری هەبوونی رەگەزی ئیسماعیلی لە باوەڕی عیرفانییانەی ئەهلی هەق بە زیندوویی دەهێڵێتەوە، رەنگە ئەگەر لە داهاتوودا توێژینەوە لەسەر ئەو بابەتە بکرێ بەپێی میتۆدی بەراوردکاریی خوێندنەوەی مێژووی بیروباوەڕە ئایینییەکان، رەهەندەکانی ئەو کاریگەرییەمان روونتر بۆ دەربکەوێ.

## ٣- کورد و زوهدی میللیی "قەرمەتییەکان – القرامطة"

بەگەڕانەوە بۆ ئەو ماوە مێژووییەی پێشتر دەستنیشانمان کرد، ئەو پارچەپارچەییەی زۆر لە رەوتە ئایینییەکانی تێکەوتبوو، ئیسماعیلییەکانیشی گرتۆتەوە، بەتایبەت لە کۆتاییەکانی سەدەی سێیەمی کۆچی، کاتێك لەهەناوی ئەواندا بزاڤی "قەرمەتییەکان – القرامطة" لەدایك بوو[130]، کە زێتر خۆی وەك بزاڤێکی کۆمەڵایەتی – ئایینی نیشانداوە، دەیویست چارەسەری ئەو نابەرابەرییە کۆمەڵایەتییەی لە پانتایی ئیسلامیدا هەبوو، لە دووتوێی باوەڕێکی ئایینی و لە رێگەی رێکخستنێکی وردەوە بکات.

هەربۆیە ئاساییە ئەگەر ئەو گرۆ و میللەتانەی خۆیان لەبەردەم نابەرابەرییەکەدا دەبینییەوە، هەوڵبدەن لەنێو بزاڤی ئاوادا جێگەیەك بۆ خۆیان بدۆزنەوە، یەکێك لەو میللەتانەش کوردەکان بوون، کە لەوە دەچێ هەر لەسەرەتاوە بەشێکی بنەڕەتی بونیادی کۆمەڵایەتی بزووتنەوەکەیان پێکهێنابێت، ئەمە بەڕوونی لە قسەی مێژوونوس ئیبن جەوزی(م ٥٩٧ك/١٢٠٠) دەردەکەوێ کە لە دیدێکی شکاندنەوە و بەکەم تەماشاکردنەوە دەڵێ: ((پەیڕەوکارانیان چەند جۆرێکن، لەوانە گروپێك کە تووشی لاوازی عەقڵی ببوون و کورتبینی

---

(١٢٨) پیترەوانی راستی، ل٦٧.

(١٢٩) ژان دورینگ: موسیقی و عرفان - سنت شیعی اهل حق، ترجمە: سودابە فضائلي، نشر پرسش، تهران، ١٣٧٨، ص٤٣.

(١٣٠) لەبارەی چۆنیەتی پارچە بوونی ئیسماعیلییەکانەوە بگەڕێوە بۆ: فرهاد دفتري: الإسماعيليون، ص ص٦١- ٧٩.

و گێلی و نەفامی بەسەریاندا زاڵ بوو و هیچ شتێکیان لە زانستەکان نەدەزانی، وەك خەڵکی رەشەخاك - السواد( خوارووی عێراقی ئێستا) و کوردەکان))[131]. لەپاڵ ئەمەدا دەقی مێژوویی ترمان هەن روونی دەکەنەوە ئەو بەشدارییەی کوردان هەر لە ئاستی میللی نەماوەتەوە، بەڵکو بۆ ئاستی سەرکردایەتی سوپای بزووتنەوەکە و سەرپەرشتی کردنی پەڕیوەتەوە، بەتایبەت لە وڵاتی شام، کە سەرکردەی سوپای قەرمەتییەکانی ئەوێ، لە ساڵی (٢٩٠ك/٩٠٣ز) جەعفەری کوڕی حەمیدی کوردی بووە[132]، ئەمە لە کاتێکدا - بە پێی پەیکەری ڕێکخراوەیی بزاڤەکە - بوون بە قەرمەتی و هەڵگرتنی ئەم ناسنامەیە پێویستی بە بڕینی چەند پلەیەکی رۆحانی هەبوو و پرۆسەیەکی ورد و تاڕادەیەك درێژ خایەن بووە[133].

هەر چۆنێك بێت رەنگە نەتوانین بە تەواوی پەیوەندیی ڕاستەوخۆی باوەڕی ئەو گرۆیە بە هزری سۆفیگەری لە کوردستاندا دەستنیشان بکەین، مەگەر بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ ئەو پەیوەندییە هەبووبێ، وەك دواتر روونی دەکەینەوە. بەڵام دەتوانین بڵێین بەشداری ئەو کوردانە لە بزووتنەوەی قەرمەتییەکان، ئەوانی خستۆتە بەردەم جیهانبینییەکی ئایینییەوە کە دەشێ خاڵی پەیوەندیی بێت لەنێوان دیاردەی ئایین و تێگەیشتنی کوردان لێی، لەگەڵ ئەو جیهانبینییەی سۆفیگەریی ئیسلامی کاری پێ دەکرد و لە زەمینەی کۆمەڵایەتیدا جێگەی دەبۆوە. دیارە لێرە مەبەستمان زوهدگەراییە، کە یەکێك لەو بنەما سەرەکییانەی هەر لە دەستپێکەوە لە جیهانبینی ئایینی قەرمەتیدا ئامادەیە، ئەوەتا دامەزرێنەری بزاوتەکە حەمدان قەرمط، لەپاڵ خوداپەرستی زۆرەوە، وەك زاهید و تەرکە دونیایەك خۆی نیشان دەدا[134]، تەنانەت هەر ئیبن جەوزی ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کەوا یەکێك لە ئامرازە بنەڕەتییەکانی قەرمەتییەکان بۆ ڕاکێشانی خەڵك بۆ سەر باوەڕەکەیان نیشاندانی پاکێتی و دەستگیری و دوورکەوتنەوە لە شەهوەت و ئارەزووەکان بوو[135].

---

(١٣١) المنتظم, ج١٢, ص٢٩٧-٢٩٨.

(١٣٢) الطبري: تاريخ الأمم و الملوك, راجعه و قدم له: نواف الجراح, ط ٣, دار صادر, بيروت, ٢٠٠٨, مج٦, ص٢١٧٦. بۆ وردەکاریی زیاتریش لەبارەی پەیوەندیی کورد و قەرمەتییەکان بڕوانە: زرار صديق توفيق: الكورد, ص ص ٩٠-٩٢.

(١٣٣) عارف تامر: القرامطة, دار القلم, القاهرة, ٢٠٠٤, ص٣٤.

(١٣٤) الطبري: تاريخ, مج٦,ص٢١٤٥. ابن الجوزي: المنتظم,ج١٢,ص٢٩١.

(١٣٥) المنتظم, ج ١٢, ص٢٩٣.

پەیوەستبوونی ئەو کوردانە بەم جیهانبینییە، سەرباری ئەوەی وەك پەرچەکردارێکی خراپی ئاستی بژێوی خەڵکەکە بوو[١٣٦]، رەهەندێکی ئایینیش بەو ئاستەی بژێوە دەبەخشێ کە زوهدگەراییە، ئەگەرچی — وەك پێشتر بینیمان — بنەماکانی بریتی دەبن لە خۆڕاهێنان لەسەر برسێتی و وازهێنان لە شەهوەت و چێژەکانی ژیان، لە هەمانکاتدا جۆرێکە لە خۆڕازیکردن بە پاساوە ئایینییەکەی هەژاریی وەك نەخۆشییەکی کۆمەڵایەتی، ئەمە یەکێکە لەو بابەتانەی هزری ئایینی ئەو گرۆیە باسی دەکات[١٣٧]. هەر بۆیە ئەگەر پاشان ئەو خوێندنەوەیەی هەژاریی لە گوتاری سۆفیگەریدا بەرجەستە دەبێ و سۆفییان بە وتە و بە کردار گوزارشتی لێ دەکەن، ئەوا لەو زەمینە کۆمەڵایەتییەدا نەك هەر بە دەرچوون لە رەوشی ئاسایی لەقەڵەم نادرێت، بەڵکو رێگەشی بۆ خۆشکراوە و لە سیستەمی کولتووری خەڵکەکەدا بە پرۆسەی پیرۆزکردن تێدەپەڕێ.

دواجار دەبێ ئاماژە بەوە بکەین بەشداری کوردان لەو بزوتنەوەیە گشتگیر نەبووە، رەنگە ئەمەش لەبەر پەرگیری و توندوتیژی بزوتنەوەکە بێت کە هەندێ ناوچەی کوردیشی کەوتۆتە بەری، وەك لە هەرێمی جەزیرە، بەتایبەت لە شارەکانی نصێبین و سنجاردا[١٣٨]، لەلایەکی ترەوە لەوە ناچێ قەرمەتییەکان خۆیان گرنگییەکی زۆریان بە پانتایی کوردی دابێ، بە بەڵگەی ئەوەی باسی هیچ بانگەوازکارێکیان لەوێ نییە بە پێچەوانەی شوێنەکانی تر[١٣٩]. رەنگە ئەمەش پەیوەندیی بە دوورکەوتنەوەی سەنتەری چالاکیان بێت، بە تایبەت دوای شکستیان لە هەرێمی عێراق و وڵاتی شام و پاشەکشەکردنیان رووەو وڵاتی بەحرێن، لەوێدا بزووتنەوەکە

---

(١٣٦) محمود إسماعيل: الحركات السرية في الإسلام, دار القلم, بيروت, ١٩٧٣, ص ١١٥.

(١٣٧) الأشعري: مقالات الإسلاميين و اختلاف المصلين, قدم له: نعيم زرزور, المكتبة العصرية, صيدا - بيروت, ٢٠٠٨, ج٢, ص٤٥.

(١٣٨) النويري: نهاية الأرب في فنون الأدب, الجزء الخاص بالقرامطة منشور ضمن كتاب: أخبار القرامطة, دراسة و تحقيق: سهيل زكار, دار الكوثر, الرياض, ١٩٨٩, ص٥٠٠.

(١٣٩) الديلمي: بيان, ص٢١.

پەرِیوەتەوە قۆناغی حوکمرانیکردن[١٤٠]، ئەمەش وادەکات چیدی باسێك نەمێنێ لەبارەی پەیوەندی کورد و گروپەکە و کاریگەریی باوەڕیانەی لەم زەمینەیەدا.

دواجار دەبێ ئاماژە بۆ ئەوەبکەین کە جگە لەو رەوتانەی شیعە، رەوتێکی تریش لەنێو کوردان و لە ولاتەکەیاندا لەم قۆناغەدا برەوی سەندووە و پەیڕەوکاری بۆ خۆی پەیدا کردووە، ئەویش "شیعەی زەیدی – الشیعة الزیدیة"یە، کە لە نێو کوردەکانی ناوچەی شارەزوور، بەتایبەت شاری پیر، بلاوبۆتەوە[١٤١]، بەهەمان شێوە پەیڕەوکارانی ئەم رێبازە لە شاری هەمەدانیش هەبوون[١٤٢] ئەم گروپە هەمان ئەو رۆحە یاخییەیان هەبوو کە لەلای خەواریجەکان هەبوو و بەسەر تێگەیشتنی ئایینی و ژیانی رۆحانیاندا زالە، هەروەها ئەوان زێتر مەیلیان بەلای عەقلانییەتی موعتەزیلەوە بوو[١٤٣]، ئەمەش سنوورێکی داناوە بۆ گەشەسەندنی سۆفیگەری لە نێوانیاندا، هەرچەندە لە قۆناغە درنگەکانی مێژوویاندا دەرکەوتەی سۆفییانەیان هەبووە[١٤٤] بەلام ئەو دەرکەوتەیە لە ناوەندی کوردیدا نادیارە.

هەرچۆنێك بێت واینابینین کوردە زەیدییەکان توانیبێتیان سنووری باوەڕەکەیان فراوانبکەن، بەلکو بە پێچەوانەوە کەوتوونەتە بەر دەمارگیری ئایینی خەلکی سەر بە رەوتەکانی تر، ئەوەتا هەر لە شارەزوور لەسەر دەستی کوردەکانی ترەوە، رەنگە زێتر سوننەکانی ئەوێ، دووچاری کوشتن و سووتان و تالان بوونەتەوە[١٤٥]، بۆیە لەوەناچێ چیدی لەوێدا پاشماوەیەکی ئەوتۆیان مابێتەوە، کە کاریگەریی بەسەر رەوشی ئایینی جڤاکی کوردیدا هەبووبێ.

---

(١٤٠) بۆ درێژەی ئەم بابەتە بگەڕێوە بۆ: ثابت بن قرة الصابي: أخبار القرامطة, حققه: سهيل زكار, دار المعرفة, بيروت, ٢٠, ص ص ٢٣-٤٥.

(١٤١) مسعر بن مهلهل: الرسالة الثانية, اعتنى بنشرها: و. مينورسكي, مطبعة جامعة القاهرة, القاهرة, ١٩٥٥, ص ١١

(١٤٢) الديلمي: بيان, ص٨٤.

(١٤٣) لەبارەی کاریگەریی موعتەزیلە لەسەر شیعەی زەیدی بڕوانە: عبداللطيف بن عبدالقادر الحفظي: تأثير المعتزلة في الخوارج و الشيعة, دار الأندلس, جدة, ٢٠, ص ص٤٠١-٤٥٩.

(١٤٤) الشيبي: الصلة, ص١٧٤-١٧٦

(١٤٥) مسعر بن مهلهل: الرسالة, ص١١ هەروەها بڕوانە: حسام الدين النقشبندي: الرسالة الثانية لمسعر بن مهلهل و شهرزور, مجلة" زانكۆی سلێمانی", السليمانية, ٢٠٠١, العدد(٨), ص٢٢٠-٢٢١.

## سێیەم: ڕەوتی سوننی و سنووره شەرعییەکانی سۆفیگەری لە کوردستاندا

ئەگەر بمانەوێ لە پێگەی مێژوویی ڕەوتی سوننەگەرا لە نێو کورداندا بدوێین، دەبێ جەخت لەسەر گەشەسەندن و شێوەگرتنی ڕێبازەکانی ئەم ڕەوتە بکەینەوە، ڕەنگە ئەمەش زۆر لە بابەتەکەمان دوور بخاتەوە، بۆیە زیاتر ئەو ڕەگەزانەی ڕەوتی سوننە دەخەینەڕوو کە لە کوردستاندا جێکەوتەی هەبووە، بەتایبەت لە بواری گەشەسەندنی هزری ئایینیدا. ڕەنگە ڕەگەزی هەرە بنەڕەتی کە ئەو ڕەوتەی پێ بناسرێتەوە بەتایبەت لە قۆناغی دەرکەوتنیدا پشتبەستنە بە فەرموودەکانی پێغەمبەر وەك سەرچاوەیەکی بنەڕەتی شەریعەت. لەم خاڵەشدا دەردەکەوێ کوردەکان – کەم تا زۆر – بەشداریان لە بەرهەمهێنانیدا کردووە، بە تایبەت بنەماڵەی ئەو کوردانەی لە زوویەکەوە تێکەڵ بە کۆمەڵی عەرەبی – ئیسلامی بوون، زێتریش بەپێی سیستەمی "موالات"[١٤٦]؛ لەوێدا دەبینین کەسانێك لەنێویاندا دەردەکەون، بەکاریگەریی ئەو ناوەندە باوەڕدەهێنن و پابەندی تێگە باوەڕیی – هزریەکانی ئەم ڕەوتە ئایینییەن.

کتێبەکانی تایبەت بە فەرموودە ناوی چەندان کەسێتی کوردمان پێ دەڵێن لەدەستە سەرەتاییەکانی گێڕەرەوەی فەرموودەن و بەڵگەی روونن لەسەر ئەو بۆچوونەمان، هەر بۆ نموونە: مەیمون ئەبو بەصیری کوردی کە مەولای عەبدوڵڵای کوڕی عامر بووە[١٤٧]، عومەری کوڕی ئیبراهیمی کوردی مەولای بەنی هاشم[١٤٨]، ناصحی کوڕی عومەری کوردی مەولای

---

(١٤٦) سیستەمێك کە موسڵمانە غەیرە عەرەبەکانی بە خێڵە عەرەبییەکان دەبەستەوە و وەك ئەندامی دووەمی خێڵ مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرا, بەهاتنی عەرەبە موسڵمانەکان, غەیرە عەرەبەکان بۆ پاراستنی پێگەی نابوری- کۆمەڵایەتی خۆیان لە زەمینەی نوێدا کاریان پێ کردووە. کلود کاهن: قبایل, شهرها و سازمانبندی اجتماعی, در: تاریخ ایران از فروپاشی دولت ساسانیان تا آمدن سلجوقیان, گرد آورنده: ر.ن.فرای, مترجم: حسن انوشه, مؤسسة انتشارات امیر کبیر, تهران, ١٣٧٩ه.ش, ص٢٦٥.

(١٤٧) يحيى بن معين: تاريخ يحيى بن معين(رواية الدوري), حققه: احمد محمد نور سيف, مركز البحث العلمي, مكة المكرمة, ١٩٧٩, ج٤, ص٣٣٠. التميمي: الجرح و التعديل, دار احياء التراث العربي, بيروت, ١٩٥٢, ج٨, ص٢٣٨.

(١٤٨) ابن الجوزي: الضعفاء و المتروكين, دار الكتب العلمية, بيروت, ١٤٠٦ه, ج٢, ص٢٠٤. الذهبي: المغني في الضعفاء, حققه: نورالدين عتر, دار احياء التراث الإسلامي, قطر, ١٩٨٧, ج٢, ص٤٦٢.

ئیبراهیمی کوڕی سلیمان[149]، عومەری کوڕی ئەبو حەکیمی کوردی مەولای بنەماڵەی زوبێر یاخود ئەزدییەکان[150]و چەندانی کەسایەتی تری کورد و غەیرە کورد لە خەڵکی وڵاتەکە ناویان دەهێنرێ[151]، کە کەم تا زۆر ڕۆڵیان لەبەرهەمهێنان و داڕشتنی گوتاری ئایینی ئەم ڕەوتە هەبووە، هەروەها هاوکاریش بوونە لە جێبەجێکردنی پرۆسەی موسڵمانبوون لە پانتاییەکە بەگشتی و داڕشتنی بناغەی یادەوەرییەکی ئایینی – ئیسلامییانە، کە خەڵکی ئەوێی بەو سیستەمە کولتوورییە پەیوەست دەکرد و ئەو ناسنامە ئایینییەیان بەسەردا زاڵ دەبوو.

کۆکردنەوە و گێڕانەوەی فەرموودە مەزهەبی ئایینی سەربەخۆی لێ کەوتۆتەوە کە زێتر بە مەزهەبی "ئەهلی فەرموودە - اهل الحديث" دەناسرێن، ڕەنگە دیارترین مەزهەبێکیش لەو قۆناغەی باسی دەکەین کە هەم کاریگەریی بەسەر ڕەوشی فیقهی و هەمیش بەسەر هزری سۆفیگەرییەوە لە کوردستاندا دیارە مەزهەبی سوفیانی ثوری(م ١٦١ك/٧٧٨ز) بێت. بە داخەوە زانیاری ئەوتۆمان لەسەر چۆنییەتی بڵاوبوونەوەی مەزهەبەکە لە ناوەندی کوردیدا نییە، تەنیا ئەوەندە دەزانین کە دوای خۆی مەزهەبەکەی زۆر تەشەنە دەکات بە تایبەت لە ڕۆژئاوای هەرێمی چیا، بە پلەی یەکەمیش لە شاری دینەوەر[152]، کە دەبێتە بنکەی هەرە سەرەکی مەزهەبەکە لە ڕۆژهەڵاتی جیهانی ئیسلامیدا[153]، هەروەها شاری هەمەدانیش کاریگەر دەبێ بە مەزهەبی ئەهلی فەرموودە بەگشتی[154].

---

(١٤٩) ابن الجوزي: الضعفاء, ج٢, ص١٥٥.

(١٥٠) ابن حجر: تقريب التهذيب, تحقيق: محمد عوامة, دار الرشيد, دمشق,١٩٨٦, ص٤٢٠.

(١٥١) هەر بۆ نموونە بڕوانە: ابن سعد: الطبقات الكبرى, حققه: احسان عباس, دار بيروت للطباعة والنشر, بيروت, ١٩٨٠, ج٥, ص. الجياني: القاب الصحابة و التابعين. تحقيق: محمد زينهم و محمود نصار, دار الفضيلة, القاهرة, ١٩٩٤, ص٨٥.

(١٥٢) المقدسي: احسن التقاسيم, ص ٢٩٦.

(١٥٣) السمعاني: الأنساب, تقديم و تعليق: عبدالله عمر البارودي, دار الجنان, بيروت, ١٩٨٨, ج١, ص٥١٨.

(١٥٤) المقدسي: احسن التقاسيم, ص٢٩٦.

هەرچۆنێك بێت رەنگە هۆكارێكی بڵاوبوونەوەی مەزهەبی "سوفیانی" لەوەدابێ كەوا جۆرێك لە ناوەندگیری پێوە دیارە لە نێوان ئەهلی فەرموودە و ئەهلی راوبۆچوون، هەر بۆیە نە هەردوو قوتابخانەدا پێگەی خۆی هەیە[١٥٥]، ئەمەش رێگە خۆشكەرە بۆ تەشەنەكردنی مەزهەبەكە، خۆ گرنگی ئەو ناوەندگیرییە زێتر دەردەكەوێ كاتێك دەبینین دامەزرێنەری مەزهەبەكە مەیلی بەلای كۆكردنەوەی تێگەیشتنی باوەڕییانەی شیعییە لەگەڵ رەوتی "ئەهلی سوننەت و جەماعەت"، ئەو خۆی لە ماوەیەكی ژیانیدا مەیلی بەلای شیعەكان هەبووە، بەتایبەت شیعەی زەیدی[١٥٦]، بەڵام دواتر دەستبەرداری دەبێت[١٥٧]، لەبەر ئەوەشە رێبازەكەی تێزی ئایینی هەردوو لای لەخۆی كۆكردۆتەوە، ئەمەش وادەكات لەو ناوچە كوردییانەدا گرفتێكی ئەوتۆی نەبێ بۆ بڵاوبوونەوە و تەشەنە كردن.

بەهەرحاڵ بڵاوبوونەوەی مەزهەبی سوفیانی لەو شارانەدا نەك هەر كاریگەریی هەبووە لەسەر دەركەوتەی سۆفیگەری، بەڵكو فاكتەرێكی بنەڕەتی بووە لە فراوانكردنی پانتایی ئەم هزرە و بوونی ئەم دوو شارە بە تایبەتی دینەوەر بە بنكەی سەرەكی سۆفیگەری لە تەواوی رۆژهەڵاتی جیهانی ئیسلامیدا، وەك دواتر بە درێژی باسی لێوە دەكەین[١٥٨]. رەنگە هۆكاری سەرەكی ئەمەش بگەڕێتەوە بۆ پێگەی باڵای سوفیان لە نێو هزری سۆفیگەری بەگشتی، چونكە چەند ئەو كەسایەتییە وەك فەقیهێك دەناسرێ، ئەوەندەش - رەنگە زێتریش - وەك زاهیدێك و دواتریش وەك كەسایەتییەكی زیندووی نێو گوتاری سۆفیگەریی ئیسلامیدا ناسراوە، ئەو خۆی ژیانێكی زاهیدانەی بەسەر بردووە و تەركەدونیایی و ترس و گریان و ئازاردانی جەستە لەڕێگەی زێدەڕۆیی لە خوداپەرستیی،

---

(١٥٥) سوسن فريد فلاحة: الإمام سفيان الثوري و آراؤه الفقهية مقارنة بالمذاهب الأخرى, الرياض, ١٤٢٨هـ/٢٠٠٧م, ص٩١.

(١٥٦) ابن قتيبة: المعارف, صححه و علق عليه: محمد اسماعيل عبدالله الصاوي, ط ٢, دار احياء التراث العربي, بيروت, ١٩٧٠, ص١٦٠. ابن النديم: الفهرست, ص ٢٦٧. هەروەها بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: الشيبي: الصلة, ص ص٤٠٠-٤٠٣.

(١٥٧) الذهبي: سير اعلام النبلاء, تحقيق: شعيب الأرنؤط و محمد نعيم العقرقوسي, ط ٣, مؤسسة الرسالة, بيروت, ١٩٨٦, ج٧, ص٢٥٣.

(١٥٨) بڕوانە ل٧٦-٩٦.

کردۆتە ناونیشانی ئەو ژیانە[١٥٩]، راستەوخۆش پەیوەندی لەگەڵ سۆفییە یەکەمینەکانی جیهانی ئیسلامی گرێداوە[١٦٠].

بۆیە دەبینین لەلای وی سنوورەکانی فیقھ و تەصەوف تێکەڵ بەیەکدی بوون، ئەو خۆی باوەڕی بەو تێکەڵییە هەبووە و وەك تێزێکی سەربەخۆ بەکاریهێناوە و بە ئاشکرا رایدەگەیەنێ فەقیهی سۆفی پلەیەکی باڵای هەیە و یەکێکە لە کەسە زێدە ئازیزەکان[١٦١]، هەر بۆیە ئاساییە مێژوونوسانی تایبەتمەند بە بواری سۆفیگەریی ئیسلامی وەك رەمزێکی نێو کایەکە قەبوڵی بکەن و بە ئاراستەی دەرخستنی رەهەندە زوهدیی — سۆفییەکانی کەسایەتییەکەی بیخوێننەوە[١٦٢].

بێگومان کۆکردنەوەی ئەم دوو کایەیە لە کەسێتی سوفیانی ثوری، لە پانتایی کوردیدا بەڕوونی رەنگی داوەتەوە، دەبینین فەقیهەکانی سەر بەو مەزھەبە لەوێ سۆفی یان لایەنی کەم زاھید بوون[١٦٣]، لای خۆشیانەوە هەندێك لە سۆفی و زاھیدەکانیش لە سەر مەزھەبەکە بوون[١٦٤]، بەمەش ئەو پەیوەندییە تەواوکارییەی باسمان کرد لەلای سۆفییەکانی ناوچەکە بەرجەستە دەبێ. لەلایەکی ترەوە ئەو جۆرە پەیوەندییە سنوورەکانی هزری سۆفیگەریش دەستنیشان دەکات تا بنەما باوەڕپێکراوە فیقهیەکان نەبەزێنی، وەك دواتر دەچینەوە سەر ئەو بابەتە. بەڵام دواجار مەزھەبی سوفیانی هەر وەك فاکتەرێکی زیندوو دەمێنێتەوە لە فراوانکردنی مەودای بوونە سۆفی و تا درەنگانێك، لایەنی کەم تا ناوەڕاستی سەدەی پێنجەمی کۆچی/ ناوەڕاستی سەدەی یانزەی زایینی، لە شارێکی وەك دینەوەردا پەیوەندییە تەواوکارییەکە هەر دەمێنێتەوە[١٦٥].

---

(١٥٩) ابن الجوزي: صفة الصفوة, ج٢, ص٢٣.

(١٦٠) ابونعيم: حلية, ج٦, ص٣٣٨, ٤٨٩.

(١٦١) القشيري: الرسالة, ص٢٦٠.

(١٦٢) ابو نعيم: حلية, ج٦, ص ص ٣٥٦-٣٩٣.

(١٦٣) ابن الأثير: اللباب في تهذيب الأنساب, مكتبة المثنى, بغداد, د.ت, ج١, ص٤٥.

(١٦٤) الذهبي: تاريخ الإسلام و وفيات المشاهير و الأعلام, حققه: عمر عبدالسلام تدمري, دار الكتاب العربي, بيروت, ١٩٨٧, ج٣, ص١٩٨.

(١٦٥) الذهبي: تاريخ الإسلام, ج٢٠, ص١٩٨.

لەڕاستیدا لەم قۆناغە مێژووییەدا زەمینەی بەرفرەبوونی ڕەوتی سوننە لەنێو کورداندا خۆش ببوو، بێگومان کۆمەڵێك هۆکار هەبوون لە پشت ئەو بەرفرەبوونە، هەندێکیان پەیوەندیان بە کوردەوە هەیە و هەندێکیش بە ڕەوشی گشتی جیهانی ئیسلامییەوە. سەبارەت بە کوردیشەوە، ئەوا زیاتر ڕۆڵی ئەوانە دەگرێتەوە کە پەیوەندییەکی دۆستانەیان لەگەڵ دەسەڵاتی ناوەندی هەبووە، سەرکردە و والی بوون لە دەزگا سەربازی و کارگێڕییەکانی دەوڵەتەوە بەتایبەت لەسەردەمی عەبباسیدا[١٦٦]، بۆیە قەبولکردنی ئیسلامی سوننی لەلای ئەم کەسایەتییانە، لەیەکێك لە ڕووەکانیدا، فەراهەمکردنی بەرژەوەندیی دونیایی بوو لە ڕێگای پاڵپشتی ئەم دەسەڵاتەوە.

وەك دەزانین لەلایەن دەسەڵاتی خەلافەتەوە نە ئامادەیی ئیسلامی خەواریجی و نە هی ئیسلامی شیعی بە ڕێباز و ڕەوتە جیاوازەکانیان لە وڵاتەکە قەبوڵ نەدەکران. سیستەمی خەلافەت تا ئەو قۆناغەی باسی لێوە دەکەین، ئەگەرچی بە کاریگەریی بزووتنەوە نەیارەکان زۆر لە هەژموونی سیاسی – ئایینی خۆی لەدەست دابوو، بەڵام هەر کاری بۆ ئەوە دەکرد لە جیهانی ئیسلامی بەگشتی ڕێبازێکی ئایینی ئەوتۆ لە ئارا بێ زامنی سەروەری باڵای سیاسی ئەو بکات لەسەر گرۆیە کۆمەڵایەتییە جیاوازەکاندا، بۆیەشە ئەستەمە ڕێگە بە فروانبوونی سنووری باوەڕییانەی ئەو دوو ڕەوتەی نەیار بە هەبوونی سیاسیانەی ئەو لەنێو کوردان و لە وڵاتەکەیاندا بدات، چونکە ڕەنگە ئەو هێڵەی پەیوەندیی و دانپیانانەی بەو سەروەرێتییەی ئەوەوە هەیە بپچڕێ، بەتایبەت لە شوێنێکدا کە ئەگەر دژە باوەڕییێت پڕ مەترسی دەبێت بۆ سەر دەسەڵاتی ناوەندی ، هەم لەبەر نزیکی لەناوەندی دەسەڵاتەکە و هەمیش لەبەر سەختی پێکهاتە جوگرافییەکەی، ئەمە سەرباری ئەو پێگە ئابورییەی بەشێکی بنەڕەتی لە داهاتی دەوڵەت پێکدەهێنا[١٦٧].

---

(١٦٦) بۆ زانیاری تەواو لەبارەی ئەو کەسایەتییانە و ڕۆڵیان بگەڕێوە بۆ: زرار صدیق توفیق: الكورد, ص ص ٥٢ – ٦٣.

(١٦٧) هەر بۆ نموونە – لەبارەی گرنگی پێگەی ئابوری کوردستان – بڕوانە: ابو یوسف: کتاب الخراج, منشور ضمن: في التراث الأقتصادي الأسلامي, دار الحداثة, بيروت, ١٩٩٠, ص ص٣٧٦-٣٨٠. ابن خرداذبة: المسالك و الممالك, حققه: محمد مخزوم, دار الكتاب العربي, القاهرة, ٢٠٠٧, ص ص٢٣-٢٦.

ئیدی ئەگەر دەوڵەتی عەبباسی لە قۆناغی لاوازبوونیدا ناتوانێ ڕێگریی بکات لە پاڵپشتی و باوەڕهێنانی بەشێکی کورد بە ئیسلامی خەواریجی و شیعی، ئەوا – لایەنی کەم – کاردەکات بۆ بەرفرە کردنی پانتایی دەرکەوتەی فەرمی و باوەڕپێکراوی ئیسلام کە ئیسلامی سوننەگەرایە بە ڕێبازە جیاوازیەکانییەوە. بێگومان ئەو هەوڵەی دەسەلاتی ناوەندی لەگەڵ خەلیفە "المتوكل"(٢٣٢-٢٤٧ك/٨٤٦-٨٦١ز)دەگاتە لوتکە، کاتێك مەزهەبی سوننەی کردە مەزهەبی فەرمی دەوڵەتی عەبباسی، وەك پەرچەکردارێك بەرامبەر بە زاڵبوونی هزری موعتەزیلە لە قۆناغی پێشتردا[١٦٨]، لەوەدەچێ لایەنێکی ئەو پەرچەکردارەی بریتی بووبێ لەوەی لەبری پرۆسەی بەعەقلانیکردنی ئایین، وەك پرۆژەی هەرە دیاری ئیعتیزال، پرۆسەی بە ڕۆحانیکردنی پیادەکردبێ، ئەمەش بە بەڵگەی ئەو ڕێژە زۆرەی لە ڕەمزە دیارەکانی سۆفیگەری دەگرت[١٦٩]، کە بێگومان کاریگەریی بەسەر پێشڤەچوونی هزری سۆفیگەری لەقەڵەمڕەوی خەلافەتدا هەبووە.

هەرچۆنێك بێت لە زەمینەی کوردیدا هاندەرێکی تر هەبووە بۆ برەوسەندن و دواتر چەسپینی ڕەوتی سوننەگەرا وەك باوەڕی زۆرینە، ئەویش ڕاستەوخۆ پەیوەندیی بە تایبەتمەندیی ڕەوتە ئایینییەکانی ترەوە هەبوو، بەتایبەت خەواریجی، چونکە ئەگەر – وەك پێشتریش گوتمان – ئامادەیی ئەم ڕەوتە بەربەست بووە لەبەردەم تەشەنەکردنی شیعەگەریدا، ئەوا کاتێك هەر لە ناوەڕاستی سەدەی سێیەمی کۆچی بەدواوە خەواریجەکان دووچاری شکستی سیاسی و ئایینی دەبنەوە و کوردە خەواریجەکان لە هەردوو ئاستی جەماوەریی و دەستەبژێردا دەست لەو باوەڕە هەڵدەگرن[١٧٠]، زەمینە بۆ بڵاوبوونەوەی خێرای ڕەوتی سوننی خۆشدەبێ، خۆ ڕەنگە ڕقی باوەڕیانەی خەواریجەکان بەرامبەر بە

---

(١٦٨) بۆ زانیاری لەسەر ئەو سیاسەتە بڕوانە:

Christopher Melchert: Religious Policies of the Caliphs from al-Mutawakkil to al-Muqtadir, A H 232-295/A D 847-908, Islamic Law and Society, Vol. 3, No. 3 (1996), pp. 320-330.

(١٦٩) السيوطي: تاريخ الخلفاء, حققه: محمد محي الدين عبد الحميد, مطبعة السعادة, القاهرة, ١٩٥٢, ص٣٥٠.

(١٧٠) ابن حوقل: صورة, ص٣٠٧. المسعودي: مروج, ج٣, ص١١٠.

ڕەمزە دیارەکانی شیعە – وەك پێشتر ئاماژەمان بۆ کرد- وابکات زێتر مەیلیان بەلای سوننەوە بێت.

لێرەوە دەبینین لەماوەیەکی کەمی دوای شکستی بزووتنەوەی خەواریجی لەهەمان ناوچەکانی چالاکی ئەواندا، مەزهەبی سوننە بلاوبۆتەوە، بەتایبەت هەرێمی جەزیرە کە لێرە بەدواوە خەلکەکەی وا وەسفدەکرێن مەزهەبیان هی ئەهلی سوننەت و جەماعەتە، هەرێمی ئازربێجان و دەوروبەریشی، وەك دواین شوێنی تەراتێنی کوردە خەواریجەکان، وا دەناسرێنەوە کەوا شیعەی لێ نییە، هەروەها شارە دیارەکانی هەرێمی چیاش لە ڕووی فیقهیەوە، وەك پێشتریش ئاماژەمان پێدا، پەیڕەوی لە ئەهلی فەرموودە دەکەن(١٧١)، خۆ هەبوونی چەندان گێڕەرەوەی فەرموودە سەر بە ڕەوتە جیاکانی سوننە لە شارە کوردییەکاندا(١٧٢)، فراوانی پانتایی و هەمەگیری پەیڕەوکردنی ئەو ڕەوتەمان لە ناوچەکەدا بۆ ئاشکرا دەکات، بەتایبەتیش مەزهەبی شافعی کە دواتر دەبێتە مەزهەبی زۆرینەی کوردان(١٧٣). ئەوەی کە هاوکاری ئەو گەشەسەندنەیە ئەوەیە کە سیاسەتە مەزهەبیەکەی المتوکل لە ناوچە کوردیەکانیشدا جێبەجێ دەکراو ڕێگەی بە پەیڕەوکارانی ڕێبازە نا سوننییەکان نەدادا لەوێ چالاکی بنوێنن(١٧٤)

ئەو فراوانبوونەی جوگرافیای ڕێبازی سوننە هاوکاتی دەرکەوتن و بەرفرەبوونی بەرچاوی هزری سۆفیگەرییە لە پانتاییەکەدا، بۆیە ئاساییە ئەگەر ببینین ئاماژەی زۆر

---

(١٧١) لەم بارەوە بڕوانە: المقدسي: احسن التقاسيم, ص١٢٩, ٢٨٥, ٢٩٦.

(١٧٢) زۆرن ئەو سەرچاوانەی باس لەو زانایانە دەکەن, بەلام بەتایبەت بڕوانە نەمەی خوارەوە کە بە پێی شار و هەرێمەکان ناوی هێناون: القزويني: الإرشاد في معرفة علماء الحديث, حققه: محمد سعيد عمر ادريس, مكتبة الرشد, الرياض, ١٤٠٩, ج٢, ص ص ٦١٧- ٦٣٩, ٧٨٠-٧٨٤.

(١٧٣ ئەگەرچی تا ئێستا مەزهەبی شافعی مەزهەبی زۆرینەی کوردە, بەلام لێکۆلینەوەی تایبەتی و ورد لەسەر چۆنییەتی بلاوبونەوەی نەکراوە, بەلکو لە دووتوێی لێکۆلینەوەی تردا ئاماژەی بۆ کراوە بۆ نموونە بڕوانە تێبینییەکانی: حسام الدين علي غالب نەقشبەندی: شارەزوور, ل١٧٨-١٧٩. عبدالرقيب يوسف: الدولة الدوستكية في كردستان الوسطى – القسم الحضاري, ط ٢, دار ئاراس للطباعة والنشر, اربيل, ٢٠٠١, ص ص٢٥٦-٢٥٩.

(١٧٤) ابن خلكان: وفيات, ج١, ص٣٥١.

## یەکەم: سەرەتاکانی سۆفیگەری لە نێو کوردان – ئاوێتەبوونی خەیاڵ و واقیع

ئەگەر دیاری کردنی ئەو زەمینە ئایینییەی ڕێگەی بە سەرهەڵدان و ئینجا لەخۆگرتنی دیاردەیەکی وەك سۆفیگەری، کەمێك ئەستەم بوو، ئەوا بێگومان دەستنیشانکردنی سەرەتاکانی سەرهەڵدانی لە ناو کوردان و لە وڵاتەکەیاندا بەگشتی کارێکی دژوارە، ئەمەش لەبەر نەبوونی دەقی مێژوویی ئەوتۆ کە بەڕوونی قسە لەسەر ئەم دەستپێکە بکات. لەگەڵ ئەوەشدا ئەگەر بمانەوێ سەرەتایەکی نزیکی چەکەرەکردنی دیاری بکەین دەبێ بچینەوە بۆ ناوەڕاستی سەدەی دووەم تا سەرەتاکانی سەدەی سێیەمی کۆچی/ناوەڕاستی سەدەی هەشتەم تا سەرەتای سەدەی نۆیەمی زایینی، واتا ئەو قۆناغەی سۆفیگەری دەیەوێ وەك ڕەوتێکی هزری - ئایینی جیاواز خۆی بناسێنێ. لەو قۆناغەدا ئەو ڕەوتە ئایینییە لەزەمینەی کوردیدا هێشتا نەبۆتە دیاردەیەك بەڵکو زیاتر نموونەی جیاجیامان هەن ڕاستەوخۆ پەیوەندیان بە کەسانێك لە دامەزرێنەرانی هزرەکەدا هەبووە، ئەگەرچی ئەو نموونانە پەیوەندیی تەواوکاریان لەنێواندا نییە و لەیەکتر دابڕاون و هەست بەوە ناکرێ جێکەوتەیەکی دیاریان لە نێو کوردان و لە پانتاییە جوگرفیەکەدا هەبووە و بوونەتە ئەو سەرەتایەی کەسانی دوای ئەوان هزری خۆیان لەسەر بونیاد نابێ، بەڵام ئاماژەیەکیشن بۆ زوو قەبوڵکردن و پێشوازیکردنی زەمینەی کۆمەڵایەتی کوردی لەم هزرە تازەیە.

مێژوویەك کە لەم قۆناغەدا بەرچاوە پەیوەندیی یەك لە ڕەمزە دیارەکانی زوهدی سۆفیگەریانەیە بە هەندێك لە کەسایەتی کورد و وڵاتەکەیان، ئەویش ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەمە، کە بە ناودارترین زاهید و سۆفی قوتابخانەی خوراسان دادەنرێ، سوودی لە کولتووری ئایینی هیندی و فارسی بەر لە ئیسلام وەرگرتووە بۆ گەڵاڵەکردن و داڕشتنی بۆچوونەکانی خۆی، ئینجا بۆچوونەکانیشی تێکەڵی دراوە هزریەکانی قۆناغی دەرەنگی زوهدی ئیسلامی کردووە، ئەم تێکەڵییەش، بەگشتی، گەیشتن بە قۆناغی سۆفیگەری لە نێو موسڵمانان خێراتر کردووە[١٧٤].

---

(175) Ignaz Goldziher: Mhamad, p.174.

الشيبي: الصلة، ص٣٢٩.

هەرچۆنێك بێت لەبارەی پەیوەندیی ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم بە کەسایەتییەکان و ڕەوشی ئایینی کوردستان، خۆمان لەبەردەم حاڵەتی ئاوێتەبوونی واقیع و ئەفسانە، ڕاستی مێژوویی و وێناکردنی ئایینی کەسایەتی پیرۆزکراو، دەبینینەوە. بۆیە دەشێ پەیوەندیی ئەو کەسە و کاریگەریی بەسەر وڵاتەکە لە چەند تەوەرەیەك بخرێتە ڕوو؛ تەوەرەی یەکەم بریتییە لە یاوەرێتی و پەیوەندیی ڕاستەوخۆی ئەو کەسەیە بە کەسایەتییەکی خەڵکی شاری سنجار، کە ئەبو عەبدوڵڵای سنجاری یە، لەمەڕ ئەو پەیوەندییە سەرچاوەکان تەنها ئەوەمان پێ دەڵێن ئەو سنجاریە لە وڵاتی شام[176] و لە ڕێگای چوون بەرەو میصر[177]، لەگەڵ ئەودا بوو، لەوە زێتر هیچی لەسەر نازانین. بەهەرحاڵ یاوەرێتی ئەو ئیبراهیم و ئەبو عەبدوڵڵا، بەپێی تێگەیشتنی ئەو سۆفییەی دوایش بەگشتی بۆ یار و یاوەری (الصحبة) ، وادەکات بە پایەی عارف بگەن[178].

دوای ئەمە پێگەی ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم لەلای گەورە سۆفییانی وڵاتەکە، لەو قۆناغەی لێی دەکۆڵینەوە، وون نابێت، بەڵکو لە تێگەیشتنی هەندێك لە سۆفییانی ئەوێ بۆ "ناسینی بەرامبەر – معرفة الغير" و چۆنییەتی مامەڵە لەگەڵ کردنی، لەڕێگەی گێڕانەوەی وتەکانی لەسەر ئەم بابەتە[179]، ئامادەیی هەیە و وەك بەشێك لە کولتووری سۆفیگەری دەخوێندرێتەوە.

تەوەرەیەکی تری ئامادەیی ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم و هزرە عیرفانییەکەی بەدەرە لەو پەیوەندییە زیندووە و لە مێژوویەکی چەندان سەدە درەنگتر تۆمارکراوە، بەڵام دەریدەخات پەیوەندیی ئەم سۆفییە بە کوردان، بەتایبەت کوردانی شاری سنجارەوە، لێرە کۆتایی نایەت، بەڵکو ناڕاستەوخۆ لەنێو ئەو بەسەرهاتەدا دەبینرێ کە لەبارەی بنەچەی کوردانەی بنەماڵەی صەفەویەکان بە گشتی و بەتایبەتی شێخ صەفیەدینی ئەردەبیلی هەیە. بەر لەوەی بچینە سەر بەسەرهاتەکە دەبێ ئاماژەیەك بۆ سەرچاوەکەی بکەین، کە بریتییە لە کتێبی "صفوة الصفا" ی دەروێش ئیبن بەزازی ئەردەبیلی( مردووە دوای ٧٥٩ك/١٣٥٨ز)، کە موریدی شێخ

---

(١٧٦) السلمي: طبقات، ص٢٩.

(١٧٧) ابن خميس: مناقب، ج١، ص٥٧.

(١٧٨) السلمي: المقدمة في التصوف، تقديم و تحقيق: يوسف زيدان، دار الجيل، بيروت، ١٩٩٩، ص٢١.

(١٧٩) ابن يزدانيار: روضة المريدين, مخطوطة مصورة, موقع جامعة برنستون الأمريكية:

//diglib.priceton.edu:http

صەدرەدین (٧٣٥- ٧٩٤ك/ ١٣٠٤-١٣٩١ز) کوڕ و جێنشینی شێخ صەفیەدین بووە و بە هاندانی ئەو شێخە کتێبەکەی نوسیوە و لەساڵی (٧٥٩ك)دا تەواوی کردووە[١٨٠]، لەوێدا بە دوور و درێژی باس لە کەسێتی و کەرامەت و کار و کردەوەکانی شێخ صەفی دەکات. بەڵام ئەوەی گرنگ بێ ئەو بەسەرهاتەیە کە نووسەر لەسەر رەسەنی ئەو شێخە دەیگێڕێتەوە، ئەویش بەمجۆرە: لەشکری کوردان بە رێبەرێتی کوڕێکی ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم لە سنجارەوە رووی کردۆتە دەڤەری ئازربێجان و دەستیان بەسەر داگرتووە، خەڵکی ئەوێ و ناوچەکانی دەوروبەری لەسەر دەستی ئەو لەشکرە وازیان لە ئایینی زەردەشتی هێناوە و بوونەتە موسڵمان[١٨١].

لە راستیدا هیچ کامێك لەسەرچاوە مێژووییەکان، ئەوانەی کە باسیان لە ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم کردووە، تەنانەت ئەوانەش کە قسە لە رەهەندی سەروو ئاسایی بەسەرهاتی ژیانی رۆحانی ئەو کەسایەتییە دەکەن، رووداوی لەمجۆرەیان نەگێڕاوەتەوە[١٨٢]، بەهەمان شێوە لەو سەرچاوە مێژووییانەش کە مێژووی گشتیان نوسیوەتەوە ئاماژە بۆ رووداوی لەمجۆرە نییە، لەکاتێکدا رووداوەکە لەبەر گرنگییەکەی — ئەگەر روویدابێ — ئەوە دەهێنێ تۆمارکرابێت، بەتایبەت کە دەشێ لە چوارچێوە مێژووی وڵاتگیریی ئیسلامییەوە بخوێنرێتەوە.

هەرچۆنێك بێت ئەو بەسەرهاتە لەلای ئیبن بەزازی مێژوونوس ناوکۆییەکی مێژوویی هەیە بۆ گەیشتن بەوەی ئاماژە بۆ کوردێك بکات لەو سوپایەدا بەشداربووە، ئەویش "پیرۆز شاە زەرین کولاهی کوردی سنجانی" یە ، کەسێکی دەوڵەمەندی دەستکراوە و دۆستی هەژاران بووە، گرنگییەکەشی لەوەدایە کە باپیرە گەورەی شێخ صەفیەدینە[١٨٣] و دەرخستنی رەسەنی کوردانەی ئەو بنەماڵە گرنگەی نێو مێژووە[١٨٤].

---

(١٨٠) صفوة، ص٦٥.

(١٨١) صفوة، ص٧٢.

(١٨٢) هەر بۆ نموونە بڕوانە: القرماني: الروض النسيم و الدر اليتيم في مناقب السلطان ابراهيم بن ادهم، مخطوط محفوظ في: معهد الثقافة و الدراسات الشرقية، طوكيو، لە ئەنتەرنێت لەم سایتەدا هەیە:
http://ricasb.ioc.u-tokyo.ac.jp

(١٨٣) ابن بزاز: صفوة، ص٧٣.

(١٨٤) بڕوانە: عبدالحسین زرین کوب: ارزش میراث صوفیه، چاپ دوازدهم، انتشارات امیر کبیر، تهران، ١٣٨٥، ص٧٥. بابا مردوخ روحانی(شیوا): تاریخ مشاهیر کرد، بکوشش: محمد ماجد مردوخ روحانی، سروش، تهران، ١٣٨٢ه.ش، ج١، ص ص٣١-٣٢.

بەدەر لە راستی و ناڕاستی رووداوەکان، ئاماژەیەك لەو بەسەرهاتەدا بخوێنرێتەوە ئامادەیی و پیرۆزی ئەو گەورە زاهیدەیە لە سیستەمی بیروباوەڕی کوردی، بەتایبەت لە رەهەندە عیرفانییەکەیدا، بەڵام کاتێکیش عیرفان دەبێتە تەواوی سیستەمی کولتووری لە ئایینێکی وەك "ئەهلی هەق"دا، ئەوا ئاسایی دەبێ ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم بچێتە سەرووی شوێن و کاتەوە و ببێتە رەمزێکی ئایینی؛ ببێتە سوڵتانێك بەهەموو ئەو مانایانەی چەمکی سوڵتانێتی لەو ئایینەدا هەیەتی[١٨٥]. ئیدی سەربوردەی ژیانی، کەرامەتەکانی، تەنانەت جیهانبینی عیرفانییانەی لە جیهانبینی ئایینی ئەواندا کاری پێ دەکرێ و وێنادەکرێتەوە و لەنێو دەقە ئایینییە پیرۆزەکاندا دەمێنێتەوە[١٨٦].

نموونەیەکی تر هەر ئەو عەکبەری کوردییەیە کە پێشتر ئاماژەمان بۆی کرد و گوتمان هاوسەردەمی بشری کوڕی حارث(م٢٢٦ك/٨٤١ز)بووە، لەبارەی ئەم کوردەوە تەنها بەسەرهاتێکمان چنگ کەوتووە کە ئەو سۆفییە ناودارە دەیگێڕێتەوە و ئاماژە بۆ گەڕانەوەی عەکبەری کوردی دەکات لە "رێگری"یەوە بۆ لای "خودا"، گەڕانەوەیەك کە پێویستی بە موعجیزەیەك لە نێو سروشتدا بووە تا وابکات ئەم کەسە رێگرە لە حاڵەتی "هەجر"ی خوداوە بپەڕێتەوە بۆ حاڵەتی "صولح"کردن لەگەڵیدا، ئەو پەڕینەوەیەی عەکبەر و هاوەڵەکانی دەخاتە باری گریان و هاوار و سەرسامی و دواجار ئاشتکردنەوەی خودا[١٨٧]، بێگومان باوەڕهێنان بە گۆڕانی حاڵی کەسیش لە رێگرەوە بۆ خوداپەرست هەر بە بینینی موعجیزەیەکی خودایی تەواو نابێ، بۆیە دەبینین پێغەمبەریش رۆڵ لەو پرۆسەیە دەگێڕێ کاتێك، بۆ سەلماندنی حاڵی

---

(١٨٥) بگەڕێوە بۆ: صدیق صفی زادە: سرانجام - کلام خزانـە، یکـی از متـون کهـن یارسـان( اهـل هـق)، انتشارات هیرمند، تهران، ١٣٧٥هـ.ش.

(١٨٦) لەم بارەوە بڕوانە: حاج نعمة الله جیحون آبادي: شاهنامەء حقیقت — تاریخ منظوم بزرگان اهـل حـق، متن مصحح: محمد مکری، انستیتیو ایران و فرانسە، تهران، ١٩٦٦، ص ص ٢٣٩ — ٢٥٢.

(١٨٧) المقدسي: التوابين، ص ٢٢٢ - ٢٢٣. ابن صصري: الدرة المضيئة، ص٢٣١-٢٣٢. هەمان بەسەرهات لە سەرچاوەی تریش هەیە بەڵام بـێ هێنـانی نـاوی "عکـبر"، بڕوانـە: اليـافعي: روض الريـاحين في حكايـات الصالحين، وضع حواشيه: عبد الجليل عبد السلام، ط ٢، دار الكتب العلميـة، بـيروت، ٢٠٠٧، ص. هـەروەها بڕوانە دەقی چیرۆکەکە لە پاشکۆی ژمارە(١)

عەکبەری کوردی، سێ جار دەچێتە خەونی پیرەژنێکی کوێر و داوای لێدەکات ئەو سامانەی لە کورپیەوە بۆی ماوەتەوە بەو کەسە کوردەی بدات[188].

جگە لەو بەسەرهاتە هیچی ترمان لەسەر رەهەندی زوهدیی – سۆفییانەی ئەو رێگرە کوردە لەبەردەستدا نییە، لەگەڵ ئەوەشدا خوێندنەوەی وردی ئاراستەکانی گەڵاڵەبوونی دەقی حەکایەتەکە دەمانخاتە بەردەم مانا شاردراوەکانی، لەوێدا سیستەمێکی داڕێژراو دەبینین، لە کۆمەڵێك یەکەی ماناداردا بونیادێکی هزری – سۆفییانەمان بۆ دەردەخات، کە بێگومان بشری کوڕی حارث لە دووتوێی بەسەرهاتی ئەو کوردەدا بینیویەتی و گێڕانەوەی بە پێویست زانیوە. بەو ئاراستەیەش چیرۆکەکە قسە لەسەر حەتمییەتی بەرهەمهێنانەوەی کەسێتییەکە دەکات، کەسێك کە لەبەرامبەر بە موعجیزەی خوداییدا دەستەوەستان دەبێ، پێویستی بە گۆڕانێکی رۆحانی دەبێ تا بتوانێ لەگەڵ کردەی موعجیزەدا رێك بێتەوە، بۆیە بەدوای حەقیقەتێك دەگەڕێ کە "رێگریی" لێی پەنهان کردووە، حەقیقەتی دوورکەوتنەوە لە راستەڕێی خودایی کە موعجیزەکە بەڵگەی نزیکیەتی، ئەگەرچی بەئاگاهاتنەوە بەرامبەر بەو راستییە کردەیەکی زاتی نابێ بەڵکو لە دەرەوە سەپێنراوە، بەڵام لە دوا مانایدا بەئاگاهاتنەوەیە بەرامبەر بەو دەرەوەیە کە زاتی خوداییە، واتا بینینی راستی رێبازێك دەبێ بۆ ناسینەوەی "هەق" خۆی، بێگومان هەموو ئەمەش بەشێکە لەو ئەزموونە رۆحانییەی دەبینین لە دامەزراندنی گوتاری سۆفیگەریی ئیسلامیدا بوونی هەیە.

بەڵگەی هەرە روونیش لەسەر ئەو کارپێکردنە ئەوەیە کە هەردوو رەگەزی سەرەکی گوتاری باوەڕداریی ئیسلامی ئامادەییان هەیە: خودا، کە ئەرکەکەی پیشاندانی کارێکی نائاساییە بۆ کەسێکی رێگر تا بگەڕێتەوە لای وی، دووەمیش پێغەمبەر بۆ جەختکردنەوە لەسەر کاری خودا و جێبەجێکردنی کاری ئاسایی خۆی کە پێکبەستی نێوان خودا و مرۆڤەکانە. ئەگەر پێغەمبەریش لەئێستادا وونە، ئەوا لەنێو ترادیسیۆنی ئیسلامی رەوایی بەو ئامادەییە ناڕاستەوخۆیەی لە بەسەرهاتەکەدا هەیە دراوە، کە بریتیە لە گەیاندنی ئەو پەیامەی دەیەوێ لە رێگەی خەونەوە، پرۆسەیەك کە لە کولتووری ئیسلامیدا کاری پێدەکرێ و وەك راستییەکی

---

(١٨٨) المقدسي: التوابين، ص٢٢٣.

ئایینی سەرەدەری لەگەڵدا دەکرێ[189]. زۆرجار بینینی پێغەمبەر لە خەوندا کاردەکات بۆ چارەکردنی گرفتەکان، قورس بن یان سووك، جا گرفتی تایبەت بە پەیوەندیی کۆمەڵایەتییەوە بێ، یان ئەو قەیرانە سیاسییانەی پێویستیان بە ئاراستە کردنەوە هەیە، یانیش تایبەتن بە مەسەلە دینییەکانەوە[190]. بۆیە لەو بەسەرهاتەی بەردەستیشماندا ئەو جۆرە خەوبینینە خراوەتە گەڕ بۆ پێدانی رەوایی بە ناوکۆی دەقی حەکایەتەکە، خۆ تا ئەو کاتەی کە پێغەمبەر لە هزری سۆفیگەریدا وەك یەکێك لە باڵاترین کەسانی خوداناس ئامادەیە. ئاساییشە، وەك سیمبولێك بۆ باوەڕهێنانی تەواو، لە داڕشتنی بەسەرهاتی ناسینەوەی "هەق"دا ئامادە بێ.

هەرچۆنێك بێت، مەغزای حەکایەتەکە هەر ئایینی- سۆفییانە نابێ و بریتی نابێ لەو پرۆسەی ناسینەوەیەی ئاماژەمان بۆی کرد، واتا کردەی پەڕینەوە لە کەسی سروشتی تەنانەت نەشیاوەوە بۆ کەسی سەروو سروشتی، بەڵکو مەغزایەکی کۆمەڵایەتی زۆر گرنگیشی هەیە کە لە چوارچێوەی تێگەیشتنی باو لە نێوەندی ئیسلامی لە سروشتی کۆمەڵایەتی تەواوی کورددا خۆی بەیان دەکات، بیری ئەوکەسانەشی پێوە خەریك بووە کە لە سنووری هزری سۆفیگەریدان وەك بشری کوڕ حارث و کەسانی دی، هەر بۆیە دەبینین پەیوەندیی رێگرە کوردەکان بە سۆفییان و سرووتەکانیان بەسەرهاتی خۆی لەنێو دەقە سۆفییەکانەوە دەبێ[191]، بەسەرهاتەکەی ئەو یەکەمین سۆفییەی کوردانیش کاتێك دەبێتە نموونەی تۆبەکاری لەلای رەمزێکی دیاری سەر بەو هزرە، هاوکێشەیەکی لەمەڕ کاریگەریی رەوشتییانەی سۆفیگەری لەسەر رەفتارێکی کۆمەڵایەتی کوردان کە بە ناجۆر دەخوێندرێتەوە دروستکردووە[192]. ئیدی

---

(١٨٩) راستی بینینی پێغەمبەر لە خەوندا پەیوەستکراوە بەو فەرموودەیەوە: (( من رآني في المنام فقد رآني فأن الشيطان لا يتمثل في صورتي - ئەوەی ببینێ منی بینیوە، چونکە شەیتان لە وێنەی مندا دەرناکەوێ))، البخاري: صحيح البخاري، حققه: مصطفى ديب البغا، ط ٣، دار ابن كثير، بيروت، ١٩٨٧، ج٥، ص٢٢٩٠.

(١٩٠) بۆ لێکۆڵینەوەی وردی بینینی پێغەمبەر لە خەون و لێکدانەوەی لە کۆنتووری ئیسلامی بگەڕێوە بۆ: آنا ماري شيمل: أحلام الخليفة – الأحلام و تعبيرها في الثقافة الأسلامية، ت: حسام الدين جمال بدر و آخرون، منشورات الجمل، كولن، ٢٠٠٥، ص ص٣٤١-٣٨٣.

(١٩١) بڕوانە: الهجويري: كشف، ص٥٦١-٥٦٢.

(١٩٢) دواتر، لەبەشی پێنجەمدا، زێتر باس لە ئاکامە کۆمەڵایەتی – ئایینییەکانی ئەو بابەتە لە ئاستی میللیدا دەکەین.

ناساییه نموونەی کوردی ڕێگر و ناسینەوەی هەق چەندبارە ببێتەوە و "ڕێگری سۆفی" ببێتە دیاردەیەك لە نێو مێژووی هزری سۆفیگەریی ئیسلامیی کوردیی لە قۆناغە جیاوازەکانیدا[193].

دواجار دەشێ بڵێین ڕەنگە گێڕانەوەی ئەو جۆرە بەسەرهاتە جۆرێك بێت لە بانگەشەکردنی سۆفییان بۆ ڕۆڵی ڕێبازەکەیان لە چاکسازی کۆمەڵایەتی و جەختکردنەوە بێت لەسەر بواری کرداری هزرەکەیان لە پانتایی ئیسلامیدا، وەك هەوڵێك بۆ ڕوونکردنەوەی هەڵوێستی شێوێندراویان لە گرفتەکانی کۆمەڵی ئیسلامی و دەرخستنی کارایی خۆیان لە چارەکردنی گرفتەکان بە هەمان ئەو لۆژیکەی هزرەکەیان کاری پێ دەکات، بێگومان بوونی "ڕێگر"یش بە "سۆفی" ڕوونترین بەڵگە دەبێ لەسەر ئەو کارابوونە کۆمەڵایەتی – ئایینییەدا. هەر بۆیەشە ئەو هزرە، وەك بینیمان، هەموو تواناکانی خستۆتەگەڕ بۆ دیاریکردنی ئاڕاستەکانی شێوەگرتنی حەکایەتەکەی عەکبەری کوردی.

نموونەیەکی تری ئەو قۆناغە زووەی پەیوەندیی کورد بە سۆفیگەرییەوە پەیوەستە بە سۆفی ناودار بایەزیدی بسطامی وەك یەکێك لەو کەسانەی لەسەر دەستیانەوە سۆفیگەری چەندان هەنگاو چۆتە پێش و گوتارە بیروباوەڕییەکەی خۆی داڕشتووە. ئەوەی گرنگ بێت بۆ باسەکە ئەوەیە کە بە پێی سەرچاوەکان وا دەردەکەوێ ئەم سۆفییە لەسەر دەستی مامۆستایەکی کوردەوە پێگەیشتووە[194]، گوایە ناوی شێخ حەسەنی کوردی یە[195]. ئەو نموونەیەش، هەروەك ئەوانی پێشووتر، نادیار و تەمومژاویە و سەرچاوەکان بە ڕوونی باس لە زێد و بیروباوەڕی ئەم کەسە و کاریگەریەکانی بەسەر بایەزیدەوە ناکەن، تەنیا ئەوە نەبێ کە دەگوترێ ئەو شێخ حەسەنە لە "أهل الرأي - ئەهلی ڕاوبۆچوون" بووە[196]، بەمەش دەزانین پەیڕەوی لە ڕێبازی فیقهی ئەبو حەنیفە کردووە، بۆیە ئەگەر کاریگەریەکی بەسەر بایەزیدەوە هەبووبێ ئەوە لایەنی کەم لە تێگەیشتنی ئەو سۆفییە بۆ شەریعەتەوەیە، ئەوەتا دەبینین ئەمیش لە

---

(١٩٣) لەوانە سۆفییانی سەدەی پێنجەمی کۆچی/ یانزەی زایینی: ئەبوبەکری هاواری، ئەبو محەمەدی شەنبەکی، ئەبولوەفای حولوانی، کە دواتر لە بەشی چوارەم باسیان دەکەین.

(١٩٤) الأنصاري: طبقات الصوفية، ص٢٠٤. جامي: نفحات، ص ٥٤.

(١٩٥) جواد نوربخش: بايزيد بسطامي، چاپ چهارم، انتشارات يلدا قلم،١٣٨٥هـ.ش، ص٢٤.

(١٩٦) جواد نوربخش: بايزيد، ص٢٤.

مەزهەبدا لە ئەهلی راو بۆچوون بووە(١٩٧). لەوە دەچێ ئەو گەورە سۆفییە ئەوەندە بەو مامۆستا کوردەی کاریگەر بووبێ کە تەنانەت وەسیەتی کردووە، لەدوای مردنی، لەژێر پێی مامۆستاکەی بنێژرێ(١٩٨). وەك دەشزانین بایەزیدی بسطامی هەر لە شاری "بسطام" نێژراوە(١٩٩)، کەواتە دەبێ گۆڕی شێخ حەسەنیش لەوێ بێت.

لەوە بترازێ هیچی تر لەبارەی ئەو شێخە کوردە نازانین، بەڵام خۆ هەبوونی شێخێکی وا لەو قۆناغە زووەدا، سەرباری ئەوەی دەستنیشانی سەرەتایەك دەکات بۆ هەڵوێست نواندن لە سۆفیگەری لە ناوەندی کوردیدا، لەهەمان کاتدا جەخت لەسەر بۆچوونەکەی پێشوترمان دەکاتەوە لەسەر هەبوونی پەیوەندییەکی تەواوکاریی لە نێوان شەریعەت و حەقیقەت لەو ناوەندەدا، ئەو حەقیقەتەی لێرە بەدواوە زێتر گەلاڵە دەبێ و بەرچاوتر دەبێ.

پەیوەندیی بایەزیدی بسطامی بە کورد و بیروباوەڕە ئایینییەکەی لێرە بە کۆتا نایەت، بەڵکو – هەروەك لە پەیوەندیی بە ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم بینیمان - لێرەشدا هەمان پرۆسەی گواستنەوە بۆ ئاستی "میتا مێژوویی - ئەودیو مێژوو" هەیە، بە دەستەواژەیەکی تر گواستنەوەی بایەزید لە کەسێتیەکی مێژووییەوە بۆ کەسێتیەکی سەروو مێژوویی و دابڕاو لە شوێن و کاتی خۆی، بەڵام ئەمجارە پرۆسەکە لە نێو کولتووری ئایینی "ئێزدییەکان"ەوە ئەنجامدراوە، کاتێك دەبینین بایەزید بۆتە باپیرەی یەکێك لە مێرخاسە دینییە گەورەکانی ئەوان، ئەویش "بایەزیدی بسطامی ئیختیار"ە کە بە "بازیدێ رم زراڤـ" ناسراوە(٢٠٠)، دەگوترێ ئەو نەوەیەی بایەزیدی گەورە هاتۆتە سەر زەمینی ئێزدیان و لەبەر ئەو پێگە گەورەیەی لە بواری عیرفاندا هەیبووە توانیویەتی پایەی " ئیختیارێ مەرگەهێ" لە شوێنی هەرە پیرۆزی ئەوان(لالش) وەربگرێ(٢٠١)، بەمەش بایەزیدی بسطامی تێکەڵ بە سیستەمی ئایینی - کۆمەڵایەتی ئەم سێکتە بووە، تا ئاستێك کە دەبینین تیرەیەکی یەکێك لە هۆزە

---

(١٩٧) الأنصاري: طبقات الصوفية، ص٢٠٤ .

(١٩٨) الأنصاري: طبقات الصوفية، ص٢٠٤. جامي: نفحات، ص٥٤.

(١٩٩) القزويني: آثار البلاد و اخبار العباد، دار صادر، بيروت، د.ت ، ص٣٠٨.

(٢٠٠) ريسان حسن البسطامي: بازيد البسطامي الإختيار عند اليزيدية، مطبعة وزارة الثقافة، اربيل، ٢٠٠٠، ص٩.

(٢٠١) ريسان حسن البسطامي: بازيد البسطامي، ص٩.

گەورەکانی ئێزدی خۆیان دەگێڕنەوە سەر ئەم سۆفییە و بە "باسطەمی" ناسراون[٢٠٢]، بێگومان ئەمەش بەکارهێنانی کەسێتییەکەیەتی وەك سەرمایەیەکی ڕەمزی و ڕەوایەتییەکی ئایینی بە پلە و شوێنی ئەو تیرەیە دەدات لە نێو جڤاکی ئێزدیدا، کە بۆ پارێزیکردن لە سەرمایەیەیان کۆمەڵێك سرووتی ئایینی لە شێوەی ئاهەنگ و داوەتکردنەوە، بۆ بەرز ڕاگرتنی ناوی دادەهێنن و تا نوکە پەیڕەوی لێ دەکەن[٢٠٣].

هەرچۆنێك بێت ئەو نموونانە کە بەگشتی لەڕووی زەمەنییەوە هی سەردەمانی دەستپێك و گەلاڵەبوونی سۆفیگەریی ئیسلامین، بایی ئەوەنین وەك پرۆژەیەکی هزری چاویان لێ بکەین، ئەوە ناچێت هیچ کامێك لەو کەسانە هەڵگری جۆرە پرۆژەیەکی لەمجۆرە بووبن، بەڵکو وادێنە بەرچاو ئەوان کارەکتەری دووەمینن بۆ کەسانێکی خودان هزر، لەبەر ئەوە لەوە ناچێت توانیبێتیان پانتاییەکی جوگرافی بۆ سۆفیگەری دابمەزرێنن، بەڵکو ئەو پانتاییە دوای ئەو ماوە زەمەنییە - وەك پاشان باسی لێوە دەکەین — لەگەڵ بەرفرەبوونی هزرەکە لەتەواوی جیهانی ئیسلامی و ئامادەیی ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆی گەورە سۆفییانی ئیسلامی لە وڵاتەکەدا ڕووخسارەکانی ئەو دیاردە ئایینییە دەردەخەن.

لەگەڵ ئەوەشدا دەبێ ئەوەمان لەبیر بێ کەسایەتییەکان بەردەوامیێتییان لە زەمینەی کوردیدا هەیە، خەیاڵدانی کۆمەڵایەتی، لەبەر جێگیربوونیان لە نێو سیستەمی کولتووری ئایینەکان، نەیتوانیوە فەرامۆشیان بکات، بە تایبەت لە ڕەهەندە عیرفانییەکانی هەردوو سێکتی "ئێزدی" و "ئەهلی هەق"دا، دەبینین هەردووکیان کاریان کردووە بۆ بەرجەستەکردنی نێستایی ڕەمزە مێژووییەکانی سۆفیگەریی ئیسلامی لە نێو سیستەمی عیرفانی خۆیاندا. لەم حاڵەشدا مەرج نییە کەسایەتییەکان هەمان خەسڵەتی مێژوویيان هەبێ کە لە واقیعی خۆیاندا هەڵیانگرتبوو، بەڵکو دووبارە دارێژراونەتەوە.

لە ناوەندە ئایینییە کوردیەکەدا ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم و بایەزیدی بسطامی دوو کەسێتی جیاوازن لە کەسێتی ڕاستەقینەی خۆیان، ئەوان تەنیا هەبوونە عیرفانییەکەیان پەیوەستە بەو حاڵەتە ڕاستەقینەیە، ئەگەرنا تێگەیشتن لە کەسێتی ئامادەیان لە نێو کولتووری

---

(٢٠٢) بازيد البسطامي، ص٥٢.

(٢٠٣) لەبارەی ئەم سرووتانە و چۆنییەتی پەیڕەوکردنیان لـەلای ئێزدیەکانـەوە بگـەڕێوە بـۆ: ريسان حسن البسطامي: بازيد البسطامي, ص ص٥٣-٥٦.

دوو ئایینەکە پەیوەستە بەو سیستەمە نێوخۆییەی لە بینینی رەمزەکان پەیڕەوی لێ دەکرێ، ئیدی ئەو عارفانە و هاوشێوەکانیان ئەوەندەی دەرکەوتەی ئێزدییانە یان ئەهلی هەقانەیان هەیە ئەوەندە ئەو دەرکەوتە سۆفییانەیان نابێ کە دەشێ لە نێو چوارچێوەی سۆفیگەریدا هەیانبووبێ. لە شوێنی تری توێژینەوەکەدا نموونەی دی دەبینین و ئەو پرۆسەی خۆماڵی کردن و پیرۆزکردنەی کەسایەتییە سۆفییەکان لە مێژووی بیروباوەڕی ئایینی کوردیدا ڕوونتر دەبێتەوە.

## دووەم: ئەستەمی دیاریکردنی سنووری سەرهەڵدانی دیاردەی سۆفیگەری

ئەگەر سۆفیگەریی ئیسلامی تا ناوەڕاستی سەدەی سێیەمی کۆچی/ نۆیەمی زایینی، لە پانتایی کوردیدا لە چوارچێوەی چەند کەسێکی پەراگەندە، لێرە و لەوێ، چڕ ببۆوە، ئەوا لەوێ بەدواوە بەرەبەرە وەك دیاردەیەکی ئایینی شێوەگیر دەبێ و دەبینین لە چەند هەرێم و شار و ناوچەدا کەسانێك دەردەکەون، هەم سەربوردەیان و هەمیش چۆنییەتی کارکردنیان لەو بوارە ئایینییەدا ئاشکراتر و بەرفرەترە، ئەمە سەرباری هەبوونی پەیوەندییەکی تەواوکارانەی — دیار و نادیار — لە نێوانیاندا و خۆناساندنیان وەك خودان تێڕوانینێکی ئایینی جیاواز.

لەگەڵ ئەوەشدا دەستنیشانکردنی چوارچێوەیەك بۆ سۆفیگەری لە پانتاییەکی کۆمەڵایەتیدا، کە جڤاکی کوردییە، لە چەندان ڕووەوە کارێکی ئەستەم و سەرکێشانەیە، تەنانەت دەشێ بڵێین رەنگە هەر هەوڵێك بۆ ئەو دیاریکردنە بە لاڕێماندا ببات و دوور بکەوینەوە لە راگەیشتن بەسەر چییەتی هزرەکە و چۆنییەتی بەرهەمهێنانی لەلایەن کەسایەتییە کارایەکانی نێو ئەو پانتاییە. بەر لە هەموو شتێك سروشتی سۆفیگەری خۆی لەمپەرێکی گەورەیە لەبەردەم رۆشن بوونەوەی سنوورەکان، چونکە — وەك لە دەروازەی توێژینەوەکەدا ئاماژەمان پێدا — ئەوەندەی سۆفیگەری لە قۆناغی سەرهەڵدانیدا هەڵوێستێکی پەرچەکردارانەی چەند تاکێکی نێو جڤاکی ئیسلامی بووە لە بەرامبەر بە دیاردە کۆمەڵایەتییەکان و خوێندنەوە فرەجیاوازەکانی ئایین و چۆنییەتی پەیڕەوکردنی، ئەوەندە دیاردەیەکی هەمەگیری ئایینی — کۆمەڵایەتی نەبووە، لە ناوچەیەکی دیاریکراودا برەوی سەندبێ و جێگیر بووبێ. ئەگەرچی سۆفییان دواتر لەو دوورەپەرێزیە دەرچوونە و گرۆی ئایینیان دامەزراندووە و لە چوارچێوەی سیستەمێکی رێکخراوەییدا کاریان کردووە، بەڵام هێشتا — تا ئەو کاتەی تەریقەتی سۆفیگەری سەری هەڵنەداوە — زیاتر وەك گرۆیەکی دابڕاو

و داخراو بەسەرخۆیدا خۆیان دەناساند، کە ڕێگەیان بە دەرەوەی خۆیان نەدەدا لە چوارچێوەیەکی دیاریکراودا سنووربەندیان بکەن.

بۆیە ئەگەر هەندێك جار چەند کەسێك، لە شارێك، یاخود لە هەرێمێکدا، بوونەتە سۆفی، ئەوا بە دوورەپەرێزی ماونەتەوە و کەمترین دەرکەوتنیان لەو گۆڕەپانە جوگرافییەدا هەبووە، ئەمەش وادەکات گومان بکەین لەوەی ئەو شوێنە بە مەنزڵگای سۆفییان دابنێین؛ کەسانێك کە ئەوەندەی هەبوونی خۆیان لە خوداناسیی و بڕینی قۆناغە ڕۆحانییەکان چڕ کردۆتەوە ئەوەندە خۆیان لەو چوارچێوە شوێنییە تەنانەت کاتییەشدا بەیان نەکردووە. ئیدی دەبینین لە زۆربەی حاڵەتدا سۆفی و تێڕوانینەکانی لەدەرەوەی فەزای گشتی ئاوەدانییەکەی دەردەکەوێ[٢٠٤]، ئەگەر جارجاریش ناچار دەبێ لەو فەزایەدا کارا بێ، ئەوا وەك پێداویستییەکی ئایینی یاخود جێبەجێکردنی ڕۆڵێکی خوازراوی کۆمەڵایەتییە[٢٠٥]. بەدەر لەمە ئەو سۆفییانە وادێنە بەرچاو لەو شوێن و کاتەی تێیدا دەژین دابڕاون و خۆشیان هەوڵی تۆخکردنەوەی ئەو دابڕانە و مانەوە بە نامۆیی لەهەمبەر بە دەوروبەرەکەیان دەدەن.

ئەستەنگییەکی تری بەردەم دانانی سنووری جوگرافی بۆ سۆفیگەری لەوەدایە، ئەو دیاردە ئایینییە لەرووی چەمك و دەرکەوتەکانییەوە بەجێگیری نەماوەتەوە و سۆفییان لە هەر شوێنێك بووبن لە بیروڕاکانیان دەگەڕانەوە بۆ یەکتر، تا ئەو کاتەی مەرزە جوگرافییەکانیش — لەوانەش هی وڵاتی گرۆیەکی "ڕەگەزیی-ئیتنی" وەك کورد — بەسەر دەرەوەدا کراوەن و ئەو شار و دەڤەرانەی سۆفییان لێ هەڵدەکەوێ، بەتەواوی لەو دەرەوەیە دانەبڕاون، دەشێ دیاردەکە تەواوکەری هەمان دیاردەی ناوچەی تر بێت؛ ئەوەتا یەك لەیەکەمین نووسەرانی سۆفی گولئابادی(م٣٨٠ك/٩٩٠ز) ناوی چەندانێك لە گەورە سۆفییانی وڵاتەکە — بەتایبەت هی دوو لە سەرەکیترین گۆڕەپانی دیاردە ئایینییەکە کە هەرێمی چیا و هەرێمی ئازربیجانن - دەخاتە پاڵ ناوی سۆفییانی "خوراسان"[٢٠٦]، ئەو شوێنەی لە زوویەکەوە سۆفیگەری لێ دەرکەوتووە و

---

(٢٠٤) بۆ نموونە بڕوانە: السراج: اللمع, ص٢٣٥. الكلابادي: التعرف, ص١١٨. الأنصاري: طبقات الصوفية, ص٣٤٤, ٣٦٦, ٣٩٣. ابن خميس: مناقب, ج٢, ص١٦٢, ٢٢٦.

(٢٠٥) دواتر لەبەشی پێنجەم زیاتر لەسەر ڕۆڵی کۆمەڵایەتی ناچارییانەی سۆفی دەدوێین.

(٢٠٦) التعرف, ص١٨.

بۆتە بنکەیەکی سەرەکی و تایبەتمەندی بەرهەمهێنانی هزرەکە[٢٠٧]، دواتریش بۆمان روون دەبێتەوە کە گەورە سۆفییانی شاری بەغداد، چەندە کاریگەرییان بەسەر سۆفییانی ناوچە کوردییەکاندا هەبووە و رەنگرێژی تیژ و بیروبۆچوونەکانیان کردوون.

لێرەوە سنووربەندکردنی دیاردەکە بە شوێنێکی جوگرافی و خوێندنەوەی لە نێو ئەو سنوورەدا دەرهێنانییەتی لە ناوکۆی مێژوویی، چونکە سۆفیگەریی ولاتەکە لەم قۆناغەدا گەشەسەندنێکی نێوخۆیی و سەربەخۆی ئەوتۆی نەبووە، لە گەشەسەندنی رەوت و دیاردە ئایینییەکانی تری دابڕیبێ و وەك دەربڕینێکی ئایینی جیاواز شێوەگیر بووبێ وەك لە قۆناغەکانی درەنگتردا وایلێبەسەر دێت، بە پێچەوانەوە پێداگیریی بەردەوامی بەشی هەرە زۆری سۆفییەکانی ئەوێ لەسەر پابەندبوون بە فەزای ئایینی گشتی، وا دەکات تایبەتمەندییەکانی ئەو هزرە - لە چەندان وێستگەدا -پاشەکشە بکەن لەبەردەم هەلکشانی چەمك و بنەما گشتگیرەکانی شەریعەت و جێگیربوونی گەلی سۆفییان لە نێو ئەو سنوورەی ئەم بنەمایانە بە هەبوونیانی دەبەخشی و بە فەزای باوی ئایینی پەیوەست دەکردن، ئەگەر هەندێکجار لەسەرەتادا دەرچوونێکیش هەبووبێ، ئەوا وەك هەلوێستی تاکێك یاخود چەند کەسێك ماوەتەوە و نەبۆتە هۆی دامەزراندنی گوتارێکی سەربەخۆی ئایینی، لە پانتاییەکی جوگرافیدا خۆی و تایبەتمەندییەکانی نیشان دابێ و سیستەمی کولتووری ئەو پانتاییەی خستبێتە ژێر هەژموونی باوەڕیانەی خۆیەوە.

لەم روانگەیەوە، ئەوە ئێمەین دەخوازین ئەو سۆفییانە جێنشینی زێدەکانیان بکەیەن، پابەندیان بە شوێن و ئامادەییان تیایدا بکەینە خالی دەستپێك بۆ خستنەڕوو و خوێندنەوەی بەشداربوونیان لە دامەزراندنی هزری سۆفیگەری. خۆ دواجار ئەو سۆفییانە نیشتەجێی ئەو شار و هەرێمانەن، بمانەوێ و نەمانەوێ، لەسەر ئەو زەمینەدا بوونە و، بە خواستی خۆیان بووبێ یان نا، کاریگەرییان هەبووە، ناچار بوونە تێکەلّ بە سیستەمە کۆمەلایەتییەکە بن، تا بیگۆڕن یانیش لایەنی کەم لە نێو هزرەکەیاندا راڤەی بکەن. هەر بۆیە هەولدەدەین لە خوارەوە دەستنیشانی گرنگترین ئەو شوێنانەیان بکەین و بەشداری سۆفییانی ئەوێ لە پرۆسەی بەرهەمهێنانی چەمك و بیروبۆچوون و تەواوی دامەزراندنەکە دەربخەین:

---

(٢٠٧) لەمبارەوە بگەڕێوە بۆ:

Ahmet T. Karamustafa: Sufism, pp.60-71. Margaret Malamud: Sufi organazations & structures of authority in Medieval Nishapur, international journal of Middle East studies, Cambridge, 1994, Vol.26, No.3, PP.428-429.

## سێیەم: دەرکەوتە و خەسڵەتەکانی سۆفیگەری لە ڕۆژئاوای هەرێمی چیا(الجبال)

لە نێو ناوچە و دەڤەرە کوردیەکاندا ڕۆژئاوای هەرێمی چیا، پتر بۆتە بنکەی سۆفییان و ئەو دیاردە ئایینییەی تێدا دەرکەوتوە، بە جۆرێك کە وا دەبینرێ دیاردەکەی تێیدا چڕ بۆتەوە و زۆربەی گەورە سۆفییانی پانتایی کوردیی خەڵکی ئەوێن.

بەر لەوەی بچینە سەر باسی سۆفیگەری لە شارەکانی ئەو دەڤەرەدا، دەشێ چەند هۆکارێك لە مەڕ ئەو چڕبوونەوەیە پێشنیار بکەین؛ بەر لە هەموویان پێگەی دەڤەرەکەیە لە چوارچێوەی نەخشی جوگرافی سەرهەڵدان و گەشەسەندنی سۆفیگەریی ئیسلامیی بەگشتی، دەڤەرێك کە کەوتۆتە نێوان دوو لە سەرەکیترین بنکەی ئەو سەرهەڵدان و گەشەسەندنە و، وەك ئەلقەی پێکبەستی نێوان ئەو دوو بنکەیە – لایەنی کەم لە رووی راستیی جوگرافیەوە – بووە، ئەوانیش ناوچە فارسییەکان بە گشتی و بەتایبەت خوراسان لەگەڵ هەرێمی عێراق بەتایبەت بەغدادی پایتەختی عەبباسییەکان، زۆرجار سۆفییانی ئەو دوو بنکە یاخود قوتابخانەیە، لە گەڕان و سوڕانەکانیاندا، بەو هەرێمەدا گوزەریان کردووە یاخود تێیدا ماونەتەوە و پەیوەندیان لەگەڵ کەسانێکدا گرێ داوە کە سەرسامی دیاردە ئایینییە نوێیەکە بوون و کەسێتی خۆیانیان تێدا دۆزیوەتەوە[٢٠٨]. ئیدی لەم قۆناغی سەرهەڵدانەدا سۆفییانی ئەو دوو قوتابخانەیە هەژموونی تەواویان کردۆتەوە سەر دەرکەوتەکانی هزرەکە و بە تێز و چەمکەکانی خۆیان سنووربەندیان کردووە و ئەوانیتری دەرەوەی خۆیان ناچارکردووە بەم تێز و چەمکانە بیربکەنەوە و بەرهەمیان بهێننەوە.

لەلایەکی ترەوە، رەنگە سروشتی ئەو ناوچەیە و ناوچە کوردییەکان بە گشتی، لەبار بووبێ بۆ گەشەسەندنی دیاردەیەکی وەك سۆفیگەری، تا ئەو کاتەی سۆفی نیشتەجێی ناو شوێنە یاخود با بڵێین پێناسی خۆی لە جۆرێکی دیاریکراوی شوێندا بەرجەستە دەکات و هاوکارێتی لە خۆدیتنەوە لە ناو حاڵی سۆفییانەدا، بەتایبەت شوێنی دوورە ئاوەدانی و خاوەن پێکهاتەی تۆپۆگرافی سەخت وەك جەختکردنەوەیەك لەسەر رووخساری دوورەپەرێزیی و تەرکە

---

(٢٠٨) بۆ نموونە بڕوانە: الكلاباذي: التعرف, ص١١٧. ابن خميس: مناقب, ج١, ص٤٣٤. ابن الجوزي: صفة الصفوة, ج٤, ص٩٨. ابن الساعي: أخبار الحلاج, اعتنى بنشره: ل. ماسينيون و ب. كراوس, منشورات الجمل, كولونيا, ١٩٩٩, ص ٤٥, ٤٩.

دونیاییەکەی ئەو پێناسەیە، هەرێمەکەش، کە بە پێکهاتە چیاییە دژوارەکەی ناسراوە[٢٠٩]، هەر لە سروشتی خۆیدا ئەم خەسڵەتە دوورەپەرێزییەی هەبووە و لەباربووە بۆ شێوە ژیانی سۆفییانە، تا راستەوخۆ لە نێو ئەم سروشتەدا بە جۆری ئەو پەیوەندییە بگەن کە دەخوازن لەگەڵ خودا و خۆیاندا گرێی بدەن. ئەگەر لەوێشدا — لە دەرەوەی حاڵەتی دوورەپەرێزیی پەیوەندیان بە خەڵکەوە هەبێ و هزریان بە ویست یان بێ ویستی خۆیان جێکەوتەی کۆمەڵایەتی هەبێ، ئەوا لەگەڵ خەڵکانێکە — کە لێرە بەشی هەرە زۆری کوردن — بەشێکن لەو سروشتە و لە ئاستێکی ئەوتۆی بیرکردنەوە و بیروباوەڕی ئایینیدان، کە لەگەڵ تێگەیشتن و جیهانبینی سۆفییانەدا گونجاوە و زەمینەیەکی کۆمەڵایەتیان هەیە وایکردووە، باش و خراپیان، قەبوڵی کەسێتی سۆفی بکەن و وەك رێبازێکی دروستی باوەڕداریی سەرەدەری لەگەڵدا بکەن[٢١٠]، وەك لە کۆتاییەکانی ئەو توێژینەوەیەدا زیاتر روونیدەکەینەوە. لە گرنگترین بنکەکانی سۆفیگەری ئەو هەرێمە:

**١- دینەوەر وەك شاری سۆفییان:**

ئەگەر پێش وەختە گوتمان رۆژئاوای هەرێمی چیا بنکەی سەرەکی سەرهەڵدانی سۆفیگەری بووە لە پانتایی کوردیدا، ئەوا دەشێ شاری دینەوەر لە نێو ئەو بنکەیەدا بە "شاری سۆفییان"ی ناوبنێین؛ شارێك کە بەرجەستەکاری تێزی سۆفییانی قوتابخانە و رەوتە جۆربەجۆرەکانی بووە و لەوێدا تێزەکان جێکەوتەی دیاریان هەبووە و برەویان پێ دەدرا.

ئەو شارە، ئەگەرچی لە ئێستادا لە پاشماوەیەکی کەمی شوێنەواریی لە "ئوستانی کرماشان"دا هیچی تری بەسەر یەکەوە نەماوە[٢١١]، بەڵام لە کۆنەوە تا سەردەمانێکی

---

(٢٠٩) اليعقوبي: كتاب البلدان, ط ٣, المطبعة الحيدرية, النجف الأشرف, ١٩٥٧, ص٦. ابن حوقل: صورة, ص٣١٥.

(٢١٠) بۆ نموونە بڕوانە: الهجويري: كشف, ج٢, ص ص٥٦١-٥٦٢. ابن خميس: مناقب, ج٢, ص ص٢٣٥-٢٣٦. السلفي: معجم السفر, حققه: عبد الله عمر البارودي, المكتبة التجارية, مكة المكرمة, د.ت, ص١١٥.

(٢١١) لەوەدەچێ شارەکە دوای شاڵاوەکانی تەیمور لەنگ (٧٧١-٨٠٧ك/١٣٦٩-١٤٠٥ز), وێران بووبێ, بۆیە ناوی لە ناو رووداوە مێژووییەکاندا نامێنی. ئێستا پاشماوەکانی لەو نوستانە, لە نزیك بە شاری "صحنە" ماوەتەوە. بۆ زانیاری زیاتر لەسەر ئەم بابەتە بگەڕێوە بۆ: حسام الدين علی غالب نەقشبەندی: شارەزوور,

درەنگی قۆناغی ئیسلامیی کلاسیکیدا، لەچەندان رووەوە پانتاییەکی جوگرافیی گرنگ بووە و رەنگرێژی یادەوەری مێژوویی دەڤەرەکەی کردووە. لەرووی مێژووی ئایینیشەوە هەر وابووە؛ پێگەیەکی بیروباوەڕە ئایینییە نێوخۆییەکانی پێش ئیسلام بووە[٢١٢]. دواتریش، وەك لە دوتوێی ئەو توێژینەوانەی لەسەر هەرێمەکە بەگشتی و شارەکە ئەنجامدراوە، دەردەکەوێ کە لەگەڵ جێگیربوونی دەسەڵاتی سیاسی – ئایینی خەلافەتی ئیسلامی، تێکەڵ بە جیهانبینیی ئەو ئایینە نوێیە بووەو ئاشنایەتی لەگەڵ بیروباوەڕ و ئاراستە هزرییەکانی جیهانەکەدا هەبووە[٢١٣]، ئەوەتا دەبینین لە ماوەیەکی کەمی دوای هەژموونی ئیسلامیی بۆتە بنکەیەکی سەرەکی زانست و زانینە ئیسلامییەکان و لە زۆر لاوە زانا و زانستخوازان روویان تێ دەکرد[٢١٤]، هەندێکیان هەر تێیدا نیشتەجێ دەبن و تا مردنیان جێی ناهێڵن[٢١٥]؛ جا هەر لە

---

ل٤٨.مسعود گلزاری: کرمانشاهان – کردستان, انتشارات انجمن مللی, تهران, ١٣٥٨هـ.ش, ص ٢٢٣, ٢٧١-٢٩٨.

L. Lochart: Dinawar, EI, Vol.II, p.299.

(٢١٢) ابن الندیم: الفهرست, ص٤٩٣.

(٢١٣) لێرەدا تەنیا چەند لایەنێکی رەوشی شاری دینەوەر دەخەینەڕوو کە پەیوەندیی بە ناوکۆی بابەتەکەوە هەیە, چونکە پێشتر تەواوی ئەو رەوشە لە چەندان رووەوە و لە ئاستی ئەکادیمیدا لێی کۆڵراوەتەوە و کارایییە مێژوویییەکەی لە چوارچێوەیەکی هەمەکیدا روونکراوەتەوە؛ بڕوانە: حسامەدین نەقشەبەندی: شارەزوور, ل٤٧-٤٨, ١٧٩, ٤٨٣-٤٩٣. مهدی قادر خضر: الحیاة الفکریة و العلمیة في غربي اقلیم الجبال في القرنین الرابع و الخامس للهجرة, رسالة ماجستیر, جامعة صلاح الدین, کلیة الآداب, اربیل, ١٩٩٤. چرا محمود حسن: بزاڤی زانستی دینەوەر لەسەدەی سێیەم و چوارەمی کۆچی/ نۆیەم و دەیەمی زایینیدا, نامەی ماستەری بڵاونەکراوە, زانکۆی سلێمانی, کۆلێژی زانستە مرۆڤایەتیەکان, سلێمانی, ٢٠٠٧, ل٨ بەدواوە.

(٢١٤) القزویني: الإرشاد, ج٢, ص٦٣٧. السمعاني: الأنساب, ج٣, ص٥٥٢. الذهبي: سیر أعلام, ج١٧, ص٤٥٤. المناوي: فیض القدیر, المکتبة التجاریة الکبری, القاهرة, ١٣٥٦هـ, ج٦, ص٣٠٥.

(٢١٥) الأنصاري: طبقات المحدثین بأصبهان, تحقیق: عبد الغفور عبد الحق البلوشي, مؤسسة الرسالة, بیروت, ١٩٩٩, ج٣, ص١٦٨. المتقي الهندي: کنز العمال في سنن الأقوال و الأفعال, تحقیق: محمود عمر الدمیاطي, دار الکتب العلمیة, بیروت, ١٩٩٨, ج٢, ص٢١٥.

فەرموودە گێڕەرەوانەوە بگرە کە زۆر دەهاتنە ئەوێ[٢١٦] تا قازی[٢١٧] و فەقیهەکان[٢١٨]. ئیدی ئەوەی دەیویست سوود لەو زانا و شارەزایانە وەربگرێ دەبووا بهاتایەتە شارەکە و لە سەردەستی "شێخانی دینەوەر" بیخوێندایە[٢١٩].

لێرە بەدواوە شار ئامادەکراوە بۆ قەبوڵکردن یاخود ڕەتکردنەوەی هەر ڕەوت و ڕێبازێکی ئایینی، چونکە ئەو فراوانبوونەی چالاکی زانستی هەر بە مانای جێگیربوونی تێگەیشتنی ئایینی نەبووە، بەڵکو ئەوەی دەبینرا هەمەچەشنی و فرەجۆری بوو لە گوزارشت و پەیڕەوی ڕەوتە ئایینییەکان؛ بەتایبەت هەبوونی چەند ڕێبازێکی وەك "سوفیانیی"، هەروەها هەبوونی ڕەوتێکی "شیعەی ئیمامی"ش، کە بە نهێنی و بە ئاشکرا لەوێ کاری دەکرد. ئەو فرەجۆریەش بۆتە بەشێك لە ناسنامەی شارەکە[٢٢٠]، ئەمەش وەك پێشتر بینیمان هاوکار بووە لە دەرکەوتن و گەشەسەندنی سۆفیگەری، تا ئەو کاتەی ئەو ڕێبازە ئایینیانە – هەریەکە و بەپێی سیستەمی خۆیەوە - پاڵپشتی ئەو دیاردەیە بوون و پەیوەندییەکی تەواوکارانەیان لەگەڵدا هەبووە و ویستوویانە لەخۆی بگرن و دەرکەوتەکانی بەخۆیانەوە سنووریەند بکەن.

جگە لەمە، شارەکە چەندان تایبەتمەندی تری هەبووە، یەك لەو تایبەتمەندییانە گەشەسەندنی بەرچاوی لایەنی دیمۆگرافیەکەی بوو لە سێ سەدەی یەکەمی کۆچیدا؛ کە

---

(٢١٦) التميمي: الجرح و التعديل, ج٧, ص٢٠٧. ابن مندة: فتح الباب في الكنى و الألقاب, تحقيق: ابو قتيبة الفاريابي, مكتبة الكوثر, السعودية, ١٩٩٦, ص١٥٠.

(٢١٧) ابو نعيم: تاريخ اصبهان, حققه: سيد كسروی حسن, دار الكتب العلمية, بيروت, ١٩٩٠, ج٢, ص٢٦١. ابن ماكولا: الإكمال, دار الكتب العلمية, بيروت, ١٤١١هـ, ج٥, ص٨٤. ابن حجر: لسان الميزان, ط٣, مؤسسة الأعظمي للمطبوعات, بيروت, ١٩٨٦, ج٣, ص٣٣٦.

(٢١٨) الذهبي: تذكرة الحفاظ, دار الكتب العلمية, بيروت,د.ت, ج٣, ص١٠٨٣. السبكي: طبقات الشافعية الكبرى, تحقيق: محمود محمد الطناحي و عبد الفتاح محمد الحلو, دار إحياء الكتب العربية, القاهرة, د.ت, ج٥, ص١٨.

(٢١٩) القزويني: الإرشاد, ج٢, ص٦٢٥., ص١٥٩.

(٢٢٠) لەبارەی ڕەوشی ئایینی شارەکە بە گشتی بگەڕێوە بۆ: چرا محمود حسن: بزاڤی زانستی دینەوەر, ل٣٣-٣٥.

وایکردووە پێکهاتەیەکی رەگەزیی تێکەڵی هەبێت[٢٢١]، بەمەش لەلایەك ژمارە دانیشتوانەکەی زۆر زیادی کردووە، بە بەڵگەی ئەوەی لە ئاکامی ئەو بوومەلەرزەیەی لە ساڵی (٣٩٨ك/١٠٠٧ز) لە شارەکەی داوە، بە پێی سەرچاوەکان بە هەزاران کەس کەوتوونەتە ژێر داروپەردووی داروخاوەوە[٢٢٢]، بۆیە لەو قۆناغەدا وەك یەك لە گەورەترین شارەکانی هەرێمی چیا ناوی دەبرێ[٢٢٣]. لەلایەکی ترەوە فرەرەگەزیی و ژمارە زۆریی، ئەگەری کرانەوەی شارەکەی بەسەر دەرەوەی خۆی پتەوکردووە، رەنگە ئەمەش رێگە خۆشکەر بووبێ تا وەك ئەلقەی پێکبەستی هەردوو قوتابخانە سەرەکیەکەی هزری سۆفیگەری (عێراق و خوراسان) دەربکەوێ.

دەسەڵاتی خەلافەت لەلای خۆیەوە – تا ئەو کاتەی بەهێز بوو – راستەوخۆ چاودێری رەوشی دینەوەری کردووە[٢٢٤]، هەوڵیداوە چالاکی رەوتە ئاینیەکانی ئەوێ کۆنترۆڵ بکات؛ خەلیفە متەوەکیل هەبوونی شیعەی لەوێ پێ قەبوڵ نەبووە و بە توندی رووبەڕوویان بۆتەوە[٢٢٥]. لە بەرامبەردا ئەگەر سۆفیگەری تیایدا گەشە دەسەنێ ، ئەوە دیارە ئەو خەلیفەیە و دەزگای خەلافەت بەگشتی کێشەیەکیان لەگەڵدا نییە، تا ئەوکاتەی دیاردەکە مەترسی بۆ دروست ناکات و گەورە سۆفییانی ئەوێ پاڵپشتی لە بڕیارەکانی ئەم دەزگایە

(٢٢١) اليعقوبي: البلدان, ص٣٥.

(٢٢٢) ابن الجوزي: المنتظم, ج١٥, ص٦٠. السمعاني: الأنساب, ج٥, ص٣٦. سبط ابن الجوزي: مرآة الزمان في تاريخ الأعيان(٣٤٥-٤٤٧هـ), دراسة و تحقيق: جنان جليل الهموندي, الدار الوطنية, بغداد, ١٩٩٠, ص٢٧٤.

(٢٢٣) الأصطخري: المسالك و الممالك, تحقيق: محمد جابر عبدالعال, دار القلم, القاهرة, ١٩٦١. ابن حوقل: صورة, ص٣٠٨.

(٢٢٤) مسكويه: تجارب الأمم, حققه: ابو القاسم امامي, دار سروش للطباعة و النشر, طهران, ١٩٩٧, ج٤, ص٤٩٦. ابن الجوزي: المنتظم, ج١٢, ص١٦٣, ١٣٩.

(٢٢٥) ابن خلكان: وفيات, ج١, ص٣٥١-٣٥٢.

بەسەر ڕەوتی ناباوی دیاردەکە دەکەن و هاوکارن لە بنبڕکردنی هەر ئاڕاستەیەك کە دەسەڵات یاساغی دەکات[٢٢٦].

لەلایەکی ترەوە، برەوسەندنی سۆفیگەری و پێگەیشتنی لە دینەوەر، ڕاستەوخۆ پەیوەستە بە گەشەسەندن و جێگیربوونی دیاردەکە لە پانتایی ئیسلامیدا، بە تایبەت لە شارێکی گرنگی وەك بەغداد، کە لە ناوەڕاستی سەدەی سێیەم تا ناوەڕاستی سەدەی چوارەمی کۆچییەوە سۆفییان بەسەر سنوورێکی بەرفرەی هزری ئایینی ڕادەگەیشتن، هەروەها زۆر لەو تێز و چەمکانە دا دەهێنن کە دەبنە بناخەی گوتاری سۆفیگەریی ئیسلامی، ئیدی سۆفیگەری لەوێدا لە چوارچێوەی قوتابخانەیەکی تایبەتمەند خۆی دەناسێنێ[٢٢٧]. هاوکاتی ئەو پرۆسەی گەڵاڵەبوونە دەبینین زۆر لەو دینەوەرییانەی تێکەڵ بە سۆفیگەری دەبن، لە مورید و یاوەرانی گەورە سۆفییانی ئەوێن، لە شارەکەی خۆیان و لە دەرەوەیدا هەمان ئەو تێز و چەمکانە دەخەنە ڕوو و دەیکەنە پاشخانێکی هزرەکەیان و ئامرازێکی ناساندنی خۆیان.

بەهەرحاڵ، ڕەنگە ئەو سۆفییەی بەغداد، کە کاریگەریی دوورمەودای بەسەر سۆفییانی دینەوەر — تەنانەت ناوچە کوردییەکانی تریشەوە — هەبووبێ جونەیدی بەغدادی (م ٢٩٨ك/٩١٠ز) بێت، کە وێنەی هەرە هۆشمەندی قوتابخانەکەیە و ڕووخسارەکانی ئەو قوتابخانەیە بە تەسەوفی ئەو دەناسرێتەوە[٢٢٨]. پەیوەندیی یەکەمین سۆفییانی دینەوەر بەو سۆفییە تایبەتمەندی خۆی هەبووە، ئەوان لەسەر دەستی یاخود بە هاوکاری ئەوەوە لە سۆفیگەری ڕاماون و تێیگەیشتوون. پێدەچێ ئەو پەیوەندییەش زێتر لە ڕێگەی پەیام گۆڕینەوە بووبێ، بەو مەبەستەی پرس و بابەتە سۆفییەکان روون ببێتەوە و هەردوولا لە یەکتر سوودمەند

---

(٢٢٦) بۆ نموونە بڕوانە: الخطيب البغدادي: أخبار الصوفية و الزهاد من تاريخ بغداد, جمعتـه و حققتـه: بلسم بصري عزت, دار الغرب الإسلامي, بيروت, ٢٠٠٤, ص١٥٣. ابن الجوزي: تلبيس ابليس, ص١٩٨. ابن حجر: لسان الميزان, ط ٣, مؤسسة الأعلمي للمطبوعات, بيروت, ١٩٨٦, ج٢, ص٣١٤.

(٢٢٧) لەبارەی "قوتابخانەی سۆفیگەری بەغدادی" و تایبەتمەندییەکانی دەشێ بگەڕێیەوە بۆ: عبد القادر موسى حمادي المحمدي: مدرسة بغداد الصوفية, رسالة ماجستير غير منشورة, كلية الآداب, جامعة بغداد, بغداد, ١٩٨٩, ص٦٠ — ١٤٩.

Ahmet T. Karamustafa: Sufism, pp.1-26.

(٢٢٨) كامل مصطفى الشيبي: صفحات, ص١١٧. محمد جلال شرف: دراسات في التصوف الإسلامي, دار النهضة العربية, بيروت, ١٩٨٤, ص٢٣٥.

بن. ئەوەی سەرچاوەکان لەم بوارەدا پێمان دەڵێن ئەوەیە کە جونەید پەیامی گۆڕیەوەتەوە لەگەڵ هەریەك لە: ئەبوبەکری کەسائی دینەوەری(م. پێش٢٩٨ك/٩١٠ز)، مەمشادی دینەوەری (م٢٩٩ك/٩١١ز)، هەروەها ئەبولعەباسی دینەوەری[٢٢٩]، کە لە بەشی رابردوو تۆزێك باسمان کرد. بێگومان ئەو پەیوەندییەش گڕوتینی خستۆتە نێو ئەم سۆفییانە و کاریگەریی بەسەر فەزای گشتی دینەوەر هەبووە.

ئەو پەیوەندییە لە ئاستێکی باڵای قوڵبوونەوەی سۆفییانە بووە، وەك لەگەڵ ئەبوبەکری کەسائی دینەوەری دەردەکەوێ، کە تەنانەت لە زاری جونەید دەگێڕنەوە گوتوویەتی: (( ئەگەر ئەبوبەکر نەبوایە، من لە عێراق نەدەمام))[٢٣٠]، ئەو سۆفییەی دینەوەر بەوە ناسراوە پەیامی زۆری بۆ دەنارد[٢٣١]، تەنانەت گوایە بەر لە مەرگی نزیکەی هەزار پرسی ئاراستەی جونەید کردووە و ئەویش وەڵامی هەمووی داوەتە و بۆی رەوانە کردۆتەوە[٢٣٢]. جێگەی داخە سۆراخی ناوەڕۆکی ئەو پرس و وەڵامانەمان نییە و نازانین ئەو مەسەلانە چی بوونو، کە ئەو دوو سۆفییەی پێ سەرقاڵ بووە. ئەگەرچی لەوە دەچێ مەسەلەی ورد و هەستیار بن کە تێگەیشتنیان بۆ خەڵکانی تر مەترسیدار بووە، بە بەڵگەی ئەوەی ئەبوبەکری کەسائی بەر لە مردنی هەموو ئەو پەیامانەی جونەید بۆی هەناردبوون لەناو بردوە، تا هیچ کەس لە دوای خۆی پەی بە ناوەڕۆکیان نەبات، سۆفی بەغداش بەم کارەی شادومان بووە[٢٣٣]، چونکە لەوە دەترسا ئەو ناوەڕۆکانە بەدەستی خەڵکی تری ناشایستە بگات و رازی نێوانیان ئاشکرا ببێت.

لەگەڵ ئەوەشدا ناوەڕۆکی پەیامێکی جونەید، کە لە وەڵامی پەیامێکی سۆفییەکەی دینەوەرە، نەبەردەستماندا ماوە. لە ناوەڕۆکەکەیدا دەردەکەوێ ئەو پەرۆشی هەواڵی کەسائی بووە و ئاگاداری حاڵەتی ناجێگیری دەروونیی ئەو و ئارەزووی بۆ تێگەیشتن و کردنەوەی گرێی چەندان پرسیاری

---

(٢٢٩) السراج: اللمع, ص٣٠٥, ٣١١-٣١٢. ابو نعيم: حلية, ج١٠, ص٢٦٥.

(٢٣٠) الأنصاري: طبقات الصوفية, ص٣٤٤. جامي: نفحات, ص١٢٨.

(٢٣١) السراج: اللمع, ص٣١٢.

(٢٣٢) الأنصاري: طبقات الصوفية, ص٣٤٤. عين القضاة الهمداني: شكوى الغريب عن الأوطان الى علماء البلدان, تحقيق: عفيف عسيران, دار بيبلوس, باريس, دون تاريخ, ص١٩-٢٠. فريد الدين عطار: تذكرة الأولياء, بتصحيح: احمد آرام, چاپ سوم, انتشارات گنجينه, تهران, ١٣٨١هـ.ش, ج٢, ص١٣٤.

(٢٣٣) الأنصاري: طبقات الصوفية, ص٣٤٤. جامي: نفحات, ص١٢٨.

هەبووە، جونەیدیش لە قالبێكی ڕەوانبێژیانەوە و بە زمانێكی پڕ لە ئامۆژگاری و ئاگادارکردنەوە لە مەینەتییەکانی دونیا و...هتد، وەڵامی داوەتەوە. لەو پەیامەی کە بۆ ئەبولعەباسی دینەوەریش ڕەوانە کردووە، جەخت لەسەر پایەبەرزی ئەو کەسانەوە دەکاتەوە کە هەڵبژێردراوی خودان(دیارە مەبەستی سۆفییانە)، لەگەڵ ئاماژەدانی بۆ ئەو ئەرکەی دەکەوێتە سەر شانیان بۆ هێشتنەوەی پایەی خۆیان و مانەوەیان وەك کۆڵەگە و ڕاگری دین و دونیا[٢٣٤].

هەرچۆنێك بێت، ئەو پەیوەندییەی جونەید بە سۆفییانی دینەوەر لە ئاستی گۆڕینەوەی بیروباوەڕ و دیاریکردنی سنوورەکانی هزری سۆفییانە نەوەستاوە، بەڵکو پەڕیوەتەوە بۆ ئاستی کردەکی و بەشێك لە سۆفییانی شارەکە ڕاستەوخۆ لەو نزیك بوونەتەوە و وتە سۆفییەکانی لە زاری خۆی دەگێڕنەوە[٢٣٥]، تەنانەت هەندێك لە دینەوەرییەکان بەتایبەت بۆ بینینی ئەو دەچوونە بەغداد خزمەتی خۆی و یاوەرانیان دەکرد[٢٣٦] .

بەهەمان شێوە سۆفییەکی تری بەناوبانگی بەغدا ئەبوبەکری شبلی، بەشێك لە دینەوەرییەکانی لێ کۆ ببۆوە، لەوانە بوکرانی دینەوەری، کە تا کۆتایی ژیانی ئەو سۆفییەی بەغدا لەگەڵیدا بووە و دواین بیروڕا و وەسیەتەکانی دەگێڕێتەوە[٢٣٧]، بەڵام لەسەر خۆی و کەسێتی سۆفییانەوی هیچمان لەبەردەستدا نییە. جگە لەو دینەوەریی تریش هەبوون موریدی شبلی بوونە و لەوە دەچێ لەڕێگەیەوە شارەزاییان لە بنەماکانی سۆفیگەری پەیدا کردبێ، دواتریش خۆیان بوونەتە سۆفی، لەوانە عیسای قەصاری دینەوەری[٢٣٨]، کە لەشوێنی تردا باسی دەکەین.

لە ئاکامی هەموو ئەوانەدا شاری دینەوەر دەبێتە بنکەیەکی دیاری سۆفیگەری و چەندان شێخی ناوداری لێ دەردەکەوێ. ئەو سۆفییەی دینەوەر کە لە سۆفییەکانی تر پتر کاریگەریی

(٢٣٤) ابو نعيم: حلية, ج١٠, ص٢٦٥.

(٢٣٥) السلمي: طبقات, ص١٥٩, ٣١٧. العمري: مسالك الأبصار في ممالك الأمصار, تحقيق: بسام محمد بارود, اصدارات المجمع الثقافي, ابو ظبي, ٢٠٠٠, ج٨, ص١١٧.

(٢٣٦) ابن خميس: مناقب, ج١, ص٣٣٦.

(٢٣٧) السراج: اللمع, ص١٤٥, ٢٨١. الخطيب البغدادي: أخبار الصوفية, ص٣٢٤. القشيري: الرسالة, ص١٠٢, ٤٦٣.

(٢٣٨) السراج: اللمع, ص٢٠٠.

بەسەر پانتایی شارەکەدا هەبووە و بە رێژەیەکی زۆر بونیادی هزری سۆفیگەری ئەوێی دارشتوە و دەرکەوتەکانی رەنگرێژ کردووە مەمشادە.

**مەمشادی دینەوەری و دیاریکردنی روگەی بوونە سۆفی:**

مەمشاد وەك "شێخی چیاکان – شیخ الجبال" ناسراوە[239]. لەراستیدا، وەك زۆربەی سۆفییانی تری سەردەمەکە، ئەوەندە زانیاریی لەسەری نییە بایی ئەوە بێت تەواوی دوورایییەکانی کەسێتییەکەی پێ بخوێنرێتەوە، ئەوەی لەبەردەستیشدایە زۆرجار لە بری روونکردنەوەی ئەو دووراییانە تەڵخی دەکەن و کارەکەمان ئەستەم تر دەکەن. ئەوەتا هەر لە ناوی ئەو سۆفییەدا دووچاری قەیران دەبینەوە؛ لەو سەرچاوانەی نزیك بە سەردەمی خۆین، بە تایبەت سەرچاوە سۆفییەکان، ئاماژەیەك نییە بۆ تەواوی ناوەکەی و وادێتە بەرچاو کە "ممشاد"[240] ناویەتی[241]، بەلاّم لە سەرچاوەکانی دواتردا دەردەکەوێ کە ئەمە نازناویەتی و خۆی ناوی تری هەبووە. لەمەشدا جیاوازی لە نێوان نووسەرەکاندا هەیە؛ ئیبن حەجەری عەسقەلانی(م ٨٥٢ك/١٤٤٨ز) دەڵێ ناوی محەمەد کوڕی حەسەنە و کونیەی ئەبو عەلی یە[242]، کەچی هەندێك سەرچاوەی درەنگتر جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە ناوی شێخ عەلۆ یە[243]. بەهەر حاڵ ئەو زانیارییانە بەس نین بۆ یەکلاکردنەوەی ناوی دروستی ئەو گەورە

---

(٢٣٩) الأنصاري: طبقات الصوفية, ص٣٠٠.

(٢٤٠) برێك لە سەرچاوەکان لە بری "ممشاد" بە شێوەی "ممشاذ" دەینوسن؛ بڕوانە: السراج: اللمع, ص٢٥٤,٢٧١. السلمي: طبقات, ص٣١٧. السلفي: معجم, ص١٠٤, ٣٤٢. الصفدي: الوافي بالوفيات, تحقيق: احمد الأرناؤوط و تركي مصطفى, دار احياء التراث العربي, بيروت, ٢٠٠٠, ج٢٦, ص٤٢.

(٢٤١) هەر بۆ نموونە بگەڕێوە بۆ: الخركوشي: تهذيب, ص١٨, ١٤١. السلمي: طبقات, ص٣١٧. ابن خميس: مناقب, ص١٦.

(٢٤٢) نزهة الألباب في الألقاب, تحقيق: عبد العزيز محمد السديري, مكتبة الرشد, الرياض, ١٩٨٩, ج٢, ص١٩٨.

(٢٤٣) نكري: دستور العلماء, عرّب عباراته الفارسية: حسن هاني فحص, دار الكتب العلمية, بيروت, ٢٠٠٠, ج٤, ص٥٩. محمد معصوم شيرازي: طرائق الحقائق, با تصحيح: محمد جعفر محجوب, چاپ دوم, انتشارات سنايى, تهران,١٣٨٢ ه.ش, ج٢, ص١٤٩.

سۆفییەی دینەوەر، هەر بۆیە نازناوەکەی — واتە مەمشاد - زاڵ بووە بەسەر ناوی راستەقینەی و لە نێوەندی سۆفییاندا هەر ئەمەیان باو بووە و ماوەتەوە.

بەهەمان شێوە لەبارەی ژیانی بەر لە بوونە سۆفیشی شتێکی ئەوتۆ نازانین، ئەوە نەبێ دەڵێن لە بنەڕەتدا کوڕی بنەماڵەیەکی دەسەڵاتدار بووە، بەڵام پاشتر پشتی لە ئارەزووە دونیاییەکان کردووە و ڕێگەی سۆفییانی گرتۆتەبەر[244] و پێی ناسراوە[245]. بە وردیش نازانین لە چەند ساڵییەوە ئەو ڕێبازەی هەڵبژاردوە و چەند ساڵی تەمەنی سۆفییانە ژیاوە، ئەگەرچی بەپێی زۆر گێڕانەوە وا پێدەچێ نزیکەی (٣٠)ساڵی تەمەنی[246]، واتا -- بەپێی ئەوەی لە ساڵی (٢٩٩ك) مردوە — لە دەوروبەری (٢٦٩ك/٨٨٢ز)دا بۆتە سۆفی، تەنانەت بڕێك لە سەرچاوە زێدەڕۆیی دەکەن و تەمەنی سۆفییانەی دەگەیەننە (٤٠) ساڵ، بەڵکو (٦٠)ساڵیش[247]. لە هەموو بارەکاندا دەگەینە ئەو ئاکامەی مەمشاد یەکێکە لە یەکەمین ئەو دینەوەرییانەی بۆتە سۆفی، نەك هەر سۆفییەکی سادە و ساکار، بەڵکو شێخێکی دیاری ڕێبازەکە و دامەزرێنەر و بانگەشەکارێکی سەرەکی ئەو ڕێبازە لە پانتایی شارەکەی و ڕۆژهەڵاتی جیهانی ئیسلامی بە گشتی[248].

ئەوەی ڕێگەی بەو پایەی مەمشاد داوە و تۆخی کردۆتەوە، پێگە و پەیوەندییەکانییەتی لەگەڵ سۆفییە هاوچەرخەکانی، کە زیاتر پەیوەندییەکی دۆستانە بووە، لە سەرووی هەمووشیانەوە لەگەڵ جونەید؛ ئاماژە بۆ ئەوە دەکرێ کە ئەو لەسەر دەستی ئەم سۆفییەی بەغداد سۆفیگەری وەرگرتووە و "خیرقە"[249]ی پۆشیوە[250]. دواتریش وەك یاوەرێکی ئەو —

---

(٢٤٤) ابن تغري بردي: النجوم الزاهرة في اخبار مصر و القاهرة, وزارة الثقافة و الأرشاد القومي, القاهرة, د.ت, ج٣, ص١٧٩.

(٢٤٥) الصفدي: الوافي, ج٢٦, ص٤٢.

(٢٤٦) بڕوانە: القشيري: الرسالة, ص٤٦٤. الغزالي: إحياء علوم الدين, دار المعرفة, بيروت, د.ت, ج٤, ص٤٨٣. ابن خميس: مناقب, ج٢, ص١٤. ابن خراز: العاقبة في ذكر الموت, حققه: خضر محمد خضر, مكتبة دار الأقصى, الكويت, ١٩٨٦, ص١٣٥.

(٢٤٧) الأنصاري: طبقات الصوفية, ص٣٠١. جامی: نفحات, ص٩٢.

(٢٤٨) الأنصاري: طبقات الصوفية, ص٣٠٠.

(٢٤٩) دواتر, لەبەشی چواردەم, زیاتر باس لە ماناکانی "خیرقە پۆشین" دەکەین.

بەڵام لە دینەوەر — دەمێنێتەوە؛ کە وەك پێشتر گوتمان پەیامیان بۆ یەکتر دەنارد، لە نێو یەك لەو پەیامانەشدا دەردەکەوێ مەمشاد پێی وابووە ئەوەی ئەو و جونەیدی لە یەکتر نزیك خستۆتەوە هاوڕاییە بووە لە هەندێك بنەمای سەرەکیی سۆفیگەری وەك ناسینی حەقیقەت، لەو گوتەنی لەمەدا بۆچوونەکانیان دژ بەیەك نەبوون[٢٥١]. ئیدی دەشێ مەمشاد لە دینەوەردا درێژە پێدەر یاخود بەرجەستەکاری تێز و بیروبۆچوونەکانی ئەم رێبەرەی قوتابخانەی بەغدادی سۆفیگەری بووبێ. لەبەر ئەوەیە دەبینین — لە قۆناغی درەنگتری مێژووی سۆفیگەری — لە نێو کولتووری تەریقەتە سۆفییەکاندا، لەو زنجیرەبەندییەی زۆر لەو تەریقەتانە هەیانە، لە رێگای ئەو سۆفییەی دینەوەرەوە خۆیان دەبەنەوە سەر جونەید و بە جێنشینی ئەوی دادەنێن[٢٥٢].

هەرچۆنێك بێت، تێزەکانی مەمشاد وەك بەرنامەیەکی سەرەتایی دێنە بەرچاو، کە بە هۆیانەوە مرۆڤی ئاسایی دەشێ رێگای خۆی لە نێو راڕەوەکانی ئەو کایە ئایینییەدا ببینێتەوە، بۆیە دەخوازێ ئەو هەنگاوانە دەستنیشان بکات کە هاوکاری ئەو مرۆڤە دەکەن تا ببێتە سۆفییەکی دروست، ئەو هەنگاوانەش بەشێکیان زیاتر جەختکردنەوەن لەسەر لایەنی کردەکی هزرەکە و بەشەکەی دیش دارشتنی چوارچێوەیەکە بۆ بیرکردنەوەی سۆفی و تێگەیشتنی لەو چەمك و رەوتە ئایینیانەی پێویستە ئاشنایان بێت و بوونی سۆفییانەی خۆی لەسەر دابمەزرێنێ.

بەر لە دەستنیشانکردنی هەنگاوەکان، گەورەی سۆفییانی دینەوەر، مرۆڤەکان لە ئەستەمی هەڵبژاردنی ئەو رێبازە ئاگادار دەکاتەوە، چونکە دواجار ئەمە رێگەیەکە هەم بۆ

---

(٢٥٠) اليافعي: مرآة الجنان و عبرة اليقظان في معرفة ما يعتبر من حوادث الزمان, وضع حواشيه: خليل منصور, دار الكتب العلمية, بيروت, ١٩٩٧, ج٤, ص٤١. ابن الملقن: طبقات الأولياء, تحقيق: مصطفى عبد القادر عطا, دار الكتب العلمية, بيروت, ٢٠٠٦, ص٣٢٠. جامي: نفحات, ص٥٥٨.

(٢٥١) ((كتب الجنيد الى ممشاذ الدينوري رحمه الله تعالى كتاباً: فلما وصل الكتاب إليه, قلبه و كتب على ظهره, ما كتب صحيح إلى صحيح قط, ولا افترقا في الحقيقة))؛ السراج: اللمع, ص٣٠٥.

(٢٥٢) هەر بۆ نموونە بڕوانە: ابن بطوطة: رحلة, ج١, ص١٨٣-١٨٤. المكي: بغية الطالبين لبيان المشائخ المحققين المعتمدين, مطبعة مجلس دائرة المعارف الإسلامية, حيدر آباد الدكن, ١٣٢٨هـ, ص٥٢. نكري: دستور, ج٤, ص٥٩. محمد معصوم شيرازي: طرائق, ج٢, ص ص٣٠٩-٣١٠, ٣٢٢-٣٢٣.

گەیشتن بە خودا و هەمیش خۆدیتنەوە و ناسینەوەی لە نێو پەیوەندییەکی نا ئاساییدا، بۆیە بە ڕێگەیەکی دووری وەسف دەکات، ئەوەی دەخوازێ پێیدا گوزەر بکات دەبێ هێور و لەسەرخۆ بێت[٢٥٣]، ئەگەرنا ڕەنگە ڕێگای لێ وون بێت و توشی مەینەتی نەزانینی ڕاستیی و نەناسینی هەق بێتەوە.

هەر بۆیە، لەدەستپێکی هەنگاوەکانیدا، دەبێ ئەو کەسە لەو مەینەتییە ڕزگاری ببێ و فریو نەخوات بەوەی دەیزانێ و بانگەشەی بۆ بکات، بەڵکو دەبێ بزانێ چۆن بە قوڵایی زانین دەگات، قوڵبوونەوەش لە زانین و لە حیکمەت بەگشتی، پەیوەستە بە جۆرێکی دیاریکراوی ڕەفتارەوە، ئەگەر پەیڕەوی بکرێ ئەوا مرۆڤی زانا ئافریدە دەبێ؛ ئەو زاناییەش — بە ڕای مەمشاد — لەسەر بێدەنگی و بیرکردنەوە ڕاوەستاوە نەك زۆر گوتن و دەربڕینی ڕووکەشیانە[٢٥٤]، بێگومان بێدەنگی و بیرکردنەوەش دوو پێشمەرجی ئەستەمن، چونکە لایەنی کەم پێویستیان بە دوورەپەرێزییە زاهیدانەکەوە هەیە؛ مرۆڤ دەبێ سنوورێك بۆ هەندێك لە پەیوەندییە مرۆڤانەییەکانی دابنێ و خۆی لەسەر ئەوە ڕابهێنێ لەگەڵ خۆیدا بژی تا بتوانێ پتر گوێگر بێ و لە وتە و تێڕوانینەکانی ئەوانیتر ڕابمێنێ و کەمتر گوزارشت لە بیروبۆچوونەکانی خۆی بکات، تا ئەو کاتەی کەسایەتییەکەی پێڕادەگات و ئەو بیروبۆچوونانەی مانا دەبەخشن، واتا دەبێ ئەو کەسە بە بێدەنگی و بیرکردنەوەوە هەوڵی داڕشتنەوەی کەسێتی باوەڕیانەی بدات، ئەوکات دەتوانێ بێ پەردە و بەربەست پەیوەندیی لە گەڵ خودادا ببەستێ‌گومان[٢٥٥].ئەمەش دەستپێکی کاری هەر کەسێکە بخوازێ لە نێو ئەلقەی سۆفییاندا جێگەی خۆی هەبێ و بتوانێ باری ئەو هەنگاوە ببات کە سۆفیبوونە، ئەگەر وانەکات ئەوا کەسێکی نەشیاوە و دەیەوێ سۆفیگەری بکاتە ئامرازێك بۆ وەدەستهێنانی پایەی کۆمەڵایەتی، یاخود گێڕانەوەی ئەو پایەیەی ڕەنگە پێشتر لە دەستی دابێ. بۆیە ئاساییە ئەم جۆرە کەسەش لە نێو

---

(٢٥٣) ((طريق الحق بعيد والصبر مع الحق شديد))؛ ابن الجوزي: صفة الصفوة, ج٤, ص٤٧. العمري: مسالك, ج٨, ص١١٥.

(٢٥٤) لە بارەی ئەو تێڕوانینـەی مەمـشاد, بگـەڕێوە بـۆ: القشيري: الرسالة, ص٢٢٤. الشهرزوري: نزهة الأرواح و روضة الأفراح في تاريخ الحكماء و الفلاسفة, اعتنى بتصحيحه: السيد خورشيد احمد, مطبعة مجلس دائرة المعارف الإسلامية, حيدر آباد الدكن, ١٩٧٦, ج١, ص ص٧-٨.

(٢٥٥) الخركوشي: تهذيب, ص٤١٧.

ئەلقەکەدا قەبوڵ نەکرێ و سەرلەبەری خۆی و بۆچوونەکانی رەت بکرێتەوە(٢٥٦)، چونکە بەلای ئەو کەسی ئاوا نە لەگەڵ خۆی و نە لەگەڵ خودا راستگۆ نییە. لە بەرامبەردا مەمشاد کەسێك، هەژارێك یان موریدێك دەخوازێ راستگۆ بێ و پەیڕەوکارێکی دروستی رێبازی سۆفییان بێ(٢٥٧)، بتوانێ ئەو ئەرکانەی لە نێو ئەو رێبازەدا دێتە سەر شانی جێبەجێیان بکات و کەسێك دەربچێت لەگەڵ ئەو وێنایەی بۆ سۆفی دروست هەیە – لایەنی کەم ئەوەی شێخی دینەوەر هەیەتی – رێکبێتەوە.

ئەرکەکانیش بەسەر سێ ئاستدا دابەشکراون، کە هەریەك لە زەمینە و سنوورە شەرعییەکانی باوەڕداریی، رووخساری کردەکیی دیاردەی سۆفیگەری، لەگەڵ تێزی بنەڕەتی هزرەکە(خوداناسین) دەگرێتەوە، ئەمە رێك لەو پێناسەیەدا دیارە کە ئەو بۆ سۆفیگەری کردووە و بریتییە لە نیاز پاکی و کارکردن لەسنووری رەزامەندی خودایی و یاوەرێتی کردنی خەڵك بێ هەڵبژاردن(٢٥٨)؛ دیارە کە نیاز پاکیی ئاماژەیەکە بۆ چۆنییەتی گوزەرکردنی مورید بەنێو ئەو پایە رۆحانییە جیاوازانەی پەیوەندییەکانی لەگەڵ خودا لەسەر دادەمەزرێ، کارکردنەکەش پابەندیی شەرعیانەی سۆفی و هەڵسوکەوت کردنی بەپێی بنەما شەرعییەکان روونەکاتەوە، بەهەمان شێوە یاوەرێتیش دەستنیشانی ئەو سیستەمە دەکات کە لە نێو ئەلقەی سۆفییاندا خۆی تێدا دەبینێتەوە و کۆمەڵێك رێسا لەخۆ دەگرێ کە پەیڕەویان دەکات. ئاوا مەمشاد لە نێو پێناسەکەیدا یەکە پێکهێنەرەکانی ئەو گوتارەی روونکردۆتەوە کە بەڕای وی دەبێ سۆفیگەری تێدا بناسرێتەوە. لە خوارەوە ئەو سێ یەکە سەرەکییە پتر روون دەکەینەوە:

### أ- پابەندی سۆفی بە شەریعەت

ئەگەرچی زۆر ئاگاداری رەهەندی شەریعەتییانەی کەسێتی مەمشاد خۆی نین؛ نازانین پەیڕەوی چ رێبازێکی فیقهی کردووە یان نەیکردووە، بەلاّم ئەوە دەزانین هەوڵیداوە بیرکردنەوە و بۆچوونەکانی خۆی بە شەریعەت پەیوەست بکات، یان با بڵێین ویستوویەتی ئەوە دەربخات کە

(٢٥٦) الأنصاري: طبقات الصوفية, ص٣٣.

(٢٥٧) السراج: اللمع, ص٢٧٥.

(٢٥٨) ((التصوف صفاء الأسرار, والعمل بما يُرضي الجبار, وصحبة الناس بلا اختيار))؛ الخركوشي: تهذيب, ص١٨. ابن خميس: مناقب, ج٢, ص١٤.

پابەندبوون بە شەریعەت و پەیڕەوکردنی بنەماکانی هەنگاوێکی سەرەکییە لە ڕێگەی بوونە سۆفیدا، یان وەك خۆی رایدەگەیەنێ یەك لەو رێسایانەی دەبێ مورید رەچاوی بکات راگەیشتنە بەسەر بنەما شەرعییەکان[٢٥٩]، بەڵام بێ ئەوەی دەستنیشانی ئەو بنەمایانەی کردبێ، بەڵکو وەك کۆمەڵە رێسایەکی باو و ناسراو قسەی لەسەر کردون.

لای ئەو ئەم پابەندییە شەرعییە زاڵبوونە بەسەر مەترسیی ئەوەی لە ڕێگەی شەریعەتەوە پەرش و بلاوی بکەوێتە نێو گرۆی باوەڕدارانەوە، چونکی جیاوازی لە راڤە و تێگەیشتنی بنەماکان ئەو ئەگەری پەرت بوونە بەهێز دەکات، لەبەرامبەردا ئەوەی بە کۆکراوەییان دەهێڵێتەوە مانەوەیە لە سنووری "یەکتایی"یەوە، کە ئەمەش پەیوەستکردنەوەی شەریعەتە بە بنەمایەکی هەرە سەرەکی نێو هزری سۆفیگەری، تەنانەت کۆکردنەوەکەش هەمان ئەو مانایەی دەبێ کە چەمکی "کۆکردنەوە - الجمع" لە کولتووری سۆفیگەریدا پێی بەخشراوە[٢٦٠]، ئیدی پابەندی بە شەریعەت لەم ترسی پەرتبوونەوە سەرچاوەی گرتووە و بوونە سۆفیش — دوای پابەندییەکە — گەرەنتی مانەوەیە بە یەکگرتوویی.

ئەو تێگەیشتنەی مەمشاد وایلێدەکات بە گومانەوە لە هەندێك رەوتی ئایینی بڕوانێ، کە خوێندنەوەی جیاوازیان بۆ دیاردەی ئایینی بەگشتی بەتایبەتیش لە تێگەیشتنیان لە "خودا" هەبووە و کاریگەرییان لەسەر برەوسەندنی جیاوازی بیروباوەڕ لە پانتایی ئیسلامیدا هەبووە، لە سەرووی هەموو ئەو رەوتانەش "کەلامناسی — علم الکلام" دێت؛ مەمشاد گەلی سۆفییان لە پەیڕەوکارانی ئەم رەوتە ئاگادار دەکاتەوە: ((با ئەهلی کەلام نێوە نەخەنە نێو لەرێ لادانەکانی خۆیانەوە))[٢٦١]، چونکی بەلای وی ئەمە زانستێکی نا دروستە، ئەوەی دروست بێ هەردوو کایەی سۆفیگەری و فیقهییە؛ سۆفیگەریەك کە لەسەر (("وەجد — الوجد" و "حال")) دامەزراوە، لەگەڵ فیقهێك کە ((زانستێکی بێ خەوش و شەرعێکی ئاشکرایە))[٢٦٢]. بەڵام مەمشاد ئەو لارێیانەی دیاری نەکردووە، کە گوایە کەلامناسی لە نێو

---

(٢٥٩) القشيري: الرسالة, ص٩٨. فريد الدين عطار: تذكرة, ج٢, ص١٣٤. السبكي: طبقات الأقطاب في ذكر اولياء الله تعالى و قوالهم و احوالهم الى انتهاء آجالهم, مخطوطة جامعه هارفرد, ص١٠١.
http://pds.lib.harvard.edu

(٢٦٠) فريد الدين عطار: تذكرة, ج٢, ص١٣٤.

(٢٦١) الأنصاري: طبقات الصوفية, ص٣٠٢.

(٢٦٢) الأنصاري: طبقات الصوفية, ص٣٠٢.

باوەڕی ئایینیدا چێی کردوون و دەشێ بەهۆیانەوە سۆفی فریو بخوات، لە بەرامبەردا خەسڵەتی هەریەك لە کایەی سۆفیگەری و کایەی فیقهی دەستنیشان کردووە، کە بە هۆیانەوە سۆفی دەبێتە خودان باوەڕێکی دروست.

بێگومان ئەمانە — کەم تا زۆر — دەستنیشانی لاڕێکانی کەلامناسیش دەکەن؛ ئەگەر سۆفیگەری بە وەجد و حاڵ، واتا ئەزموونی رۆحانی، مەیسەر بێ ئەوا دەبێ لە ڕێ لادانی کەلامناسان بریتی بێ لە ئەزموونی عەقڵانی و گەڕانی مەنتقییانە بەدوای وەڵامی کۆمەڵێك پرس، کە دەشێ لە نێو باوەڕدا دروست ببێ، هەر بۆیە دەبێ بابای کەلامناس بەدوای پێچ و پەناکانی ئەو باوەڕە بگەڕێ و هەوڵی خوێندنەوەی رەهەندە نادیارەکانی بدات، ئەمەش پێچەوانەی زانستی فیقهە کە - وا نیشاندەدا — بەدوای راستەڕێ و رووخسارە روون و دیارەکانی باوەڕ دەگەڕێ و بانگەشەی پەیڕەوکردنیان بۆ دەکات. پێشتریش بینیمان کە ئەو سۆفییەی دینەوەر موریدێك دەخوازێ ئاوا لە ئاستی ساکاری باوەڕداریی بمێنێتەوە و نەچێتە ئەو شوێنانەی رەنگە بە هۆیانەوە لە ئەزموونە رۆحانییەکە بسڵەمێتەوە یاخود پێیان رازی نەبێت.

لەراستیدا بانگەوازی مەمشاد بۆ دوورکەوتنەوە لە کەلامناسیی رەنگدانەوەی هەڵوێستی گشتی سۆفیگەریی ئیسلامییە؛ سۆفییەکان هەوڵیانداوە لە دەرەوەی دراوەکانی ئەو زانستە، کە لە قۆناغی سەرهەڵدانی کایەکەی ئەوان هەژموونی کردبووە سەر"خوداناسیی - ثیولۆجیا"ی ئیسلامی، لەم بابەتە رابمێنن و -- بەپێی چەمك و دەستەواژەی تایبەت بەو کایەوە -- هەڵیسەنگێنن[٢٦٣]. تەنانەت، وەك پێشتریش بینیمان، ئەو بۆچوونەش لە ئارادایە کە دەگوترا برەوسەندنی سۆفیگەری، لە سەدەی سێیەمی کۆچی، پەرچەکردارێك بووە دژ بەو هەژموونە و دەسەڵاتی سیاسی پشتگیری لێ کردووە، بەتایبەتیش ئەو کەلامناسییەی "موعتەزیلەکان" ئیشیان لەسەر دەکرد و ئاکامەکەی لەو وەختدا بەرتەسکبوونی راڤەی رۆحانی بوو بۆ ئایین لە بەرامبەر بە فراوانبوونی بەکارهێنانی عەقڵ لە راڤەکردندا.

لەوەدەچێ ئەو جەختکردنەوەیەی مەمشاد لەسەر دوورکەوتنەوەی سۆفی لە ئەهلی کەلام، جێکەوتەی خۆی لە شارەکەدا هەبووبێ؛ ئەگەر چاو لە سەرچاوە بایۆگرافییەکانی تایبەت بە کەسایەتییەکانی موعتەزیلە بکەین، کەسێکی ئەوتۆی دینەوەریی نابینینەوە توانیبێتی لە نێو

---

(٢٦٣) لەم بارەوە بڕوانە: الكلاباذي: التعرف, ص ص١٩-٣٦.

ئەو گرۆیە و لە بواری کەلامناسیی بە گشتی دیار بووبێ و خۆی سەپاندبێ[٢٦٤]. بێگومان لە ئاکامی باڵادەستی سۆفیگەری بەسەر ئەو شارەدا سنوورێك بۆ هەر هەوڵێکی کارکردن لە بواری کەلامناسیی دانراوە، رەنگە بنەماڵەی مەمشاد – بەتایبەت کوڕەکەی کە ئەبوبەکری ناوە – سەردەستە بووبن لەو کارەدا، چونکی بە کردار، وەك دواتر دێینە سەری، هەوڵێداوە سنوور بۆ هەر رەوتێکی ئایینی "ناجۆر" لە پانتایی شارەکە دابنێ[٢٦٥].

## ب- پابەندبوون بە شێخی سۆفی

ئەگەرچی بوونە سۆفی بڕیارێکی تاکەکەسیانەیە و باوەڕبوونە بەوەی پەیوەندیی نێوان مرۆڤ و خودا لەو ئاستە ناوەستێ کە شەریعەت دەستنیشانی کردووە، یاخود با بڵێین دەشێ لەسەرووی بنەما شەرعییەکانیشەوە سۆفی خودا بناسێ، ناسینێکی جیاواز لە هی خەڵکی ئاسایی، لە رێگەی کۆمەڵێك چەمك و دەستەواژەی تایبەتەوە کە لەخۆیدا بەرجەستەی بکات و دەریببڕێ، بەڵام ئەو ئەزموونە خودگەراییە لەلای مەمشاد بە ئەستەم دەزانرێ و ئەو کەسەی دەخوازێ بەو روگەیەدا گوزەر بکات پێویستی بە رێنمایی و رێنیشاندان هەیە، چونکی ئەگەر

---

(٢٦٤) لە نێو کتێبی تایبەت بە کەسایەتییە موعتەزیلەکان – ئەوەندەی ئاگادار بین – تەنیا ناوی یەك کەسی دینەوەری دێت ئەویش ئەبوبەکری دینەوەرییە؛ بڕوانە: ابن المرتضى: باب ذكر المعتزلة من كتاب المنية و الأمل في شرح كتاب الملل و النحل, أعتنى بتصحيحه: توما ارنلد, دار صادر, بيروت, د.ت, ص٧٠.

(٢٦٥) دەشێ بیروبۆچوونی مەمشاد لەسەر کەلامناسی, بەڵگە بێت لەسەر بەهەڵەداچوونی رۆژهەڵاتناسیی فەرەنسی "لویس ماسینیون - Louis Massignon ", کە دەیەوێ بنەماڵەی ئەو سۆفییە - بە تایبەت ئەبوبەکری مەمشاد - بە کولتووری "کەڕڕامیەکان – الكرامية"کانەوە پەیوەست بکات ( ئەو گروپەی لەلایەن محەمەدی کوڕی کەڕڕام (م٢٥٥ك/٨٦٩ز) دامەزراوە و زانستی کەلام بەشی هەرە گەورەی تێزەکانیان پێکدێنێ؛ بڕوانە: الشهرستانی: الملل, ق١, ص ص٩٩-١٠٤).

Louis Massignon: Essai, p. 242.

لێرەدا لویس ماسینیون ئەوەندەی پشتی بە لێکچوونی ناوی ئەو کوڕەی مەمشاد لەگەڵ رێبەری کەڕڕامییەکانی خوراسان ئەبوبەکری کوڕی حەمشاد (م٤١٠ك/١٠١٩ز) بەستووە ئەوەندە نەچۆتەوە سەر ئەو دەقە مێژووییانەی جەخت لەسەر مانەوەی کوڕی مەمشاد لەشارەکەی خۆی تا مردنی لە ساڵی (٣١٩ك/ ٩٣١ز) دەکەن, واتا نزیکەی سەد ساڵێك بەر لەوەی تر مردووە. بڕوانە: المسعودی: مروج, ج٤, ص ص٣٧٩-٣٨٠.

رەفتاری سۆفی دروست نەبێ، ئەوا بەڕای ئەو ناتوانێ بەتەواوی لە نێو حاڵی سۆفییانەدا جێی خۆی بکاتەوە[٢٦٦]، ئەمەش تەنیا لە میانەی ناسین و پابەندبوون بە کەسانێکەوە دەبێ، کە هەمان ئەو ئەزموونەیان هەبووە و بە ئاکامی دروست گەیشتوون، ئەوانیش شێخانی سۆفین[٢٦٧]. ئەو شێخانە دەتوانن ئەو ڕۆڵی نیشاندانە ببینین و دەزانن ئەمە ئەزموونێکی سەخت و مەترسیدارە دەشێ هەر کەس لە نێو پێچ و پەناکانیدا وێڵ ببێ. بۆیە لای مەمشاد پابەندبوون بە شێخی سۆفی بە هەڵبژاردن نییە، بەڵکو پێشمەرجێکی حەتمییە لە پرۆسەی بوون بە سۆفیدا، بێ پرسیار کردن لە چۆنییەتی بوونی ئەو شێخانە بە ڕێنیشاندەر لەو کایە ئایینییەدا.

ئەو بۆچوونەش، کە لە قۆناغی دوای دەرکەوتنی سۆفییە گەورەکان و لەسەردەستی ئەوان وەك جەختکردنەوەیەك لەسەر پەیوەندیی دەسەڵاتدارییانەی — دەسەڵاتێکی ڕۆحانی — نێوان شێخ و مورید لە تەواوی کولتووری سۆفیگەریی ئیسلامیدا برەوی سەندبوو[٢٦٨]، تاڕادەیەکی زۆر سنوور بۆ هەر هەوڵێکی تاکگەرایانە دادەنێت بخوازێ لە دەرەوەی گوتاری باوی سۆفیگەری — کە شێخانێکی وەك مەمشاد دایانڕشتبوو — کەسێتی عارفانەی بدۆزێتەوە، ئەمە سەرباری دڵنیابوون لەوەی ئەو زانینەی مورید وەری دەگرێ ئەوەیانە کە شێخەکان بە ڕاستی دەزانن و ئەوی تازە پێگەیشتوو لە نێو چەمك و تێزە فرەجۆرەکانیدا وون ناکات.

خۆ پابەندبوون بە شێخ و سوودمەندبوون لە وتە و زانستەکانیشی، کارێکی ئاسان نییە، بەڵکو بۆ مورید جۆرێکە لە خۆنەویستی و بێبەریبوون لە ئارەزوو و پێداویستییە دونیاییەکان، تا بتوانێ خۆی بۆ تێگەیشتن لەو وتە و زانستانە تەرخانبکات، ئەگەر وانەبێ ئەوا سوودێکی ئەوتۆ لە هاموشۆکردنی کۆڕی سۆفییان و پابەندییەکە نابینێ[٢٦٩].

داڕشتنی ڕەفتاری مورید هەر تەنیا بۆ پەیوەندی گرێدان لەگەڵ شێخی سۆفیدا نییە، بەڵکو دەبێ لە پەیوەندیی بە ئەوانیتریشەوە پێوەری هەبێ، بەهۆیەوە پارێزگاری لە ڕەوشت و

---

(٢٦٦) القشيري: الرسالة, ص٢٨٩. الغزالي: إحياء, ج٤, ص١٢٧١.

(٢٦٧) ابن خميس: مناقب, ج٢,ص١٣ .

(٢٦٨) لەمبارەوە بگەڕێوە بۆ: السراج: اللمع, ص ص٢٧٣-٢٧٦. السلمي: المقدمة, ص ص٦٤-٦٥. القشيري: الرسالة, ص ص٤٩٥-٤٩٨.

(٢٦٩) القشيري: الرسالة, ص٩٩. السبكي: طبقات الأقطاب, ص١٠١-١٠٢.

کەسێتی خۆی بکات و نەکەوێتە ژێر کاریگەریی کەسانێکەوە کە ڕەنگە بەتەواوی لە سۆفیگەری نەگەیشتبن و یاوەرێتی کردنیان بە خراپە بشکێتەوە، بۆیە — ئەوەی دەخوازێ لە نێو ئەلقەی سۆفییاندا جێی ببێتەوە — دەبێ ورد بێ لە هەڵبژاردنی یاوەرانی تا لەو ڕێگەوە بە چاکی دڵ بگات، ئەوەندە پاکیی تێدابێ کە پێویستە سۆفی هەیبێ، چونکە مەمشاد گوتەنی: (( یاوەرێتی ئەهلی چاکە دڵ پڕ لە چاکە دەکات، یاوەرێتی خراپەکارانیش تژی خراپەی دەکات))[٢٧٠].

## ج - سۆفیگەری وەك خوداناسین(عیرفان)

پرۆسەی بوونە سۆفی تەنیا بە پەیڕەوکردنی کۆمەڵێك بنەمای شەرعی و ڕەفتاری دیاریکراوی سۆفییانە نایەتەدی، چونکە دەشێ ئەو پەیڕەوییە جۆرێك بێ لە بانگەشە و خۆدەرخستن و خۆنواندن، بە مەبەستی ڕازیکردنی ئەوانیتر و بەدەستخستنی دەسەڵاتێکی ڕەمزی لە نێوەندیی ئایینی — کۆمەڵایەتی بێ. هەر بۆیە گەڕانەوە بۆ دانایی و حیکمەتی پێشینان و هاوچاخان، هەروەها قوڵبوونەوە لە واتاکانی ئەو حیکمەتە، بەس نییە بۆ شێوەگیریی ئەو بوونە، چونکە — بەڕای مەمشاد — سۆفیبوون هەر تەنیا پەیڕەوکاری و لێ وردبوونەوە نییە، زانستێك نییە بۆ فێربوون ئەوەندەی زانینێکە لە میانەی جۆرێکی دیاریکراوی پەیوەندییەوە دێتە کایەوە، کە پەیوەندییە بە خوداوە، هەر ئەمەشە مانای "عیرفان"، تەواوی ئەو عیرفانەش ڕاستگۆییە لە پێویستی مرۆڤ بە خوداوە[٢٧١]. درك کردن بەو پێویستییە وا لە سۆفی دەکات وەك خوداناس"عارف"ێك دەربکەوێ، کە ئەمەش — وەك پایەکی باڵای نێو تەواوی هزرەکە - نە بە کۆکردنەوەی حیکمەت و نە بە پەیڕەوکردن لە حاڵی گەورە وەلییەکان مەیسەر دەبێ، بەڵکو ناکامی گەڵاڵەبوونی "ڕاز - السر"ێکە، کە لە نێوان مرۆڤ و خودادا هەیە و لە میانەیدا متمانەی تەواوی دەخاتە سەر ئەوەی — جا هەر شتێك بێت — لەلایەن خوداوە بۆی زامن کراوە[٢٧٢].

---

(٢٧٠) ابـن الجـوزي: صـفـة الـصـفوة, ج٤, ص٤٧. العمـري: مـسـالك, ج٨, ص١١٥. ابـن الملقـن: طبقـات, ص٢٢٠.

(٢٧١) الأنصاري: طبقات الصوفية, ص٣٠٢. الذهبي: تاريخ الإسلام, ج٢٢, ص٣١٣.

(٢٧٢) ابو نعيم: حلية, ج١٠, ص٣٥٣. ابن خميس: مناقب, ج٢, ص١٢.

ڕەنگە هەر ئەو جیاکاری و جۆری پەیوەندییە بێ وادەکات زۆرجار گەلێ سۆفییان پەشێوحاڵ بن و لە پایە ڕۆحانییەکان تێ نەگەن و لە ناساندنی پێگەی خۆیان سەرلێشێواو دەربکەون؛ ئەوان لەژێر باری گرانی حاڵی سۆفییانەیاندا ناچار دەبن ڕوو لە زانستە جیاوازەکانی کایە ئایینییەکەدا بکەن و لێیان شارەزا بن، ئەمەش لەو باوەڕەوە دێ ئەو زانستانە ڕێگە خۆشکەر بن بۆ بڕینی حاڵەکان و دواجاریش گەیشتن بە پلەی "عارف". بەڵام – بەلای مەمشاد – ئەمە بە هەڵە خوێندنەوەی تەواوی سۆفیبوونە، تەنانەت پێی وایە ئەگەرچی ئەو تێگەیشتنە واهاتۆتە بەرچاو ڕێگەی ناسینی دروست بووە، بەڵام بە لاڕێی بردوون و دوورکەوتوونەتەوە و چیدی ((هەقیێتی هەق ناناسن و ڕاستگۆیی ڕاستگۆیان نازانن))[٢٧٣]. ئەو جەختی لەسەر ئەوە دەکاتەوە زانستە سۆفییەکان زانستی ئیلهامین و پەیوەستن بە خودی کەسەکە و ویست و تواناکانی لە خوداناسییدا، نەك ئاکامی هەوڵێکی بابەتییانە بن و ئەوەی بیەوێ بتوانێ شارەزایان بێ و لە چوارچێوەی کۆمەڵێك دەستەواژەی ناسایی دایانڕێژێ و قسەیان لەسەر بکات.

بێگومان پەیوەندیی گرێدان و هەوڵی دروست ناسینی خودا پرۆسەیەکی وردە و ساکار نییە، بەر لە هەموو شتێك دەبێ عارف بکارێ پەیوەندییە مرۆڤانەییەکانی سنووریەند بکات، کەمتر تێکەڵی کۆمەڵایەتییانەی هەبێ و خۆی دوور بگرێ لە هەرشتێك خودا ناڕازی دەکات و بە هۆیانەوە پشتی لێ دەکات[٢٧٤]، لە هەمانکاتدا دەبێ ڕەچاوی ڕازەکەی نێوان خۆی و خودا بکات بەوەی کە لە هەموو کردە دونیاییەکانی یاد و هانای خودایی بخوازێ، چونکە بەلای وی کاری هەرە کرێت غافڵبوونە لە گوێڕایەڵی و یادکردنەوەی ئەوەی (( لە چاکەکردن لەگەڵی و یادکردنەوەی غافڵ نابێ))، کە خودایە[٢٧٥].

لێرەشدا نابێ کەسی عارف وا تێبگات تەواوی کارەکانی بۆ ڕازیکردنی خودا بێ، چونکە ئەو پەیوەندییەی دامەزراوە لەسەر ڕازیکردن دانەڕێژراوە و بەو تێگەیشتنە عیرفانێکی دروست فەراهەم نابێت، بەڵکو دەبێ پەیوەندییەکە پێچەوانەبێ، چونکە ئەوەی لەگەڵ خودابێ – واتا ئەوەی تەنیا ئەرکە دینی و دونیاییەکان جێبەجێ دەکات – لە نێو دەچێ، تەنیا ئەو مرۆڤە

(٢٧٣) ابن خميس: مناقب, ج٢, ص١٤.

(٢٧٤) ابو نعيم: حلية, ج١٠, ص١٥٣.

(٢٧٥) السلمي: طبقات, ص٣١٧.

دەربازی دەبێ کە خودای لەگەڵدا بێ[٢٧٦]. ئەو جیاکارییە لە نێوان "لەگەڵ خودا بوون" و "خودا لەگەڵ بوون" جەختکردنەوەیە لەسەر تایبەتمەندی ئیلهامییانەی زانستە سۆفییەکان و جیاکردنەوەیەتی لەو کایە ئایینیانەی "لەگەڵ خودا بوون" دەکەنە پێوەری باوەڕداریی و دروستی کەسێتی باوەڕدار، تەنانەت ڕەهەندەکانی ئەو کەسێتیەشی پێ دەستنیشان دەکەن.

مەمشاد دەیەوێ ئەوە روونبکاتەوە کە تۆکمە بوونی پەیوەندیی نێوان عارف و خودا، بە هێزکردنی کەسێتی عارفی لێ دەکەوێتەوە، تا نەکەوێتە ژێرباری تارەزوو و پێداویستیە ژیانییەکانەوە، ئیدی ئەوەی بە تەواوی پەیوەستی خودا بێ نە باکی بە قەدەر و نە بە مەترسییەکانی ژیان دەبێ[٢٧٧]. ئەگەر جێگەیەك بۆ ترس لە دڵی عارفدا هەبێ، ئەوا ترسانە لەوەی کردەوە دونیاییەکانی بابی ئەوەنەبن خودای لەگەڵدا بێ[٢٧٨]، ڕێگر بن لەوەی پەیوەندییە دروستەکە سەرهەڵبدات و رازە خوداییەکەی بۆ دەربکەوێ.

### د- جێکەوتەی بۆچوونەکانی مەمشاد لە دینەوەر

مەمشاد لە هەردوو ئاستی کردەکی و تیۆریدا پەیڕەوکاری یەکەمی تێڕوانینییەکانی خۆی بووە، لە ئاستی کردەکیدا ویستویەتی ئەو تێڕوانینە لە ژیانی ڕۆژانەیەدا پیادەبکات، جا هەر لە ریزگرتنی لە ڕادەبەدەری شێخەکانییەوە بگرە تا خزمەتکردنی زۆری ئەو سۆفییانەی هاموشۆیان کردووە[٢٧٩]. لەگەڵ خەڵکی ئاساییش سۆفییانە پەیوەندیی گرێ داوە، بەجۆرێك کە هەوڵیداوە تا بۆی بلوێ پێویستی بەوان نەبێ و تا لەتواناشی دابێت پێداویستییەکانیان بەجێ بگەیەنێ[٢٨٠]. ڕەنگە هەر ئەو چاکەکاری و بیرکردنەوە لە ڕەوشی خەڵك وایکردووە وەك یەکێك لە "جوامێر – الفتیان"ی هەرێمی چیا بناسرێ و ئەو خەسڵەتەی لێ دەربکەوێ[٢٨١]،

---

(٢٧٦) الأصفهاني: محاضرات الأدباء, حققه: عمر الطباع, دار القلم, بيروت, ١٩٩٩, ج٢, ص٤٢٦.

(٢٧٧) ابن خميس: مناقب, ج٢, ص١٣.

(٢٧٨) العمري: مسالك, ج٨, ص١١٧.

(٢٧٩) السراج: اللمع, ص٢٥٤. السلمي: طبقات, ص٣١٧-٣١٨. ابن الملقن: طبقات, ص٢٢٠.

(٢٨٠) الأنصاري: طبقات الصوفية, ص٣٠٣. الغزالي: احياء, ج٤, ص٢٧١. ابن خميس: مناقب, ج٢, ص١٣, ١٥.

(٢٨١) السلمي: طبقات, ص٣١٦. الأنصاري: طبقات الصوفية, ص٣٠٠.

وەك ئاماژەیەك بۆ پەیڕەوكردنی ئەو بنەما ڕەوشتییانەی پەیوەندیی ئەوی سۆفی لەگەڵ ئەوانیتردا ڕێكدەخست.

لە دەرەوەی ئەو پەیوەندییە مرۆڤایەتییانە مەمشاد سۆفیبوونی خۆی لە كردەی خوداناسیدا دۆزیوەتەوە، ئەو كاتێك لەو ناسینە قووڵبۆتەوە دەچووە خەڵوەت و شەوخوونی بۆ كردووە و خۆشییەكانی دونیا نەیانتوانیوە لەو حاڵەی دەربخەن[٢٨٢]، بەمەش وەك خۆی گوتەنی بەتەواوی لە خودا نزیك بووە؛ نزیكبوونەوەیەك كە ئەو ئەلقە پەیوەندییە خودییەی سۆفی بە خودا دەبەستێتەوە و بریتییە لە بیركردنەوە لە خودا بە "دڵ"، نەیماوە. هەر ئەمەیە وایلێدەكات بڵێ چەندان ساڵە: (( لەگەڵ خودادا دڵم بزر كردووە))[٢٨٣]. دیارە لەمەدا مەبەستی وونبوون و وێڵ بوونی خۆی لە داڵانەكانی خوداناسیی نییە، ئەوەندەی گوزارشت لە باڵاترین "حاڵ"ێك دەكات كە لەو پرۆسەی ناسینەدا خۆی تێدا بینیوەتەوە، ئەویش "فەنابوون – الفناء"ە[٢٨٤]. ئەو لە سەرەمەرگیدا ئەو حاڵەی دەردەخات و ڕایدەگەیەنێ تەواوی خۆی لە خودادا فەنا كردووە، ئەمە لەو دوو دێرە شیعرەدا دەردەكەوێ لەو ساتی سەرەمەرگەدا گوتویەتی:

أفنيت كلي بكلك    هذا جزاء مَن يحبك

أعجزتني عن خطابك    فالكل مني جوابك[٢٨٥]

بێگومان ئەمەش دوا ئاكامی ئەزموونی سۆفییانەیەتی و لەو پەیوەندییە خۆشەویستییەی لەگەڵ خودا هەیبووە سەرچاوەی گرتوە.

---

(٢٨٢) الرازي: حدائق الحقائق, تحقيق و تقديم: سعيد عبد الفتاح, مكتبة الثقافة الدينية, القاهرة, ٢٠٠٢, ص٢٤٤. الزبيدي: تاج العروس من جواهر القاموس, تحقيق: مجموعة من المحققين, دار الهداية, القاهرة, د.ت, ج٩, ص٤٧٨.

(٢٨٣) القشيري: الرسالة, ص٤٦٤. ابن خميس: مناقب, ج٢, ص١٥. فريد الدين عطار: تذكرة, ج٢, ص١٣٥.

(٢٨٤) لەبەشی سێیەم بە درێژی باس لەو چەمكە و بەكارهێنانەكانی دەكەین.

(٢٨٥) (( بە تەواوی خۆم لە تەواوی تۆدا فەنا كردووە, ئەمە پاداشتی كەسێكە تۆی خۆش بووێ. بێ دەسەڵاتت كردم لەوەی بتدوێنم, تەواوی من وەڵامی تۆیە))؛ الخركوشي: تهذيب, ص٥٠٥. القشيري: الرسالة, ص٤٦١.

بەهەرحاڵ، ڕەنگ ئەو بەرجەستەکردنەی هزری سۆفییانە و ئەو پایە ڕۆحانییەی پێی گەیشتوە، وا دەکات لە نێو ئەلقەی سۆفییانی هاوسەردەمیدا بەڕێزەوە سەیری بکرێ؛ خەسڵەتی گەورە سۆفییانی تر بە خەسڵەتەکانی ئەو بپێورێن[٢٨٦]. تەنانەت هەر دوای مەرگیشی لە شێوەی عارفێکی سەروو ئاسایی یادی دەکرێ، وەك لە تێڕوانینی گەورەی سۆفییانی فارس ئەبو عەبدوڵڵای کوڕی خەفیفی شیرازی دیارە کە وەك خودا پەرستێکی ڕەها وێنا کردووە[٢٨٧].

بێگومان تێڕوانین و کەسایەتی مەمشاد بەر لە هەموو کەس و شوێنێك کاریگەریی بەسەر شارەکەی خۆیدا هەبووە، بەتایبەت لەسەر ئەو سۆفییانەی دینەوەر، کە لە دوای ئەودا ناویان دەرکردووە و لە مورید و کەسە نزیکەکانی خۆی بوون، لەوانە: ئەبو عەبدوڵڵا محەمەد کوڕی عەبدولخالقی دینەوەری[٢٨٨]، عیسای قەصاری دینەوەری، کە ئەویش لە گەورە شاگرد و موریدانی مەمشادە[٢٨٩]و وتەکانی دەگێڕێتەوە[٢٩٠]، پاشانیش وەك جێنشینێکی ئەو و ئەلقەیەکی بنەڕەتی زنجیرەی نێو سیستەمی تەریقەتیی دەردەکەوێ کە مەمشاد بە ئەلقەکانی دواترەوە دەبەستێتەوە[٢٩١]. ئەوەی لە هەموویان زیاتر لەو نزیك بووە شێخ ئەبولعەباس ئەحمەدی کوڕی سیاە ئەسوەدی دینەوەرییە، کە ڕێبازی سۆفییانەی لێ وەرگرتووە و نزیکەی سەد ساڵێك ژیاوە[٢٩٢]، لەماوەی ژیانیدا بانگەشەی بۆ هەمان ئەو تەرزەی سۆفیگەری دەکرد

---

(٢٨٦) الخطيب البغدادي: أخبار الصوفية, ص٨٥. ابن عساكر: تاريخ مدينة دمشق, حققه: محب الدين العمري, دار الفكر, بيروت, ١٩٩٥, ج٦, ص٨٦. ابن العديم: بغية الطلب في تاريخ حلب, تحقيق: سهيل زكار, دار الفكر, بيروت,١٩٨٨, ج٣, ص١٢٣٥.

(٢٨٧) ابو الحسن ديلمي: سيرت شيخ كبير ابو عبد الله بن خفيف شيرازى, ترجمهٔ فارسى: ركن الدين يحيى بن جنيد شيرازى, تصحيح: آ. شيمل – طارى, انتشارات بابك, تهران, بى تا, ص١٩٣.

(٢٨٨) السلفي: معجم, ص١٧٩.

(289) الذهبي: تاريخ الإسلام, ج٣٠, ص١٩٨.

(290) السلفي: معجم, ص١٠٤.

(٢٩١) المتقي الهندي: كنز العمال, ج٩, ص٩٦. دواتر زیاتر باس لەو سۆفییەی دینەوەر دەکەین.

(٢٩٢) السلفي: معجم, ص ص١٠٤-١٠٥. الذهبي: تاريخ الإسلام, ج٣٠, ص١٩٨. ابن بطوطة: رحلة,ج١, ص١٨٣-١٨٤.

که مەمشاد لەوێ دایمەزراندبوو؛ ئەو شێخ ئەحمەدە پێی وابوو سۆفی لە هەردوو بواری کردەکی و تیۆریدا، بەر لەوەی چاودێری رەوشت و رەفتاری خەڵك بکات دەبێ خۆی لەو بوارانەدا پێگەیشتبێ و بە پێچەوانەی خەڵکی ئاسایی — کە سەرقاڵی ژیانی دونیایین — تەواوی کۆششی بۆ دامەزراندنی ژیانێکی ئایینی تەرخانبکات[٢٩٣]. بەهەرحاڵ، مەمشاد لەناو بنەماڵەی خۆشی ئەبوبەکری کوڕی سۆفییانە پەروەردە کردووە، بۆیە درەنگتر دەیبینین وەك سۆفییەکی دیار و جێنشینی باوکی دەردەکەوێ[٢٩٤]، کە — وەك دواتر باسی لێوە دەکەین — دەسەڵاتێکی رەمزی و کردەکی بەهێزی بەسەر شارەکەدا هەبووە.

دواجار، دەبێ ئاماژە بۆ ئەوەش بکەین کە مەمشاد، لەدوای قۆناغی دامەزراندنی سۆفیگەری، یادی هەر دەمێنی و لە دووتوێی کولتووری ئایینی کوردیدا ناوی دەهێنرێ، هەریەك لە مەمشاد و موریدەکەی شێخ ئەحمەد ئەسوەد، وەك دوو قوتبی "چل تەن"، یان با بڵێین، دوو لە چل عارفی پیرۆز لە کولتووری ئایینی "ئەهلی هەق" ماونەتەوە، ئەگەرچی مانەوەکەشیان تەنیا بەناوە[٢٩٥]، کە رەنگە ئەمەش بەڵگە بێ لەسەر کاریگەریی دوورمەودای کەسێتیەکەی لە ناوەندی عیرفانی کوردیدا.

**بەردەوامیی سۆفیگەری لە دینەوەر:**

لە ئاکامی ئەو گەشەسەندنە شاری دینەوەر دەبێتە شاری سۆفییان؛ ئەوانەی لەوێدا دەردەکەون یان نیشتەجێ دەبن ئەوەندە زۆر دەبن، بەتایبەت بە درێژایی سەدەی چوارەمی کۆچی، کە لەسەر دەستیان سۆفیگەری لە کایەیەکی سنووردار بە چەند کەسێکەوە دەبێتە دیاردەیەکی ئایینی دەستەجەمعی و لەسەر رووبەرێکی بەرفرەی شاردا خۆی دەنوێنێ، کە

---

(٢٩٣) السلفي: معجم, ص٤٥٧.

(٢٩٤) لەبارەیەوە بڕوانە: السلمي: طبقات, ص٤٠٩. الخطيب البغدادي: أخبار الصوفية, ص١٥٣.

(٢٩٥) بڕوانە: سيد محمد علي خواجه الدين: سرسپردگان — تاريخ و شرح عقائد ديني اهل حق, چاپخانه خورشيد, تبريز, ١٣٤٩هـ.ش, ص١٠. بەدەر لەو سێکتە ئایینییەش شێخ ئەحمەد ئەسوەد, پێ دەچێ لە خەیاڵدانی ئایینی جڤاکی کوردی باسی بمێنێ و بە "شێخ ئەحمەدە رەش" ناوی دەبرێ؛ بڕوانە: نۆشاد دینەوەری: چیرۆکی داری جەنگیان, بە هەوڵ و تێکۆشانی: عەزیز موحەممەد پور, چاپخانەی پەیام, تاران, ١٣٧٨هـ.ش, ل٦١.

تەنانەت ناسنامەی ئایینی ئەو شارەی بەتەواوی رەنگرێژ کردووە. نەك هەر لەلای خەڵکی ئەوێ بەڵکو لەدەرەوەشیدا وا دەبینرێ و سۆفیگەری دەکرێتە ناونیشانی شارەکە، ئەمە بە روونی لەو وتەیەدا دەردەکەوێ کە لەسەر دینەوەردا باو بووە و هەریەکە لە ثەعالبی (م٤٢٩ك/١٠٣٨ز)[٢٩٦] و ئبن فندق ( ٤٩٣ك/١١٠٠ز - ٥٦٥ك/١١٦٨ز)[٢٩٧] دەیگێڕنەوە و رایدەگەینن "سۆفییانی دینەوەر" بۆتە ناونیشانێکی هاوشێوەی ئەو ناونیشانانەی شار و ناوچەکانی تری جیهانی پێ دەناسرێتەوە وەك "حەکیمانی یۆنان" و "جادوگەرانی هیند"و...هتد. نوسەر ثەعالبی باوبوونی وتەکە لە نێو خەڵکدا دەگێڕێتەوە بۆ: ((زۆری ژمارەیان لەوێ، نیشتەجێبوونی خانەدانەکانیان تیایدا، بڵاوبوونەوەی رێبازەکەیان لەوێدا))[٢٩٨].

بێگومان ئەو وتەیە و هەبوونی ناوی دەیان سۆفی دینەوەریی لە نێو سەرچاوەکاندا، بەو ئاڕاستەیەمان دەبات بیر لە قوتابخانەیەکی تایبەتی سۆفیگەری بکەینەوە، بەو جۆرەی لە هەریەك لە بەغداد و خوراسان و شوێنی دیکەی جیهانی ئیسلامیدا هەبووە. بەڵام باوەڕهێنان و سەلماندنی ئەو تێزە کارێکی ئەستەمە؛ ئەگەرچی دەشێ دەقەکەی هەردوو نووسەر ثەعالبی و ئیبن فندق وەك ئاماژەیەك بۆ ئەو قوتابخانەیە بخوێنرێتەوە، بەڵام دواجار پەیوەستبوونی توندی سۆفییانی ئەوێ بە رەوت و قوتابخانە سۆفییەکانی تری جیهانی ئیسلامیی وایکردووە دیاردەکە لەوێ لە سنووری چەندایەتیدا بمێنێتەوە، هەروەها بۆتە هۆی ئەوەی رووخسار و تایبەتمەندێتی شارەکە، لەم بوارەدا، بزر ببێ و شتێکی ئەوتۆی لێ نەبینرێ. خۆ سەرچاوەکانیش باس لەوە ناکەن هیچ کامێك لە سۆفییانی دینەوەر خودان رەوتێکی سەربەخۆ و تێگەیشتنێکی جیاوازی سۆفیگەری بووبن. لەگەڵ ئەوەشدا زۆری ژمارەی سۆفییەکان بەردەوامێتی بە دیاردەکە داوە و، تا ئەو کاتەی وەك کایەیەکی هزریی ماوەتەوە، سۆفییانی ئەوێ رۆڵیان لە بەرهەمهێنانیدا هەبووە.

---

(٢٩٦) ثمار القلوب في المضاف و المنسوب, حققه: محمد ابو الفضل ابراهيم, دار نهضة مصر, القاهرة, ١٩٦٥, ص٢٣١, ٢٣٨.

(٢٩٧) تاريخ بيهق، با تصحيح و تعليقات: احمد بهمنيار، كاتبفروشى فروغي، تهران, بى تا، ص٢٨.

(٢٩٨) ((صوفية الدينور يضرب بهم المثل لكثرتهم بها, واستيطان أعيانهم إياها, ونفاق مذهبهم فيها))؛ ثمار القلوب, ص٢٣٨.

جێگەی باسە، کە ئەو بەرفرەبوونەی دیاردەی سۆفیگەری، وادەکات سۆفییانی دینەوەر لە دەرەوەی شارەکەشدا رۆڵێان لە برەوپێدانی هزرەکە هەبێ؛ سەفەر بکەن بۆ هەرێم و شارەکانی تری جیهانی ئیسلامی و هەژموون بکەنە سەر دەرکەوتن و جێگیربوونی ئەو دیاردەیە لەو ناوچانەدا. بێگومان ئەو پرۆسەی سەفەرکردنەش بەشێکە لە پێکهاتەی سۆفیگەری و لە دووتوێی بیروباوەڕی سۆفییاندا رەوا بووە و رووخساری کردەکییانەی دیاردەکەی دەنواند؛ بەجۆرێك کە مەبەست لە سەفەرکردن فراوانبوونی توانا عەقڵیەکانی مرۆڤە لە پێناو خوداناسیدا، لە رێگەی سەفەرەوە دەشێ بە ئاراستە جیاوازەکانی زانستە ئایینییەکان ئاشنا ببێ، هەروەها بە یاوەرێتی کردنی سۆفییانی تر لەو سەفەرانەدا پەیوەندییەکانی خۆی لە میانەی سیستەمێکی رێکخراوی رۆحانییەوە برەو پێبدەدات[٢٩٩]. لەبەرامبەردا ئەوەی لەو پرۆسەیەدا زەرەرمەند بێ سۆفیگەری ناوچەییە کە ناتوانێ سەرمایەی هزریی ئەو کۆچکردووانە بخاتە سەر ئەزموونی ئەوانەی - لە شێوەی مەمشاد - لەشارەکەدا مابوونەوە.

لە یەکەمین ئەو سۆفییانەی خولیای سەفەری هەبووە و هەمیشە لە سەفەر دابووە هەر ئەوئەبوبەکری کەسائی دینەوەری[٣٠٠] یەیە کە پێشتر باسمان کرد. لەدوای ئەو رەنگە لە دیارترین ئەو سۆفییە دینەوەرییانەی سەفەریان کردووە و زیاتر لە دەرەوەی شارەکەی خۆیاندا ناسراون: ئەبولحەسەن عەلی کوڕی محەمەدی صائیغی دینەوەری (م٣٣٠ك/٩٤٢ز)، کە لە دینەوەر سۆفییەکی دیار بووە و مەمشادیش بە خوداپەرستییەکەی سەرسام بووە[٣٠١]، بەڵام وادیارە دواتر چۆتە "وڵاتی مصر" و وەك شێخێکی شکۆمەند و شارەزا لە هەردوو بواری سۆفیگەری و زانستە شەرعییەکان (بەتایبەت گێڕانەوەی فەرموودە) دەرکەوتووە[٣٠٢]، لەوێدا موریدێکی زۆری لەخۆی کۆکردۆتەوە و توانیویەتی زەمینەی بڵاوبوونەوەی دیاردە ئایینییەکە

---

(٢٩٩) لەبارەی ماناکانی سەفەر لە کولتووری سۆفیگەری – بۆ نموونە – بڕوانە: المكي: قوت القلوب, ج٢, ص ص٣٤٢-٣٤٩. الخركوشي: تهذيب, ص٢٣٦-٢٤١.

(٣٠٠) الأنصاري: طبقات الصوفية, ص٣٤٤.

(٣٠١) ابن الجوزي: صفة الصفوة, ج٤, ص٤٧. ابن كثير: البداية, ج١١, ص٢٢٤.

(٣٠٢) السلمي: طبقات, ص ص٣١٢-٣١٥. ابو نعيم: حلية, ج١٠, ص٣٥٣.

فراوان بکات[٣٠٣]. بەهەمان شێوە ئەبوبەکر محەمەد کوڕی داودی دینەوەری دقی، چۆتە وڵاتی شام و تا ئەو کاتەی لە دیمەشق لەدوایساڵی (٣٥٠ك/٩٦١ز) مردووە[٣٠٤]، تێیدا ماوەتەوە. هەروەها ئەبو عەبدوڵڵا محەمەد کوڕی عەبدولخالقی دینەوەری مورید و یاوەری مەمشادیش، بۆ حیجاز سەفەری کردووە و بۆ ماوەیەکی زۆر لەوێدا ژیاوە، بەڵام دواتر گەڕاوەتەوە دینەوەر و تیایدا مردووە[٣٠٥].

لەوە دەچێ سەفەرکردن و جێهێشتنی دینەوەر تەنیا بریتی نەبووبێ لە پرۆسەی بەکردەکی کردنی بیروبۆچوونێکی دیاری کراوی سۆفیگەری، بەڵکو هەندێك جار هەڵوێستێکی باوەڕییانە بووە یانیش دوورکەوتنەوەی ناچاری بووە؛ ئەوەتا پێشتر کۆچکردنی ئەبولعەباسی دینەوەری بۆ نیشاپور ئینجا بۆ سەمەرقەند و مانەوەی لەوێ تا کۆتایی ژیانی بەستمانەوە بە پەیوەستیی باوەڕییانەی ئەو سۆفییە بە شیعەگەرییەوە. هەروەها دەبینین کۆچکردنی سۆفییەکی گەورەی وەك فارسی کوڕی عیسای دینەوەری بۆ سەمەرقەند، جۆرێك لە ناچاری پێوە دیارە، بەوەی کە ئەو سۆفییە سەرسەختانە بانگەشەی بۆ ڕەوتێکی دیاری کراوی سۆفیگەری دەکرد، کە لە پانتایی شارەکەی قەبوڵ نەدەکرا[٣٠٦]، هەر بۆیە ئەویش تا لە دەوروبەری ساڵی (٣٤٥ك/ ٩٥٦ز) دەمرێ، هەر لەسەمەرقەند ماوەتەوەو دوای خۆی گۆڕەکەی بۆتە مەزارگەیەکی ناوچەکە[٣٠٧].

## ٢- سۆفیگەری لە کرماشان (قرمیسین)

ڕەنگە ئەو شارەی لەدوای دینەوەر بێت، لە رووی دەرکەوتنی سۆفی تیایدا، شاری کرماشان بێت، ئەگەرچی لێرەدا زۆری ژمارەی سۆفییان نەبۆتە پێوەر بۆ ئەو پێگەیە ئەوەندەی

---

(٣٠٣) الماليني: الأربعون في شيوخ الصوفية, ج١, ص٥٧, ١٢٧-١٣١, لەم سایتەی خوارەوە بڵاوکراوەتەوە : http://www.alsunnah.com. الأنصاري: طبقات, ص٣٩٣.

(٣٠٤) القشيري: الرسالة, ص ص١١٦-١١٧. الخطيب البغدادي: أخبار الصوفية, ص ص٢٥٩-٢٦٠. ابن الأثير: اللباب, ج١, ص٤٢٢.

(٣٠٥) السلمي: طبقات, ص٥١٥, ٥١٧. ابن خميس: مناقب, ج٢, ص٢٢٦.

(٣٠٦) دواتر لە بەشی سێیەم ئەو باسە روونتر دەکەینەوە.

(307) السمعاني: التحبير في المعجم الكبير, تحقيق: منيرة ناجي سليمان, مطبعة الأرشاد, بغداد, ١٩٧٥,ج١, ص٢٣٦.

کەسایەتی سۆفییەکانی ئەوێ خۆی بەسەر دەرکەوتەکانی دیاردە ئایینییەکەدا سەپاندووە و وایکردووە بە دووەمین بنکەی سۆفیگەری لە پانتایی کوردیدا دابنێین. کرماشان لە چەند سەدەی یەکەمی کۆچیدا لە چەند روویەکەوە بەرچاو بووە؛ جا چ بە هۆی زۆری دانیشتوانییەوە بووبێ، کە جگە لە کورد رەگەزی تریشی لێ بووە بە تایبەت فارس[٣٠٨]، یاخود هەلکەوتە جوگرافییەکەی بێ لە رووی ئابورییەوە[٣٠٩]، یانیش پێگەکەی بووبێ لەڕووی ئایینییەوە، بەوەی کە کەوتبووە سەر رێگای حاجییانەوە[٣١٠]. ئەو خالەی دوایيان، ئەوەمان پێ دەلێ کرماشان پەیوەندیی و تێکەلی لەگەل خەلکی شار و دەڤەرەکانی تردا هەبووە و دەستەبژێرە ئایینییەکەی ئاگاداری ئەو رەوت و رێبازە ئایینیانە بوون، کە لە رۆژهەلاتی جیهانی ئیسلامیدا برەویان دەسەند، لەوانەش سۆفیگەری. ئیدی دەبینین لە زوویەکەوە بۆتە مەنزلگای هێندێك لە زاهید و سۆفییەکان بە تایبەت خوراسانییەکان، ژیان و بەسەرهاتی ئەو کەسانەش جێگەی پرسیاری خەلکی شارەکە بووە[٣١١]، بەمەش لەوێدا سۆفیگەری وەك دیاردەیەکی نامۆ چاوی لێ نەکراوە و زەمینەی ئایینی – کۆمەلایەتی ئامادەکراوە بۆ چەکەرەکردن و برەوسەندنی.

بەهەر حال، لە سەرچاوەکاندا، زیاتر باس لە دوو سۆفی دەکرێ، کە لەبواری بەرهەمهێنانی هزری سۆفیگەریدا سەردەستە و لە ئاستێکی بالادا بوون و ناویان سنووری شارەکەشی بەزاندووە، ئەوانیش هەریەك لە ئەبو عەلی مظفەری کرماشانی و ئەبو ئیسحاق ئیبراهیمی کوڕی شەیبانی کرماشانی. ئەوان هەردووکیان بە "شێخی چیاکان – شیخ الجبال" ناودەبرێن[٣١٢]، ئەمەش پێمان دەلێ ئەو دووانە – لە رووی هزریەوە – هەژموونیان بەسەر ئەو

---

(٣٠٨) اليعقوبي: البلدان, ص٣٥.

(٣٠٩) لەمبارەوە بڕوانە: حسام الدين على غالب نەقشبەندى: شارەزوور, ل٥٠.

(٣١٠) مؤلف مجهول: حدود العالم من المشرق الى المغرب, تصحيح: مريم مير احمدى و غلامرضا ورهرام, مركز چاپ و انتشارات دانشگاه پيام نور, تهران, ١٣٧٢هـ.ش, ص٣٩٠. ياقوت: معجم البلدان, ط ٢, دار صادر, بيروت, ١٩٩٥, مج٤, ص٣٣٠.

(٣١١) ابن خميس: مناقب, ج١, ص٤٣٤. ابن الجوزي: صفة الصفوة, ج٤, ص٩٨.

(٣١٢) السلمي: الطبقات, ص٤٠٣،٣٩٦. القشيري: الرسالة, ص١١٠. الصفدي: الوافي, ج٦, ص١٦. المناوي: الكواكب الدرية في تراجم السادة الصوفية او طبقات المناوي الكبرى, حققها: عبد الحميد صالح حمدان, المكتبة الأزهرية للتراث, القاهرة, ١٩٩٤, ج١, ص٦١٦.

هەرێمەدا هەبووە و کاریگەریان لەسەر دامەزراندنی هزرەکە لەوێدا دیار بووە، بە تایبەت لە ناوچە کوردییەکاندا. بێگومان دەشێ ئەو کارەشیان بە تەواوکەری رەوتی سۆفیگەری دینەوەر بزانین، بێگومان نزیکی هەردوو شار لە یەکدی[٣١٣](نزیکەی بیست و پێنج میل)، رێگەی بەو تەواوکاریە داوە، ئەمە بێ ئەوەی بەمانای پاشکۆیی سۆفییانی کرماشان بۆ ئەوانی دینەوەر بێ، وەك لە پەیوەندیی هەندێك لە سۆفییانی دینەوەر بە هی کرماشان، بە تایبەت بە ئیبراهیمی کوڕی شەیبانەوە، دیارە؛ پایەی ئەو کرماشانییە وایکردووە سۆفییانی هەرێمەکە بە گشتی، بە تایبەت دینەوەر [٣١٤] و هەمەدان [٣١٥] و نەهاوەند [٣١٦]، لەو کۆ ببنەوە، وەك مورید و وەك یاوەر، سوود لە بیروبۆچوونەکانی وەربگرن. ئیدی ئەو دوو سۆفییە جۆرێك لە سەنتەرگیریان بە شار لە نێو جوگرافیای سۆفیگەریی ئیسلامیدا بەخشیوە و وایانکردووە هەڵوێست و تێگەیشتنی سۆفییانەیان لە پانتاییەکەدا تەشەنەبکات.

### مزەفەری کرماشانی و سۆفیگەری وەك هەژاریی:

ژیان و سەربوردە و تەنانەت ساڵی مەرگی ئەو سۆفییە نادیارە، هەر ئەوەندەی لەسەر دەزانین یاوەرێتی سۆفییانی کۆتایی سەدەی سێیەم و سەرەتای سەدەی چوارەمی کۆچی کردووە[٣١٧]، هەروەها شاگرد و موریدی خۆی هەبوون[٣١٨]. هەرچۆنێك بێت ئەوەی گرنگ بێت خوێندنەوەی ئەو کرماشانییەیە بۆ چییەتی سۆفیگەری، کە ئەویش پتر بوارە کردەکییەکەی گرتۆتەوە. مظفر دەیەوێ چۆنییەتی پەیڕەوکردنی ئەو دیاردەیەمان بۆ بخاتە روو، نەك تەنیا

---

(٣١٣) اليعقوبي: البلدان, ص٣٥. ياقوت: معجم, مج٤, ص٣٣٠.

(٣١٤) السلمي: ذكر النسوة المتعبدات الصوفيات, تحقيق: محمود محمد الطناحي, مكتبة الخانجي, القاهرة, ١٩٩٣, ص٦٨. الخطيب البغدادي: أخبار الصوفية, ص٦٢.

(٣١٥) الخطيب البغدادي: أخبار الصوفية, ص ١٤٧. ابن الساعي: أخبار الحلاج, ص١٠١.

(٣١٦) السلمي: نسيم الأرواح, حققه: احمد طاهرى عراقى, منشور ضمن: مجموعة آثار ابو عبدالرحمن سلمي, گردآوري: نصرالله پورجوادى, مركز نش دانشگاهى, تهران, ١٣٦٩ه.ش, ج٢, ص١٦٨.

(٣١٧) السلمي: طبقات, ص٣٩١, ٥٠٩. الأنصاري: طبقات الصوفية, ص٤٣٣, ٤٩٦-٤٩٧. الذهبي: تاريخ الإسلام, ج٢٦, ص٥٤١.

(٣١٨) الأنصاري: طبقات الصوفية, ص٢٢٨.

وەك پرۆسەیەكی بەرهەمهێنانی چەمك و دەستەواژە بۆ دارشتن و دەربڕینی ئەزموونی رۆحانی سۆفی، بەڵكو زیاتر وەك هەڵسوكەوتێك لە ژیانی رۆژانەیدا بەرجەستە دەبێ و دەستنیشانی ئەو ناسنامەیەی دەكات كە لە چوارچێوەی جڤاكی ئایینیدا پێی دەناسرێتەوە. ئەو تێگەیشتنەی مظفەر بۆ سۆفیگەری لەو پێناسەیە دەردەكەوێ كە بۆ ئەو هزرەی كردووە و دەڵێ بریتییە لە "رەوشتی رەزامەندانە"[319]، رەوشتێك كە وادەكات مرۆڤ لە هەموو كات و بارێكدا بەرامبەر بە خودا رەزامەند بێ[320].

بەر لەوەی پێكهاتەی ئەو رەوشتە دەربخەین كە سۆفیگەری پێ دەناسرێتەوە، دەبێ ئەوە بزانین یەكسانكردنی سۆفیگەری بە رەوشت لەمێژ نەبوو لە نێو ئەو كولتوورەدا دەركەوتبوو، وەك ئاكامێك بۆ كەڵەكەبوونی ئەزموونێكی تازەی سۆفییانە گەڵاڵە ببوو[321]، سۆفیەكەی كرماشانیش دەبێتە یەكێك لە یەكەمین ئەو كەسانەی ئەم بۆچوونەی برەوپێداوە. لێرەدا رەوشت نەسەر سیستەمی دوانەیی(دوالیزم) دانەمەزرابوو، وەك لە كایە مەعریفییەكانی تر وابوو چ لە زانستە ئایینییەكان بە كەلامناسیشەوە یاخود نا ئایینییەكان بەتایبەت فەلسەفەی ئیسلامی، بەڵكو تەنها بەها بالآكانی دەگرتەوە و ئاماژەبوو بۆ چاكەكاریی، رەوشت – بە دەستەواژەی نووسەری سۆفی هجوەیری – كارێكە بێ هۆكار و لە "باطن" و "ظاهر"دا یەكدەگرێتەوە و بانگەشەكاریی پێوە دیار نییە[322]، بەمەش – لە نێو چەمكە سۆفییەكاندا – كەمترین راڤە نەخۆ دەگرێ و وەك بزاوتێك و هەڵوێستێكی تایبەتمەند شێوە دەگرێ.

سەبارەت بەو رەوشتەی مظفەری كرماشانی دەیكاتە ناونیشانی رێبازە سۆفییانەكەی خۆی، ژیانی دەروێشانە یاخود "هەژاریی – الفُقر"ە، لەمەشدا لە نێو شێخانی هاوسەردەمی بە تاقانە دادەنرێ[323]، نەك هەر هزرەكەی بەڵكو ئەو خۆشی بە "دەروێشی راستگۆ" یان

---

(٣١٩) السلمي: طبقات, ص٣٩٦. الأنصاري: طبقات الصوفية, ص٤٤٨.

(٣٢٠) الهجويري: كشف, ج١, ص٢٣٨.

(٣٢١) لەبارەی "سۆفیگەری وەك رەوشت" بڕوانە: محمد عابد الجابري: العقل الأخلاقي العربي – دراسة تحليلية لنظم القيم في الثقافة العربية, ط٢, مركز دراسات الوحدة العربي, بيروت, ٢٠٠٦, ص ص٤٤٣-٤٤٤.

(٣٢٢) كشف المحجوب, ج١, ص٢٣٧.

(٣٢٣) السلمي: طبقات, ص٣٣٦. الشعراني: طبقات, ص١٦٨.

"هەژاری راستگۆ" وەسفدەکرێ[٣٢٤]. لای وی "هەژار – الفقیر" کەسێك نییە پێداویستییە دونیاییەکانی نەبێ، چونکە هەلێپەی دەستخستنی ئەو پێداویستییانە ناچارییەکی ژیانە، بەلکو هەژار ئەو کەسەیە کە جگە لە خودا پێویستی بە هیچ کەسی تر نییە و هەژاریی – لە مانا گشتییەکەیدا – پەیوەستە بە پەیوەندیی مرۆڤ بە خوداوە[٣٢٥]، بەهۆیەوە سۆفی دەتوانێ لە بەندایەتی خۆی بۆ خودا تێ بگات. لە بەرامبەردا نابێ بژێوی ژیان و دابینکردنی مەبەستێك بێت لەخۆیدا و لە میانەی پەیداکردنیدا، ڕەفتاری ڕۆژانەی سۆفی دیاری بکات و پەیوەندییەکانی لەگەڵ ئەوانیتر، تەنانەت لەگەڵ خوداشی، لەسەر دابمەزرێ، بەلکو دەبێ دەسبەرداری خواستی چاك کردنی باری ژیانی بێت، خۆ باشترین جۆری بژێوی ئەوەیانە کە بێ خواستن و هەوڵدان، بەلام لە چوارچێوەیەکی شەرعییەوە، دەست بکەوێ[٣٢٦].

بێگومان ئەمە بەمانای تەوەزەلی و خۆدانەدەست ویستێکی هەمەگیری کۆمەلایەتی نایەت، ئەوەندەی بێباکییە لەبەرامبەر بە پێداویستیە ئاساییەکانی ژیان، ئەوەتا مظفەر بە ویستی خۆی ئەو حالە هەژاریەی هەلبژاردبوو، لای ئەو ئەمە ڕەفتارێکی پەرچەکردارانەیە لە هەمبەر ڕەوشی خراپی کۆمەلایەتی و تەشەنەکردنی هەژاری لە نێو خەلکدا پەیڕەوی لێ دەکرێ، ئەگەرنا ئەو خۆی وەك کەسێکی خودان پلە و پایە دەردەکەوێ، کە خەریکی خزمەت کردنی یار و یاوەرانی بووە[٣٢٧]، ئەو پایە کۆمەلایەتییەی – بەهۆی سۆفیبوونییەوە بە دەستی هێنابوو – دەیویست دیاردە کۆمەلایەتییەکەی پێ چارە بکات، ئیدی ئەوەی بهاتایەتە دەستی دەیبەشییەوە، چێژی لەوە وەردەگرت هیچی پێ نەمابوایە[٣٢٨].

خۆدیتنەوە لە نێو هەژاریی سۆفییانە نە ئاسانە و نە سادە؛ ئاسان نییە چونکە پێویستی بە کارکردنی زۆر هەیە لەسەر جەستە، سادەش نییە چونکە دەبێ ڕێگایەك بێ سۆفی بە پلە بەرزەکانی ئەزموونی ڕۆحانی سۆفییانە بگەیەنێ. سەبارەت بە کارکردن لەسەر جەستە، ئەوا

---

(٣٢٤) الأنصاري: طبقات الصوفية, ص٤٤٧. ابن خميس: مناقب, ج٢, ص١١٣.

(٣٢٥) ابن خميس: مناقب, ج٢, ص١١٤. ابن قيم الجوزيه: طريق الهجرتين, تحقيق: عمر محمود, ط ٢, دار ابن قيم, الدمام, ١٩٩٤, ص٨٧.

(٣٢٦) الشعراني: طبقات, ص١٦٩.

(٣٢٧) السراج: اللمع, ص٢٥٣.

(٣٢٨) السراج: اللمع, ص٢٥٣.

دەبێ زێتر راهێنانی بێ لەسەر دۆخێك كە لەگەڵ خوداناسیندا بگونجێ؛ ئەمەش بەر لە هەموو شتێك دەخوازێ جەستە بەتەواوی فەرامۆش بكرێ و لە دەوروبەر دابڕێنرێ، جەستە تەنێكی دونیاییە و ئەگەر پشتگوێ نەخرێ دەرگای بوونە "عارف" بەسەر مرۆڤدا دادەخرێ، چونكە عارف – بەلای ئەو كرماشانییەوە - كەسێكە جەستەی بۆ خەڵكە و دڵی بۆ خودا[٣٢٩]، بە دەستەواژەیەكی تر جەستەی لە خزمەتی خەڵكدایە نەك خزمەتی خۆی، دڵیشی بۆ ناسینی خودایە نەك ناسینی خەڵك.

بێگومان گونجاوترین و باوترین جۆری راهێنان بۆ بەرزەفتكردنی جەستە و چەپاندنی ئارەزووەكانی، برسی كردنییەتی. بەڵام مەبەست لەو برسی بوونەش تەنیا بەرزەفتی و چەپاندن نییە وەك لە رووكەشدا وادێتە بەرچاو، بەڵكو – سەرباری ئەوە – ئامرازێكیشە بۆ بەهێزكردنی توانا هزرییەكانی مرۆڤ. مرۆڤ بە برسێتی، برسێتییەكی بە ویست و قەناعەتەوە[٣٣٠]، دڵی – كە وەك بینیمان ئەركی ناسینی خودا بەجێ دەگەیەنێ – رۆشن دەبێتەوە و توانای بیركردنەوەی فراوانتر دەبێت[٣٣١].

بەرزەفتكردنی جەستە وایكردووە كاتێك ئەو سۆفییە دەچێتە سەر ئەركە ئایینییەكانیش، زیاتر قسە لەسەر ئەوەیان بكات كە پەیوەندیی بەو بەرزەفتكردنەوەیە هەیە، دیارە لێرە مەبەستمان "رۆژوو گرتن-الصوم"ە؛ لای ئەو ئەم ئەركە لە مانا باوەكەی دەرچووە و – لە دووتوێی كرداری كۆنترۆڵكردنی جەستە و گەیشتن بە حاڵی هەژاری – بە سێ رووخسار خۆی دەنوێنێ: بەوەی كە - بەر لە هەموو شتێك – بەرۆژووبوونی رۆحە، ئەو رۆژووەی وا لە

---

(٣٢٩) المكي: علم القلوب, حققه: عبدالقادر احمد عطا, دار الكتب العلمية, بيروت, ٢٠٠٤, ص١٢٧.

(٣٣٠) قەناعەت لای مظەفەر كرماشانی وەك سەرمایەیەكی رەمزی وایە, بەهۆیەوە توانیویەتی بەو حاڵە بگات كە تێیدا بووە, ئەو لە چەند دێرە شیعرێكی عەرەبیدا ئاماژە بۆ ئەو قەناعەتە دەكات و دەبێژێ:

افادتني القناعة كل عـــز    وهـل عـزٌ اعـز من القناعـــة

فصَيرها لنفسك رأس مال    وصَير بعدها التقوى بضاعة

(( قەناعەت زۆر شكۆمەندانە سودی پێ گەیاندووم, جا لە شكۆی قەناعەت مەزنتر هەیە, بۆیە بۆ خۆت بیكە بە سەرمایە و دوای ئەمیش تەقوا بكە بە كاڵا))

الخركوشي: تهذيب, ص٤٦٣. البيهقي: الزهد الكبير, ص٩٢.

(٣٣١) القشيري: الرسالة, ص١١٠. ابن الملقن: طبقات, ص٢٦٣.

مرۆڤ دەکات ئەوەندە دونیایی نەبێ و هیوای زۆری بە ژیان نەبێ و باوەڕ بەوە بهێنێ کە ژیان کورتە. ئەوەش بەرەو رووخساری دووەمی رۆژوومان دەبات، رووخسارێك کە دەبێ ئەو باوەڕە تۆخ بکاتەوە، ئەویش بەرۆژوو بوونی عەقڵە، نەك بەوەی بیر نەکاتەوە، چونکە وەك بینیمان برسێتی خۆی لەپێناو بیرکردنەوە بووە، بەڵکو تا بتوانێ بەسەر ئارەزووەکانی جەستەدا زاڵ ببێ، لەو بەها بەرزەی پێیان بەخشراوە دایان بماڵێ و رێگەیان پێ نەدات مرۆڤ دونیایی بکەنەوە و وەك ئەوانیتر خەریکی چێژەکانی ژیان بێت. لێرەوە رووخساری سێیەمی رۆژوو دەردەکەوێ، ئەویش سنووردانانە بۆ هەژموونی ئەو چێژانە بەسەر دەروونی مرۆڤدا، بەتایبەت خواردن و خواردنەوەی و شەهوەتبازی و شتە حەرامکراوەکانی تر، ئەمەش بەرۆژووبوونی دەروون دەگەیەنێ[٣٣٢].

کاتێکیش ئاوا جەستە لەژێر چاودێری رۆح و عەقڵ و دەروون دابێ، ئەوکات سۆفی دەچێتە نێو قۆناغێکی نوێی پەیوەندیی گرێدان بە خوداو ناسینی، ئەمجارەش ناسین لەسەر چەمکی خۆشەویستی خودایی دادەمەزرێ، خۆشەویستییەك کە لە نێوخۆیدا مەرگی مینۆکییانەی سۆفی هەڵگرتووە، نەك بەمانای توانەوەی زاتی مرۆڤانە لە نێو زاتی خودایی، بەڵکو بەمانای نەمانی زاتی مرۆڤانە — کە وەك بینیمان بە خۆبرسیکردن و چەپاندنی جەستە مەیسەر دەبوو - لەپێناو "نزیك بوونەوە- القرب"ی تەواو لە خوداوە. ئەگەر ئەو مەرگە مینۆکییە نەبێ ئەوا ئەو نزیکییە ئەستەم دەبێ، هەر بەو نزیکبوونەوەشە جارێکی تر سۆفی زیندوو دەبێتەوە، یاخود وەك ئەو دەڵێ: ((ئەوەی خۆشەویستی بیکوژێ، نزیکیی زیندووی دەکاتەوە))[٣٣٣]. بەڵام بێگومان لەو زیندووبوونەوەیەدا هەرگیز مرۆڤ هەڵگری هەمان خەسڵەتەکانی پێشووی نییە، بەڵکو ئەمجارە عارفێکە بێباك لە دەوروبەر و ژیانێکی ئەوتۆ دەژی کە تەنیا خودا رازەکانی دەزانێ.

### ئیبراهیمی کوڕی شەیبان و برەوپێدانی سۆفیگەری لە کرماشان:

لەوە دەچێ دووەم سۆفی شارەکە کە ئیبراهیمی کوڕی شەیبانە تەمەنی سۆفییانەی لە هی مظفەر بچوکتر بووبێ[٣٣٤]؛ ئەوەیان بەوە ناسراوە لەسەر دەستی سۆفی بەناوبانگ ئەبو

---

(٣٣٢) السلمي: طبقات, ص٣٩٦. الخركوشي: تهذيب, ص٢١٦. الأنصاري: طبقات الصوفية, ص٤٤٧.

(٣٣٣) ((مَن قتله الحبُّ أحياه القربُ))؛ السلمي: طبقات, ص٣٩٧. الأنصاري: طبقات الصوفية, ص٤٤٧.

(٣٣٤) السراج: اللمع, ص٢٥٣.

عەبدوڵڵای مەغریبی پێگەیشتووە، هەر لە گەنجێتییەوە یاوەری ئەوی کردووە و زۆری لێ نزیك بووە و لەگەڵیدا چەندان شوێنی جیهانی ئیسلامی گەڕاوە[٣٣٥]. بۆماوەیەکی زۆر لەگەڵیدا ماوەتەوە؛ هەندێك دەڵێن سی ساڵ[٣٣٦] و ڕای واش هەیە دەڵێ چل ساڵی لەگەڵدا بووە[٣٣٧]. ئەوەدەچێ ئەو کرماشانییە، وەك بەشێکی پێویستی کردەی بوونە سۆفی، خۆی ئارەزووی گەڕانی هەبووبێ، بۆیە دەیبینین لە زۆر شوێندا ئامادەیە(هەرێمی جەزیرە، وڵاتی شام، وڵاتی مەغریب)[٣٣٨]، کەچی وادیارە دواجار گەڕاوەتەوە کرماشان و لەوێدا ژیانی بەسەر بردووە[٣٣٩]. ئەو تەمەنێکی باشی هەبووە، لایەنی کەم لە هەشتا ساڵیدا هێشتا زیندوو بووە[٣٤٠]، لەبارەی ساڵی مردنی بۆچوونی جیاواز هەیە هەندێك دەڵێن لە (٣٣٠ك/٩٤١-٩٤٢ز)[٣٤١]، هەندێکیش دەڵێن لە(٣٤٠ك/٩٥٩ز)[٣٤٢] و ڕایەکیش هەیە دەڵێ لە ساڵی (٣٣٧ك/٩٤٨ز)[٣٤٣] مردوە.

هەرچۆنێك بێت، خوێندنەوەی ئیبراهیم بۆ سۆفیگەری کردەکی و هەڵسوکەوتی ڕۆژانەی سۆفییان، هاوشێوەی هەمان ئەو خوێندنەوەیەیە کە مظەفەری کرماشانی هەیبوو و جەختی لەسەر ژیانی هەژاری و زاهیدانە کردۆتەوە. ئەو خۆی یاوەرێتی ئەو مورید و سۆفییانەی پێ دروست بووە کە پێداویستییەکانی ژیانیان بەهەند وەرنەگرتوە و لەوانەش دوور کەوتۆتەوە کە

---

(٣٣٥) ابن الجوزي: صفة الصفوة, ج٤, ص٣٥١. السهروردي: عوارف, ج٢, ص٢١٤. الذهبي: سير أعلام, ج١٥, ص١١٩.

(٣٣٦) ابن الملقن: طبقات, ص٢٥٠.

(٣٣٧) فريد الدين عطار: تذكرة, ج٢, ص٢١٤.

(٣٣٨) ابن خميس: مناقب, ج١, ص٤٣٣. ج٢, ص١١٩.

(٣٣٩) الكلاباذي: التعرف, ص١١٨.

(٣٤٠) السراج: اللمع, ص٢٤٣. الخركوشي: تهذيب, ص٢٢٦.

(٣٤١) ابن عساكر: تاريخ, ج٦, ص٤٤٤.

(٣٤٢) ابن الجوزي: المنتظم, ج١٤, ص١١٩.

(٣٤٣) اليافعي: مرآة الجنان, ج٢, ص٢٤٣.

وێڵی دوای ئەو پێداویستییانە - چەندەش سادە بێ – بوونە[٣٤٤]. هەر لەو روانگەیەوە شاری جێهێشتوە و لە دێیەکی نزیکدا ژیاوە و تەنیا بۆ نوێژ چۆتەوە ناو شار[٣٤٥]، هەروەها دەڵێن بۆ ماوەیەکی درێژی تەمەنی بێ ماڵ و حاڵ بووە و بە دڵی خۆی خۆراکی نەخواردووە[٣٤٦].

ئەوەی ئیبراهیم لە مظفەر جیا دەکاتەوە و وایلێدەکات، لە ئاستی گشتیی سۆفیگەریی ئیسلامیدا، پێگەیەکی بالاتری هەبێ، کارکردنییەتی لەبواری تیۆری و دارشتنی تێز و چەمکە بنەرەتی و هەستیارەکانی سۆفیگەری، هاوتەریب لەگەڵ گرنگیدانی بە لایەنی کردەکی هزرەکە. ئەمە سەرباری پەیوەندیی لەگەڵ گەورە سۆفییانی سەردەمەکەی[٣٤٧] ؛ هەر لە جونەید[٣٤٨]ەوە بگرە تاوەکو شبلی[٣٤٩] و ئیبراهیمی خەواص، کە ئەوەی دواییان لە یاوەرە زۆر نزیکەکانی بووە و هەردووکیان موریدی هەمان سۆفین کە ئەبو عەبدوڵڵای مەغریبییە[٣٥٠]. لە بەشی دابێت بەدرێژیی قسە لەسەر هزری ئەو سۆفییەی کرماشان دەکەین.

### ٣- سۆفیگەری لە شاری نەهاوەند:

شارێکی تری هەرێمەکە کە بزاوتێکی تارادەیەك بەرچاوی سۆفیگەری لێ هەبووە، شاری نەهاوەندە، ئەمەش یەك لە شارە کۆنەکانی ئەوێیە و لە زوویەکەوە تێکەڵ بە جیهانبینی ئیسلامی بووە[٣٥١]و ئەهلی فەرموودەی تێدا دەرکەوتووە[٣٥٢]، یاخود روویان تێکردووە و

---

(٣٤٤) (( كنا لا نصحب مَن يقول نعلي))؛ السلمي: المقدمة, ص٢١-٢٢. ابن شاهاور: منارات السائرين و مقامات الطائرين, تحقيق و تقديم: سعيد عبد الفتاح, دار سعاد الصباح, الكويت, ١٩٩٣, ٤٩٨.

(٣٤٥) الكلابادي: التعرف, ص١١٨.

(٣٤٦) الخركوشي: تهذيب, ص١٥٢, ٢٢٦. القشيري: الرسالة, ص٢٦٦.

(٣٤٧) السلمي: المقدمة, ص٥٨.

(٣٤٨) البيهقي: البيهقي, ص٣٥٥. الخطيب البغدادي: أخبار الصوفية, ص٦٢.

(٣٤٩) السراج: اللمع, ص٢١٠.

(٣٥٠) السراج: اللمع, ص٢٢٦. القشيري: الرسالة, ص١١٢. ابن خميس: مناقب, ج١, ص٤٣١. فريد الدين عطار: تذكرة, ج٢, ص٩٨.

(٣٥١) الجيهاني: أشكال العالم, ترجمه: علي بن عبد السلام كاتب, با مقدمة و تعليقات: فيروز منصورى, شركت به نشر, تهران, ١٣٦٨هـ.ش, ص١٤٢.

"خەڵکی چیاکان" لێیان سوودمەند بوونە[353]. لە بواری سۆفیگەرییش، ئەوا بەرلەوەی خۆی وەك بنکەیەکی کایەکە باسی بکرێ، وەك زێدی یەکێك لە گەورەترین و کاریگەرترین کەسایەتییەکان ناوی دەهێنرێ، کە ئەویش جونەیدە[354]. بەڵام لەوە زیاتر هیچمان لە بارەی کاریگەریی ئەو لەسەر ئەو زێدەی خۆی بەرچاو نەکەوتووە، ئەگەرچی ئەو کاریگەریە — بە پشتبەستن بەو زانیاریيانەی لە پێشدا خستمانە روو — بە دوور نازانین، بەتایبەت کە لەوەدەچێ شارەکە جێگەی سەرنجی سۆفییان بووبێ و هەندێك لەوان سەردانیان کردبێ[355].

بەهەرحاڵ، زانیاریمان لەبارەی رەوشی سۆفیگەری نەهاوەند پچڕ پچڕ و پەرش و بڵاوە. رەنگە لە یەکەمین ئەو کەسانەی وەك سۆفی ناویان هاتووە ئەبولقاسم کوڕی مەروانی نەهاوەندی[356] بێت کە یاوەرێتی سۆفی ناسراو ئەبو سەعیدی خەڕاز(م٢٧٩ك/٨٩٢ز) ی کردووە و دەبیبینین لە لە حەج و لە وڵاتی شام لەگەڵیەتی و وتەی لێ دەگێڕێتەوە[357]، بەمەش دەبێ لە سەدەی سێیەمی کۆچیدا دەرکەوتبێ. جگە لەمە ئەوەش لەسەر ئەو نەهاوەندییە دەزانین کە ماوەیەك لە بەغداد ژیاوە، لە شارەکەی خۆشیدا وەك سۆفییەکی دیار ناسراوە و گەنجانی شار سوودیان لە شارەزاییەکانیی لەم کایە ئایینییە وەرگرتووە[358].

---

(٣٥٢) التميمي: الجرح و التعديل, ج٩, ص٤٤٧. السمعاني: الأنساب, ج٥, ص٥٤١.

(٣٥٣) البستي: الثقات, بعناية: محمد عبد المعين خان, مطبعة مجلس دائرة المعارف العثمانية, حيد آباد — الدكن, ١٩٧٣, ج٨, ص٨٩. هەروەها بڕوانە: القزويني: التدوين في اخبار قزوين, حققه: الشيخ عزيز الله العطاردي, دار الكتب العلمية, بيروت, ١٩٨٧, ج٢, ص٨٩.

(٣٥٤) السلمي: طبقات, ص١٥٥.

(٣٥٥) ابن الساعي: أخبار الحلاج, ص٤٥.

(٣٥٦) لەلای مێژوونوس "ابن عساكر"(م ٥٧١ك/١١٧٥ز) ناوەکەی بە شێوەی "ابو القاسم بن مردان"نوسراوە. بڕوانە: تاريخ مدينة دمشق, ج٥, ص١٣٣.

(٣٥٧) الخركوشي: تهذيب, ص٣٣٦. السلمي: طبقات, ص٢٦٥. الخطيب البغدادي: أخبار الصوفية, ص٣٤٠. ابن خميس: مناقب, ج١, ص٤٢٤.

(٣٥٨) الخطيب البغدادي: أخبار الصوفية, ص٣٤٠.

لەلای خۆیەوە سوللەمی لە نوسینەکانیدا ناوی چەند دانە سۆفییەکی شارەکەمان بۆ دەهێنێ، وەك محەمەد کوڕی مەعادی نەهاوەندی[٣٥٩]، ئەبو عەلی ئەحمەد کوڕی محەمەدی نەهاوەندی ناسراو بە "قومان"[٣٦٠]، هەروەها محەمەدی کوڕی عەلی نەهاوەندی[٣٦١]. ئەم دووانەی کۆتایی زیاتر وەك گێڕەرەوە و یاوەری سۆفییانی تر ناویان تۆمار کراوە، کەچی لەوە دەچێ ئەوەی یەکەم خۆی سۆفییەکی پێگەیشتوو بووبێ، بە بەڵگەی ئەو وتەیەی ئەم نووسەرە لێی دەگێڕێتەوە و بریتییە لە گوزارشتکردنێکی مەجازیی – عیرفانییانە لە قورئان و کرۆکی سورەت و ئایەتەکانی، هەر بۆیە سوللەمی لە دەستپێکی ئەو کتێبەی کە راڤەی قورئانە "زیادات حقائق التفسیر" یاداشتی کردووە.

ئەگەر تا ئێرە ئەوەندە زانیارییەی لەسەر سۆفییەکان هەیە، پاڵپشتمان ناکات لە دۆزینەوە و دیاری کردنی تایبەتمەندی و تەنانەت هێڵە گشتییەکانی سۆفیگەری لە نەهاوەند، ئەوا لەگەڵ ئەحمەدی کوڕی محەمەدی کوڕی فەزڵ ناسراو بە ئەبولعەباسی نەهاوەندی (م٣٣١ك/ ٩٤٣ز) تایبەتمەندی و هێڵە گشتییەکان وردتر دەبینرێن. بەر لە هەموو شتێك زانیاری لە بارەی ئەو سۆفییە پتر لە سەرچاوە فارسییەکاندا هەیە؛ لەوێدا ئەوەی جەختی لەسەر کرابێتەوە ئەوەیە کە دەڵێن ئەو لە شاگردانی سۆفییانی ناسراوی وەك جەعفەر خولدی و ئەبو عەبدوڵڵای کوڕی خەفیفی شیرازی بووە، تەنانەت وەك جێنشینێکی ئەوەی دووەم ناوی دەهێنرێ[٣٦٢]. بەڵام ئەمە بەو مانایە نایەت پێگەیشتنی کەسێتییەکەی هەر تەنیا لە میانەی سوود وەرگرتن لە مامۆستاکانی بووبێ، بەڵکو باس لەوە دەکرێ خۆی لە چوارچێوەی ئەزموونێکی رۆحانی درێژخایەنەوە بیری روناك بۆتەوە و برێك لە راستییەکانی بۆ دەرکەوتووە، بەتایبەت ئەوانەی بە ناسینی دەروونییەوە پەیوەستن، لەم بارەوە دەڵێ: ((لە سەرەتا کە دەردی ئەو کارەم گرت، دوازدە ساڵ وەك چاودێر مامەوە، تا (خودا) یەك گۆشەی دڵمی پێ نیشان دام))[٣٦٣].

---

(٣٥٩) زيادات حقائق التفسير, حققها و قدم لها: جرهارد بوورينغ, دار المشرق, بيروت, ١٩٩٥, ص٢.

(٣٦٠) نسيم الأرواح, ص١٦٨. لە سەرچاوەکانی بەردەست مانای ئەو نازناوەمان دەست نەکەوت.

(٣٦١) طبقات الصوفية, ص١٢٢.

(٣٦٢) زركوب شيرازي: شيرازنامه, بتصحيح: بهمن كريمي, مطبعة روشناني, طهران, ١٣٥٠هـ.ش, ص١٠٣

(٣٦٣) جامي: نفحات, ص١٥٠. فصيح خوافي: مجمل فصيحي, تصحيح و تحقيق: سيد حسن ناجي نصرآبادى، انتشارات اساطير، تهران، ١٣٨٦هـ.ش, ج٢, ص٥٠٢.

بێگومان ئەو دڵ روناکبوونەوەیەش رێگەخۆشکەرە بۆ خۆناسینی سۆفییانە و ئەو پەیوەندییە سەرەکییەی کەسی سۆفی بە خودا دەبەستێتەوە، ئەو دەخوازێ بەو پەیوەندییەوە لە خۆی و پێگەی لە جیهانی مرۆڤانە بگات. رەنگە رێگری هەرە سەرەکی بەردەم ئەو پرۆسەیەش نامادەیی هەژموونگەرانەی خودایەتیی بێت لە ژیانی مرۆڤانەیدا، تا ئاستێك کە رێگر بووە لە بەردەم تێڕامانێکی سەربەخۆ و جیاواز لەوەی خەڵکیی هەیانە و پێیەوە سەرقاڵن، بۆیە ئەگەر تەواوی ئەو خەڵکە دەخوازن ئەگەر بۆ کاتژمێرێکیش بێت لەگەڵ خودا بن، ئەو دەیەوێ بۆ کاتژمێرێك خودا خۆی بەخۆی بداتەوە (پەیوەندییە هەژموونگەراکە نەمێنێ)، دیارە ئەمەش نەك بۆ گومان بردن و دەربازبوون لە بیرکردنەوەی ئایینیانەیە، بەڵکو تا وەك دەڵێ تێبگات: ((ئەو چییە و لە کوێوە هاتووە))[٣٦٤].

رەنگە ئەو گەڕانە ئەبولعەباسی نەهاوەندی بردبێتە نێو ئەلقەی سۆفیگەری، بەڵکو سۆفیبوون راڤەیەکی بۆ مرۆڤبوونی ئەو هەبێ و ئەو رێگا دروستە بێ، کە هەم ناسینە مرۆڤانەکە فەراهەم دەکات هەمیش پەیوەندییە خوداییەکە رۆشنتر دەکاتەوە. شێخی نەهاوەند بەر لەوەی سنوورەکانی سۆفیگەری دیاری بکات رایدەگەیەنێ ئەو دیاری کردنە جەربەزەیەکە پاڵپشتی خودایی پێویستە، ئەگەرنا دەشێ لەلایەن خودا خۆیەوە دژایەتی بکرێ. بێگومان ئەمەش پاڵپشتییەکی رەهایە لە پابەندی تەواوی مرۆڤایەتی بە خودایەتیەوە سەرچاوە دەگرێ، ئەو پابەندییەی دەبێ لە سەرووی هەموو پەیوەستبوونێکی مرۆڤانەوە بێ تا ئەو ئاستەی رایدەگەیەنێ: ((ئەوەی خوداوەند خولیای بێ، دەبێ ئەگەر دەستە چەپی لە خودای سەرقاڵ کرد، بە دەستە راستی بیبڕێتەوە))[٣٦٥].

بەدەر لەو تێگەیشتنە، لەلای ئەو سۆفیگەری پتر لە چوارچێوەی بوارە کردەکییەکەیەوە دەردەکەوێ، بەجۆرێك کە پێی وایە ئەو کاتە سۆفیبوون دەست پێ دەکات کە ژیانی هەژارانە و دەروێشییانەی دەگاتە ئەوپەڕی . بەو مانایە پێویستە سۆفی نەك هەر لە سیستەمی ژیانی ئاسایی دەربچێ، بەڵکو لەو شێوە ژیانە هەژارانەی کە پاشخانە بۆ سۆفیبوونیش تەواو پێ بگات و بتوانێ کەسێتی نوێی خۆی لەسەر دابمەزرێنێ. بێگومان ئەو دامەزراندنەش بریتی نابێ لە ئاشکراکردنی ئەزموونە رۆحانییەکەی کەسێتییەکە و لە ئاکامیشدا ئەو جۆرەی بوون

---

(٣٦٤) فصيح خوافي: مجمل فصيحي, ج٢, ص٥٠٢.

(٣٦٥) الأنصاري: طبقات الصوفية, ص٣٧٠. جامي: نفحات, ص١٤٩.

بانگەشەکاری و خۆدەرخستن بێ، ئەوەندەی دەبێ ڤەشارتنی حاڵی بێ لە ئەوانیتر لە ڕێگەی خۆبەدوورگرتن لە ناوەندە کۆمەڵایەتییەکەوە، بۆ قەرەبووی ئەو دوورییەش دەشێ لە نێو ئەلقەی سۆفییاندا بە خزمەتکردن و گرنگیدان بە ژیانیان خەریك بێ[٣٦٦].

ئەو بیروبۆچوونانە بەو مانایە نایەت ئەبولعەباسی نەهاوەندی بە تەواوی لە دەوروبەرەکەی دابڕابێ و تەنیا لە نێو سۆفییاندا ئامادەیی هەبووبێ، بەڵکو لە شارەکەی خۆیدا – بەکاریگەریی سەرمایە ڕەمزییەکەی - بەو دوورکەوتنەوەی ڕازی نەبوون و ڕێزی زۆریان دەگرت و خزمەتیان دەکرد[٣٦٧]، بەتایبەت کە دەبێتە ڕەمزێك بۆ باوەڕداریی و ڕێنیشاندانی ئەوانەی لە "ڕاستەڕێی ئایین" نەگەیشتوون، بێگومان بەو مانایەی لە فەزاکەی ئەودا هەبووە. ئیدی لەمبارەوە چەند بەسەرهاتی لەسەر دەگێڕدرێتەوە، تێیدا دەبینین بۆتە ئەو کەسایەتییەی ئەم ڕێگەیە بۆ خەڵکی تر، تەنانەت غەیرە دینانیش، ڕۆشن دەکاتەوە[٣٦٨]. بەمەش سۆفیگەری دەبێتە دیاردەیەکی ویستراوی ناوەندە جوگرافییەکە کە نەهاوەندە و ڕووخسارە کردەکیەکەی – وەك لە شوێنی تریشدا دێینەوە سەری - گەشەسەندنی بەرچاو بەخۆوە دەبینێ، ئیدی لە دیاردەیەکی تاکەکەسییانەی پەیوەست بە سۆفییەوە دەگۆڕێ بۆ دیاردەیەکی دەستەجەمعی و کەسانێك لە خۆی خڕ دەکاتەوە کە هەمان تێگەیشتنی ئایینی و ئەزموونی ڕۆحانی ئەویان هەیە، بەمەش شارەکەی کردۆتە سەرچاوەیەکی ڕاگەیشتن بەسەر زانستە سۆفییەکان و موریدی لێ کۆدەبێتەوە و دەبێتە مامۆستای چەندانێك لەو کەسانەی دواتر وەك سۆفی دەناسرێن[٣٦٩].

تا ئەوکاتەی ئەبولعەباسی نەهاوەندی لە ژیان مابوو لە گەورە سۆفییانی سەردەمەکەی دانەبڕاوە و هاموشۆی هەندێك لەوانی دەکرد و گفتوگۆی لەگەڵ دەکردن، ئەمە سەرباری گرنگیدانی بە کولتووری ئەو سۆفییانە و گێڕانەوەی سەربوردەیان[٣٧٠]. بێگومان ئەو دەرکەوتن

---

(٣٦٦) فريد الدين عطار: تذكرة, ج٢, ص٢٦٨.

(٣٦٧) الأنصاري: طبقات الصوفية, ص٥٠٣.

(٣٦٨) بۆ دەقی بەسەرهاتەکان بگەڕێوە بۆ: فريد الدين عطار: تذكرة, ج٢, ص ص٢٦٨-٢٧٠. فصيح خوافي: مجمل فصيحي, ج٢, ص٥٠٢.

(٣٦٩) بۆ نموونە بڕوانە: الأنصاري: طبقات الصوفية, ص٣٧٠. فريد الدين عطار: تذكرة, ج٢, ص٢٦٨-٢٦٩.

(٣٧٠) ابو نعيم: حلية, ج١٠, ص٣٧٠. زركوب شيرازي: شيرازنامه, ص١٠٣.

و چالاکییانەی ئەوە وایکردووە سۆفیگەری لەوێ بەردەوامیی هەبێ و لەدوای خۆی، هەم یاوەرانی هەمیش بنەماڵەکەی بە تایبەت هەر یەك لە نەوەکانی ئەبولحەسەن عەلی کوڕی طاهر و ئەبو سەعیدی کوڕی طاهر کە لە سەدەی پێنجەمی کۆچی و سەرەتای سەدەی شەشەم دەردەکەون، برەو بە کایەکە بدەن و شار ببێتە بنکەیەکی سەرەکی سۆفیگەری ئەو قۆناغە و خەڵکانێك لەوێ و لەسەر دەستی ئەمان ببنە سۆفی و شارەزایی پەیدا بکەن[٣٧١].

## ٤- سۆفیگەری لە شاری حولوان:

بەر لەوەی قسە لەسەر سۆفیگەریی ئیسلامی لەو شارەدا بکەین، بە پێویستی دەزانین ئاماژە بۆ ئەوە بکەین کەوا پێگەی جوگرافی حولوان، تایبەتمەندی بەو شارە داوە، ئەو سەرەتای هەرێمی چیا و کۆتایی هەرێمی عێراقی پێکدەهێنا، هەندێکجار لەسەر ئەوەی یەکەم بووە و چەند جاریش خراوەتە سەر ئەمەی دووەمەوە[٣٧٢]، بۆیە دەشێ بڵێین هەم خەسڵەتی دەڤەرە چیاییەکانی هەبووە و هەمیش نزیکبوونی لە بنکە شارستانییەکانی هەرێمی عێراق بەتایبەت بەغداد، وایکردووە دەستەبژێرەکەی لە رەوت و گۆڕانە ئایینییەکان ئاگادار بن. رەنگە هەر ئەو پێگە جوگرافییەش بێ، لە رووی پێکهاتەی دانیشتوانەوە، فرە رەگەزی پێوە دیار بێ، بە جۆرێك کە لە سەدەی سێیەمی کۆچی هەر سێ میللەتی کورد و عەرەب و فارسی تێدا ژیاوە[٣٧٣]، ئەگەرچی پتر وەك نشینگە و هەواری کورد و خێڵە کوردییەکان ناوی دێت، کە تەنانەت توانیویانە دەسەڵاتی کارگێڕیی شارەکەش بگرنە دەست[٣٧٤].

---

(٣٧١) بۆ زانیاری زیاتر بگەڕێوە بۆ: السلفي: معجم, ص٢١, ٤١, ١٣٠, ٢٩٦, ٣٩١.

(٣٧٢) الجيهاني: أشكال, ص١٤. السمعاني: الأنساب, ج٢, ص٢٤٧. لە ئێستادا ئەو شارە پاشماوەیەکی ئەوتۆی نەماوە, بەتایبەت کە هەر لە سەدەی حەوتەمی کۆچییەوە دوچاری داڕوخان دەبێتەوە و لەسەدەی هەشتەمیش وەك وێرانە باسی کراوە, پاشماوەکەی بە "طاق كُرَة" دەناسرێ. بۆ زانیاری زیاتر بگەڕێوە بۆ: حسام الدين علي غالب نەقشبەندی: شارەزوور, ل ل٦٣-٦٤.

(٣٧٣) اليعقوبي: البلدان, ص٣٥.

(٣٧٤) ابن رسته: الأعلاق النفيسة, وضع حواشيه: خليل المنصور, دار الكتب العلمية, بيروت, ١٩٩٨, ص١٤٥.الصولي: قسم من أخبار المقتدر بالله العباسي, دراسة و تحقيق: خلف رشيد نعمان, دار الشئون

لەرووی ئایینییەوە رەوشی ئەو شارە زۆر روون نییە، ئەوەندە دەزانین تا درەنگانێك — لایەنی کەم تا سەردەمی گەڕیدە ئیبن روستە(م ۲۹۰ك/۹۰۳ز) — کوردە زەردەشتییەکان لە دێهاتەکانی دەوروبەری دەژیان و ئاتەشکەدەیان هەر مابۆوە[٣٧٥]. هەروەها دەبینین ناو شارەکە بۆتە بنکەی بەشێك لە فەرموودەگێڕەوانی دەستەی یەکەمی جیهانی ئیسلامی[٣٧٦]. بەمەش زەمینەی برەوسەندنی رەوتی ئیسلامیی سوننەگەرا خۆشبووە، هەروەها رەنگە سنوورێکیشی بۆ رێباز و رەوتە ئایینییەکانی تر دانابێ، بە تایبەت خەواریجەکان، ئەوەتا دەبینین لە سەروبەری سەرهەڵدانی سۆفیگەری، هێندێك لە خەڵکەکەی دژ بە چالاکی فراوانخوازییانەی ئەو گرۆیە وەستاونەتەوە[٣٧٧]. رەنگە ئەمەش بەڵگە بێ لەسەر سنووردارییی قەبوڵکردنی بیروباوەڕی خەواریج و هەژموونی رەوتە سوننەگەراکە.

وادیارە هاوکات ئەو هەژموونە وایکردووە دەرکەوتنی هزری سۆفیگەری لە پانتایی شارەکەدا کەمتر بێ لە هی زۆربەی شارەکانی تری ناوچەکە، لەو شارەدا سۆفییەکی ئەوتۆمان بەرچاو ناکەوێ توانیبێتی کەسێتی سۆفییانەی خۆی بەسەر دەوروبەرەکەی بسەپێنێ و ژیان و بیروباوەڕ و وتەکانی بابی ئەوەبن لە دووتوێی سەرچاوە بایۆگرافییەکانی تایبەت بە ژیانی سۆفییان بنوسرێتەوە. ئەمە لە کاتێکدا لە ئاستی کۆمەڵایەتیدا دیاردە ئایینییەکە قەبوڵکراوە و پێگەی خۆی هەبووە، تەنانەت ئەوانەیشی کە بە لەڕێلادەر دادەنران و خەریکی "رێگری" بوون، مەیلیان بەلای سۆفییاندا هەبووە و رێزیان گرتوون و هاوکاریان کردوون[٣٧٨].

---

الثقافية, بغداد, ۱۹۹۹, ص١٦٥. ابن الفقيه: البلدان, ص٣٨٧. الهجويري: كشف,ج٢, ص٥٦٢. ابن الأثير: اللباب, ج١, ص٣٠٧.

(٣٧٥) الأعلاق النفيسة, ص١٤٥.

(٣٧٦) بۆ نموونە بڕوانە: البستي: مشاهير علماء الأمصار, وضع حواشيه: مجدي منصور, دار الكتب العلمية, بيروت, ١٩٩٥, ص٢٠٩. القزويني: الإرشاد, ج١, ص٦٢٣-٦٢٤.

(٣٧٧) کاتێك سەرکردەی ناوداری خەواریجی مساوری کوڕی عەبدولحەمیدی شاری لە ساڵی (٢٥٣ك/٨٦٧ز) هێرشی کردە سەر حولوان، خەڵکەکەی بە توندی رووبەڕووی بوونەوە و ژمارەیەکی زۆریان لێ کوژرا, بڕوانە: الطبري: تاريخ, مج٥, ص٢٠٢٣.

(٣٧٨) الهجويري: كشف, ج٢, ص٥٦٢.

لەگەڵ ئەوەشدا هەندێك لە كەسایەتییەكانی حولوان لە پانتایی سۆفیگەریدا ئامادەن، بەڵام زیاتر وەك گێڕەرەوەی وتە و كردەوەی سۆفییە گەورەكان، نەك وەك بەرهەمهێنەرێكی هزرەكە، ئەوەتا ئەبو ئیسحاق ئیبراهیم كوڕی ئەحمەدی حولوانی یەكێكە لەوانەی گوتەی بایەزیدی بسطامی لێ دەگێڕدرێتەوە(٣٧٩)، یەكێكی تریش بینەری كەرامەتی جونەیدە و سەرسامە بە توانا سەروو ئاساییەكانی ئەو سۆفییە(٣٨٠). لەوە بترازێ زانیاریەكی ئەوتۆ لەسەر ئەو كەسایەتیانەی حولوان لەبەردەستدا نییە، ژیان و بۆچوونەكانیان نادیارە.

ڕەنگە هۆكارێكی بنەڕەتی وونبون و نادیاری سۆفییانی حولوان پەیوەندیی بە تێگەیشتنی ئەوان لەو هزرە و پیادەكردنییەوە هەبووبێ؛ ئەمە بە ئاشكرا لە پەیوەندیی سۆفییەكی ئەوێ بەناوی محەمەدی كوڕی قاسمی حولوانی بە گەورە سۆفی كرماشان ئیبراهیمی كوڕی شەیبان زادیارە، ئەو حولوانییە زێتر بە نێو هێندێك بواری هزرەكەدا ڕۆچووە، كە بە دڵی سۆفییەكەی كرماشان نەبووە و — وەك دواتر دێینەوە سەری — مایەی ڕەخنە لێ گرتن بووە(٣٨١).

بەهەمان شێوە چەند سۆفییەكی تری شارەكە هەن تەنها ناویان لەگەڵ ڕەوتە ناباوەكانی سۆفیگەری دێت، ئەو ڕەوتانەی لە دەقە مێژووییەكاندا كەمتر قسەیان لەسەر دەكرێ و تێزەكانیان بە ترسەوە و هەندێكجاریش بە پەنهانییەوە خراونەتەروو، ئەمە بە ئاشكرا لە پەیوەندیان بە حوسێنی كوڕی مەنصوری حەلاج(م٣٠٩ك/٩٢١ز) و ڕەوتی حەلاجییەوە دەردەكەوێ، كە ناوی چەندان سۆفی ئەوێ دێت وەك: ئەبو ئیسحاق ئیبراهیم كوڕی عەبولكەریمی الحولوانی، یونسی كوڕی خضری حولوانی، ئەبولحەسەنی حولوانی(٣٨٢)، كە جگە لە پەیوەندیان بە حەلاج و هزری ئەو و لە نێو ئەو بەسەرهاتانەی باس لەو سۆفییە دەكەن، لە شوێنی تردا ناویان نییە. بێگومان ئەمەش وا دەكات جگە لە ناو و چەند هەڵوێستێكی ئەو سۆفییانەی حولوان هیچی تریان لەسەر نەزانین، بەو كەمە زانیارییەش ناتوانین بە وردی دەستنیشانی پێگەی هزرەكە لە پانتایی ئەو شارەدا بكەین.

---

(٣٧٩) السهلجي: النور من كلمات ابی طيفور، حققه: عبدالرحمن بدوي، منشور ضمن: شطحات الصوفية، ط٣، وكالة المطبوعات، الكويت، ١٩٧٨, ص١٧٣.

(٣٨٠) ابو الحسن ديلمي: سيرت, ص١١٥-١١٦.

(٣٨١) السلمي: الملامتية, ص١١٦.

(٣٨٢) ابن الساعي: أخبار الحلاج, ص ص٢٢-٢٦, ٣٥-٣٧.

دواجار نابێ ئەوە لە بیر بکەین کە جگە لەو شارانەی باسمان کردن، لە شوێنی تری هەرێمەکەش سۆفیگەری دەرکەوتووە، بۆ نموونە لە شارێکی وەك هەمەدان[٣٨٣]، بەڵام بە وردبوونەوە لە دەقە مێژووییەکان، لەو قۆناغەی سەرهەڵدانی سۆفیگەری، لایەنی کەم تا ناوەڕاستی سەدەی چوارەمی کۆچی، پێگەی جوگرافی شارەکە وای کردبوو پتر سۆفییەکانی بە جیهانی دەرەوە پەیوەست بن نەك سۆفییانی شار و دەڤەرەکانی پانتایی کوردی، بەمەش کەمتر کاریگەریان بەسەر فەزای کۆمەڵایەتی و ئایینی ئەوێ هەبووە، بە پێچەوانەی قۆناغی دواتر کە – وەك لەبەشی چوارەم دەبینین – ئەو کاریگەرییە روونتر دەردەکەوێ و شارەکە و دەوروبەری دەبێتە بەشێك لە تێگەیشتنی باوەڕییانەی پانتاییەکە و رۆڵی لە برەوسەندن و شێوەگیربوونی هزری عیرفانیی لە ناوەندی کوردی دەبێ.

لەلایەکی ترەوە جێگەی باسە، هەر لەو قۆناغی سەرهەڵدانەدا، سۆفی کوردمان هەیە لە دەرەوەی زەمینە کوردییەکە دەرکەوتوونە و بە هەمان شێوە لەوەناچێ کاریگەری راستەوخۆیان بەسەر ئەو زەمینەوە هەبووبێ، ئەگەرچی بە سۆفی دیاری سەردەمەکەیان دانراون لەوانە ئەبولفەوارسی کوردی[٣٨٤]، رەنگە بەناوبانگترینشیان ئەبو عەبدوڵڵای بابۆیی (م٣٧٤ك/٩٨٤ز) بێ، کە یەکێکە لەو سۆفییانەی وتەی "أمسیتُ کردیاً و اصبحت عربیاً"یان دەدرێتە پاڵ، ئەو لە شاری شیرازی وڵاتی فارس گیرساوەتەوە و هەر لەوێش مردووە[٣٨٥].

---

(٣٨٣) بۆ نموونە بڕوانە: الأنصاري: طبقات الصوفية, ص ص٣٣٦-٣٣٩, ٥٢٤-٥٢٥.

(٣٨٤) عين القضاة الهمداني: شكوى الغريب , ص٣٠.

(٣٨٥) شيرازي: تذكرة, ص٢٠٣. جامي: نفحات, ص٣٢٥.

## چوارەم: مەڵبەندەکانی سۆفیگەری لە هەرێمی جەزیرە (نصێبین و سنجار)

لە بەشی پێشوودا ئاماژەمان بەوەدا کە ئەو دەڤەر و ناوچانەی لە رووی پەرەسەندنی هزری ئایینی ئیسلامیدا کەوتبوونە ژێر کاریگەریی بیروباوەڕی خەواریجییەوە، کەمتر دیاردەی سۆفیگەری تیایاندا گەشەی سەندوە، بە تایبەتیش هەرێمێکی پان و پۆڕی وەك جەزیرە کە بەشێکی بەرفرەی کوردستانی لەخۆوە دەگرت. لە راستیدا نەیارێتی خەواریجەکان بە پەیڕەوکارانی گروپ و رەوتە ئایینییەکانی دەرەوەی خۆیان، وایکردووە لە ناوچەکانی ژێر دەستیاندا، بە تایبەت لەو هەرێمە، بەربەستێك هەبێ لەبەردەم هەمەڕەنگی لە بیروباوەڕی ئایینی و گەشەسەندنی ئەلقەی ئەو گفتوگۆ و تێزە باوەڕییانەی لە ناوەند و ناوچەکانی تری جیهانی ئیسلامیدا هەبووە. بۆیە نەك هەر سۆفیگەری بەڵکو کایەی تری ئایینیش، لایەنی کەم لە سەدەی سێیەم و سەرەتای سەدەی چوارەمی کۆچییدا، کەمتر سەرهەڵدەدەن و برەودەسەنن(٣٨٦).

لەوە دەچێ ئەو هەژموونەی باوەڕی خەواریجی تا ئاستێك بووبێ، کە تەنانەت رێگر بووە لە کاریگەر بوونی خەڵکی ئەوێ بە سیستەمی تەرکەدونیایی مەسیحیشەوە، کە سیستەمی "رەبەنێتی —الرهبنة"یە، خۆ ئەگەر بچینە ژێر باری ئەو تێزەی پێی وایە هۆکارێکی بنەڕەتی دەرکەوتنی سۆفیگەریی ئیسلامی کارتێکردن و ئامادەیی ئەو سیستەمە مەسیحییەیە لە پانتایی ئیسلامیدا - وەك لە دەروازەی توێژینەوەکەدا ئاماژەمان بۆ کرد — ئەوا دەبووا چاوەڕێی ئەوە بکەین ناوچە کوردییەکانی هەرێمی جەزیرە یەکەمین و سەرەکیترین بنکەی سەرهەڵدانی سۆفیگەری بوونایە لە نێو جڤاکەکەدا. بێگومان ئەمەش لەبەر ئەو پانتاییە فراوانەی ئایینی مەسیحیە بە گشتی و سیستەمی رەبەنێتی بە تایبەتی لەوێدا هەیبووە؛ نەك هەر لەو قۆناغەدا بەڵکو زۆر زووتر، لە پێش دەرکەوتنی ئیسلام بە چەند سەدەیەکەوە، ئەو ناوچانە بە دەیان دێری لێ دروست کراوە، تیایاندا رەبەنەکان، لە هەردوو رەگەز، بە گوفتار و بە کردار ژیانی نەسکێتی و گۆشەگیرییان هەڵبژاردووە و سرووتە ئایینییەکانیان لە پەیوەندیی نێوان خۆیان و خودا چڕ کردۆتەوە و خوداناسیان کردۆتە کاری هەرە بنەڕەتیان، هەندێکیشیان لە زەمینە ئایینی — کۆمەڵایەتییەکەدا لە مرۆڤێکی سروشتی کراونەتە مرۆڤی سەروو

(٣٨٦) بۆ نموونە بڕوانە: المقدسي: احسن التقاسيم، ص١٢٩.

سروشتییەوە، کە کردەوەی ئەوتۆیان لێ دەگێڕدرێتەوە[٣٨٧] پتر لە کاری کەرامەتنوێنیانەی سۆفییان دەچوو. لەدوای دەرکەوتنی ئیسلام و هەژموونی باوەڕییانەی بەسەر هەرێمەکەشدا، زۆر لەو دێرانە هەر مابوونەوە و ژیان و سەربوردەی ڕەبەنەکانیش جێگەی سەرنج و هەڵوێست وەرگرتنی خەڵکە موسڵمانەکە بووە، تەنانەت هەندێکیشیان دەکەوتنە ژێر کاریگەریی ئەو پیرۆزییەی لە نێو دێرەکاندا بەرهەم دەهات و لەلایەن مێژوونوس و جوگرافیناسانی موسڵمان هەواڵ و شوێن و سروشتی دێرەکان و ڕەبەنەکانی تۆمار دەکران[٣٨٨].

لەگەڵ ئەوەشدا — وەك گوتمان — مێژووی هزری سۆفیگەری لەو هەرێمەدا دەریدەخات ئەو سیستەمی ڕەبەنییە کاریگەریەکی ئەوتۆی بەسەر دەرکەوتنی هزرەکەوە نەبووە و ئەو بە ئاکام گەیشتنە ڕاست دەرناچێ و هەرێمەکە بە بەراورد لەگەڵ ناوچەکانی تری وەك هەرێمی چیا، کە کەمتر بەریەککەوتنی لەگەڵ کولتووری مەسیحیدا هەبووە، کەمترین دەرکەوتەی سۆفیگەری تێدا دەبینین.

بەهەرحاڵ سنوورداری هزری سۆفیگەری لەوێدا بەمانای دەرنەکەوتنی نییە، بەڵکو لێرە و لەوێ، لە نێو سەرچاوەکاندا، ناوی کۆمەڵێك سۆفیمان بەرچاو دەکەوێ خەڵکی ئەوێن. خۆ هەندێ ناوچەی ئەو هەرێمە وەك بنکەیەکی زاهیدان و سۆفییانی لێ هاتووە و ئەگەری ئەوە هەبووە کاری کردبێتە سەر ناوچە کوردییەکانی هەرێمەکە، بە تایبەت شارێکی وەك موسڵ، کە لەبەر تایبەتمەندییە ناوەندێتییەکەی لە ڕووی سیاسی و ئابوری و کارگێڕی لە ناوچەکە و پەیوەستبوونی بە سەنتەری دەسەڵات لە بەغدا و تێکەڵبوونی بە جیهانبینی ئەو سەنتەرەوە، بۆتە هۆی ئەوەی سۆفیگەری وەك دیاردەیەکی ئایینی باوی نێو ئەو جیهانبینییە، لەوێشدا

---

(٣٨٧) لەبارەی سەرهەڵدانی سیستەمی ڕەبەنێتی مەسیحی و گرنگترین دێرەکانی هەرێمی جەزیرە بەر لە ئیسلام, بگەڕێوە بۆ: ایشو عدناح البصري: الديورة في مملكتي الفرس و العرب المسمى "كتاب العفة", نقله الى العربية: بولس شيخو, نقحه: البير ابونا, بغداد, ٢٠٠٦, ص ص ١١٩-١٨٢. توما المرجي: كتاب الرؤساء, عرّبه: البير ابونا, المطبعة العصرية, الموصل, , ١٩٦٦, ص ٢١ بەدواوە.

(٣٨٨) هەر بۆ نموونە بگەڕێوە بۆ: الشابشتي: الديارات, تحقيق: كوركيس عواد, ط ٣, دار الرائد العربي, بيروت, ١٩٨٦, ص ص١٧٦-٢٠٣. ياقوت الحموي: الخزل و الدأل بين الدور و الدارات و الديرة, تحقيق: يحيى زكريا عبارة و محمد أديب جمران, وزارة الثقافة, دمشق, ١٩٩٨, ق٢, ص ص٥٢-٥٨, ٧٧-٧٨, ١٢٤-١٢٦, ١٧-١٧٢, ١٨٨-١٩٠, ٢٠٠-٢٠١.

برەوبسەنێ[٣٨٩]. بەڵام دیسان زانیاری ئەوتۆمان نییە ئاماژە بۆ کاریگەریی شارەکە بەسەر ناوچە کوردییەکانی دەوروبەریەوە هەبووبێ، ئەگەرچی ئەو کاریگەریە بەدوور نازانین، بەتایبەت لەسەر شارۆچکەیەکی تاڕادەیەك نزیکی وەك سنجار، کە نزیکەی سێ ڕۆژەرێ لێیەوە دوورە[٣٩٠](نزیکەی ١١٨کم). وەك پێشتریش باسمان لێوە کرد، ناوی چەند کەسێکمان هەیە لە زوویەکەوە تێکەڵ بە جیهانی سۆفییان بوون، لەوانەش هەر ئەو ئەبو عەبدوڵڵای سنجارییەی یاوەری ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەمی دەکرد. درەنگتر ناوی ئەبوبەکری سنجاری دێت، کە تەنیا ئەوەندە دەزانین لە گێڕەرەوەی وتەکانی سۆفی گەورەی دینەوەر ئەبوبەکر محەمەدی کوڕی داودی دینەوەری بووە[٣٩١].

لێرەوە دەتوانین بڵێین لەو شارەدا کەسانێکمان هەن لە سۆفییانی دەستەی یەکەمی جیهانی ئیسلامی نزیك بوون و وتە و کردارەکانیان دەگێڕنەوە، بەڵام جگە لە ناویان زانیاری تریان لەسەر نازانین، ئامادەیی ئەو سنجارییانە لە کۆڕ و لەگەڵ ئەو سۆفییانەدا دەریدەخات ئەوان کاریگەربوونە بەو هزرە و پەیڕەویان لێ کردووە، ئەگەرچی لەوە ناچێ گەیشتبنە ئاستی بەرهەمهێنانی هزرەکە و لە سنووری یاوەر و موریدەوە ماونەتەوە، مەگەر ئەو سۆفییەیان نەبێ کە بەناوی ئەبولحەسەنی سنجاری ناسراوە؛ بەپێی خەرگوشی(م٤٠٧ك/١٠١٦ز) بێ، ئەو سۆفییە ناسینی خۆی بۆ سۆفیگەری هەبووە و لای ئەو تەسەوف هەم بەجێگەیاندنی ئەرکە ئایینییە جێگیرەکان و هەمیش زوهدگەرایی و گۆشەگیری و گرتنەبەری ژیانی هەژارانەیە[٣٩٢]. لەوە زیاتر - لە دووتوێی سەرچاوەکاندا — هیچ رووخسارێکی تری هزری ئەو سنجارییە نابینرێ و وردەکارییەکانی ئەو هزرە بە پەنهانی دەمێنێتەوە، وەك ئەوەی تەواوی کەسێتی سۆفییانە و هزرەکەی بریتی بووبێ لەو وتەیە. بەهەرحاڵ، ئەگەرچی ئەو کەسایەتییانە

---

(٣٨٩) ابن الجوزي: صفة الصفوة, ج٤, ص ص١٠٥-١١٢.

(٣٩٠) ابن حوقل: صورة, ص١٩٠. هەروەها بڕوانە: موسى مصطفى الهسنياني: سنجار – دراسة في تاريخها السياسي و الحضاري, دار سپيريز, دهوك, ٢٠٠٥, ص٢٥-٢٦.

(٣٩١) الخطيب البغدادي: أخبار الصوفية, ص٦٣.

(٣٩٢) ((الصوفيُّ مَنْ صام وصلّى فيما أقبل و تولّى, وتزهد وتخلى, وارتقع وتعلى, فإن خطر بباله شئ قال: كلا.))؛ تهذيب الأسرار, ص١٨.

نەیانتوانیوە لە نێو ئەلقەی سۆفییاندا جۆرێك لە سەنتەرگیری بەدەست بخەن و کەسێتی خۆیان بەسەر ئەو ئەلقانەدا بسەپێنن.

لە شاری نصێبین، پانتایی سەرهەڵدان و تەشەنەکردنی سۆفیگەری — لە رووی چەندێتییەوە - کەمێك لەوەی سنجار فراوانتر بووە، ئەگەرچی لە رووی بەرهەمی هزرییەوە بەدەست هەمان هەژارییەوە دەناڵێنێ. دیارە کە لە سەرووی هەموویانەوە سۆفی گەورەی شارەکە ئەبو یەعقوبی مەیدانی دێت؛ کە لە سەرەتای چوونی بۆ نێو بازنەی سۆفییان کاریگەر بووە بە شبلی یەوە[٣٩٣]، لەوەدەچێ دواتر توانیبێتی لە نێو شارەکەی خۆیدا کەسانێك بخاتە سەر خولیای سۆفیگەرییەوە، ئیدی دوو لە سۆفییانی تری ئەوێ — کە تەنیا ناویان دیارە و بیریان ون — بەسەرهاتەکانی ئەو دەگێڕنەوە، ئەوانیش: ئەسەدی نصێبینی و ئەبو عثمانی نصێبینین، ئەوەی یەکەمیان ئەوەندەی لەبارەوە دەزانین لە شبلی نزیك بووە و بەسەرهاتی ئەبو یەعقوبی مەیدانی لێ دەگێڕێتەوە[٣٩٤]. هەرچی ئەوەی دووەمیشیانە، ئەوە جگە لە گێڕانەوەی بەسەرهاتی مەیدانی، وتە و بەسەرهاتی سۆفییانی تری دەرەوەی نصێبین دەگێڕێتەوە[٣٩٥].

جێگەی ئاماژە پێدانە هەندێك لە سۆفییانی نصێبین لە قۆناغی سەرهەڵداندا پتر لە دەرەوەی شارەکەدا دەبینرێن و کەمتر کاریگەریان بەسەر ئەوێوە هەبووە، ئەوەتا ئەبو عثمانی نصێبینی لەوێ نەماوەتەوە و چۆتە نیشاپور و لەوێ مردووە[٣٩٦]، هەروەها ئەبولحەسەنی نصێبینییش زیاتر لە حیجاز و دەوروبەری دەردەکەوێ[٣٩٧]. تەنانەت سۆفییەکی وەك ئەبو عەبدوڵڵای نصێبینی سەفەرکردنی کردۆتە ناونیشانێکی رێبازی سۆفییانەی خۆی و سی ساڵی تەمەنی بەسەفەرکردن بەسەر بردووە؛ سەفەرێك کە ویستویەتی بە هۆیەوە — وەك جەختکردنەوەیەك لەسەر تێگەیشتنەکەی بۆ سۆفیگەری — زۆرترین کات لە کەس و ناسیاوانی بەدوور بێت[٣٩٨].

---

(٣٩٣) الأنصاري: طبقات الصوفية, ص٣٥٤. جامي: نفحات, ص١٣٥.

(٣٩٤) الأنصاري: طبقات الصوفية, ص٢٩٤.

(٣٩٥) الخركوشي: تهذيب, ص٣٦١.

(٣٩٦) الأنصاري: طبقات الصوفية, ص٢٩٢.

(٣٩٧) ابن خميس: مناقب, ج٢, ص٢٥٧.

(٣٩٨) السراج: اللمع, ص٢٥١. القشيري: الرسالة, ص٤٤١.

بێگومان دووركەوتنەوە لە نصێبین، وادەكات لە قۆناغی سەرهەڵدان و گەلاڵەبووندا، نەبێتە بنكەیەكی سۆفییان و لەوێدا دیاردە ئایینییەكە بەردەوامییەكی مێژوویی تۆكمەی نەبێ، ئەمە لە كاتێكدا ئەم سۆفییانە لە دەرەوەی شارەكەدا كەسی ئاسایی نەبوون، بەڵكو لە هەندێ حاڵەت هەژموونیان بەسەر ناوەندی سۆفییاندا هەبووە؛ ئەوەتا ئەبولحەسەنی نصێبینی ببووە تەوەرەیەك بۆ سۆفییانی دەوروبەری و كردەوە سۆفییانەكانی مایەی ستایش و باسكردن بووە[399].

وادیارە لە نێو خێڵە كوردییەكانی هەرێمەكەش بەرەبەرە سۆفی دەردەكەوتن، لەوانەش مەمەكی بەشنەوی، كە ناوی محەمەد بووە و بەر لە ساڵی (٤٠٠ك/١٠٠٩ز) ژیاوە، لەبارەیەوە زانیارییەكی ئەوتۆمان چنگ نەكەوتووە، تەنیا ئەوە نەبێ كە ئیبن ئەثیری مێژوونوس باسی كردووە و وەك پیاوچاكێكی سۆفی وەسفی دەكات[400]. بەڵام خۆ هەبوونی سۆفییەك لە نێو خێڵێكی ئاوادا ئاماژەیەكی روونە بۆ ئەگەری قەبوڵكردنی دیاردەكە لەو ئاستە كۆمەڵایەتییە كوردیە لەم سنورە جوگرافییەدا.

---

(٣٩٩) الأنصاري: طبقات الصوفية, ص٥١٤. ابن خميس: مناقب, ج٢, ص٢٥٧.

(٤٠٠) اللباب, ج١, ص١٥٧.

## پێنجەم: سۆفیگەری لە شاری ورمێی هەرێمی ئازربێجان

هەرێمی ئازربێجان، لە سەرەتاکانی سەردەمی کلاسیکیی ئیسلامیدا، وەك یەك لە هەرێمە کوردنشینەکان دەردەکەوێ. رەوشە ئایینییەکەیشی لەو قۆناغەی باسی دەکەین، هاوشێوە و درێژەپێدەری ئەو رەوشە بووە کە لە هەرێمی جەزیرەدا بینیمان. دوای شکستی خەواریجەکان لە کۆتایی سەدەی سێیەمی کۆچی ئازربێجان دەبێتە بنکەی نوێیان و تا چەند دەیەی یەکەمی سەدەی چوارەمی کۆچی گۆڕەپانی تەراتێنیان بوو، بەتایبەت هی کوردە خەواریجەکان[٤٠١]، پتریش لە کەنارەکانی دەریاچەی ورمێ نیشتەجێ بوون[٤٠٢]. لەگەڵ ئەوەدا لەوە ناچێ ئەمانە توانیبێتیان هەژموونی سیاسی و ئایینیان بەسەر دەڤەرەکەدا بە پتەوی بهێڵنەوە، بەتایبەت کە چیدی بیروباوەڕەکانیان لەلایەن خەڵکەوە پێشوازی لێ نەدەکرا، لە بیروباوەڕێکی بەرهەڵستکارانەی شۆڕشگێڕەوە گۆڕابوو بۆ پرۆژەیەکی سیاسی دەسەڵاتیانە، کە بەدەست بێ بەرنامەییەوە دەینالاند[٤٠٣]. ئیدی لە هەندێ شار و ناوچەدا زەمینەی کۆمەڵایەتی -- ئایینی رەخسابوو بۆ گەشەسەندنی رەوت و دیاردەی تری وەك سۆفیگەری.

شارێك کە لە هەرێمەکەدا ئەو دیاردە ئایینییەی تێدا دەبینرێ، شاری ورمێیە؛ ئەو شارە کۆنەی -- لەرووی ئایینییەوە -- وەك شوێنی سەرهەڵدانی ئایینی زەردەشتی دەناسرا[٤٠٤]، کوردەکانی دەوروبەریشی وەك خودان تایبەتمەندی ئایینی سەرەدەریان لەگەڵدا کراوە[٤٠٥]، ئەمە سەرباری هەبوونی ژمارەیەك مەسیحی لە شارەکەدا[٤٠٦]. لە

---

(٤٠١) المسعودي: مروج, ج٣, ص١١١. هەروەها بگەڕێوە بۆ: زرار صديق توفيق: الكورد, ص ٩٤-٩٥.

(٤٠٢) الأصطخري: مسالك, ص١٨١.

(٤٠٣) بۆ نموونە تێبینی رەوش و چارەنوسی بزوتنەوەکەی دەیسەمی کوڕی ئیبراهیمی کوردی(٣١٥-٣٤٥ك/ ٩٢٦-٩٥٦ز) بکە لەو هەرێمە و دەوروبەری؛ بڕوانە: مسكويه: تجارب, ج٦,ص ٦٢-٦٩, ١٦٩-١٧٠, ١٨٤-١٨٦.

(٤٠٤) ابن الفقيه: البلدان, ص٥٨٢.

(٤٠٥) البلاذري: فتوح البلدان, وضع حواشيه: عبد القادر محمد علي, دار الكتب العلمية, بيروت, ٢٠٠٠, ص١٩٦.

(٤٠٦) مسعر بن مهلهل: الرسالة, ص٧.

سەردەمانی دواتریشدا هەر وەك شارێکی ئاوەدان ماوەتەوە، کە چەند شارۆچکەی لەخۆگرتبوو[٤٠٧] و تێکەڵ بە جیهانبینی ئایینی ئیسلامیی ببوو، لەرووی دانیشتوانیشەوە تا دوای چەند سەدەیەکیش لە چەسپینی دەسەڵاتی ئیسلامی زۆربەی دانیشتوانەکەی لە کورد و مەسیحییەکان بوون[٤٠٨].

بەهەرحاڵ، سەبارەت بە سۆفیگەری لەو شارەدا، گەورەترین و ناودارترین سۆفییەك کە لەورمێدا دەرکەوتبێ ئەبوبەکر حوسێنی کوڕی عەلی کوڕی یەزدانیار(م ٣٣٣ك/٩٤٤ز)ە. ئەمەش، وەك زۆربەی سۆفییانی تر، زانیاری لە بارەی کەسێتی و چۆنییەتی پێگەیشتنی کەمە. لەگەڵ ئەوەشدا، لەبارەی رەچەڵەکیەوە جوگرافیناس ئیبن باکەوەی(م٨٠٦ك/١٤٠٠ز) لە کتێبەکەی خۆیدا "تلخيص الآثار في عجائب الأقطار" بە کوردی داناوە و ئەو وتە ناودارەی نێو کولتووری سۆفیگەری دەخاتە پاڵ کە دەڵێ: (( أمسيت كردياً و أصبحت عربياً))[٤٠٩]، ئەگەرچی وتەکە لەدوای ئەودا دراوەتە پاڵ چەندان سۆفی تری کورد[٤١٠] و – وەك پاشانیش دەبینین – ئاماژەیە بۆ گۆڕینی حاڵی مرۆڤی کورد لە بیروباوەڕی سادەوە بۆ روناکبیریی و حاڵەتی قووڵی عیرفانی، کەچی توێژەران، بەتایبەت هێندێك لە ئێرانییەکان[٤١١]، وتەکە وەك بەڵگەیەك بۆ کوردبوونی ئەو سۆفییە دەهێننەوە، هەروەها رایدەگەیەنن ئەم کوڕی یەزدانیارە هەمان ئەو "کوردی سۆفی ورمێیی – الكردي الصوفي الأرموي"یەیە کە نوسەری سۆفی ئەبو نەصری سەڕاج (م٣٧٨ك/٩٨٨ز) ناوی هێناوە و وتەی لێ دەگێڕێتەوە[٤١٢].

---

(٤٠٧) ابن حوقل: صورة, ص٢٨٩. مؤلف مجهول: حدود العالم, ص٤١٩.

(٤٠٨) V. Minorsky :Urmiya, EI,Vol.X, p.897.

(٤٠٩) محمد علي تربيت: دانشمندان آذربايجان, تهران ١٣١٤هـ.ش, ص٤٠١, وەریگرتوە لە دەستنوسی: ابن باكوي: تلخيص الأثار في عجائب الأقطار, ص٢١.

(٤١٠) دواتر لە چەندان شوێنی تر دێینەوە سەر ئەو دەقە و شرۆڤەی دەکەین.

(٤١١) محمد قزويني: حواشي تذكرة هزار مزار- ترجمة شد الازار، به تصحيح و تحشيه: محمد قزويني و نوراني وصال، انتشارات كتابخانه احمدى, شيراز، ١٣٦٤هـ.ش, ص٢٥٤-٢٥٥. عبد الحسين زرين كـوب: جستجو در تصوف ايران, چاپ هفتم, مؤسسة انتشارات امير كبير, ١٣٨٥هـ.ش, ص ص١٢٨-١٢٩.

(٤١٢) اللمع, ص٢٧١, ٣١٦.

کوڕی یەزدانیار  لە چەندان خاڵدا لە سۆفییانی تری دەوروبەر جیا دەکرێتەوە، رەنگە ئەو جیاوازییەی لەوە دابێ -- وەك نووسەرانی بواری سۆفیگەری پێناسەی دەکەن -- خودان رێبازێکی سۆفیگەری تایبەتی خۆی بووە [٤١٣] و لە دەرەوەی تێگەیشتنە باوەکان لە نێو ئەو کایەیەدا بیری کردۆتەوە، هەم خوێندنەوەیەکی رەخنەیی بۆ کولتووری سۆفیگەریی ئیسلامی کردووە و هەمیش هەوڵی داڕشتنی بنەمای رەوتێکی جیاوازی لە نێو کایەکەدا داوە، بەمەش -- دەشێ بڵێین -- لە نێو سۆفییانی پانتایی کوردی سەردەمەکەی پرۆژەیەکی جیاواز و کەسێتییەکی سەربەخۆی هەبووە، کە مایەی تێبینی و لێوردبوونەوەیە[٤١٤].

خاڵێکی تری جیاوازی ئەو سۆفییە لەوەدایە، کە لە قسەکردن لەسەر چەمك و دەستەواژەکان قووڵ بووە و هەوڵیداوە بەسەر تەواوی رەهەندەکانیاندا رابگات، بۆیە لەوە دەچێ  خاوەنی بەرهەمی سەربەخۆ بووبێ لە بواری سۆفیگەریدا، نەك هەر تەنیا کۆمەڵێك کورتە وتەی لێ بگێڕدرێتەوە. ئەگەرچی ناوی هیچ بەرهەمێکی ئەومان لەبەردەستدا نییە و سۆفی گولئابادی لە ریزی ئەوانەی لە رێگەی " کتێب و نامە" زانستی سۆفییانەیان بلاوکردۆتەوە ناوی نەهێناوە[٤١٥]، بەلام ئەوەی لەو نوسینەی وی بڕوانێ کە لەسەر چەمکی "شەرم -- الحياء"[٤١٦] هەیەتی و لەلایەن نووسەرانەوە تۆمار کراوە[٤١٧]، دەبینی پڕیەتی لە وردەکاری و لە داڕشتنیدا شارەزاییەکی زۆری، نەك هەر لە بواری سۆفیگەری بەڵکو لە بواری زانستە ئایینییە شەرعییەکانیشدا نواندووە، بە تایبەت لە خوێندنەوەی چەمکەکە لە چوارچێوەی قورئان و فەرموودە و تەنانەت بەکارهێنانی بۆچوونی گەورە کەسایەتییە ئیسلامیەکانیش. ئەوکات دەگەینە ئەو باوەڕەی کە دەشێ ئەمە بەشێك بێت لە دەقێکی نوسراوەوە، یاخود لایەنی کەم نامیلکەیەکی سەربەخۆی تایبەت بەو چەمکە بووبێ.

---

(٤١٣) السلمي: طبقات, ص٤٠٦. الأنصاري: طبقات الصوفية, ص٤٣١. القشيري: الرسالة, ص١١٢.

(٤١٤) بۆ تایبەتمەندیەکانی هزری ئەو سۆفییە بڕوانە بەشی سێیەمی ئەم توێژینەوەیە.

(٤١٥) التعرف, ص١٨.

(٤١٦) لە شوێنی تردا کەمێك تێڕوانینی کوڕی یەزدانیار لەسەر ئەو چەمکە روونده‌کەینەوە.

(٤١٧) الخركوشي: تهذيب, ص ص٤٠٣-٤٠٧ . ابن خميس: مناقب, ج٢, ص ص١٢٢-١٣٢.

هەوڵەكانی كوڕی یەزدانیار پتر تاكە كەسییانە دێتە بەرچاو و نەیتوانیوە — بۆ نموونە وەك مەمشاد ئەوەندە مورید و شاگردە پێبگەیەنێ كە دیاردە ئاییننییەكە هەژموون بەسەر فەزای شاردا بكات، بۆیە كەمتر ناوی سۆفی تری شارەكەمان بەرچاو دەكەوێ كە توانیبێتیان بەرهەمهێنەری هزری سۆفیگەری بن، مەگەر چەند دانەیەك نەبێ كە زۆر بەوەوە پەیوەست بوون، لەوانەش ئەبولحەسەن عەلی كوڕی سەعیدی نورمەوی، كە بە نزیكترین مورید و یاوەری كوڕی یەزدانیار دێتە هەژمارتن؛ داكۆكی لە بیروباوەڕەكانی كردووە و گێڕەرەوەیەكی سەرەكی تێزەكانییەتی[٤١٨].

تەنیا سۆفییەكی تری ئەو شارە، كە لە نێوەندی سۆفییاندا دیار بووبێ بولحوسێنی ورمێیە؛ ئەو سۆفییەی خواجە عەبدوڵڵای ئەنصاری (م٤٨١ك/١٠٨٨ز) بە یەكێك لە پێشەوایانی تایەفەی سۆفییانی دادەنێ، كە هاوئاستی سۆفیگەلێكی وەك ئەبولحەسەنی حوصەری (م٣٧١ك/٩٨١ز) و ئەبوعەبدوڵڵای كوڕی خەفیفی شیرازی بووە[٤١٩]. سەبارەت بە بیروبۆچوونەكانی ئەو سۆفییە، ئەوا وردەكارییەكانی نازانین، ئەگەرچی خواجەی ئەنصاری یەك وتەی لێ دەگێڕێتەوە لەمەڕ "وەفاداری سۆفییانە"، لەوێدا دەردەكەوێ ئەم سۆفییە تێڕوانینێكی تایبەتی هەبووە لە داڕشتنی كۆی تێزەكانی؛ لای ئەو وەفاداری دەرچوونە لە بارێكی دیاریكراو و نیشتەجێبوونی نێو بارێكی ترە كە بواری گەڕانەوە بۆ باری یەكەمی نەبێ[٤٢٠]، بە دەستەواژەیەكی تر وەفاداری هەوڵێكە بۆ خۆداڕشتنەوە بەپێی چییەتی وەفاكەوە، هەر لەبەر ئەوەشە بەڕای بولحوسێنی ورمێیی جیاوازی هەیە لە نێوان ماناكانی وەفاداری لەلای خەڵكی سادە(العوام)، لە گەڵ ماناكانی لەلای دەستەبژێرەوە(الخواص)، كە سۆفییان خۆیان لەگەڵ چینی دووەمدا پۆلێن دەكەن، پۆلێنكردنێك كە پەیوەست نییە بە پایەی كۆمەڵایەتییەوە، ئەوەندەی ڕەنگدانەوەی ئاستی باوەڕدارییانە. جیاكاری نێوان ماناكانی وەفاداریش لەسەر ئەو باوەڕە دامەزراوە نەك پایەكە، ئیدی ئەو وەفاداریەی بولحوسێن قسەی لەسەر دەكات تۆخكردنەوەی جیاكارییەكەیە؛ ئەگەر لەلای خەڵكی سادەدا گۆڕینی بار بێت ئەوا لەلای

---

(٤١٨) السلمي:طبقات, ص٤٠٨. ابن خميس: مناقب, ج٢, ص١٣٢.السلفي: معجم, ص١٢٢.

(٤١٩) طبقات الصوفية, ص٤٧٩.

(٤٢٠) طبقات الصوفية, ص٤٧٩.

دەستەبژێر پرسیارێکی وجودییە، وجودی ئایینیانەی مرۆڤ و شێوازی گەڕانییەتی بەدوای هۆکاری هەبوونی لەسەر زەویدا[٤٢١].

بێگومان نەبوون، یاخود تۆمار نەکردنی دەق و وتەی تری ئەو سۆفییە، بێبەشمان دەکات لەوەی لە ماناکانی ئەو وجودە تێبگەین، بەمەش رووخساری گشتگیری هزرەکەی بە نادیاری دەمێنێتەوە.

(٤٢١) طبقات الصوفية, ص٤٧٩. هەروەها بڕوانە: جامی: نفحات, ص٣٤٥.

## دەروازە: ڕەوتگەری لە هزری سۆفیگەریدا

وەنەبێ تەواوی سۆفییان بە یەك ئاراستە و بەهەمان شێوە بیریان لەو چەمك و تێزانە کردبێتەوە، کە کایە ئایینییەکەی ئەوانی پێکدەهێنا، بەڵکو وەك لە دەروازەی توێژینەوەکەمان گوتمان، ئەو کایەیە لەگەڵ هەرکامێك لەو سۆفییانەی بونیادەکەیان دامەزراندوە، تا ئەو کاتەی بریتی بووە لە ئەزموونێکی رۆحانیی تاکەکەسیانە، قالبێکی تایبەتمەندی وەرگرتووە و بە ڕێچکەیەکدا رۆیشتووە جیاواز لەوەی سۆفییانی تر گرتویانەتە بەر.

بێگومان ئەو جیاوازییە لە ساتی بەیەکگەیشتن و ڕووبەڕووبوونەوەی سۆفییەکان، یان ئەوانەی لەدوای ئەمانەوە هاتوون و لە چوارچێوەی کولتووری کەڵەکەبووی هزریاندا خۆیان ناسیوە و بەلایانەوە سۆفیگەری بریتی بووە لە پەیڕەوکردنی ئەزموونی ئەم پێشینانە، مشتومڕ و دەمەقاڵەی لێ کەوتۆتەوە. ئەگەرچی ئەمەش لە دەستپێکدا وەك حاڵەتێکی دروست و ئاسایی تەماشاکراوە تا ئەوکاتەی لە بەرژەوەندی برەوپێدان و فراوانکردنی ئاسۆی هزرەکە بووە[٤٢٢]، بەڵام دواتر ڕێگەی بۆ سەرهەڵدانی ڕەوتی جیاوازی سۆفیگەریی خۆش کردووە کە تایبەتمەندی ئەو کەسێتییانەی لەخۆگرتبوو، تەنانەت بەناوی ئەوان وەك: "طەیفوری"[٤٢٣]، "جونەیدی"، "حەلاجی" بووە، یانیش بەناوی شار و ناوچەکان وەك: (بەغدا، بەصرا، میصر، خوراسان و...هتد) دەناسرا[٤٢٤].

بێگومان لەو قۆناغی سەرهەڵدان و جێگیر بوونەدا، دەستنیشانکردنی خەسڵەتەکانی ڕەوتەکان کارێکی ئەستەمە، ئەمەش لەبەر تێکچڕژانیان و هاوبەشییان لە هەندێك خاڵی بنەڕەتی و جیاوازییان لە بڕێکی تر، کە پەیوەستن بە هاوشێوەیی یان جیاوازی ئەزموونە رۆحانییەکان و سەرچاوەکانی تێگەیشتن و گەڵاڵەبوونی تێزەکانی نێو هزرێك کە گوزارشت لەو ئەزموونە دەکات، بۆیە ئەوەی بیەوێ بەدوای تایبەتمەندی ڕەوتەکان، تەنانەت ڕەوتەکان خۆشیاندا بگەڕێ، دەبێ کار لەسەر چییەتی چەمك و تایبەتمەندی سۆفییەکان لە داڕشتن و خستنەڕووی ئەو چەمکانە بکات و لەوێوە دەست بە بەراوردکردنیان بکات، تا لەڕوانگەیەکی دروستەوە خاڵە لەیەکچوو و جیاوازەکان ببینێ.

---

(٤٢٢) القشيري: الرسالة, ص٤٢٩.

(٤٢٣) دەگەڕێتەوە بۆ طەیفور, کە ناوی بایەزیدی بسطامی یە.

(٤٢٤) بۆ نمونە بڕوانە: الهجويري: كشف, ج٢, ص ص٤٠٣-٥٠٨.

هەرچۆنێك بێت، بەر لەوەی بێینە سەر گرنگترین ڕەوتی سۆفیگەری قۆناغەکە و هەڵوێستی سۆفییانی پانتایی کوردی بخەینە ڕوو، دەبێ ئاماژە بۆ ئەوە بکەین، کە قسەکردن لەسەر ڕەوتی جیاواز، قسەکردن نییە لەسەر ئەو سیستەمە ڕێکخراوەییەی لە سنووری ئەو هزرەدا دادەمەزرێ؛ کە ئەویش "سۆفیگەری تەریقەتیی"یە، بەوشێوەیەی لە قۆناغەکانی دواتر لە جیهانی ئیسلامیی سەرهەڵدەدات و تا سەردەمانی ئێستا رووخساری دیاردە ئایینییەکەی داپۆشیوە. بەڵکو وەك گوتمان ئەو ڕەوتانەی سەرەتا لە سنووری تێگەیشتن و خوێندنەوەی جیاوازی چەمکە بنەڕەتیەکان ماوەتەوە، لەگەڵ بەرهەمهێنانی چەمکی تر و جێگیرکردنیان لە دووتوێی فەرهەنگی دەستەواژە سۆفییەکاندا، نەك دابڕانی تەواو لە نێوان ئەو تێگەیشتنانە، یانیش جەختکردنەوە لەسەر بواری کردەکیی سۆفیگەری وەك لە چوارچێوەی سیستەمی تەریقەتییدا وایلێدێت [٤٢٥]. بەڵکو ئەمەی سەرەتا جۆرێك بووە لە بەرفرە بوونی بازنەی بیرکردنەوە و بیروباوەڕی سۆفییانە و چۆنییەتی گوزارشتکردن لەو بیروباوەڕە لە کۆڕی سۆفییان خۆیاندا، وەك لە خوێندنەوە و تێخوێندنەوەی ڕەوتی حەلاجیدا بە ئاشکرا بۆمان دەردەکەوێ.

(٤٢٥) بۆ تێگەیشتن لەو بوارە و گەڵاڵەبوونی لە نێو هزری سۆفیگەری ناوچەکە بڕوانە بەشی چوارەمی ئەم توێژینەوەیە.

## یەکەم: ڕەوتی حەلاجیی و دژە حەلاجیی لە پانتایی کوردیدا

ڕەنگە یەکێك لە یەکەمین ئەو سۆفییانەی گوتاری یەکگرتووی سۆفیگەری دووچاری لێکترازان و خوێندنەوەی جیاواز کردۆتەوە حوسێنی کوڕی مەنصوری حەلاج بێت؛ ئەو سۆفییەی نەك هەر کاریگەریی بەسەر تێگەی هزریی کایەکەوە هەبووە، بەڵکو توانیویەتی لە کایەیەکی داخراویشەوە بیگوازێتەوە بۆ ئاستی دیاردەیەکی ئایینی و تەنانەت کۆمەڵایەتیی – سیاسیی تێبینی کراو لە پانتایی ئیسلامیدا. گرنگی ئەو تەنیا لە سنوری داڕشتنی چەمکی نوێ و تێگەیشتنی ناباو بۆ چەمکە کۆنەکان و دامەزراندنی ڕێچکەیەکی سەربەخۆ لە نێو هزرەکەدا نەماوەتەوە، بەڵکو لەو مەودا فراوانەشەوەیە کە لە پانتاییەکەدا داگیری کرد، بەجۆرێك – جگە لە سۆفییان – زۆربەی کارەکتەرە سەرەکییەکانی پێوە خەریك بوو؛ هەر لە فەقیە و کەلامناسان و...هتدەوە بگرە تا خەڵکی ئاسایی، بەهەمان شێوە ڕەوت و ڕێبازە ئایینییە دژ بە یەکەکانیش لە سوننییەکانەوە تا شیعییەکان هەڵوێستی خۆیان لە بارەوە دەربڕیوە، ئەمە سەرباری تێوەگلانی دەسەڵاتی سیاسی سەردەمەکە. دواجار چارەنوسی ئەو کە لە داردان بوو، بابەتی تێڕامان و لێ وردبوونەوەی هەموو ئەمانە دەبێ و وەك جۆرێك لە دابڕان لە نێو مێژووی هزری ئایینی خۆی دەنوێنێ.

لێرە ناخوازین وردەکارییەکانی ژیانی ئەو و هەڵوێستە جیاوازەکان لە بارەی کەسێتی و بیروبۆچوونەکانی بخەینە ڕوو، بەتایبەت کە ئەو بابەتانە – ڕەنگە هەڵە نەکەین ئەگەر بڵێین – بە بەراورد لەگەڵ سۆفییانی تری هاوسەردەم و دواتریش زۆرترین گفتوگۆی لەسەر کراوە و چەندین لێکۆڵینەوەی لەبارەوە ئەنجام دراوە و چارەنووسە تراژیدییەکەی زوو سەرنجی توێژەران، نەخاسمە ڕۆژئاواییەکانی ڕاکێشاوە و خوێندنەوەی هەمەجۆر و فرەچەشنی بۆ کراوە، خۆ – هەر بۆ نموونە -- ئەوەی بڕوانێتە بەرهەمەکانی ڕۆژهەڵاتناسی فەڕەنسایی "لویس ماسینیون" بەتایبەتیش کتێبی "La Passion de Husayn Ibn Mansûr Hallâj"[٤٢٦] و چەندانی تر[٤٢٧]، ئەو گرنگیدانەی بە باشی بۆ دەردەکەوێ.

---

(٤٢٦) لێرەدا پشت بە بەشی یەکەمی وەرگێڕانە عەرەبییەکەی ئەو کتێبە بەستراوە بەناوی "آلام الحلاج"؛ ترجمة: الحسين مصطفى حلاج, شركة قدمس للنشر والتوزيع, بيروت, ٢٠٠٤.

(٤٢٧) لەبارەی کارەکانی لویس ماسینیون لەمەڕ حەلاج دەشێ بگەڕێیەوە بۆ: مجموعة من المؤلفين: في قلب الشرق – قراءة معاصرة لأعمال لويس ماسينيون, المجلس الأعلى للثقافة, القاهرة, ٢٠٠٣, ص ص٢٠-٢٤, ٩٧-١١١.

بەهەرحاڵ، رەنگە خاڵی بنەڕەتی ئەو گرنگیدانە بە حەلاج ئەوە بێ کە سۆفیگەری لای ئەو هەر تەنها بەرهەمێکی هزریی و ئاکامێکی لێ وردبوونەوەی باوەڕدارییانەی ساکار نییە، ئەوەندەی بریتییە لە حاڵەتێکی دەروونی بەرهەمهێنەری هزر، بیرکردنەوەی رەهای کەسی عارفە لە "خودا" و پچڕانی هەر پەیوەندییەکە کە دەشێ ئەو بە "خود" ببەستێتەوە[428]، ئەمەش دەیخاتە باری هەڵچوونێکی دەروونی سەخت و دواتریش خەیاڵکردنی شێوەکانی پەیوەندی نێوان خودایانە و مرۆڤانە( یاخود بەپێی دەستەواژەی بەکارهێنراو لە لایەن حەلاج خۆیەوە: "لاهوت" و "ناسوت")[429]، جێگەی تێگەیشتنی ئاسایی — بە مانا سۆفیگەرییەکەی — دەگرێتەوە و دەگاتە ئەو باوەڕەی ئاستێکی باڵای پەیوەندی لە ئارادایە و بریتییە لە یەکگرتن و ئاوێزانبوونی "من"ی ئەو و "من"ی خودایی[430]، ئەمەش یەکگرتنێکە پێویستی بەوەیە لە نێو گوتاری ئایینەکە کە ئیسلامە بناسێنرێ، لێرەوە بیرۆکەی "حلول"ی سۆفییانە دێتە ئارا و حەلاج بە یەکێك لە "حلولییەکان" دەژمێردرێ[431].

هەر چۆنێك بێت لای حەلاج و پەیڕەوکارانی ئەو تێگەیشتنەی سەرەوە مەرزە جیاکارییەکانی نێوان "لاهوتی - خودایی" و "ناسوتی — مرۆڤانە" کاڵ دەکاتەوە، تەنانەت

---

(٤٢٨) الحلاج: الطواسين, ضمن: الحلاج — الأعمال الكاملة, بتحقيق: قاسم محمد عباس, رياض الريس للكتب و النشر, بيروت, ٢٠٠٢, ص١٩١. الأنصاري: طبقات الصوفية, ص ص٣٨٤-٣٨٥. ابن خميس: مناقب, ج٢, ص ص٧٥-٨٠.

(٤٢٩) ابن الساعي: أخبار الحلاج, ص٨٢. لە دەقە شیعرییەکانیشی جەختی لەسەر ئەو تێکەڵبوونە کردۆتەوە, بۆ نموونە دەڵێ:

مُزجت روحك في روحي كما    كما تمزج الخمرة بالماء الزُلال

فـإذا مسك شيء مسني    فـإذا انـت أنـا فـي كـل حـال

((رۆحی خۆت تێکەڵ بە رۆحی من کردووە, وەك چۆن مەی تێکەڵ بە ئاوی زولاڵ دەبێ, ئەوەی پەیوەندی بە تۆ بێت پەیوەندی بە من هەیە, چونکە لە هەموو حاڵێکدا تۆ منی))؛ الحلاج: ديوان الحلاج, حققه: كامل مصطفى الشيبي, ط ٢, دار آفاق عربية, بغداد,١٩٨٤ , ص ٧٣.

(٤٣٠) بەراورد بکە لەگەڵ: محمد عابد الجابري: بنية العقل العربي — دراسة تحليلية نقدية لنظم المعرفة في الثقافة العربية, مركز دراسات الوحدة العربية, ط٦, بيروت, ٢٠٠٠, ٢٨٨.

(٤٣١) الأسفراييني: التبصير, ص١٣٠, ١٣٢-١٣٤. البغدادي: الفرق, ص ص٢٤٦-٢٥٠.

ئە ماناكانی پێشوو بەتاڵیان دەكاتەوە، لە ئاكامیشدا وتەی هەرە بەناوبانگی حەلاجیی كە "أنا الحق — من هەقم(خودام)"ە لێ دەكەوێتەوە[432]. بێگومان تێزی ئاواش دەچێتە چوارچێوەیەكی گشتگیری هزری ئایینی و وادەكات كەسانی وەك حەلاج لە سنووری هزری ئیسلامییەوە نەمێننەوە، بەڵكو دەشێ لە نێو كولتووری ئایینی تردا هاوشێوەیان ببینرێ، وەك بۆ نموونە لە كولتووری مەسیحیی خۆی لە "بەرجەستەبوون – incarnation"ی خودا لەنێو مرۆڤ دەبینییەوە و لەو كولتوورەدا قسە و باسی زۆری لە بارەوە كراوە، تەنانەت ئەگەری كاریگەری ئەو تێزەش لەسەر حەلاج خراوەتە ڕوو[433]. ئەوەی لەو تێزە گرنگ بێ ئەوەیە كە دەروازەیەكی گەورەی بۆ تەواوی كایەكە خستۆتە سەر پشت، تەنانەت بۆچوونەكانی ئەو چییەتی سۆفیبوونیشی خستە بەردەم پرسی ئەوتۆوە كە وەڵامدانەوەیان ئاسان نەبوو، مەگەر ئەوانە بتوانن شێوە وەڵامێكی بدەنەوە كە چوونەتە سەر ڕێبازی ئەو یاخود بە هەمان ئەزموونی رۆحانیی تێپەڕیون و خۆیان لە نێو هەمان حاڵەتی دەروونی دۆزیوەتەوە.

لێرەدا دەبێ ئاماژە بۆ ئەوە بكەین كەوا هەژاندنی بونیادی سۆفیگەریی ئیسلامیی بە مانای ئەوە نەدەهات هزری حەلاجیی بە تەواوی لە دراوە گشتییەكانی سۆفیگەری دەرچووبێ؛ ئەوەی تەماشای "شەتەحات – الشطحات"ەكانی سۆفییانی بەر لە حەلاج وەك بایەزیدی بسطامی، یاخود هاوسەردەم و دوای ئەو وەك ئەبوبەكری شبلی و چەندانی تر رابمێنێ[434]، ئاستی پابەندیی حەلاجی بەو دراوانە بۆ دەردەكەوێ، بەڵام ئەوەی حەلاج ڕووبەڕووی دادگا و دواتریش لەداردان دەكاتەوە، جەرەبەزەییەتی لە خۆدەربڕین و دركاندنی رازی تایبەت بە جۆری پەیوەندییە خوداییەكە و تەنانەت بانگەوازكردنی ئاشكراش بۆ ئەو تێز و بیروبۆچوونانە.

بۆیە حەلاج لە زۆربەی ئاستەكانەوە ڕەت دەكرێتەوە؛ لە ئاستی سیاسیی جموجۆڵەكانی وەك فیتنەبازی و نانەوەی دووبەرەكی و مەیلی گۆڕینی سیستەمی سیاسی تەماشا

(٤٣٢) ابن الساعي: أخبار الحلاج, ص١٠٤.

**(433)** Reynold Nicholson: Studies, pp.79-80.

(٤٣٤) گشتگیرترین سەرچاوەیەك لەمەڕ شەتەحاتی ئەو سۆفییانە و هی تریش و راڤە كردنیان, كتێبەكەی "شیخ روزبهان بقلی شیرازی" (م٦٠٦ك/ ١٢٠٩ز) بێت؛ بگەڕێوە بۆ: شرح شطحیات, بە تصحیح و مقدمة از: هنری كوربن, ترجمەء مقدمة از: علي امیر معزي, انتشارات طهوري, تهران, ١٣٨٢هـ.ش.

دەکرێ[٤٣٥]، لە ئاستی فیقهی، بە پشتبەستن بە بۆچوونەکانی سەرەوەی، بە دەرچوون لە سنووره رەنگ سوورەکانی شەریعەت تۆمەتبار دەکرێ[٤٣٦]، کۆمەڵێك لە سۆفییانیش بە تۆمەتی درکاندنی راز و راگەیاندنی لە نێو خەڵکدا بێ جیاوازیکردن لەنێوان ئاستی تێگەیشتن و بیرکردنەوه رەتی دەکەنەوه، چونکه پێیان وایه ئەو رازانه تەنها بۆ کەسانێکه کە بە مەشقێکی باشی رۆحانییدا تێپەڕیون ئینجا توانیویانه باریان ببەن[٤٣٧].

ئەو ئامادەییەی حەلاج، سۆفیگەری خسته بەردەم دووڕیانێکەوه، رێگەیەکیان بەرەو لای ئەو خۆی دەچوو و کۆتایی رێگاکەش – لەگەڵ تراژیدیای لە داردانیدا – بە روونی دیار بوو کە چەند تاریکه، رێگاکەی تریش ئەوەیان دەبێ کە لە فەزای باوی شەریعەتەوه قەبوڵ دەکرا و دەرکەتەکانی هزرەکەی لە قالب دەدا. لەوه دەچێ لە پانتاییه کوردییەکەدا هەردوو رێگاکە تاقی کرابنەوه، بۆیه لە قۆناغی جیاجیای درێژبوونەوەیان کەسانێکی وڵاتەکە دەبینین بۆچوونی خۆیان لەم خوێندنەوەیەی سۆفیگەری دەربڕیوه و لە ناوکۆی تێڕوانینەکانیاندا – کەم تا زۆر – پابەندی بوونه یانیش دژایەتییان کردووه و رەتیان کردۆتەوه.

### ١- قەبوڵکردنی رەوتی حەلاجیی

### هەوڵی بڵاوکردنەوەی بیروباوەڕی حەلاج لە ئاستی میللیی:

ئەوەی زێتر لەبارەی کاریگەریی حەلاج بەسەر کوردستانەوه بەرچاو بێت، پەیوەندیی ئەوه بە دەستەبژێری سۆفی و ئایینی ئەوێ، جا بیرەکەی قەبوڵ کرابێت یاخود رەتکرابێتەوه، بەڵام دەقه مێژووییەکان پێمان دەڵێن کاری وی لەو ئاستە نەوەستاوه و لە ئاستی میللیش بانگەشەی تەواوی خەڵکی بۆ بیروباوەڕەکەی خۆی کردووه. بە دەستەواژەیەکی تر کاری کردووه بۆ دابەزاندنی هزری عیرفانی لە ئاستی دەستەبژێرەوه، کە گۆشەگیرانه بەرهەمی دێنن و

---

(٤٣٥) بۆ نموونه بڕوانه: ابن النديم: الفهرست, ص ص٢٨٣-٢٨٤. مسكويه: تجارب, ج٥, ص ص١٣٢-١٣٥.

(٤٣٦) الصولي: أخبار المقتدر, ص٢٢٥. ابن تيمية: توحيد الألوهية, بتحقيق: عبد الرحمن محمد النجدي, ط٢, مكتبة ابن تيمية, القاهرة, د.ت, ج٢, ص ص٤٨٠-٤٨٧.

(٤٣٧) السلمي: طبقات, ص٣٠٧-٣٠٨. الخطيب البغدادي: أخبار الصوفية, ص ص١٤٠-١٤٢. هەروەها بڕوانه: جان شوفلیی: التصوف, ص٤٥.

تیۆریزەی دەکەن، بۆ ئاستی میللی، کە بە ئاشکرا پەیڕەوی لێ دەکەن و پابەندی دەبن. ڕەنگە هەر ئەو پرۆسەی "بەکۆمەڵایەتیکردنی سۆفیگەری" یە فاکتەرێکی ئەو ناوبانگەی حەلاج بێ کە لە پانتایی ئیسلامیدا هەیەتی.

لەم بوارەدا دەڵێن حەلاج خۆی رایدەگەیاند رێبازێکی نوێی داهێناوە و پەیڕەوی لێ دەکات[٤٣٨]، بەمەش دەروازەیەکی نوێی بەسەر باوەڕی سۆفییاندا کردەوە، چونکە ئەگەر ئەوان پێشتر دوورەپەرێزی و تەرکەدونیاییان کردبووە ناونیشانی پێگەی کۆمەڵایەتیان، ئەوا حەلاج ئەو رۆڵە تێدەپەڕێنێ و بانگەواز لە نێو توێژە کۆمەڵایەتییە جیاوازەکان دەکات[٤٣٩].

لێرەدا حەلاج بە دوو ئاراستە کاری کردووە، لەرووی کردارییەوە ویستوویەتی تێگەیشتنێکی نوێ لەسەر دینداری لە نێو خەڵك بڵاوبکاتەوە کە لەسەر ساناکردنی سرووتە ئایینییەکان و ئەگەری دەست لێ هەڵگرتنیان دامەزرابوو[٤٤٠]، لە پاڵ ئەمە بانگەوازی بۆ وەلانانی ئەو جیاوازییە مەزهەبییانە دەکرد کە پانتایی ئیسلامی پارچە پارچە کردبوو، ئەو لەسەرووی لاگیری مەزهەبییەوە کاری بۆ کۆکردنەوەی خەڵك لەدەوری هزرەکەی دەکرد و لەگەڵ هەر گروپێك و لەهەر شار و ناوچەیەکدا پەیڕەوی لەو رێبازە کردووە کە ئەوان باوەڕیان پێی بووە، هاوەڵ و موریدانیشی ڕاسپاردبوو، لەهەر شوێن و لەگەڵ هەر میللەتێك، بەپێی ئاستی تێگەیشتنیان لەگەڵیان بدوێن[٤٤١]، بێگومان لەمەدا پشتی بەو تێزەی خۆی بەستووە کە قسە لە یەکبوونی ئایینەکان لە کرۆکدا" الباطن" و جیاوازبوونیان لە رووخساردا"الظاهر" و ئەگەری دەست هەڵگرتن لە رووخسار و دەستگرتن بە کرۆك دەکات، وەك پاشتر زێتر لێی دەدوێین.

لەم تێڕوانینە گشتگیرەوە دەتوانین لە هەنگاوەکانی حەلاج لە پانتایی کوردی تێبگەین، کە بۆ رازیکردنی خەڵك بە بانگەوازەکەی ناویەتی. ڕەنگە یەکەمین هەنگاوێکیش بانگەوازی ڕاستەوخۆ بووبێ لە رێگەی گەشتکردن بۆ ناوچەکە و بینینی خەڵکی ئەوێ؛ ئەو بۆخۆی، لە

---

(٤٣٨) الصولي: أخبار المقتدر, ص٢٢٦.

(439) History, p. Henry Corbin: 1980.

(٤٤٠) بڕوانە: مسكويه: تجارب,ج٥ ,ص١٣٧. مؤلف مجهول: العيون و الحدائق, تحقيق: نبيلة عبد المنعم داود, مطبعة النعمان, النجف الأشرف, ١٩٧٢, ج٤, ق٢, ص٣٠٠-٣٠١.

(٤٤١) الصولي: أخبار المقتدر, ص٢٢٥. مسكويه: تجارب, ج٥, ص١٣٦ .

نێوان ساڵانی(٢٧٢-٢٨٨ك/٨٨٥-٩٠١ز) هاتۆتە هەندێ شوێنی وڵاتەکە، بەتایبەتیش هەرێمی چیا. لەمەڕ ئەو گەشتە ئەوە دەزانین چۆتە دوو شاری گرنگی ئەوێ، ئەوانیش نەهاوەند و دینەوەرن، لە ڕۆژی نەورۆز - لە کاتی ئاهەنگ گێڕانی خەڵکەکە – لە شاری نەهاوەند بووە[٤٤٢]، بەڵام سنووری چالاکی لەوێ زۆر روون نییە. کەچی لە دینەوەر لە مزگەوتدا ماوەتەوە و گفتوگۆی لەگەڵ هاوڕێیانی کردووە[٤٤٣]، کە ئەمەش ئاماژەیە بۆ هەبوونی لایەنگری دینەوەریی بۆ بیروباوەڕەکەی[٤٤٤]. بەدەر لەم دوو شارە ئاماژە بۆ چوونی حەلاج بۆ ناوچەی تری کوردی ناکرێ، ئەگەرچی گەڕان و سوڕانی زۆری وی ئەو ئەگەرە دەهێڵێتەوە.

حەلاج هەر بە بانگەوازی راستەوخۆوە ناوەستێ، بەڵکو بەردەوام پەیامی بۆ دەڤەرە جیاجیاکان هەناردووە بۆ کۆکردنەوەی لایەنگر؛ ئەو نامەیەی لەسەروبەری دادگایی کردنی، لە دەست پەیڕەوکارێکی رێبازەکەی لە دینەوەر گیراوە[٤٤٥]، بەڵگەیەکی روونە لەسەر ئەم جۆرە چالاکیە. لەوەش دەچێ حەلاج هەندێك جار، نەك هەر پەیام، بەڵکو موریدەکانی خۆی، لە پێناو خۆشکردنی زەمینە بۆ قەبوڵکردنی بۆچوونەکانی، رەوانە کردبێ، لەم ڕووەوەش هەر پتر گرنگی بە هەرێمی چیا داوە، موریدەکان لەوێ بە شێوازی جیاواز و نائاسایی کاریان بۆ دروستکردنی ئەم زەمینەیە کردووە[٤٤٦].

ئەوەی لە دووتۆی پرۆسەی بانگەوازکاریی حەلاجیدا جێگەی سەرنج بێت، هەوڵی ئەو سۆفییەیە بۆ رازیکردنی دەستەی سیاسی بە بۆچوونەکانی، کە ئەمەش تێوەگلانی ئەو بە کێشە سیاسیەکانی سەردەمەکەی دەردەخات. لەم بوارەدا، بەپێی قسەی هەندێك لە گەڕیدە و شارناس، ئەو سۆفییە توانیویەتی مەیلی هەندێك لە ((میری دەڤەرەکان و پادشاکانی عێراق و جەزیرە و چیا...))[٤٤٧] بۆ خۆی ڕابکێشێ. هەرچەندە نازانرێ کێن ئەو میر و دەسەڵاتدارانەی

---

(٤٤٢) ابن الساعي: أخبار الحلاج, ص٤٥.

(٤٤٣) ابن الساعي: أخبار الحلاج, ص٤٩.

(٤٤٤) دواتر دێینەوە سەر ئەو بابەتە.

(٤٤٥) الخطيب البغدادي: أخبار الصوفية, ص١٥٣. ابن الجوزي: تلبيس ابليس, ص١٩٨.

(٤٤٦) التنوخي: نشوار, ج٦, ص٧٦. ماسينيون: الآم الحلاج, ص١٦٦.

(٤٤٧) الأصطخري: مسالك, ص٩٠. الجيهاني: أشكال العالم, ص١٢٣.

هەرێمی چیا و جەزیرە کە بانگەشە کراون، بەڵام ئەوە دەزانرێ ئەو قۆناغەی حەلاج بانگەوازی دەکرد و پەیامی دەنارد، بەتایبەت لە کۆتاییەکانی سەدەی سێیەمی کۆچی، قۆناغی دەرکەوتنی چەندان میر و دەسەڵاتداری کوردییە لە هەردوو هەرێمەکە کە ئارەزووی فراوانخوازی و دامەزراندنی قەوارەی سیاسی سیمای هەرە دیاری مێژووەکەیانە[٤٤٨]، ئەو حەزەی ئەوانیش لەگەڵ ئارەزووی حەلاج بۆ گۆڕینی سیستەمی باوی سیاسی[٤٤٩] ڕێکدێتەوە. لەوەدەچێ، لەپاڵ باوەڕی سۆفییانەی، بۆ بەدەستهێنانی ئەو مەبەستە سیاسییەش پەیامی بۆ هەناردبێ.

لەلایەکی ترەوە ئەگەر دەخوازین، هەمەگیرانە، کاریگەریی ئەو سۆفییە لەزەمینەی کۆمەڵایەتی کوردیدا ببینین، ئەوا دەبێ بچینەوە سەر خوێندنەوەی کەسایەتییەکەی ئەو لە نێو بزاڤە ئایینی - کۆمەڵایەتییەکانی سەردەمی خۆی، لەوێدا دەبینین لە قۆناغی بانگەوازکردنی بۆ بیروباوەڕی خۆی و لەدیدی دەسەڵاتی فەرمیدا، وەك بانگەوازکارێکی "قەرمەتی" دەخوێندرێتەوە، تەنانەت لەدوای دەستبەسەرکردنیشی بە ئاشکرا رادەگەیەنرێ ئەو یەکێکە لەسەرانی بزاڤەکە[٤٥٠]. بەدەر لە راستی و ناڕاستی "قەرمەتیبوونی حەلاج" ؛ وروژاندنی بابەتێکی لەمجۆرە دەماخاتە بەردەم پرسی کاریگەر بوونی کوردە قەرمەتییەکان - وەك پێشتر باسمان لێوەکردن - بەو کەسایەتییە، کە دێتە ناوچەکانیان و راستەوخۆ لەو زەمینە کۆمەڵایەتییەدا - لەهەمان قۆناغی چالاکبوونی ڕەوتەکە لەوێ - ئامادەیی دەبێ. خۆ دواتریش کە دەگیرێ و تۆمەتی قەرمەتیبوونی دەخرێتە پاڵ، بێگومان دەنگدانەوەی لەنێو کوردە قەرمەتییەکان هەبووە و سۆزی ئەوانی بەرامبەر بەو کەسە راکێشاوە، بەتایبەت دوای ئەو چارەنوسەی پێی گەیشتووە. بەدەستەواژەیەکی تر هاوبەشی حەلاج وەك دیاردەیەکی هزریی - ئایینی و کۆمەڵێك کورد وەك گرۆیەکی کۆمەڵایەتی - ئایینی لەیەك بزاڤدا، ئاماژەیەکە بۆ ئەگەری قەبوڵکردن و پەیڕەوکردنی بیروباوەڕی دیاردەکە لە زەمینە کۆمەڵایەتییەکەدا.

---

(٤٤٨) بۆ زانیاری لەسەر ئەو قۆناغە و دیارترین میر و دەسەڵاتدارە کوردیەکان, بگەڕێوە بۆ: زرار صدیق توفیق: الکورد , ص ص١٣٧-١٤٤.

(٤٤٩) ابن الندیم: الفهرست, ص٢٨٣

(٤٥٠) مسکویە: تجارب, ج٥, ص١٣٩.

### حەلاج لای سۆفییانی دینەوەر:

ئامادەیی راستەوخۆی حەلاج لە شاری دینەوەر و ئەو پانتاییە گەورەیەی سۆفیگەری لە شارەکەدا هەیبوو، کاریگەریی ئەو بەسەر کۆمەڵێك لە سۆفییانی ئەوێ بەهێزدەکات، نەدەکرا سۆفییە دینەوەرییەکان بچنە دەرەوەی ئەو بازنەیەی دیاردەی حەلاجی هزری سۆفیگەری تێدا جێ کردبۆوە و تەواو کەسانی سەر بەو هزرە یان نزیك لێی پێ سەرقاڵ کردبوو. سۆفییانی ئەوێ، بەهۆی پەیوەندیی و پابەندی سۆفییانەیانەوە بە رەمزە دیارەکانی ئەو هزرە، بەتایبەت قوتابخانەی بەغداد، دەبووا بەروونی هەڵوێستی خۆیان بەرامبەر حەلاج دەربڕیبووایە، هەندێك لەوانە تا ئاستی لایەنگیری راستەوخۆی ئەو کەسە، بەڵکو داکۆکیکردنی توندیش لە بۆچوونەکانی، چوونەتە نێو بازنەکەوە.

#### أ- عیسای قەصاری دینەوەری و بەرجەستەکردنی هەڵوێستی "شبلی"یانە

رەنگە یەکێك لە یەکەمین ئەو سۆفییە دینەوەریانەی لە نێو بازنەکەدا ناوی هەبێت و باسی لێوەکرابێت عیسای قەصاری دینەوەرییە. بەر لەهەموو شتێك ئەو کەسە لەنێو بایۆگرافیای تایبەت بە سۆفییاندا ونە، رەنگە سەرچاوەیەك کە لای بەلای ئەو سۆفییەدا کردبێتەوەو برێك لە هەواڵ و وتەی لێ بگێڕێتەوە "اللمع"ەکەی نەصری سەڕاج بێت، کە تەنانەت راستەوخۆ قسەی لێ دەگێڕێتەوە[٤٥١]، ئەگەرچی لەوەناچێت عیسا کەسێکی دوورەپەرێز و کەم بەها بووبێ لە نێو ئەلقەی سۆفییان لە شارەکەی خۆی و دەرەوەی، وەك پێشتر گوتمان ئەو لە کەسە نزیکەکانی مەمشادی دینەوەری و ئەبوبەکری شبلی بووە، ئەمە سەرباری چاو کەوتنی بە گەورە سۆفییانی تری سەردەمەکەی[٤٥٢]، هەروەها تێزی سۆفییانەی خۆی هەبووە بەتایبەت لەمەڕ "برسێتی" و پێویستیی ئاگاداربوونی " هەژار - الفقیر" بەرامبەر بەم چەمکە لە پرۆسەی بوونە سۆفیدا[٤٥٣].

بەهەرحاڵ پەیوەندیی عیسا بە حەلاجەوە – بەپێی ئەوەی لەبەردەستە – لەوکاتەوەیە کەوا ئەم سۆفییە بۆ لەداردان دەبردرێ، یەکێك لە دوا وتە گرنگەکانی لەسەرە مەرگدا لەمەڕ

---

(٤٥١) اللمع, ص٢٦٩.

(٤٥٢) بڕوانە: اللمع, ص٢٥٠.

(٤٥٣) اللمع, ص٢٦٩.

"وەجد" و یەکتاپەرستی لێ دەگێڕێتەوە[٤٥٤]، هەر بۆیە وەك یەکێك لەو گەواهیدەرانەی قۆناغەکانی ئازاردانی حەلاجیان بینیوە قسەی لەسەر دەکرێ[٤٥٥]. لەوە بترازێ وردەکاری تری هەڵوێستی لە بەرامبەر بە حەلاج نازانین، ئەگەرچی رەنگە بتوانین لە میانەی سەرەدەری شبلی لەگەڵ حەلاج زێتر هەڵوێستەکەمان بۆ روون ببێتەوە، چونکە دەشێ ئەو دینەوەرییە — لە ساتی لەداردانداا — لەگەڵ شبلی بووبێ، کە ئەویش لە بەسەرهاتی دراماتیکیانەی کوشتنی حەلاج ئامادە بووە، نزیکی عیساش لەم شێخە بەڵگە دەبێ لەسەر ئەو بەیەکەوە بوونە. وەك دەشزانین شبلی لە رووی هزریەوە کێشەیەکی لەگەڵ بیری حەلاجییدا نەبووە و هاوڕابوونی خۆی لەگەڵ بەیان کردووە، تەنانەت دواتر رایدەگەیێنێ کە: (( من و حەلاج لەسەر یەك شتین، بەلاّم شێتیم دەربازی کردم و عاقڵییش سەری وی خوارد ))[٤٥٦].

بێگومان ئەو خۆ بەشێت نیشاندانەی شبلی وا لێکدەدرێتەوە بۆ ئەوە بووە لەگەڵ حەلاج تۆمەتبار نەکرێ، واتا ئەو لە رووی کردارییەوە نەك هەر جەربەزەیی حەلاجی نەبووە، بەڵکو نکۆڵیشی لێ دەکات[٤٥٧]، ئەگەرچی دواتر دیاردەی حەلاجیی بۆ ئەو و پەیڕەوکارانی کردنەوەی دەروازەی بابەتێکی گرنگی سۆفییانە بووە[٤٥٨].

کاتێك ئەمە هەڵوێستی شبلی بێ بێگومان موریدێکی وەك عیساش، هەمان هەڵوێست یان نزیك بەوی هەبووە، هەر بۆیە ئەویش لە سنووری سەرسامیی بەو هزرە و گێڕانەوەی هێندێك رووداو ماوەتەوە و کەمتر گوزارشتی لە هەڵوێستی راستەوخۆی کردووە.

---

(٤٥٤) اللمع, ص٣٧٨. الخطيب البغدادي: أخبار الصوفية, ص١٥٧.

(٤٥٥) لويس ماسينيون: المنحنى الشخصي لحياة الحلاج – شهيد الصوفية في الإسلام, ضمن: شخصيات قلقة في الإسلام, ترجمة: عبد الرحمن بدوي, ط٣, سينا للنشر, القاهرة, ١٩٩٥, ص١٢٩.

(٤٥٦) الأنصاري: طبقات الصوفية, ص٣٧٩. جامي: نفحات,ص ١٥٤. محمد معصوم شيرازي: طرائق, ج٢, ص٤٥٦.

(٤٥٧) لويس ماسينيون: آلام الحلاج, ج١, ص١١٢.

(٤٥٨) لويس ماسينيون: المنحنى الشخصي, ص١٣٠-١٣١

## ب- فارسی دینەوەری و دامەزراندنی گروپی "حەلاجیی – فارسیی"

ئەگەر کاریگەریی حەلاج بەسەر عیسای دینەوەری سنووردار بووبێ، ئەوا لەسەر سۆفییەکی تری شارەکە، کە ئەبولقاسم فارسی کوڕی عیسایە، هیچ سنوورێکی نییە، پەیوەندیی نێوان ئەم دینەوەرییە و هزری حەلاجی هەر لە زوویەکەوە و لەو نوسینانەی باس لەو هزرە دەکەن جێگەی سەرنج و تەنانەت مشتومڕ بووە.

ژیانی فارس تەمومژاوی و نادیارە؛ ئەگەرچی ئەو خەڵکی دینەوەرە[٤٥٩]، بەڵام لە بەغداش ژیاوە[٤٦٠]، هەربۆیە هەندێك جار بە دینەوەری و هەندێك جاریش بە بەغدادی ناوی دێنن. لەلایەکی ترەوە وازەن دەکرێ فارس هەر کوڕی عیسای قەصاری دینەوەری بووبێ، لویس ماسینیۆن لە لێکۆڵینەوەکانی لەسەر حەلاج جەخت لەسەر ئەو بۆچوونە دەکاتەوە[٤٦١]، بەڵام لەسەرچاوەکانی بەردەستدا، شتێکی ئەوتۆمان بەرچاو ناکەوێ ئەم بۆچوونەی ماسینیۆن پشتڕاست بکاتەوە، کەچی ئەوەش دەزانین ئەم ڕۆژهەڵاتناسە لە نوسینەکانی لەبارەی حەلاج پشتی بە چەندان دستنووس بەستبوو، بۆیە دەشێ لەوێدا باسێك لەو پەیوەندییە هەبێ. هەرچۆنێك بێت پەیوەندیی نێوان ئەو دووکەسایەتییەی دینەوەر لەوەدایە هەردووکیان مەیلیان بەلای حەلاج و بۆچوونەکانیدا هەبووە.

ڕەنگە بتوانین سێ قۆناغی بنەڕەتی لە ژیانی سۆفییانەی فارسی دینەوەری دەستنیشان بکەین؛ قۆناغی یەکەم: قۆناغی پێش حەلاجیبوونییەتی، دووەم: قۆناغی بوونی ئەوە لەگەڵ حەلاج و هزرەکەی، هەرچی سێیەمە ئەوا دەشێ ناوی بنێین قۆناغی بانگەوازکردن بۆ باوەڕی ئەو سۆفییە و دامەزراندنی ڕەوتێکی تایبەت بە بیروباوەڕی ئەو.

لە قۆناغی یەکەمدا، سەرەدەری لەگەڵ کەسێکی بزێوی نێو جیهانی سۆفیگەریدا دەکەین، کەسێك کە لە زۆربەی گەورە سۆفییانی سەردەمەکەی نزیکە و ڕاستەوخۆ پەیوەندیی لەگەڵیاندا هەیە، جا چ لە دینەوەر، لەگەڵ مەمشاد بێت[٤٦٢]، یاخود لە دەرەوەی شار،

---

(٤٥٩) البغدادي: الفرق, ص٢٤٨.

(٤٦٠) الكلاباذي: التعرف, ص١٢٠.

(٤٦١) آلام الحلاج, ج١, ص٧٢, ٦٦٧.

(٤٦٢) السلمي: طبقات, ص٣١٧. العمري: مسالك, ج٨, ص١١٧.

بەتایبەت لەگەڵ سۆفییانی قوتابخانەی بەغدا وەك جونەید[٤٦٣]و شبلی[٤٦٤] و چەندانی تر، هاوڕێیەتی هەندێك لەوانەی کردووەو لەگەڵ هەندێکیشیان هەر تەنها بریتی دەبێ لە گرنگیدانی بە ژیان و بیروبۆچوونەکانیان. بێگومان ئەو ئامادەبییەی فارس لە نێو ئەلقەی گەورە سۆفییاندا، کەڵەکەبوونێکی باشی ئەزموونی سۆفییانەی وی بووە، وایلێکردووە بە وردەکاریەکانی هزرەکە و حاڵی کەسایەتییەکانی ئاشنا ببێ، هەر بۆیە دەبینین بۆتە سەرچاوەیەکی بنەڕەتی گێڕانەوەو خستنەڕووی تێزەکانیان و نووسەرانی سۆفی لە بابەتەکاندا پشتی پێ دەبەستن، بەتایبەت هەریەك لە گولئابادی[٤٦٥]و سوللەمی[٤٦٦]، کە هەندێکجار راستەوخۆ، بەتایبەت ئەوەی یەکەمیان[٤٦٧]، هەندێکجاریش ناڕاستەوخۆ بابەتەکانی لێ دەگێڕنەوە و سەرچاوەیەکی متمانە پێکراویان بووە.

سەبارەت بە قۆناغی دووەمی ژیانی فارس، ئەوا تەواو بە حەلاج و رەوتەکەیەوە پەیوەستە، بەڵام ئەوەی لەم قۆناغە رابمێنێ دووچاری قەیرانی جیاوازی خوێندنەوەکان دەبێتەوە، ئەمەش – بەر لەهەمموو شتێك – رەنگە بگەڕێتەوە بۆ کەم باسکردنی هەڵوێست و هزری ئەو لەلای نووسەرانی زووی مێژووی سۆفیگەری؛ لەلایەك هەندێك بە بیانووی حەلاجیبوونییەوە بەپەراوێزیان خستووە، هەندێکی تریش بەو حەلاجییەتەی فارس بانگەشەی بۆ دەکرد رازی نەبوون، ئەگەرچی ئەوان خۆیان حەلاجیان پێ قەبوڵ بووە. رەنگە دیارترین کەسێکی ئەو خانەیەش زانا و نووسەری سۆفی هجوەیری بێت، لە کتێبەکەیدا "کشف المحجوب" بەرگرینامەیەك دەخاتەڕوو لەسەر بنەمای وێناکردنی حەلاج وەك کەسێکی خودان هزرێکی دروست و پەیوەست بە بنەما سەرەکیەکانی شەریعەت و پەیڕەوکاری رێبازی ئەهلی سوننە، با حاڵی سۆفییانەشی بەدڵی گەورە سۆفییان نەبووبێ[٤٦٨]. بەڵام کێشەی هجوەیری لە بێبەریکردنی حەلاج لەو تۆمەتانەی دەدرێتە پاڵی و تەواو نابێ ئەگەر کەسانێك نەبینێتەوە

(٤٦٣) البيهقي: الزهد الكبير, ص٢٩٣. الخطيب البغدادي: أخبار الصوفية, ص١٢٣, ٢٣٢-٢٣٣.

(٤٦٤) السلمي: جوامع آداب الصوفية, ص٦٠.

(٤٦٥) التعرف, ص٦٩, ١٠٨, ١١٠, ١١١, ١١٧, ١٢٠.

(٤٦٦) طبقات, ص٢٢-٢٣, ٢٥.

(467 ) Ahmet .T. Karamustafa: Sufism, p.69.

(٤٦٨) كشف المحجوب, ج١, ص ص٣٦٢-٣٦٤.

ئەو تێزانەی ناو هزری حەلاجیان بخاتە ئەستۆ کە هجوەیری ناتوانێ لەو چوارچێوە فیقهیەی بۆ بەرگری کردن داینابوو بەرگریان لێ بکات، بەتایبەت مەسەلەی ئاوێزانبوونی خودایەتی ومرۆڤایەتی "حلول". کەسێکیش بە باوەڕی خودانی "کشف المحجوب" بابەتی ئاوای خزاندبێتە نێو هزری حەلاجەوە فارسی دینەوەری یە. بۆ سەپاندنی تۆمەتەکەش پەنا دەباتە بەر هەندێك لە حەلاجییەکان، هەر بۆیە دەبینین زۆر بە کەم لە فارس دەڕوانێ و بە کەسێکی نەناسراو و بێ ـ ـای وەسف دەکات و بە شایستەی ئەوەی نازانێ بیناسێنێ و ژیان و سەربوردەی بخاتەڕوو[٤٦٩].

بەهەر حاڵ ئەگەر حەلاج گەلی سۆفییانی کردە دوو بەرە، ئەوا، لە سەرچاوەکاندا، لەو بەرەیەی پشتگیریان لێ کردووە بەزۆری ناوی فارسی دینەوەری دەهێنرێ[٤٧٠]. نازانین فارس چەندە لەگەڵ حەلاجدا ژیاوە، بەڵام ئاگادارین لەوەی ئەو لە کەسە نزیکەکانی بووە؛ پرسیاری لێ دەکات بۆ روونکردنەوەی هەندێك لە بابەتە سۆفییەکان[٤٧١]، هەروەها ئەوەش دەزانین کە لەدوای گرتنی حەلاج هەر لێی دوور نەکەوتۆتەوە، ئەوەتا ئاماژە بۆ دۆخی شێخەکەی لە نێو زینداندا دەکات[٤٧٢]، بەهەمان شێوە لەکاتی لەداردانیشیدا لەوێ بووە و باسی بەجەرگی حەلاج، دوای بڕینی دەست و پێی، دەکات[٤٧٣].

ئەو تێکەڵبوونەی فارس بە جیهانی شێخەکەی، وادەخوازێ خۆی بۆ تەرخانبکات، لەو پێوەندانە دەرباز ببێ کە ئەوی بە گەورە سۆفییانی تر بەستبۆوە، بەتایبەت ئەوانەی بە حاڵ و هزری حەلاجیی رازی نابن، وەك جونەید. ئەمە لە لایەك، لەلایەکی ترەوە لەبەر ئەو ئەزموونە پێشینەی فارس هەیبووە، نەدەکرا لەگەڵ حەلاجدا لە سنووری پەیوەندیی نێوان شێخ و مورید و سەرسام بوونی مورید بە بیروبۆچوون و کاریگەربوونی بە چارەنووسی شێخەکەی بوەستێ، بەتایبەت ئەوکاتەی شێخ تێ دەچێ و ئەو موریدە دینەوەرییەی دەبێتە یەکێك لە

---

(٤٦٩) کشف المحجوب, ج٢, ص٥٠١. هەروەها لەمەڕ ئەو هەڵوێستەی "الهجویری" لە فارس بڕوانە:
Ahmet .T. Karamustafa: Sufism, p.106.

(٤٧٠) الأسفراييني: التبصير, ص١٣٣. البغدادي: الفرق, ص٢٤٨.

(٤٧١) السلمي: طبقات, ص٣٠٩. الأنصاري: طبقات الصوفية, ص٣٨٤. جامي: نفحات, ص١٥٧-١٥٨.

(٤٧٢) خواجه محمد پارسا: فصل الخطاب, به تصحيح: جليل مسگر نژاد, مركز نشر دانشگاهی, تهران, ١٣٨١ ه.ش, ص٦٥.

(٤٧٣) الخطيب البغدادي: أخبار الصوفية, ص١٥٦.

جێنشینەکانی[٤٧٤]، ئیدی دەبێ فارس کار لەسەر هزری حەلاجی بکات بۆ دروستکردنی وێنایەکی ئەرێنییانە و برەو دان بە بیروبۆچوونەکانی.

لەم بوارەدا ئەو وەك گێڕەرەوەیەکی وتەکانی دەردەکەوێ. نەك هەر ئەمە بەڵکو دەست بە ڕاڤەکردن و ڕوونکردنەوەی مەبەستەکانیان دەکات، ئەو زێتر کاری لە بارەی ڕاڤەی حەلاجیی بۆ قورئان کردووە[٤٧٥]، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر قوڵبوونەوەی زۆری لە هزری ئەو کەسێتیە نا ئاساییە. جگە لە ڕاڤەکردن، تایبەتمەندی وەردەگرێ لە بینینی ئەو سۆفییە بۆ ئاستەکانی پەیوەندیی نێوان مرۆڤ و خودا، بەڵام گشتگیرانە قسەی لەسەر ناکات، بەڵکو زێتر هەوڵ دەدات ئاماژە حەلاجییەکان بۆ حاڵەتی "یەکگرتن - الإتحاد" و زاڵبوونی خوداوەند"الحق" بەسەر زاتی مرۆڤانە ڕوونبکاتەوە[٤٧٦]، ئەمەش مانای قەبوڵکردنی ئەو هزرەیە لە تێزە نائاساییەکانیدا، ئەو تێزانەی پێشتر – وەك گوتمان – لە گوتاری سۆفیگەریدا ئەوەندە بەڕوونی تاوتوێ نەدەکران و لەهەمانکاتدا دەستنیشانی چارەنوسی حەلاجیشیان کرد. هەر بۆیە دوان لەو لایەنانە هەم جەربەزەیی و هەمیش تێڕامان و وەرگرتنی لە ئاستی فیکریی پێویستە. شتێکی ئەوتۆمان لەسەر ئەو قەبوڵکردنە لەبەردەستدا نییە، بەڵام ئەگەر بمانەوێ لە ڕوانگەی فارس نزیك ببینەوە، دەشێ بچینەوە سەر بۆچوونی وی لەسەر مرۆڤی "یەکتاپەرست – الموحد" بەگشتی، لێرەدا دەبینین بۆچوونێکی هەیە لە میانەیدا حەلاجیبوون وەك حاڵەتێکی قەبوڵکراو چاوی لێ دەکرێ. ئەو شێخەی دینەوەر پێی وایە "یەکتایی تەواو" بوونی نابێ ئەگەر ئەو مرۆڤەی بانگەشەی دەکات پەیوەستی دونیا بێ، هەروەها ئەوەی تەنیا بە زار یەکتاپەرستە، ناتوانێ ڕازی خودایی ببینێ، ئەوەیش یەکتایی بەحاڵی خۆی بزانێ ئەوا حاڵێکی بێ زارە، هەر بۆیە "بینینی خودا – مشاهدة الحق" حاڵێکە تەنیا هی کەسی شایستە؛ کەسێك کە باوەڕبوونی بە یەکتایی بە حاڵ و بە زارە[٤٧٧]. ئەگەر حەلاجیش ئەو بینینە ڕادەگەیەنێ، بەڵکو تێیدەپەڕێنێ بۆ حاڵی ئاوێزانی

---

(٤٧٤)خواجه محمد پارسا: فصل الخطاب, ص١٦٧.

(٤٧٥) الحلاج: حقائق التفسير او خلق خلائق القرآن و الأعتبار, حققه: محمود الهندي, مكتبة مدبولي, القاهرة, ٢٠٠٦, ص٢٢٣, ٢٤٥.

(٤٧٦) خواجه محمد پارسا: فصل الخطاب, ص١٦٩.

(٤٧٧) الكلابادي: التعرف, ص٩٩.

تەواو بە یەکتاوە[٤٧٨]، ئەوا دەبێتە ئەو کەسە شایستەیەی فارس باسی دەکات، هەر بۆیە قەبوڵیەتی لە نێو هزری کەسێکی ئاوادا خۆی پێناسە بکاتەوە.

هەرچۆنێك بێت، وەك بینیمان، ئەو لایەنەی لە هزری حەلاجی سەرنجی فارسی راکێشاوە پەیوەندیی نائاسایی نێوان مرۆڤ و خودایە، کە لەسەرووی تێگەیشتنە باوەکان بووە، لایەنی کەم لە زەمینەی ئایینی گشتیدا. کارکردنی فارسیش لەسەر ئەو لایەنە وادەکات، لە نێو کولتووری سۆفیگەریدا، وەك رەمزێکی بەرهەمهێنەری ئەم جۆرە هزرە بناسرێ، جا چ تۆمەتبارکردنی بێ بە زیادکردن شتگەلێك لەسەر بیروباوەڕی حەلاج وەك لای هجوەیری بینیمان، یانیش هەر خۆی مەبەستی بووبێ لەم لایەنەی بیری سۆفیگەری قووڵببێتەوە؛ ئەوەی لەم رووەوە لەبەردەستمان بێت قسەکردنییەتی لەسەر "فەنابوونی مرۆڤانە"، لێرە دەریدەخات کە ئەو جۆرەی "فەنا" بەمانای نەمانی خەسڵەتی مرۆڤانە نییە، بەڵکو بە مانای ئەوە دێت لە نێو چێژی خودایی نقوم ببیت و ئازارە مرۆڤانەییەکان نەبینی[٤٧٩]، بەهەمان شێوە پێیوایە ئەگەر مەبەست لە تۆبەکردن گەڕانەوەیە بۆ لای خودا، ئەوا لەهەمان کاتدا مەحوکردنی مرۆڤایەتیە لەبەردەم جێگیرکردنی خودایەتیدا[٤٨٠].

ئەو دوو حاڵەتەی ئاماژەمان بۆ کردن، وایکردووە فارس لە نێو گروپی "حلوليیە حەلاجییەکان" دابنرێ، ئەمانەش وا دەناسێنرێن کە باوەڕیان بە حەلاج لە سنووری ئاساییەوە پەڕیوەتەوە بۆ سەروو ئاساییەوە، تەنانەت وا وێنا دەکرێن باوەڕیان بە خودایەتی حەلاج هەیە[٤٨١]، ئیدی دوای حەلاج تۆمەتی "حلوليی بوون" دەبێتە یەکێك لە دیارترین ئەو تۆمەتانەی کەسانی دەرەوەی ئەلقەی سۆفیگەری دەیخەنە پاڵ سۆفییان و تا درەنگانێك بە بنەمایەکی بنەڕەتی تەواوی دیاردە ئایینییەکەی دادەنێن[٤٨٢].

---

(٤٧٨) بۆ نموونە بڕوانە: الحلاج: ديوان الحلاج, ص ٢٩, ٣١, ٣٧.

(٤٧٩) بڕوانە: الكلاباذي: التعرف, ص ٩٢-٩٣.

(٤٨٠) السلمي: تفسير السلمي, ج١, ص٦٠.

(٤٨١) ابن حزم الأندلسي: الفصل في الملل و الأهواء و النحل, تحقيق: يوسف البقاعي, دار احياء التراث العربي, بيروت, ٢٠٠٢, ج١, ص٢٤٩. ج٢, ص١٨٣. ج٣, ص١٠٦.

(٤٨٢) هەر بۆنموونە بڕوانە: المقدسي: البدء و التاريخ, وضع حواشيه: خليل عمران المنصور, دار الكتب العلمية, بيروت, ١٩٩٧, ج٢, ص١٨٩. بلخي: بيان الأديان, به تصحيح: محمد تقى دانش پژوه, انتشارات بنياد, تهران, ب.ت, ص٥٧, ٨٨. ابن الجوزي: تلبيس ابليس, ص١٩٦.

بێگومان ئەم سەرەدەریە لەگەڵ حلولییەکان لە کولتووری باوی ئیسلامی بەگشتی، گەڕان نییە بەدوای راستی بیروباوەڕیان، ئەوەندەی هەوڵێکە بۆ سەپاندنی ئەو وێنایە شێوەگرتووە، کە دەخوازێ جەخت لەسەر لەرێلادان و هەڵگەڕانەوەی گروپەکە بکات و کەمتر دەپرژێتە سەر بونیادی هزریی — ئایینییەکەیان. بۆیە ئەستەمە وێنەی دروستی گروپەکە ببینرێ، لەوەش ئەستەمتر ئەوەیە جێ پەنجەی فارسی دینەوەری لەم بوارە و لە پرۆسەی بەگروپکردنی یار و پەیرەوانی حەلاج و زێدەکارییەکانی لەسەر هزری ئەو سۆفییە دەستنیشان بکرێ، زێدەکارییەك، کە ئەگەر قسەی هجوەیری دروست بێ، دەبێ ئەوەندە بەرفرە بووبێ لقێکی سەربەخۆی لە نێو گروپی حلولییەکان هێنابێتە دی، کە ناوی ئەویان هەڵگرتبێ، واتا "فارسییەکان"، ئەوانەی ئەم نووسەرە سۆفییە وا پێناسەیان دەکات خەڵکانێکن : ((دەگەڕێنەوە سەر فارس، ئەویش رایدەگەیەنێ ئەمە رێبازی حەلاجە و جگە لە یاوەرانی کەسی دی هەڵگری ئەو رێبازە — واتا حلولی- نییە))[٤٨٣]، لەو پێناسەی ئەم نووسەرە تێدەگەین فارس رێبازی "حلولی" لە حەلاجییەتدا چڕ کردۆتەوە، بەمەش رێبازەکە جۆرێك لە تایبەتمەندی هەیە کە پەیوەستە بە جیهانبینی حەلاجییانە. جگە لەمە هیچی تر لەسەر گروپی "فارسییەکان" نازانین.

سەبارەت بە رۆڵی فارس لە بانگەوازی حەلاجیشدا، کە بە قۆناغی سێیەمی ژیانی سۆفییانەی ئەومان دانا، ئەوە دەزانین لە دەستپێکدا چالاکی زۆری لە هەرێمی عێراق، بەتایبەت لە بەغدا و دەوروبەری، نواندووە. رەنگە ئەو چالاکییانەش پتر لەدوای لە داردانی حەلاجەوە بووبێ، چونکە دەبینین بانگەوازەکەی فارس بە دڵی ئەو حەلاجییانە نەبووە کە لە رەهەندی حلولییانەی بیری حەلاج ترساون و — وەك پێشتریش گوتمان — ختوویانەتە پاڵ فارسەوەو بە نەفرەتیان کردووە، هەربۆیە لەوەناچێ لەوێ جێگەی بووبێتەوە، ئەگەرچی وادیارە لەوناوچانە لەدوای فارس، لایەنی کەم تا سەدەی پێنجەمی کۆچی، لایەنگر و پەیڕەوکارانی هەر مابێتنەوە[٤٨٤].

بەهەر حاڵ رەنگە هەر لەو قۆناغەدا بووبێ کە فارس هاتۆتەوە شارەکەی خۆی و بانگەوازی تێدا کردووە[٤٨٥]، بەڵام بێگومان لەبەر هەژموونی رەوتێکی دژە حەلاجی بەسەر دینەوەر، تا ئاستی گرتنی حەلاجییەکان و بەدەستەوەدانیان وەك کەمێکی تر باس دەکەین،

---

(٤٨٣) كشف المحجوب, ج٢, ص٥١٢.

(٤٨٤) الهجويري: كشف, ج١, ص٣٦٤. ج٢, ص٥٠١.

(٤٨٥) البغدادي: الفرق, ص٢٤٨.

نەیتوانیوە بنکەیەکی بەرفرە دابمەزرێنێ. خۆ سەرباری ئەو دژایەتییەی لەوێ هەبووە، وادیارە حەلاجییەکانی شارەکەش بۆ بێبەریکردنی شێخەکەیان لە تۆمەتی حلول، تۆمەتەکەیان خستبێتە پاڵ فارسەوە، چونکە وەك دەزانین یەکێك لەو حەلاجییانەی بە توندی دژی فارس و تێگەیشتنی لە هزری حەلاج بووە ئەبو جەعفەری صەیدەلانییە[٤٨٦]، ئەویش لە نێو سۆفییانی دینەوەردا پەیڕەوکاری هەبووە بە تایبەت سۆفی ناودار ئەبولحەسەنی صائیغی دینەوەرییە، کە وادیارە بەر لە کۆچکردنی بۆ میصر شاگردی صەیدەلانی بووە[٤٨٧]، بۆیە ئاساییە گەر فارس لەشارەکەی خۆی نەمابێتەوە و بەجێی هێشتبێ.

دوای ئەم قۆناغە دەبینین رووی کردۆتە هەرێمی خوراسان و لەشاری سەمەرقەندا گیرساوەتەوە[٤٨٨]، دەگوترێ لەوێ رێبەرێتی رێکخستنەوەی بانگەوازی حەلاجی، لەژێر سایەی حوکمی سامانییەکاندا( ٢٦١-٣٩٥ك/ ٨٧٤-١٠٠٤ز) کردووە[٤٨٩]، وادیارە بانگەوازەکەی ئاکامی باشی هەبووە، بۆیە دەبینین بەرێزەوە باس لەو قۆناغەی ژیانی و پەیوەندیی بە گەورە زاناو فەقیهەکانی ئەوێ دەکرێ[٤٩٠]، ئەمە سەرباری ئەوەی لەم قۆناغەدا کاری لەسەر هزری سۆفییانەی خۆشی کردووە، لە زۆر لە مەسەلەکان قوولبۆتەوە و بۆچوونی خۆی هەبووە و راستەوخۆ بە گوڵئابادی گوتوون، بەتایبەت لەبارەی ماناکانی "ناسین" و "فەنابوون" وتایبەتمەندییەکانی "عارف" و چەندانی تر[٤٩١]، بەهەمان شێوە وەك راڤەکارێکی قورئان لە دیدێکی سۆفییانەوە دەردەکەوێ و کۆمەڵێك لە ئایەتەکانی لە رەهەندێکی عیرفانییەوە شرۆڤە کردوون[٤٩٢] ، بێگومان ئەمەش دەمانخاتە بەردەم سۆفییەك تایبەتمەندی خۆی وەرگرتووە و لەبازنەیەکی سەربەخۆدا، بەڵام بە تامێکی حەلاجییانە کاردەکات.

---

(٤٨٦) الهجويري: كشف, ج٢, ص٥٠١. لويس ماسينيون: آلام الحلاج, ص٧٧.

(٤٨٧) الأنصاري: طبقات الصوفية, ص٣٩٣.

(٤٨٨) خواجه محمد پارسا: فصل الخطاب, ص١٦٧. جامي: نفحات, ص١٥٧.

(٤٨٩) لويس ماسينيون: آلام الحلاج, ص٤٣٤.

(٤٩٠) خواجه محمد پارسا: فصل الخطاب, ص١٦٧.

(٤٩١) التعرّف, ص٤٣,٩٢-٩٣, ٩٩,١٠٢,١٠٦.

(٤٩٢) هەر بۆ نموونە بڕوانە: السلمي: تفسير السلمي , ج١,ص٤٩,٥٣,٦٠,٦٧,٧٥,١١٣,١٣٢,٣٤٤ و چەندان شوێنی تر.

**ڕەوتی حەلاجیی لە نێو سۆفیانی شاری حولوان:**

سۆفییانی شوێنێکی دی کە کەوتبوونە ژێر کاریگەریی حەلاجەوە، هی شاری حولوان بوون، لەوێدا ناوی چەند کەسایەتییەکمان لەبەر دەستدایە ڕاستەوخۆ پەیوەندیان بە حەلاجەوە هەبووە، ڕەنگە هەرە دیاریان ئەبو ئیسحاق ئیبراهیمی کوڕی عەبدولکەریمی حولوانی بێت، ئەو کەسە وا وەسفدەکرێ لە خزمەتکارەکانی حەلاج بووە و نزیکەی دە ساڵێك خزمەتی کردووە و . خۆی گوتەنی، لە کەسە هەرە نزیکەکانی بووە[٤٩٣]، لەو بەسەرهاتانەی ئەو حولوانییەش دەیگێڕێتەوە وادیارە تەواو تێکەڵ بە جیهانبینی عیرفانیانەی حەلاج بووە[٤٩٤]، تا ئاستێك ڕەهەندە سەروو ئاسابییەکەی ئەو سۆفییەشی پێ قەبووڵ بووە، هەر بۆیە دەیبینین لەگەڵ یاوەرانی تری داوای نواندنی کەرامەت لە حەلاج دەکەن و ئەویش بە گوێیان دەکات[٤٩٥].

هەرچۆنێك بێت لەبەر نەبوونی هیچ باسێکی ئیبراهیمی حولوانی لە سەرچاوە تایبەتیەکاندا، هیچی تری لەبارەوە نازانین، ئاگاداری وردەکاریی هەڵوێست و تێگەیشتنی وی بۆ هزری حەلاجی نین. مەگەر لە خاڵێکی گرنگدا نەبێت کە پەیوەستە بە تێڕوانینی "نەوانیتر"ی نەیار بۆ حەلاج و ئەو بەدگومانییەی لە نێوەندی ئیسلامیدا لە هەمبەر تێزەکانی هەبووە، بەدگومانییەك کە وایکردووە کەسێکی وەك ئیبراهیمی حولوانیش، سەرباری ئەو ئەزموونە ژیانییەی لەگەڵ حەلاجدا هەیبووە، بکەوێتە حاڵی ڕاڕایی و دوودڵییەوە[٤٩٦]. ئەمەش، بەر لە هەموو شتێك، دەریدەخات پڕوپاگەندەی دژە حەلاجی چەندە بەهێز بووە، بە تایبەتیش بە "زەندیق" دانانی و تۆمەتبارکردنی بە دەرچوون و بەتاڵکردنەوەی بنەما ئاینییە چەسپیوەکان.

دیارە هەر ئەمە وایکردووە کەسە نزیکەکانیشی، لە وێنەی ئیبراهیمی حولوانی، پرسیاریان لەلادا دروست ببێ و پێویستیان بەوەبێ دڵنیایان بکاتەوە. مەسەلەیەك کە پتر بۆ ئەو حولوانییە کێشە بووە گونجان و نەگونجانی تێگەیشتنی حەلاجیی بووە لەگەڵ دەرکەوتە باوەکانی ئاین، بەو جۆرەی ڕەوت و ڕێبازە ئاینییەکان و ڕەوتە سۆفییەکانی پەیوەست بەوان،

---

(٤٩٣) ابن الساعي: أخبار الحلاج, ص٢٢.

(٤٩٤) أخبار الحلاج, ص ٢٣-٢٤.

(٤٩٥) أخبار الحلاج, ص٢٥-٢٦.

(٤٩٦) أخبار الحلاج, ص٢٢.

گوزارشتیان لێ کردووە و کردوویانەتە پێوەری پێدانی ناسنامەی موسڵمانێتی دروست بە تاکەکان. زێتریش رەهەندی "باطنی" هزرەکە ئەو قەیرانە رۆحییەی بۆ ئیبراهیم دروست کردووە، ئەو دەیویست بزانێ و دڵنیا بێت چەندە ئەو رەهەندە توانیویەتی " شەریعەت" لەخۆ بگرێ و لێی دەرنەچووە[٤٩٧]، بەتایبەت کە جەختکردنەوە لەسەر ئەو رەهەندە باطنیە بەوە تۆمەتبارە چۆتە سەرووی شەریعەت و رووخسارە دەرەکییەکانی موسڵمانێتی و باوەڕداری بەئاڕاستەیەکدا بردووە جیاوازە لە تێگەیشتنی هەمەگیر و کارپێکراو لە ئاستی ئایینی فەرمی و میللییدا، تەنانەت چەمکەکە کراوەتە ناوی هێندێك لە گروپە شیعییە نەخوازراوەکان نەخاسمە ئیسماعیلییەکان[٤٩٨].

حەلاج، بۆ نەهێشتنی گومانی حولوانی، پێویستی بەوە بووە بۆچوونی خۆی لەمەڕ "ظاهر" و "باطن"ی ئایین روونتر بکاتەوە، رایبگەیەنێ ئەو وردبوونەوەیە لە رووخساری دەرەکی شەریعەت کرۆکەکەی کەشف دەکات، کرۆکیش — کە رەهەندە باطنیەکەیە — خۆی لەخۆیدا بریتیە لە ناسینی خودا، هەر ئەمەشە چییەتی ئایین، با ئەو تێگەیشتنەش لە سەرووی بیروباوەڕە باوەکانەوە بێت و، وەك حەلاج بە حولوانی دەڵی، بریتی دەبێ لە قەبوڵکردن و تواندنەوەی تێگەیشتنی رەوتە هەمەچەشنەکان — تەنانەت ئایینە جیاکان - لەیەك بۆتەدا[٤٩٩]. بێگومان مانەوەی ئەو حولوانییە لەگەڵ حەلاجیش پێمان دەڵێ بەو تێزە رازی بووە و هەمان بۆچوونی لەسەر "ظاهر" و "باطن" لەلادا گەڵاڵە بووە.

جگە لەو حولوانییە ناوی کەسایەتی تری شارەکە هاتووە، وەك یونسی کوڕی خضری حولوانی و بولحەسەنی حولوانی، ئەم دووانەش لە یاوەرانی حەلاج بوون؛ هەم گوێگری وتەکانی و هەمیش لە ساتی لەداردانیدا لەگەڵی بوونە[٥٠٠]. لەوە بترازێ هیچی دی لەسەر خۆیان و ئەو پەیوەندییەیان نازانین، ئەگەرچی هەبوونی چەند کەسێکی حولوانی لەگەڵ حەلاج، دەریدەخات ئەم رەوتەی سۆفیگەری توانیویەتی بخزێتە نێو پانتایی ئایینی شارەکە. خۆ پشتگوێ خستنی

(٤٩٧)أخبار الحلاج, ص٢٢.

(٤٩٨) هەر بۆ نموونە بڕوانە: الغزالي: فضائح الباطنية, اعتنى به: محمد علي القطب, المكتبة العصرية, صيدا — بيروت, ٢٠٠١, ص ص٢١-٢٢.

(٤٩٩) ابن الساعي: أخبار الحلاج, ص٢٣

(٥٠٠) أخبار الحلاج, ص ص٣٥-٣٧.

بەسەرهات و بیروبۆچوونی ئەو کەسایەتیانەش لە دەرەوەی دەقەکانی لایەنگر بە حەلاج، وامان ئیَ دەکات بلَیّین شار بۆتە پیَگەیەکی دیاری رەوتی حەلاجی لە تەواوی ناوچەکەدا.

رەنگە ئەو کاریگەریەی حەلاج وابکات جۆریَك لە قوولَبوونەوە لە هزری سۆفییانە و هیَنانـەوەی وردەکاریەکانی ببیَتە خەسلَەتیَکی سۆفییانی ئەویَ، ئەمە لە شیَوازی دەربڕینی هزرەکـەیان رەنگـی داوەتەوە، وەك لە پەیامی یەکیَك لە سۆفییەکانی ئەویَ، کە ناوی محەمەد کوڕی قاسمی حولوانی یە، بۆ سۆفی گەورەی کرماشان ئیبراهیمی کوڕی شەیبان دەردەکـەویَ، تیایـدا — وەك سـوللەمی بـاس دەکات — ئەو حولوانییە وردەکاریەکانی زانست و زیَدەڕۆیی لە خستنەڕووی تەمومژانەی بابەتەکان لە چوارچیَوەی ئەوەی پیَی دەگوتریَ " ئاماژەکان — الإشـارات" دا کردووە[٥٠١]، بەدەسـتەواژەیەکی تر ئەمە ئەو رەخنەیەیە کە کرماشانی، وەك رەخنەگریَکی سەر سەختی رەوتی حەلاجی، ئاڕاسـتەی پەیامەکەی ئەو سۆفییەی کردووە، هەر بۆیە سوللەمی — بە پشتبەستن بە هەلَویَـستی کرماشـانی - وازهیَنان لە باسکردنی وردەکاری و ئاماژەکان بە یەکیَك لە بنـەما سـەرەکیەکانی سـۆفیگەری دروست دادەنیَ؛ بنەمایەك کە وادەکات سۆفی سنوورەکانی شەریعەت نەبەزیَنیَ و لـە چوارچـیَوەی فەرمان و نەهیدا " الأمر و النهي" بمیَنیَتەوە و زیَتر قوولَ نەبیَتەوە[٥٠٢].

بۆیە ئەگەر محەمەد کوڕی قاسمی حولوانی ئەو پابەندیـەی هـەبیَ بیرکردنـەوەی دروسـتە و حالَی سۆفییانەی باش، ئەگەر وانییە ئـەوا — هـەر بـەپیَی تیَگەیـشتنی بـاوی سـۆفییانە — دووچاری "بانگەشەکردن — الإدعاء"[٥٠٣] دەبیَتەوە[٥٠٤]. ئەوەی لەو بـە ئاکـام گەیـشتنەشدا جیَگەی سەرنج بیَت ئەوەیە کرماشانی هـەمان ئـەو رەخنەیـەی ئاڕاسـتەی حـەلاج کـردووە و تەواوی سۆفییانی ئاگادار کردۆتەوە لەوەی ئاکامی بانگەشە کردن هەمان ئەو چارەنوسەیە کە حەلاج پیَی گەیشت. کەمیَکی تر ئەو بابەتە زیَتر ڕووندەکەینەوە.

(٥٠١) الملامتیة, ص١١٦.

(٥٠٢) الملامتیة, ص١١٦.

(٥٠٣) لە شویَنیَکی تردا ماناکانی ئەم چەمکە روونتر دەکەینەوە.

(٥٠٤) الملامتیة, ص١١٦.

**حەلاج لە تێڕوانینی فیقهیدا – هەڵوێستی قازی ئیبن گەچی دینەوەری:**

ئەگەرچی دەبوایە باسی هەڵوێستی ئەو کەسایەتییەی لێرە لێی دەدوێین لەگەڵ باسی دینەوەرییەکان بێ، بەڵام لەبەرئەوەی سۆفی نییە و فەقیهە بۆیە ئاوا بەجیا قسەی لەسەر دەکەین. بەهەرحاڵ وەك پێشتر روونمان کردەوە لەو قۆناغەدا ڕێبازی شافعی نەك هەر دەخزایە نێو زەمینەی ئیسلامیی – کوردیی، بەڵکو بەرەبەرە جیگەی بە ڕێبازە فیقهی و ڕەوتە ئیسلامیەکانی تر لەق دەکرد. ئیدی کەسایەتی ئەوتۆی شافعیمان بۆ دەردەکەوێ، وەك سەری دیاری ئەم ڕێبازە دەبن، لە ئاستی جیهانی ئیسلامیدا پێگەی باڵایان دەبێ و لەسەر ئەو بنەمایە سەرەدەریان لەگەڵدا دەکرێ. ڕەنگە لە دیارترین ئەو کەسایەتییانە قازی دینەوەر و دەوروبەری لە سەردەمی میرنشینی حەسەنوەیهی کوردی( ٣٤٨؟-٤٠٦ك/٩٥٩؟-١٠١٥ز)، ئەبولقاسم ئیبن گەچی دینەوەری بێت، کە شارەکەی خۆی کردبووە سەنتەرێکی بنەڕەتی ڕێبازەکە و ببووە هۆکاری ئەوەی لە شوێنە دوورەکانەوە کەسانێك، بەمەبەستی ئاشنابوون بەو زانست و وردبینییەی پێی ناسرابوو، ڕووی تێبکەن[٥٠٥]. بە شایەتی هاوسەردەمانی لە ڕووی زانستییەوە بە پلەی یەکەم دەهات و وەك نموونەی بەرزی شارەزا لە فیقهی شافعی قسەی لەسەر دەکرا[٥٠٦]، هەروەها ئەو خۆی لە ڕاڤەکردنی ئەو ڕێبازە فیقهییەدا ئاراستەی جیاوازی هەبووە و کۆمەڵێك مەسەلەی خستۆتەڕوو لای زاناکانی دی بەرچاو ناکەون[٥٠٧].

سەبارەت بە پەیوەندیی ئیبن گەچ بە هزری سۆفیگەری و هەڵوێستی لەو دیاردە ئایینییە، شتێکی ئەوتۆمان لەبەردەستدا نییە، بەڵام بێگومان ژیانی ئەو لە دینەوەری شاری سۆفییان، نەك هەر دەیخاتە نێو ئەڵقەی ئەم گرۆیە، بەڵکو ناچاریشی دەکات کار لەسەر تێز و بۆچوونە ئایینییەکانیان بکات، یان لایەنی کەم سنوورە شەرعییەکانی هزری ئەوان بزانێ، خۆ

---

(٥٠٥) الشيرازي: طبقات الفقهاء, حققه و قدم له: إحسان عباس, دار الرائد العربي, بيروت, ١٩٧٠, ص١١٩. السبكي: طبقات الشافعية, ج٥, ص٣٥٩. الأسنوي: طبقات الشافعية, تحقيق: عبد الله الجبوري, دار الكتب العلمية, بيروت, ١٩٨٧, ج٢, ص١٧٦.

(٥٠٦) السمعاني: الأنساب , ج٥, ص٣٦.

(٥٠٧) النووي: كتاب المجموع, دار الفكر, بيروت, ١٩٩٧, ص٢٨٨. ابن كثير: البداية, ج١١, ص٣٨٦.

نەوەدەچێ ئەو لە نێو ئەو ئەلقەیەدا رێز لێ گیراو بووبێت، هەر بۆیە دەبینین سۆفی هەن وتەکانی دەگێڕنەوە[٥٠٨].

ئەوەی لەو بوارە جێگەی سەرنج بێت پەیوەندییەتی بە دیاردەی حەلاجییەوە، ئەگەرچی وردەکارییەکانی ئەو پەیوەندییەش نازانرێ، بەڵام بەسەرهاتێك هەیە ئیبن گەچ لەسەر حەلاجی دەگێڕێتەوە کە وەك مرۆڤێکی نائاسایی و خاوەن کەرامات، لە هەمان کاتدا بانگەوازکارێك بۆ ئایینی ئیسلام، دەریدەخات. لە دەقی بەسەرهاتەکەدا کەرامەتی حەلاجیی وەك ئامرازێك بۆ رازیکردنی غەیرە دین( کە لێرە زەردەشتییە) بە ئایینی ئیسلام بەکار هێنراوە[٥٠٩].

ناواخنی بەسەرهاتەکە بۆ ئێمە مەسەلەیەك نییە، بەڵکو ئەوەی گرنگە گێڕانەوەیەتی نەلایەن ئیبن گەچەوە، کە دەشێ وەك بەرجەستەکردنەوەی حەلاج لە زەمینەی فیقهیدا بخوێنرێتەوە و گێڕانەوەی بەسەرهاتی کەسێکە، فەقیهی دینەوەر پێی وایە نابێ تێپەڕێنرێ و بە شاردراوەیی بمێنێتەوە.

هەرچۆنێك بێت لەوە ناچێ گرنگیدانی ئەو فەقیهە بە حەلاج هەر تەنها بە گێڕانەوەی ئەو بەسەرهاتە بوەستێ، بەڵام لەبەر فەوتانی بەرهەمەکانی ناتوانین تەواوی هەڵوێستەکەی لە حەلاج بخوێنینەوە، هەر بۆیە بەسەرهاتەکە وەك تاکە هەڵوێست و تێگەیشتنی ئەو زانایە لەو سۆفییە دەمێنێتەوە. بەڵام خۆ هەر تەنها گێڕانەوەی بەسەرهاتەکە خاڵێکی گرنگمان بۆ روونەکاتەوە ئەویش بریتییە لە بوژاندنەوەی باسی حەلاج لە پانتایی ئیسلامیدا، چونکە وەك دەزانین هێنانەوەی وتەکانی ئەو سۆفییە و باسکردنی — هەر لەدوای لە داردانییەوە — چوونە خانەی حەرامکراوەکانەوە؛ کتێبەکانی قەدەغەکران و کتێبفرۆشان ( الورّاقون) سوێند دران ئەو کتێبانە نەکڕن و نەفرۆشن[٥١٠]، ئیدی ئەگەر کەسێك متمانەی تەواوی بەخۆی و بەو زەمینەی تێیدا دەژیا نەبووایە و باوەڕی بە تێگەی حەلاجییانە نەکردایە ئەو کارەی نەدەکرد، بەتایبەتیش فەقیهێکی بەندی نێو شەریعەت، شەریعەتێك کە لەمێژ نەبوو حەلاجی بەو چارەنووسە گەیاندبوو. بۆیە گێڕانەوەکەی ئیبن گەچ هەم بەخشینەوەی پێگەی پەراوێزخراوی حەلاج و هەمیش هەنگاوێکی جەربەزەیە بۆ قەبولکردنەوەی لە گوتاری فیقهی ئیسلامیدا، بە تایبەت لەلایەن شافعیەکانەوە.

---

(٥٠٨) الذهبي: تاريخ الإسلام, ج٣٢, ص٧٤.

(٥٠٩) بۆ دەقی تەواوی بەسەرهاتەکە بگەڕێوە بۆ: القزويني: آثار البلاد, ص ١٦٥.

(٥١٠) مسكويه: تجارب, ج٥, ص١٣٩.

بێگومان ئەگەر بمانەوێ بە وردی لە هەڵوێستی فەقیهی دینەوەر تێبگەین، ئەوا دەشێ بە هەڵوێستی گشتی شافعییەکان لەو سۆفییەی ببەستینەوە، چونکە وەك دەزانین گەورە زاناکانیان هەر لەسەرەدەمی حەلاجەوە، بەتایبەت دوای گرتنی و هاتنە گۆڕێی پرسی دادگایی و لەداردانی، نەرمییان نواندووە. ڕەنگە ڕوونترین هەڵوێستی شافعییەکانیش هی قازی و فەقیهی دیار ئەبولعەباس ئیبن سورەیج بێت ، کە ڕازی نەبووە لە دادگاییکردنەکەی بەشداری بکات، بە بەهانەی ئەوەی سروشتی سۆفییانەی حەلاج لەدەرەوەی پسپۆڕی دادوەرانە کە ناتوانن جیاکاری لە نێوان دەروونەکان بکەن[٥١١]. بۆچوونەکانی ئەو زانا شافعییە لە دوای خۆی هەژمونی بەسەر فیقهی شافعیدا کردووە[٥١٢]، هەڵوێستەکەشی تا سەردەمانێکی درەنگ قەبولکراوە[٥١٣]. بۆیە چاوەڕێی ئەوە دەکرێ کاریگەریی بەسەر ئیبن گەچەوە هەبووبێ، بە تایبەت کە ئەوە دەزانین لە پەیڕەو و شاگردانی قوتابخانەی فیقهی ئیبن سورەیج نزیك بووە[٥١٤]، بۆیە بێگومان ئاگاداری هەڵوێستەکەی بووە، ئەگەر ئەویش ئاوا حەلاج دێنێتەوە نێو باسەکانەوە، ئەوە دیارە لەسەر هەمان ئەو هێڵە دەڕوا کە ئیبن سورەیج بەسەریدا ڕۆیشتووە.

دواجار خاڵێکی تری ئەو گێڕانەوەیە، نەك هەر تەنها بریتییە لە ئاشناکردنەوەی حەلاج بە ناوەندی فیقهییەوە، بەڵکو ئیشەکە لە چوارچێوەی ڕێبازێکدا دەکرێ کە لێرە بەدواوە دەبێتە ڕێبازی پەیڕەوکراوی زۆرینەی ئەو خەڵکەی فەقیه لە نێویاندا دەژیا، بێگومان ئەو خۆشی، وەك یەکێك لە "سەرەکانی" ڕێبازەکە، ڕۆڵی لە بڵاوبوونەوەی هەبووە. بەمەش حەلاج چیدی وەك تەنێکی نامۆ و ڕەمزێك بۆ دەرچوون لە تێگەیشتنی شەرعییانە نامێنێتەوە، بەڵکو — لەگەڵ بەردەوامیێتی هێزی سۆفیگەری لە ناوچەکەدا — زەمینە لەبار دەبێ بۆ هێشتنەوەی و بردنی بە نێو پرۆسەی وێناکردنەوە و جێکردنەوەی، وەك دیاردەیەکی سۆفیگەری — ئایینی، لە چوارچێوەی ئەو سیستەمە کولتووریەی لە زەمینە کۆمەڵایەتییەکەدا باوەڕ بەرهەم دەهێنێ.

---

(٥١١) لەبارەی بۆچوونی ئەو فەقیهە بڕوانە: الأسفراييني: التبصير, ص١٣٣. البغدادي: الفرق, ص٢٤٧. ابن الجوزي: تلبيس ابليس, ص٢٠٠. لويس ماسينيون: المنحنى الشخصي, ص١٣٦.

(٥١٢) الشيرازي: طبقات الفقهاء, ص٥٤.

(٥١٣) لويس ماسينيون: المنحنى الشخصي, ص١٣٦.

(٥١٤) الشيرازي: طبقات الفقهاء, ص١١٣, ١١٨-١١٩.

**٢ - ڕەوتی دژە حەلاجیی:**

**دژایەتیکردنی حەلاجییەکان لە دینەوەر:**

لە شاری دینەوەر ڕەوتێکی دژە حەلاجی لە ئارادابوو، ئەگەرچی قەوارەی ئەم ڕەوتە بەتەواوی دیار نییە، بەڵام بە لەبەرچاوگرتنی سۆفییانی سەر بەڕەوتەکە دەتوانین بڵێین هەژموونی بەسەر هەر ڕەوتێکی تردا هەبووە کە ویستبێتی هەڵوێستێکی ڕوون و لاگیرانەی لە حەلاج هەبێ. هەرچۆنێك بێت زیاد لەپاڵنەرێك هەبوو بۆ سەرهەڵدان و گەڵاڵەبوونی ڕەوتی دژە حەلاجی؛ بەر لەهەموو شتێك بونیادی فیقهی شار هاندەرێکی باش بووە بۆ ئەم کارە، ئەگەر تازە گوتمان شافعییەکان لەبەرامبەر بە حەلاجدا نەرمیان نواندووە، ئەوا ڕێبازە فیقهییەکانی تری ئەوێ هەمان هەڵوێستییان نەبووە، بەتایبەتیش — وەك پێشتر بینیمان — لایەنگرانی ڕێبازی باڵادەستی "سوفیانیی"، کە وەك باسی لێوەدەکرێ، بە گشتی بە پارێزی و بەدگومانییەوە تەماشای حەلاجیان دەکرد[٥١٥]، بێگومان ئەم هەڵوێستەش لەسەنتەرێکی سەرەکی ڕێبازەکە کە دینەوەرە، چ لە ئاستی فیقهی یانیش لە ئاستی سۆفیگەری پەیوەست بەشەریعەتەوە، ڕەنگدانەوەی هەبووە، چونکە ڕێبازەکە دارێژەری هەڵوێستی ئایینیانەوە و پێوەریان دەبێ لە خوێندنەوەی هەر دیاردەیەکی وەك دیاردەی حەلاجی. لەلایەکی ترەوە پابەندبوونی پتەو و پەیوەندیی سیستەمەتیکانەی چەند سۆفییەکی شارەکە بە گەورە سۆفییانی نەیار بە حەلاج، بەتایبەت بە جونەید، پاڵنەرێکی تری دژایەتی دەبێ لە شارەکەدا.

ڕەنگە دیارترین ڕووبەڕووبوونەوەی پەیڕەوکارانی ڕەوتەکە هی ئەبوبەکری کوڕی مەمشادی دینەوەری بێ؛ لەو کاتەی ئەو جێنشینی باوکێتی لە شاردا و حەلاجیش لە بەغداد لە زینداندایە، بەڵام هەر بەردەوامە لە هەناردنی پەیام و بانگەوازکردن، یەکێك لەو پەیامانەی بەلایەنگرێکی بۆ دینەوەری دەنێرێ، بەڵام — وەك ئەبوبەکر دەیگێڕێتەوە — ئەو کەسە گیراوە و بەخۆی و پەیامەکەی ڕەوانەی بەغداد دەکرێ، لەوێشدا وەك بەڵگەیەکی بەهێز بۆ تاوانبارکردنی حەلاج بە بانگەشەی خودایەتی بەکاردەهێنرێ[٥١٦].

---

(٥١٥) لویس ماسینیون: آلام الحلاج, ج١, ص٢٣٤.

(٥١٦) الخطيب البغدادي: أخبار الصوفية, ص١٥٣. ابن الجوزي: تلبيس ابليس, ص ١٩٨ .ابن حجر: لسان الميزان, ج٢, ٣١٤. الحنبلي: شذرات, ج٢, ص٢٥٧.

بەپێی بەسەرهاتەکە بێ کارەکەی ئەبوبەکری کوڕی مەمشاد زێتر ڕەنگدانەوەی پابەندیی ئەو کەسەیە بە بڕیاری سیاسی — فیقهی ناوەندەوە و کەمتر خوێندنەوەیەکی هزریی ڕەوتەکەیە؛ بەدەستەوەدانی ئەو کەسە حەلاجییەش سنوورێك دادەنێ بۆ هەر هەوڵێك لەدەرەوەی ڕەوتی ڕێگەپێدراوی سۆفیگەری کار بۆ دامەزراندنی تێگەیشتنێکی نوێی هزرەکە لەپانتایی شاردا بکات، ئیدی با شار مەڵبەندی هەرە سەرەکی سۆفییان بێت بەڵام سنوورێك هەیە بۆ سۆفیبوون لایەنی کەم لە ڕووی چییەتی هزرەکەوە.

بەدەر لەو هەڵوێستە، دیار نییە کە پەیوەندییەکانی گرۆی کوڕەکەی مەمشاد بە حەلاجییەکان — دینەوەری بن یان نا — بۆ ئاستی هزریی گوازرابێتەوە، هیچ رایەکی ئەوانمان لەبەردەستدا نییە گفتوگۆیەکی ڕاستەوخۆی حەلاجیەتی کردبێ، ئەبوبەکریش بەدەگمەن نەبێ لە نێو سەرچاوە سۆفییەکاندا دەرناکەوێ و کەمترین وتە و تێزی سۆفییانەی خراونەتە ڕوو. لەگەڵ ئەوەشدا ناتوانین ئەگەری هەبوونی ئەم تەرزە لە گفتوگۆ ڕەتبکەینەوە؛ خۆ قسەکردنی ئەم سۆفییەی دینەوەر لەسەر مەقامی پشتبەستنی سۆفی بە خودا، ئەوەی کە - بە دەستەواژەی سۆفییانە - "تەوەکول - التوکل"ی پێدەگوترێ و یەکێکە لەو چەمکانەی هەندێك لە گەورە سۆفییان لە گەڵ حەلاج مشتومڕیان لەسەر هەبووە، دەشێ وەك دەرکەوتەیەکی گفتوگۆکەی ببینین، لە وتەکەیدا ئەبوبەکر جەخت لەسەر گرنگی ئەم مەقامە و پێویستیی لێ وردبوونەوەی، لە پێناو پشتبەستنی دروست بە خودا، دەکات. تەوەکولیش وەك ڕازێکی نێوان خوداو مرۆڤ دەخاتەڕوو، ئەگەر ئەو مرۆڤە تەواو پابەندی مەقامەکە نەبێت ئەوا خودا نابێتە تاکە پشتوپەنای[٥١٧]. کەچی پێشتر حەلاج — وەك کەمێکی تر بە درێژی ڕوونی دەکەینەوە — بەکەم تەماشای ئەو مەقامە دەکات و ئەو بەهایەی پێ نەبەخشیوە کە کوڕەکەی مەمشاد پێی دەدا، لای وی پەیوەندیی مرۆڤ بە خودا لە سنووری پشتبەستن ڕاناوەستێ و دەیباتە ئاستێکی باڵاترەوە کە "حلول"ە، ئەمە ڕێك لەو پەیامەی بەدەستی موریدەکەی گیرا ڕەنگدانەوەی هەیە و ئەبوبەکریش پێی ڕازی نەبوو.

بەهەر حاڵ دەشێ ئەمەی گوتمان وەك جیاوازی ڕەوتی دژە حەلاجی لە دینەوەر بخوێنرێتەوە، ئەگەرچی ناتوانین بیسەلمێنین تێڕوانینەکەی کوڕی مەمشاد وەك پەرچەکردارێکی

---

(٥١٧) السلمي: جوامع آداب الصوفية, ص١٩.

بۆچوونەکەی حەلاج بووە، بۆیە تەنیا وەك دوو رای جیاواز لە خوێندنـەوەی پەیوەنـدیی نێـوان مرۆڤ و خودادا لە نێو کولتووری سۆفیگەریدا دەمێنێتەوە.

## ئیبراهیمی کوڕی شەیبانی کرماشانی و خوێندنەوەی بـۆ تێگەیـشتنی حەلاجییانـە لـە سۆفیگەری:

لە سۆفییانی پانتایی کوردی، کەسێك کـە هـەوڵی دابـێ لـە نێـو رەوت و قوتابخانـە جیاوازەکانی سۆفیگەریدا پێگەی هەبێ و هەڵوێستێکی روون لە دووتوێی تێگەشتنێکی وردی هزرەکە دابڕێژێ، سۆفی کرماشان ئیبراهیمی کوڕی شەیبانە.

بەشێوەیەکی شتی هزری کرماشانی بـە ئاسـانی خـۆی بەدەسـتەوە نـادات، جـا چ لەبـەر ئاڵۆزکاوی هزرەکەوە بێت یانیش بەهۆی پەرش و بڵاوی تێزەکانی لە نێو کتێبە سـۆفییەکاندا، لەگەڵ ئەوەشدا بۆ تێگەیشتنی دروستی تەصەوفی ئەو، دەبـێ لـە دوو خـاڵی گرنگـەوە بـۆی بـچین، یەکـەمیان پەیوەسـتە بـە چـییەتی کایەکـە لـە هەڵـسوکەوت و پەیوەندییـە نێوخۆییەکانییەوە، وەك لە بەشی پێشوو قسەمان لەسەر کرد، دووەمینیشیان هێـشتنەوەیەتی لە سنووری باوەڕی ئایینی باو لە میانەی بەرپەرچدانەوەی هـەر رەوتێکـی ئـایینی نـاجۆر و ناباو، سۆفییانە بێت یان هیتر. ئەوانەی ناسیویانە زۆر جەخت لەسەر ئەو بۆچوونەی دەکەنـەوە و رایدەگـەینن: ((تونـد بـووە لەسـەر بانگەشـەکاران و پەیوەسـت بـووە بـە کتێـب و سوننەتەوە))[518].

هەربۆیە ئەگەر بمانەوێ لە هەڵوێستی ئەو سۆفییە لە رەوتەکانی سۆفیگەری بە گشتی، بە تایبەت رەوتی حەلاجی بگەین، دەبێ لەو جیهانبینییە ئایینییەوە دەست پـێ بکـەین و ئـەو پەیوەندییە دەستنیشان بکەین کە لە نێوان حەقیقەتی سۆفییانە و شـەریعەتدا دەیبینـێ، بـە دەستەواژەیەکی دی دەبێ ئاگاداری خوێندنەوەی کرماشـانی بـۆ هاوکێـشەی "سـۆفیگەری = حەقیقەت" لە سنووری "فیقهـ = شەریعەت" بین، ئەوەی لـە سـەربوردەی هـزری وی رابمێنـێ برێك لە وردەکارییەکانی ئەو خوێندنەوەیە دەبینێ.

بەر لەهەموو شتێك وادیارە کرماشانی پەیوەندیی راستەوخۆی بە خانەی فیقهی سەردەمی خۆی هەبووە، هەرچەندە شتێك لەسەر ئەو رێبازە فیقهیە نازانین کە پەیرەوی لێکردووە، بـەڵام

---

(٥١٨) السلمي: طبقات, ص٤٠٢. ابن خميس: مناقب, ج٢, ص١١٧.

ئەوە دەزانین بـەینی لەگـەڵ فەقیهـە شـافعییەکان بـاش بـووە؛ هەنـدێك لـەوان فـەرموودەی پێغەمبەر و هەندێکیشیان وتەکانی خۆی لیّ دەگێڕنەوە، ئـەویش بـۆ دڵنیـا بـوون لـە چـەند مەسەلەیەك هانا بۆ زاناکانی ڕێبازەکە دەبات[٥١٩]. ئەو پابەندییە فیقهییە لە هەڵـسوکەوتیدا ڕەنگی داوەتەوە، وا باسی دەکریّ کەوا خاوەن ئیلتزامێکی ئایینی پتەو بووە؛ ئەوەتا لە وڵاتی شامدا چۆتە نێو دوکانی شەراب فرۆشێك و لێی ڕشتووە، لەسەر ئەو کـارە گـیراوە و لەلایـەن دەسەڵاتدارانەوە جەڵد کراوە[٥٢٠]. هەر ئەمـەش وای کـردووە، لـە گوتـاری فیقهیـدا، بخرێتـە دەرەوەی سنووری تەسکی حوکمی سۆفیبوون و تا درەنگانێك، ببێتە ڕەمزێکی سۆفی دروسـت و پابەند[٥٢١].

کرماشانی لەچوارچێوەی سنووره شەرعییەکانەوە سۆفیگەری خۆی بەیان دەکات و تەواوی هزرەکەی پیّ هەڵدەسەنگێنیّ، پێی وایە سۆفی ڕاست هەر بەوە نابێت پەیڕەوی لـە ڕێـساکانی سۆفیبوون "حەقیقەت" بکات، بەڵکو دەبیّ لە بنەما فیقهییەکانیش"شەریعەت" تێگەیشتوو و لێهاتوو بیّ، چونکە حەقیقەت بیّ شەریعەت مانای تەواوی نابـیّ، ئەمـە بـیّ ئـەوەی "بـیّ مانایی" حەقیقەت لە هزری ویدا بگەیەنیّ[٥٢٢]، ئەوەنەبیّ کە دەبیّ سـۆفیبوون ڕەنگدانـەوەی قووڵبوونەوە لە زانستە شەرعییەکان بێت.

ئەمە هەڵوێستی ئەو سۆفییە لە هەر دەرکەوتنێکی نابـاوی سـۆفیگەری دیـاری کـردووە، ڕەنگە دەستپێکی ئەو هەڵوێست وەرگرتنەش لەبەرامبەر بە هزری ئەبویـەکری شـبلی بووبـیّ، لەسـەرەتای ناسینی ئەو سۆفییەوە و تا ئەو کاتەی خۆی لە ڕووی فیقهیەوە تاقی نەکردۆتەوە و لە شارەزابوونی دڵنیا نەبووە، نەهی کردووە لە چـوونە لای و گـویّ لیّ گرتنـی[٥٢٣]. ئەمـەش

---

(٥١٩) الـسلمي: طبقـات, ص٤٠٢-٤٠٣. القـشيري: الرسـالة, ص١١٢. الأنـصاري: طبقـات الـصوفية, ص٤٤٧. ابن الساعي: أخبار الحلاج, ص١٠٢. الذهبي: سير أعلام, ج١٥, ص١٩٢.

(٥٢٠) القشيري: الرسالة, ص٢٦٧. فريد الدين عطار: تذكرة, ج٢, ص٢١٤. الـشعراني: الأنـوار القدسـية في معرفة قواعد الصوفية, دار المعرفة, بيروت, ٢٠٠٦, ص٤٢-٤٣.

(٥٢١) هەر بۆ نموونە بڕوانە: الشاطبي: الإعتصام, ضبطه و صححه: احمد عبد الـشافي, دار الكتـب العلميـة, بيروت, ١٩٨٨, ج١, ص٦٩.

(٥٢٢) ابن خميـس: مناقب, ج٢, ص١١٨.

(٥٢٣) السراج: اللمع, ص٢١٠.

بەڵگەیە لەسەر ئەوەی لای کرماشانی شەریعەت روونکردنەوەی حەقیقەتە، ئەگەر وانەبێ دەشێ سۆفی بە شتێك بگات حەقیقەت بێ یان شێواوی حەقیقەت و جۆرێك لە بانگەشەکاری بێت، وەك لە خوێندنەوەی ئەزموونی حەلاجی بەو ئاکامە دەگات.

هەرچۆنێك بێت، کرماشانی لە دوو ئاستی جیاوازدا حەلاجی هەڵسەنگاندووە، ئاستی هەڵسوکەوت و ستراتیژییەتی بەرجەستەکردنی حاڵی سۆفییانە لە کەسێتییەکەیدا، لەگەڵ ئاستی بیرکردنەوە و دارشتنی هزریدا، بەم شێوەیە:

### ١- هەڵوێستی کرماشانی لە حاڵی حەلاج:

لە خوێندنەوەی حاڵی حەلاج ئەو خۆی لە سێ چرکەساتی جودادا حەلاج دەبینێ؛ سێ قۆناغی دەرکەوتنی حەلاج کە گەشەسەندنی هەڵوێستی سۆفییانەی کرماشانیمان بۆ دەخاتە روو و هاوکارمانە لە قەبووڵکردنی بینینی رەخنەییانەی ئەو بۆ تێزە سۆفییەکانی لە ناوکۆی هزری سۆفیگەریی ئیسلامیدا.

رەنگە ساتی یەکەمی رووبەڕووبوونەوەی کرماشانی لەگەڵ ئەو حاڵە، ئاستی بینینی حەلاج بێت و سەرەدەری بێت لەگەڵ کەسێکدا کە "حال"ی وەك حاڵی باوی سۆفییانە نییە، لێرەدا هێشتا کرماشانی نەبۆتە ئەو سۆفییە پێگەیشتووە تا بتوانێ بەخۆی لەم کەسە تێبگات، بەڵکو موریدێکی شێخەکەیەتی و بە پشتبەستن بە هەڵوێستی شێخەوە لە حەلاج دەڕوانێ، ئەمەش قۆناغی گەڕانییەتی لەگەڵ شێخەکەی ئەبو عەبدوڵڵای مەغریبی؛ لەوکاتەی لە شاری مەککە دەبن پێیان دەگوترێ حەلاج لەسەر چیایەکی ئەوێیە، ئەوانیش بۆ بینینی سەردەکەون، کرماشانی لەمەڕ ئەم دیدەنییە دەبێژێ: (( لە هەیوانی  خانووەکەی لەسەر بەردێك و لەبەر رۆژ دانیشتبوو، ئارەقەی لێ دەتکایە سەر بەردەکە، کە مەغربی تەماشای کرد، بەدەست ئاماژەی بۆ کردین کە بگەڕێینەوە، چووینەوە مزگەوت، لەوێ ئەبو عەبدوڵڵا پێی گوتم: ئەگەر بژی دەبینی ئەوە چی بەسەر دێت، ئاوا بە گێلی رۆنیشتووە و لەگەڵ خودادا سەبر دەگرێ. پرسیمان ئەو کەسە کێیە؟ گوتیان حەلاجە)) [٥٢٤].

ئەو بەسەرهاتە پێمان دەڵێ یەکەمین بینینی کرماشانی بۆ حەلاج هەستەکییە و لەدەرەوەی هەڵوێستی خۆیەتی، بەڵام کاریگەرە لەسەر هەر هەڵوێست وەرگرتنێکی دواتری

(٥٢٤) الخطيب البغدادي: أخبار الصوفية. ص١٤٦. الذهبي: سير أعلام, ج١٤, ص٣١٧.

ئیبراهیم، چونکە ئـەو – وەك پێـشتریش ئاماژەمـان پێـدا - زۆر نزیکـی ئـەبو عەبـدوڵڵای مەغریبی بووە، بۆیە بێگومان کاریگەریی بەسـەر هـەبووە. کـاتێکیش کرماشـانی قۆنـاغی موریدی دەبڕێ و وەك سۆفییەك، بەڵکو گەورە سۆفییەکی سەردەمەکەی، جارێکی تـر ناچـار دەبێ هەڵوێستی هەبێت، کە دەشێ ئەمەش بە قۆناغی دووەمی هەڵسەنگاندنی حاڵی حەلاجی ناوزەد بکەین، ئەویش قۆناغی گەڕانە بەدوای حەقیقەتی ئەو سۆفییە. لێرەدا حەلاج گیراوە و هەرایەکی گەورەی لە ناوەندی ئایینی بە گشتی و ئەلقـەی سـۆفییان بـە تایبـەتی ناوەتـەوە. کرماشانی خۆی لەبەردەم دوو هەڵوێستدا دەبینێتەوە: هەڵوێستێکی شەرعی لەمەڕ سەرەدەری و دادگایی کردنی کەسێك پابەندی بنەماکان نابێ و بە ئاشکرا پێشێلیان دەکـات، دووەمـیش سۆفییەك کە خاوەن بۆچوونی خۆیەتی، ئەگەر جۆرێك لە جیاوازی پێوە دیـارە و خوێندنـەوەی رەخنەییمان بۆی هەیە مانای ئەوە نییە بەمجۆرە مامەڵەی لەگەڵدا بکەین. لەوەدەچێ ئـەو دوو هەڵوێستییە، بەتایبەت دوای ئەوەی هەندێك لە گەورە سـۆفییان بـە ئاشـکرا دژایـەتیان بـۆ حەلاج رادەگەیـەنن وەك عـەمرو کـوڕی عـوثمـانی مـەککی (م٢٩٧ك/ ٩١٠ز)، و لەسـەرووی ئەوانیشەوە جونەیـد[٥٢٥]، کرماشـانی تووشـی جۆرێـك لـە دوودڵـی کـردووە، وایلێکـردووە لەسەرووی جیاوازییە هزرییەکان و دژە بۆچوونی بۆ هەندێك لە تێزە بنەڕەتیەکانی حەلاجـەوە، لەودیو رەوایی و ناڕەوایی ئەو مامەڵەیەی لەگەڵ حەلاجدا دەکرێ، بـەدوای راسـتیدا بگـەڕێ. لەمبارەوە دەقێك لەبەردەستە، ئەویش ئەوەیە کە کرماشانی چۆتە لای گەورە فەقیهی شافعی لە بەغدا، کە لە ناوەندی سۆفیگەریشدا ئامادەیی هەیە، ئـەویش هـەر ئەبولعەباسـی کـوڕی سورەیجە کە پێشتر ئاماژەمان بۆ هەڵوێستی ئەرێنییانەی لە حەلاج کرد، پێدەچـی کرماشـانی لەو رۆژەی فەتوای کوشتنی حەلاج دراوە، چۆتە لای ئەو فەقیهە و پرسی فەتواکەی لێکردووە، ئەویش بە ناڕەوای داناوە و رەتی کردۆتەوە[٥٢٦].

دواجار چارەنوسی حەلاج لەداردان دەبێت، کە ئەمەش هەژانێکی گەورەی گەلی سۆفییانە، لەگەڵی بووبن یان دژی، بۆیـە دەبـووا خوێندنـەوەی خۆیـان بـۆ ئـەو چارەنووسـە هەبووایـە، کرماشانی یەکێك بووە لەمانە، کە تا ئاستی بەرهەمهێنانی گوتار لێی ورد بۆتەوە، گوتارێك کە دەشێ هەمەگیرانە ناڕاستەی ئەوانە بکرێ وەك حەلاجن یاخود بیرکردنەوەی حەلاجییانەیان

---

(٥٢٥) الأسفراييني: التبصير, ص١٣٣.

(٥٢٦) ابن الساعي: أخبار الحلاج, ص١٠٢.

هەیە، لەو هەڵوێستەی کرماشانی تەنیا وتەیەکی گرنگمان لەبەردەستدا ماوە، کە هەم هەڵسەنگاندنی ئەزموونی عیرفانی حەلاجە و هەمیش پێشنیارکردن و دەستنیشانکردنی ڕێبازێکی ترە بۆ هەر ئەزموونێکی عیرفانی بیەوێ بەهەمان ئاراستەی حەلاجدا نەڕوا و هەمان چارەنووسی نەبێ. وتەکە بە شێوازی ئاگادارکردنەوەیە و لە چوارچێوەی چەمکێکی گرنگی سۆفییانە خراوەتەڕوو، ئەویش "بانگەشەکاریی - الإدعاء"ە؛ کرماشانی دەڵێ: ((دووركەونەوە لە بانگەشەکاری، ئەوەی بیەوێ بەرهەمی بانگەشەکردن ببینێ با تەماشای حەلاج و چارەنووسی بکات))[٥٢٧]، لەڕیوایەتێکی تریشدا وتەکە زیادەی هەیە کە دەڵێ: ((لەوکاتەوەی ئیبلیس گوتی من لەو باشترم، بانگەشە و نەیارێتی شوومە بۆ نەربابەکانی))[٥٢٨].

بۆ تێگەیشتن لەو بۆچوونە دەبێ بیخەینە ناوکۆی هزری سۆفیگەرییەوە، لەوێدا دەزانین کرماشانی "بانگەشەکردن" لە چوارچێوەی سنووری شەرعییەکان دەبینێ، بانگەشەیەك کە وا دەناسرێ جۆرێکە لە بێشەرمی و بێڕێزیی و زێدەڕۆیی لە ئاخافتندا[٥٢٩]. ئەگەرچی کرماشانی لەدەقەکەی خۆیدا دەستنیشانی چییەتی بانگەشەکردنی حەلاجییانەی نەکردووە و بەڕوونی مانای چەمکەکەی ڕانەگەیاندووە، بەڵام لە شوێنێکی تردا ئەو مانایەی ئاشکرا کردووە کاتێ ڕایدەگەیەنێ ئەو کەسە تووشی بانگەشەکاری درۆزنانە دەبێ کە دەستی لە حورمەتی شێخەکانی هەڵگرتبێ[٥٣٠]، واتا پابەند نەبوونی بە سیستەمی سۆفییانە کە خۆی لە پلەبەندییەکی ئایینی تۆکمە و پیرۆزکراوەوە دەبینێتەوە، کە دەرچوون لێی وادەکات سۆفی بخرێتە دەرەوەی سیستەمەکەوە. هەر ئەو پابەند نەبوونەش بە سیستەمی کارپێکراو کرماشانی بەو ئاراستەیە دەبات حاڵی حەلاج بە حاڵی ئیبلیس بچوێنێ، هەر بۆیە ڕەخنەگرتنی ئەو لە حەلاج پەیوەستکراوە بە ڕەخنەگرتن لە ئیبلیس کە لە تێڕوانینی ئەودا وەك یەکەمین بانگەشەکارێك چاوی لێ دەکرێ، بەتایبەت کاتێك چاکتر بوونی خۆی لە مرۆڤ بە خودا

(٥٢٧) ابن الساعي: أخبار الحلاج,ص١٠١.

(٥٢٨) الخطيب البغدادي: أخبار الصوفية, ص١٤٧.

(٥٢٩) القشيري: منشور الخطاب, ص٩٩.

(٥٣٠) الشعراني: الطبقات, ص١٧٠.

رادەگەیەنێ، ئاکامی ئەو بانگەشە کردنەش — وەك لە کولتووری ئیسلامیدا بە روونی خراوەتە روو — بە نەفرەت کردنی بووە.

بۆ روونبوونەوەی زیاتری بابەتەکە، هانا بۆ بیروبۆچوونی حەلاج لە کتێبی "الطواسین" دەبەین، ئەو رێك لەو بابەتە دەدوێ، بە ئاشکرا رایگەیاندووە کە خۆی وەك ئیبلیس بانگەشەکارە، بەڵام بێگومان بە تێگەیشتنێکی تەواو جیاواز لەوەی کرماشانی، بەڕای حەلاج کاتێ، ئیبلیس رایدەگەیەنێ لە ئادەم باشترە و جگە لە خودا سوژدە بۆ هیچی تر نابات، ئیدی بەمە لە ئەهلی ئاسمانە و لەو یەکتاپەرستتر نییە، ئەمەش بانگەشەیەکی دروستە[٥٣١]، لە بەرامبەردا بانگەشەی حەلاجیی بریتی دەبێ لەوەی "مـن خـودام - انـا الحـق" و — وەك لە سەرەتاوە بەدیار کەوت - بانگەوازی تێکەڵ بوونی زاتی مرۆڤانەی لەگەڵ زاتی خودایی جار دەدا، بێ ئەوەی لەو چارەنووسە بترسێ کە دەشێ لە ئاکامی بانگەشەکەی پێی بگات[٥٣٢]، واتا بەڕای ئەو بانگەشە پەیوەست بوونە بە گوتنی راستی تەنانەت ئەگەر لەبەرامبەر خوداشەوە بێت، کەچی کرماشانی ئەمە وەك حاڵەتێکی نادروست دەبینێ. بەمەش لەبەردەم دوو ئاستی قەسەکردنین لەسەر یەك تێز کە بانگەشەکردنە، ئەوەی کرماشانی دوانە لەسەر بەرهەم و ئاکامی تێزەکە نەك چییەتییەکەی، بۆیە لای ئەو بینینی حاڵی هەریەك لە ئیبلیس و حەلاج وامان لێ دەکات - بێ پرسی چییەتی - لە بانگەشەکاریی دوور بکەوینەوە، چونکە لە هەردوو حاڵەتدا ئاکامی شوومە، خۆ دواجار ئیبلیس بەنەفرەت کرا و حەلاج لە دار درا.

## ٢- تێڕوانینی کرماشانی بۆ چەمکەکانی نێو هزری حەلاج:

رەخنەگرتنی کرماشانی لە حەلاج لە ئاستی بیروباوەڕەوە بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆیە، هیچ دەقێکی مێژوویيمان لەبەردەستدا نییە بیسەلمێنێ ئەو دوو سۆفییە رووبەڕوو قسەیان لەگەڵ یەك و لەسەر بۆچوونە سۆفییەکانی یەکتر کردبێ، بەڵام بێگومان ناوبانگی حەلاج و ئەو سەرکێشیەی لە بیرکردنەوەدا پێی ناسرابوو، وای لە کرماشانی کردووە لەو ئاستەشدا قسەی

---

(٥٣١) الطواسین, ص١٣. هەروەها بڕوانە: روزبهان بقلي: شرح شطحیات, ص ص٣٧٧-٣٨١. آنا ماري شیمل: أبعاد, ص٢٦٥.

(٥٣٢) الطواسین, ص١١٤. هەروەها بڕوانە:

Arberry: Sufism, p.60.

لەسەر بکات. بەتایبەت کە دەقێکی گرنگمان لەمەڕ هەڵوێستی حەلاج لە تێگەیشتنی هاوڕێیەکی نزیکی کرماشانی لە حاڵەتی سۆفییانە هەیە، ئەویش ئیبراهیمی خەواصە[533]، رەخنەی حەلاج لەو سۆفییە لەوەدایە کە نەیتوانییەوە لەنێو مەقام و حاڵە سۆفییەکاندا، لە مەقامی پشتبەستن بە خودا "تەوەکول" بپەڕێتەوە بۆ حاڵی "فەنابوون لە یەکتاپەرستی - الفناء في التوحيد"دا [534]. وەك دەزانرێ ئەو هاوڕێیەی کرماشانی لەتەوەکولدا یەکانەی سەردەمەکەی خۆی بوو، تەوەکول بۆتە بابەتی هەرە سەرکی بیرکردنەوەی و کتێبی تایبەتی لەسەر نوسیوە[535].خەواص پێی وابوو سۆفی لە چوارچێوەی ئەو مەقامەدا دەتوانێ پێناسەی پەیوەندیی خۆی بە خوداوە بکات، ئەو تەوەکولەی بە پلەی یەکەم پەیوەستە بە ئازاردانی جەستەیی وەك کەم خواردن و پشتکردن لە حەز و ئارەزووە دونیاییەکان[536]، کەچی حەلاج رازی نەبووە بەوەی ئەو مەقامە رێبازێك بێت بۆ رازیکردنی خودا بەڵکو دەبێ سۆفی بەتەواوی خۆی بداتە دەستی خوداوە، کە ئەمەش رێگای فەنابوونە[537]، وەك تۆزێکی تر باسی دەکەین.

ئەوەی لێرەدا گرنگە هەڵوێستی ئیبراهیمی کرماشانی یە لەو بەریەککەوتنە هزرییەدا، ئەگەرچی هەڵوێستەکە نادیارە، بەڵام بە وردبوونەوە لە تێگەیشتنی بۆ تەوەکول ناڕاستەوخۆ قسە لەسەر بەریەککەوتنەکە دەکات و ویستوویەتی سنووری بۆچوونی هەردوولا دەستنیشان بکات، ئەمەش لە رێگەی نیشاندانی ئەو پایەیەی ئەو و هاوڕێکەی و پەیڕەوکارانی رەوتەکەیان بە تەوەکولی دەدەن و بۆتە بەشێك لە بونیادی بیرکردنەوەی سۆفییانەیان، لەگەڵ ئەو حاڵەی حەلاج داوای لێ کردون پێی بگەن و رایگەیاندووە ئەوان هێشتا لێی دوورن کە فەنابوونە.

بە بۆچوونی کرماشانی تەوەکول: ((رازێکە لە نێوان بەندە و خودا دا، بۆیە ئەرکە — لەسەر بەندە — ئەو رازەی بۆ کەس ئاشکرا نەکات))[538]. بێگومان بە "راز"دانانی ئەو مەقامە

(٥٣٣) السلمي: طبقات, ص٤٠٢. القشيري: الرسالة, ص١١٢.

(٥٣٤) بۆ دەقی رەخنەکەی حەلاج بگەڕێوە بۆ: الهجويري: كشف, ج٢, ص٤٣٦.

(٥٣٥) السلمي: المقدمة, ص٣٩. منصور بن اردشير عبادي: مناقب, ص٩٧.

(٥٣٦) الخركوشي: تهذيب, ص١١٣. السلمي: المقدمة, ص٣٩.

(٥٣٧) لويس ماسينيون: آلام الحلاج, ج١, ص١٣٧.

(٥٣٨) السلمي: المقدمة, ص٣٩. فريد الدين عطار: تذكرة, ص٢١٥. ابن الملقن: طبقات, ص٥٠.

بەرزکردنەوەیەتی بۆ سەرووی ئەو پێناسانەی سۆفییان بۆیان دەکرد، هەروەها بەخشینی تایبەتمەندییەکی عیرفانییانەیە بە مەقامەکە و رایدەگەیەنێ ئەستەمە مرۆڤ بتوانێ پێی بگات، چونکە دواجار "راز" لە خەڵك پەنهانە و، بە دەستووری سۆفییان، تەنها خودا دەیزانێ[٥٣٩]، بۆیە دەشێ وەك بالآترین پایەی پەیوەندیی نێوان مرۆڤ و خودای ببینین و چاوەڕێی ئەوە نەکەین لەپشت ئەودا ئاستێکی تری پەیوەندیی هەبێت. کەچی لای حەلاج تەوەکول تاقیکردنەوەی تواناکانی مرۆڤە لە بەرگە گرتن، مانەوەش لەو مەقامەدا رەفتارێکی سۆفییانەیە نەك رازێکی خودایی، بۆیە رایدەگەیەنێ کەسێك بەڕاستی تەوەکولی کردبێ نابێ لە شارێکدا شتێك بخوات کە تیایدا کەسێکی لەو شایستەتر هەبێ بیخوا[٥٤٠]، کەواتە ئەگەر سۆفیبوون لە سنووری ئەو مەقامەدا بمێنێتەوە ئەوا دەستنیشانکردنی ئەو پانتاییەیە کە سۆفی دەتوانێ تیایدا پەیوەندیی خۆی بە "هەق" ببینێ، نەك رازێك پەیوەندییەکەمان لێ بشارێتەوە.

بەهەرحاڵ مانەوە لە مەقامی تەوەکول لای کرماشانی مانای ئەوە نییە قسەی لەسەر "فەنابوون"، کە حەلاج بانگەشەی بۆ دەکرد، نەبێ؛ بەڵکو دەیەوێ — رەنگە وەك رەخنەیەکیش بۆ تێگەیشتنی حەلاجییانە — بۆچوونی خۆی لەسەر بخاتە روو، تەنانەت دەشێ بڵێین دوان لەو چەمکە جومگەیەکی بنەڕەتی هەڵوێستە رەخنەییەکەی پێکدێنێ.

چەمکی "فەنابوون" لە هزری سۆفیگەریدا فرە مانایە، بەجۆرێك ئەوەی بخوازێ لە یەك پێناسەدا جێی بکاتەوە کورت دێنێ، لەگەڵ ئەوەشدا "فەنا" و "بەقا" بە دوو پایەی بنەڕەتی گەشەسەندنی سۆفی لە دالآنەکانی عیرفان دادەنرێن[٥٤١]. پێ دەچێ لە دەستپێکی بەکارهێنانی دوو چەمکەکەشدا زێتر مانایەکی رەوشتییانەیان پێ درابێت، هەر بۆیە فەنابوون بریتی دەبێ لە ونبوونی هەموو خەسڵەتێکی خراپ و پشتگوێ خستنی تەواوی ئارەزووە دونیاییەکان[٥٤٢]، کەواتە گەڕان بەدوای حاڵی فەنابوون گەڕانە بەدوای کۆمەڵێك بنەمای ئاکاریی، سۆفی دەتوانێ بەهۆیانەوە خۆی پێناسە بکات، کاتێکیش رەفتارە مرۆییەکان بایی

(٥٣٩) القشيري: عبارات الصوفية , ص٦٠.

(٥٤٠) ابن خميس: مناقب, ج٢, ص٧٧.

(541) F.Rahman: Baka wa Fana, EI,Vol.I,p.951.

(٥٤٢) القشيري: الرسالة, ص ١٤٦-١٤٧ .

ئەو پێناسەیە نابن سۆفی بەدوای خەسڵەت و ڕەفتاری سەروو مرۆڤانە دەگەڕێ، بۆیە فەنابوونی دەبەستێتەوە بە پەیوەندیی خۆی بە خوداوە بۆ دۆزینەوەی کۆمەڵێك ڕەفتاری خودایی و مانەوە بە هۆیانەوە، کە ئەمەش حاڵی بەقایە[٥٤٣]، لێرەوە ئاسایی دەبێ حاڵەکان وونبوون و بێ ویستیی مرۆڤ بێ لەبەردەم ئامادەیی و ویستی ڕەهای خودایی.

بەدەر لەم تێگەیشتنە دوانی سۆفییان لەسەر فەنابوون دوانە لەسەر بار و پایەکانی، کە لەمەشدا گەلی سۆفییان بە ڕەوتی جیاواز و دژ بەیەکدا رۆیشتوون؛ هەندێکیان فەنابوون لەسنووری شەریعەتدا دەخوێننەوە و پیادەی دەکەن، وەك لەتەسەوفی سوننەگەرادا دیارە[٥٤٤] و کرماشانی لەمەڕخۆشمان سەر بەم ڕەوتەیە، کەسانێکیش دەیبەنە دەرەوەی ئەو سنوورە و تێکەڵی چەمکی تری دەکەن کە نە شەریعەت و نە سۆفییەکانی پابەند بە بنەماکانی قەبوڵی دەکەن، ئەمەش زێتر لەلای سۆفییانی بەغدادەوە دەبینرێ[٥٤٥]، کە بێگومان حەلاج نموونەی هەرە دیاریانە، بە تێگەیشتنی ئەم گرۆیەش لەدەستدانی خەسڵەت و تایبەتمەندیە مرۆییەکان دەروازەیەکە بۆ بەرجەستەکردنی خودایەتی لەمرۆڤدا، وەك لە دەستپێکدا قسەمان لەسەری کرد.

لەبەرامبەردا بەرەی یەکەم کە کرماشانی یەکێك لە ڕەمزەکانییەتی، پێیان وایە دەبێ فەنابوون لەچوارچێوەی پەیوەندییەکی خودان مەرزی نێوان مرۆڤ و خودا بمێنێتەوە و بریتی دەبێ لە ناسینی خودا و بە تاك دانانی، ئەمە ڕێك لە پێناسەی ئیبراهیم بۆ "زانستی فەنا و بەقا" دەردەکەوێ ، کاتێك رایدەگەیەنێ ئەو زانستە:(( لەبارەی دڵسۆزی بۆ یەکتایی و ڕاستی بەندایەتی یە، هەر شتێکی تری جگە لەمە لەرێلادان و زەندەقەیە))[٥٤٦]. ئەم وتەی

---

(٥٤٣) الكلابادي: التعرف, ص٩٠-٩١.

(٥٤٤) ڕەنگە دیارترینیان جونەید بێت, لەمبارەوە بڕوانە: رسائل الجنيد, تحقيق: علي حسن عبد القادر, القاهرە, ١٩٨٨, ص ص٣٢-٣٧, بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: مجدي ابراهيم: التصوف السني- حال الفناء بين الجنيد والغزالي, مكتبة الثقافة الدينية, القاهرة, ٢٠٠٢, ص ص٢٨٣-٣٠١.

(٥٤٥) السراج: اللمع, ص٥٥٢.

(٥٤٦) (( علم الفناء و البقاء يدور على إخلاص الوحدانية و صحة العبودية, و ما كان غير هذا فهو المخاريق و الزندقة))؛ الخركوشي: تهذيب, ص٣٥٣. القشيري: الرسالة, ص١١٢.الأنصاري: طبقات الصوفية, ص٤٤٢. ابن عساكر: تاريخ, ج٦, ص٤٤٣. اليافعي: مرآة الجنان, ج٢, ص٢٤٣.

کرماشانی لە نێو کولتووری ئیسلامیدا بە ئاسانی تێنەپەڕێنراوە و پشتگوێ نەخراوە، بەڵکو چەند جارێك هەڵوەستەی لەسەر کراوە و وەك بەڵگەیەکی تێگەیشتنی دروستی فەنا و بەقا بەکارهێنراوە؛ لایەنی کەم دوو ڕاڤەی جیاوازی وتەکە لەبەردەست دایە، یەکێکیان هەر لە نێو بازنەی سۆفیگەریەوە لەلایەن هجوەیری بۆی کراوە[٥٤٧]، ئەویتریان درەنگتر لەدەرەوەی ئەو بازنەیەیە، لەلایەن زانای ناودار ذەهەبی(م ٧٤٨ك/ ١٣٤٧ز)یەوەیە[٥٤٨]، بەڵام ئەوەیان ڕووکەشیانەیە و وەك تانە لێدانێکی ساکاریی هزری سۆفیگەری لە دیدێکی شەرعی، بەکارهێنراوە و زۆر لەمانای دروستی وتەکەمان دوور دەخاتەوە.

هەرچۆنێك بێت وتەکە جۆرێك لە گشتگیری پێوە دیارە و هاوکارمان نابێت لە تێگەیشتنی بۆچوونی وردی ئەو لەسەر دوو چەمکەکە، چونکە ئەو لەڕووی چییەتیەوە باسیان ناکات ئەوەندەی دەستنیشانی ئەوە دەکات کە دەبێ چی نەبن، بێگومان سنووردار کردنیشیان بە دوو چەمکی تری وەك "یەکتایی" و "بەندایەتی" نەك هەر پێناسەیان ناکات بەڵکو جەخت لەسەر ئەو سنوورانە و پێویستی پاراستنیان دەکاتەوە، هەر بۆیە دەشێ بڵێین ئەو خوێندنەوەیەی فەنابوون سنووردانانە بۆ هەر کەسێك بیەوێ لەدەرەوەی یەکتاییەوە لە پەیوەندیی نێوان خۆی و خودا بگات، تێگەیشتنێك کە نابێ لەدەرەوەی بەندایەتی مرۆڤ بۆ خودا هیچ مانایەکی تری پێ ببەخشرێ، بۆیە ئەگەر فەنابوون بە لەدەستدانی خەسڵەت و تایبەتمەندیی مرۆڤانە لەبەرامبەر بەخودا لێکدەدرێتەوە، ئەوا بەمانای ئاوێزانی مرۆڤ بە خەسڵەت و تایبەتمەندییە خوداییەکان نایەت، وەك حەلاج بانگەشەی دەکرد. کرماشانی لەو بڕوایە بووە نابێ فەنابوون ئاوێزانبوونی زاتی مرۆڤانە بێ بە زاتی خودایی، بەڵکو دەبێ بە ڕوونی تخوبی نێوان زات و بابەت دیاربێ، خودێك کە کارەکەی یەکتاپەرستی و دروستی پابەند بوونە بەو کردەیە، لەگەڵ بابەتێك کە نابێ تێکەڵ بەو کردەیە بکرێ و ببێتە بەشێکی بەرجەستەکراو، چونکە هەر کارێکی لەمجۆرە دەرچوونە لە سادەترین پێناسەی یەکتاپەرستی و ئاساییە – وەك ئەو حوکمی لەسەر داوە – بچێتە خانەی زەندەقەوە.

خوێندنەوەی هجوەیری بۆ وتەکە لەوەی گوتمان نزیکە، پێی وایە هەر دەرچوونێك لەو تێگەیشتنەی فەنابوون نزیك بوونەوەیە لە تێگەیشتنی مەسیحییانەی پەیوەندیی نێوان

---

(٥٤٧) كشف المحجوب, ص٤٨٦. هەروەها بڕوانە: خواجە محمد پارسا: فصل الخطاب, ص٤٦-٤٧.

(٥٤٨) سير أعلام, ج١٥, ص٣٩٣.

خودایەتی و مرۆڤایەتی(لاهوت و ناسوت)، بۆیە دەڵێ ئەوەی کرماشانی مەبەستیەتی دانپیانانی "بەندە"یە بە یەکتایی خودا، مانای ملکەچی و گوێڕایەڵی بەندەیە بۆ بڕیاری خودایی، لێرەوە "ملکەچ – مرۆڤ" لە نێو سەرکەوتنی "باڵادەست – خودا" فەنا دەبێ، ئەوکاتە مرۆڤ هەست بە بێدەسەڵاتی خۆی دەکات و جگە لەبەندایەتی هیچی تری بۆ ناکرێ[549].

لەلایەکی ترەوە لە بۆچوونی سۆفییەکەی کرماشان دەردەکەوێ کەمتر فەنابوون ئەو مانا ڕەوشتییەی هەیە کە تەنانەت لە کولتووری سۆفیگەری فەرمی پێی بەخشراوە و وەك بینیمان جیاکاری بوو لە نێوان ڕەفتاری چاکە و خراپە[550]، بەڵکو تەنیا لە پەیوەندیی بە خوداپەرستییەوە خۆی بەیان دەکات، ئەگەر ڕەهەندێکی ڕەوشتیانەشی هەبێ، ئەوا بریتی دەبێ لە ڕەوشتی "خوداپەرستی" لە ڕێگەی ئاشنابوون بە چۆنییەتی دڵسۆزبوون بۆ ئەو چەمکە و بەندایەتی دروست، ئیدی هەر بنەمایەکی ئەخلاقی ئەم مەبەستە دەپێکێ دەکرێ لەنێو فەنا و بەقادا جێگەی ببێتەوە.

بێگومان هێشتنەوەی ئەم دوورایەی نێوان مرۆڤایەتی و خودایەتی بەو مانایە نییە کرماشانی هەمان ئەو تێگەیشتنە باوەی لەمەڕ پەیوەندیی مرۆ بە خوداوە هەبێت کە لە زەمینەی فەرمی ئیسلامیدا کاری پێ دەکرێ و ئاکامەکانی پەیوەندییەکەی لەسەر دادەڕێژرێ؛ پەیوەندییەك کە خۆی لە تێزی "خوداپەرستی لە پێناو پاداشت" دەبینێتەوە، بەدەستەواژەیەکی تر باوەڕبوون بە خودا و جێبەجێکردنی فەرمانەکانی بەمەبەستی شادبوون بە بەهەشت بێ، بەڵکو لە ڕوانگەیەکی عارفانەوە دەخوازێ پەیوەندییەکە لە چوارچێوەیەکی تر بێ کە بریتییە لە "بینینی خودا".

بەر لەوەی تێزەکەی لەسەر ئەو بابەتە بخەینەڕوو دەبێ ئەوە ڕوونبکەینەوە کەوا پرسی بینین و نەبینینی خودا پانتاییەکی دیاری لە هزری ئیسلامیدا – بە ڕەوت و ئاراستە جیاوازەکانییەوە – هەیە و بۆتە پرسێکی بنەڕەتی کەلامناسی ئیسلامی، بەکورتی تەنیا ئەوەندە دەڵێین هەندێك لە ڕەوتەکان لەوانە موعتەزیلەکان پێیان وابووە – لەبەر تایبەتمەندی

(٥٤٩) كشف المحجوب, ص٤٨٦.

(٥٥٠) بۆ پێناسەی زیاتری چەمکەکە بگەڕێوە بۆ: رفيق العجم: موسوعة مصطلحات التصوف الأسلامي, مكتبة لبنان, بيروت, ١٩٩٩, ص ص٧٣٠-٧٤٠.

پێکهاتە و سیفاتەکانی — بینینی خودا مەحاڵە[٥٥١]. کەسانێکیش، بەتایبەت بەشی هەرە زۆری پەیڕەوکارانی رەوتە سوننەگەراکان لەباوەڕی بینینی لە رۆژی پەسلاّن دان، بەلاّم لە دەرەوەی هەر چۆنییەتی و مەرزێکدا (بلا کیف و لا حَد)[٥٥٢]. کرماشانی بۆچوونی دووەمی هەیە و پێی وایە مرۆڤ خودا دەبینێ، لەلای ئەودا مەسەلەکە لەدەرەوەی چییەتی خوداوەیە، کە ئەمە رێگەیەك بوو بۆ فەنابوون تیایدا، بەڵکو پەیوەستە بە مەبەستی بەندایەتی لەخۆیدا، کە ئەمەش فەنابوونە لە یەکتاپەرستی.

ئەو ئاماژە بۆ دوو جۆر لە بینینی خودا دەکات کە دەشێ ناویان بنێین "بینینی راستەوخۆ" و "بینینی ناڕاستەوخۆ" یاخود "بینین بە نوێنەرایەتی"، ئەمانە هەردوو جۆریان جەختکردنەوەیەکی شاراوەی لەسەر ئاوێزان نەبوون تێدایە، بەلاّم گەڕانە بەدوای جێگرەوەیەکی ئەم ئاوێزانە. جۆری یەکەمی بینین پەیوەستە بە ژیانی دوای مەرگەوە؛ لێرە قسە لەسەر پاداشتی خوداپەرستی دەکات و رایدەگەیەنێ بۆ "وەلیەکانی خودا" ئەو کارە بە مەبەستی شادبوون بەو بەهەشتە نییە کە — وەك خۆی وەسفی دەکات — بەقەد زەوی و ئاسمان بەرینە، بەڵکو بۆ بینینی خودا خۆیەتی، ئەو خوداپەرستییەی وەلییەکان کردوویانە تەنها بەوە رازیان دەکات لە رووخساری خودا رابمێنن[٥٥٣]. ئیدی چێژی رامان لەو رووخسارە و "کەشفبوون"ی، لە سەرووی هەر چێژێکی تری جەستەیی دەبێ کە لە کولتووری ئایینیدا وێنای بەهەشتی پێکراوە[٥٥٤]. بێگومان هەر کرماشانی ئەم بۆچوونەی نییە، بەڵکو هاوشێوەی ئەو تێڕوانینە لای کەسانی تریش هەیە لەوانە ئەبو حامدی غەزالی کە رایدەگەیەنێ کەسە نزیکەکانی خودا لە بەهەشتدا تەنها لەو دەڕوانن و بەکەم تەماشای "نیعمەتەکان"ی ئەوێ دەکەن[٥٥٥].

---

(٥٥١) لەمبارەوە بگەڕێوە بۆ: الأسدآبادي: الأصول الخمسة, حققه: فيصل بدير عون, مطبوعات جامعة الكويت, الكويت, ١٩٩٨, ص٧٤.

(٥٥٢) البغدادي: الفرق, ص٣٠١.

(٥٥٣) المكي: علم القلوب, ص١٦٦.

(٥٥٤) لەبارەی چێژی فیردەوسی بگەڕێوە بۆ: عزيز العظمة: دنيا الدين في حاضر العرب, ط٢, دار الطليعة, بيروت, ٢٠٠٢, ص ص١٣٩-١٤٧.

(٥٥٥) المحبة والأنس و الشوق والرضا, مكتبة و مطبعة مصطفى البابي الحلبي, القاهرة, ١٩٦١,ص٨١.

هەرچی بینینی ناڕاستەوخۆیە ئەوا نزیکترمان دەکاتەوە لە بابەتی فەنابوونەوە، ئەوەتا پێی ـ یە خودا لەبری ئەوەی باوەڕداران لەسەر زەوی تەماشای رووخساری وی بکەن، قەرەبووی کرێوونەتەوە بەوەی دەشێ لە برا باوەڕدارەکانیان بڕوانن[556]، بێگومان لێرەدا کرماشانی مەبەستی ئاوێزان بوون نییە، بەڵکو جەختکردنەوەیە لەسەر کردەوەی زاتێکی مرۆڤانە کە ـ نینی لەسەر یەکتاوە هەیە، بۆیە بینینی باوەڕداران، بینینی کەسانێکە لە حاڵی فەنابووندان، پەیوەندییان بە هەق چۆتە سەرووی حەزەکانیان، ئەوان نوێنەرایەتی خودا دەکەن لە پرۆسەی پەیوەندیی گرێدانی مرۆڤی باوەڕدار بە خوداوە، بەڵام نوێنەرایەتی کردن بە کردەی مرۆڤانە کە بەندایەتییە نەك خودایانە کە یەکتاییە.

هەرچۆنێك بێت — بە گەڕانەوە بۆ بابەتە بنەڕتییەکە - وەنەبێ ئەو تێگەیشتنەی کرماشانی بۆ مەسەلەی فەنا و بەقا تایبەت بێ بەو، بەڵکو هەندێك لەوانەش کە قەبوڵی حەلاجیان کردووە و تێزەکانی ئەویان پێ قەبوڵ بووە، جەختیان لەسەر ئەوە کردۆتەوە ئەگەر دوو چەمکەکە بەندایەتی بۆ خودای لەگەڵ نەبێ دەبێتە جۆرێك لە بانگەشە، بۆیە هەر کاتێك سۆفی بچێتە دۆخی فەنابوونەوە، لە هەموو شتێك خاڵی دەبێتەوە جگە لە پابەندبوون بە بەندایەتی بۆ خودا، چونکە راستی ئەم دۆخە بەندە بە راستی بەندایەتییەوە[557].

بەمشێوەیە، وا دێتە بەرچاو دابڕانێکی گەورە لە نێوان هزری کرماشانی و حەلاجدا هەیە و وا دەردەکەوێ زۆر کەم ئەگەری بەیەکگەیشتنی ئەم دوو بازنەیە هزرییە هەبێ، لەگەڵ ئەوەشدا ئەوەی جێگەی سەرنج بێ لە مانابەخشین بە چەمکی "بەندایەتی"، بە پێچەوانەی چەمکەکانی ترەوە، کرماشانی لەگەڵ حەلاجدا هاوڕایە، ئەویش بریتییە لە ناساندنی بەندایەتی لە چوارچێوەی چەمکی "ئازادی"دا؛ حەلاج پێی وابوو ئەوەی ئازادی بوێ دەبێ بە بەندایەتی بگات[558]، هەرچی ئیبراهیمە رایدەگەیەنێ ئەوەی بیەوێ لە نێو گەردووندا ئازاد بێ، با لە خوداپەرستیدا دڵسۆز بێ، ئەوەیش بتوانێ بە خودا پەرستی بگات لە هەموو شتێکی تر ئازاد دەبێ[559]، بەو مانایە بەندایەتی بۆ خودا — بە بینینی هەردوو سۆفی-

---

(٥٥٦) ابن خميس: مناقب, ج٢, ص١١٧. فريد الدين عطار: تذكرة, ج٢, ص٢١٥.

(٥٥٧) الخركوشي: تهذيب, ص٣٥٣-٣٥٤.

(٥٥٨) ابن خميس: مناقب, ج٢, ص٧٧.

(٥٥٩) السلمي: طبقات, ص٤٠٤. فريد الدين عطار: تذكرة, ج٢, ص٢١٥.

ئازادبوونی سۆفییە لەو پەیوەستییانەی وەك ئاکامی هەبوونی مرۆڤ لە جیهاندا هەیە، ئەوکاتە دەچێتە دەرەوەی بازنەی هەر پەیوەستییەکەوە جگە لەوەی بە خودای دەبەستێتەوە، بێگومان ئەمەش بەخشینی مانایەکی عیرفانییە بە چەمکی ئازادی لە نێو کولتووری ئیسلامی[٥٦٠] و دەرهێنانییەتی لەو چوارچێوە گشتییەی دەشێ جێگەی چەمکەکەی تێدا بکرێتەوە و بناسێنرێ.

(٥٦٠) بۆ زانیاریی پتر لەسەر ئەو مانا عیرفانییەی ئازادی بگەڕێوە بۆ: فرانز روزنتال: مفهوم الحرية في الإسلام, ت: رضوان السيد و معن زيادة, ط٢, دار المدار الإسلامي, بيروت, ٢٠٠٧, ص ص١٥٩-١٧٥.

## دووەم: ئەبوبەکری کوڕی یەزدانیاری ورمێ و دامەزراندنی ڕەوتی سەربەخۆی سۆفیگەری

لە پێناو دانانی سنوورێك بۆ هەر هەوڵێکی دەرچوون لە بنەما چەسپێنراوەکانی هزری سۆفیگەری، گەورە سۆفییانی سەردەمەکە سیستەمێکی کولتووری ئەوتۆیان دامەزراندبوو، جەختی لەسەر پیرۆزکردنی زۆری شێخی سۆفی و گوێڕایەڵی مورید و پەیڕەوکارانی بۆ بڕیار و کردەوەکانی دەکردەوە، ئەوەش لە میانەی برەوپێدانی سرووتی ئایینی — سۆفییانەی ئەوتۆ کە نەوکەسەی دەچووە نێو ئەلقەی سۆفییانەوە ناچار دەکرد لە هەموو زانین و حاڵێکدا بگەڕێتەوە بۆ مامۆستاکانی و لە بۆچوونی ئەوان دەرنەچێ[٥٦١]. ئەو سیستەمەش کاری دەکرد بۆ ئەوەی هزری ئایینی، زیاتر لە خزمەت تۆخکردنەوەی ئەو پەیوەندیانە بێت، دواتریش تەواوی هزرەکە لە چوارچێوەی تیژ و چەمکی بەرهەمهێنراو لەلایەن گەورە سۆفییانەوە، سنووربەند دەکرا. لە نێو ئەم ڕەوشەدا ئەستەم بوو چاوەڕێی ئەوە بکرێ کەسانێك دەربکەون، بەو سیستەمە ڕازی نەبن و بتوانن بە ئاشکرا ڕەخنە لەو گەورە سۆفییانە بگرن و هەوڵبدەن سنوورێك بۆ هەژموونی تێزەکانیان بەسەر تەواوی گوتاری سۆفیگەریی ئیسلامی دابنێن، یاخود لایەنی کەم بتوانن لە دەرەوەی کولتووری ئەوان لەنێو ئەو گوتارەدا کار بکەن و برەو بە چەمکگەلێك بدەن کە بە ڕای ئەوان لە نێو گوتارەکەدا پشتگوێ خراون یاخود تێگەیشتنی هەڵەیان لەسەر هەیە.

کەسێك کە لە پانتایی کوردیدا ئەو توانایەی لە خۆیدا بینیوە هەڵوێستێکی ڕەخنەیی لەو جۆرەی هەبێ و لە دەرەوەی بۆچوون و ڕێبازە باوەکانی سۆفیگەری کەسێتی خۆی هەبێ - وەك پێشتر ئاماژەمان بۆی کرد - گەورە سۆفی کوردی شاری ورمێ، ئەبوبەکری کوڕی یەزدانیارە، وەك لە خوارەوە وردەکاریەکانی هزرەکەی دەخەینە ڕوو.

### پێگەی شەریعەت لە تێڕوانینی کوڕی یەزدانیاردا:

ئەوەی لە سەربوردەی هزریی ئەبوبەکری کوڕی یەزدانیار رامێنی تێبینی دوو ڕەهەندی بنەڕەتی دەکات، یەکێکیان شارەزابوونییەتی لە بواری شەریعەت و ئەویتریان قوڵبوونەوەیەتی لە بواری حەقیقەتدا؛ ئەو دوو ڕەهەندەش تەواوکەری یەکترن، بەبێ خوێندنەوەی ئەوەی یەکەمیان زەحمەت دەبێ بتوانین تێڕوانینێکی گشتگیرمان لە سەر ئەوەی دووەم — کە بابەتی

---

(٥٦١) السلمي: الملامتيه, ص١٠٨.

بنەڕەتی توێژینەوەکەیە - بۆ گەڵاڵە بێ، بۆیە بەر لەوەی بێینە سەر بنەما و رووخسارەکانی ئەو رەوتە سۆفیگەریەی هەوڵی دامەزراندنی داوە، بە پێویستی دەزانین تیشکێك بخەینە سەر پەیوەندییەکانی بە کایەی شەریعەتەوە و لەوێوە ئەو زەمینە شەرعییە دەستنیشان بکەین کە ئەوی عارف کاری تێدا کردووە و رەوایی بۆ تێزە هزریەکانی خۆی لە بواری سۆفیگەریدا دۆزیوەتەوە.

گێڕانەوەی فەرموودەی پێغەمبەر دەچێتە چوارچێوەی شارەزایی کوڕی یەزدانیار لە بواری شەریعەتدا و یەکێکە لەو زانستانەی پێیەوە سەرقاڵ بووە[٥٦٢]، کاتێکیش دەبینین وەك ژێدەرێك لە لایەن کەسانی ترەوە پشتی پێ دەبەسترێ و وا دەناسرێن لە سەردەستی ئەودا فەرموودەیان وەرگرتووە[٥٦٣]، بەمە دەبێتە ئەلقەیەکی ئەو زنجیرەبەندییەی لە دەستنیشانکردنی پایەی گێڕەرەوانی فەرموودە هەیە لە چوارچێوەی ئەو زانستانەی لەو بوارە پەیڕەویان لێ دەکرا. هەرچی پەیوەندیی بە کایەی فیقهیەوە هەبێ، ئەوا زانیاری ئەوتۆمان لەبەردەستدا نییە لەسەر ئەو رێبازە فیقهیەی دەشێ پەیڕەوی کردبێ، ئەگەرچی لەوە دەچێ مەیلی بەلای رێبازی شافعییەوە بووبێ، بە بەڵگەی ئەو گوتەیەی لە خودی شافعی دەگێڕێتەوە و ئاماژە بۆ پێگەی باڵا و سەروو ئاسایی فەقیھ لای خودا دەکات[٥٦٤].

کارکردن لەنێو شەریعەت سنوورێکی بۆ بەرهەمهێنانی هزری ئایینی لای ئەو سۆفییە داناوە، رازی کردووە بەوەی تەنیا لەو سنوورەدا بیر لە دیاردەی ئایینی بکاتەوە و رێگە بە خۆی نەدات بچێتە نێو هەندێ کایەوە کە ئەو سنوورە شەرعیانە بە لادان و دەرچوون لە باوەڕداریی دروستی دەزانن، ئەوەتا ئەو پابەندبوونە وایلێکردووە خۆی لەو گفتوگۆ و مشتومڕانە بەدوور بگرێ، کە لە دووتوێی کەلامناسیی ئیسلامیدا، لە بارەی سروشتی دەقی

---

(٥٦٢) السلمي: طبقات, ص٤٠٦. أبو نعيم: حلية, ج١٠, ص٣٦٤.

(٥٦٣) السلفي: الأربعين البلدانية, تحقيق: عبد الله رابح, مكتبة دار البيروتي, دمشق, ١٩٩٢, ص١٣٦. ابن عساكر: تاريخ, ج٥, ص٥٢, ٨١.

(٥٦٤) البيهقي: المدخل إلى السنن الكبرى, حققه: محمد ضياء الرحمن ألأعظمي, ط ٢, مكتبة أضواء السلف, الرياض, ١٤٢٠هـ/١٩٩٨م, ج١, ص ١٦٧.

قورئانی و گوتەی خودایی لە ئارادابوون[٥٦٥]، لەوە ناچێ مەیلی ئەوەی هەبووبێ قسە لەسەر ئەو بابەتانە بکات و بە نەشیاوی زانیوە، بۆیە دەبینین ئەو بۆچوونانەی زانایانی پێشووتر دەگێڕێتەوە کە دەریدەخات ناکامی سەرقاڵ بوون بەو بابەتانە و بە کەلامناسیی بە گشتی، لەڕێ لادان و زەندەقەیە[٥٦٦]، لەسەر هەمان بابەت فەرموودەی وا دەگێڕێتەوە گوایە پێغەمبەر رایگەیاندوە:((گوتەی خودا خەلق نەکراوە))[٥٦٧]، بەمەش — لە میانەی دروستکردنی رەوایەتییەکی شەرعییەوە — سنوورێك بۆ هەر راوبۆچوونێکی جیاواز لەسەر ئەو بابەتە دادەنێ.

لەو پێودانگەوە، پابەند بوون بە شەریعەت وای لە کوڕی یەزدانیار کردووە لەگەڵ کایەی سۆفیگەریدا تێکهەڵکێشی بکات، هەوڵبدات پەیوەندییەکی تەواوکاریی لە نێوان شەریعەت و حەقیقەتدا بدۆزێتەوە، لێرەدا شەریعەت دەبێتە ئەو پاشخانە زانستیەی سۆفی رەوایی قەوارەی ئایینی خۆی لەسەر دادەمەزرێنێ، ئیدی خوداپەرستی سۆفییانە نایەتە دی ئەگەر رەچاوی قورئان و سوننەت و بنەما شەرعییەکانی نێویان نەکرێ[٥٦٨]، چونکە بەڕای ئەو کەسێك ئەو پەیڕەوەی نەبێ بە پلەی عارف ناگات، ئەوەتا دەڵێ: (( ئەوەی پەیڕەوی لە سوننەت نەکات خودا بەوە سزای دەدات کە نەتوانێ ئەرکە دینییەکانی جێبەجێ بکات، ئەوەی ئەرکەکانیش جێبەجێ نەکات سزاکەی ئەوەیە کە بە مەعریفە نەگات))[٥٦٩].

ئەو پەیوەندییە تەواوکاریە لە وێستگەی تری هزری کوڕی یەزدانیاردا ئامادەیە، وەك لە راڤەکردنی عیرفانییانەی برێك لە ئایەتی قورئانیدا بەرجەستە بووە، بەتایبەت راڤەی بۆ ئەو ئایەتانەی باس لە دوورکەوتنەوە لە ئارەزووەکانی ژیان و رازی کردنی خودا لەلایەن مرۆڤ

---

(٥٦٥) وەك دەزانین مەسەلەی سروشتی قورئان, لە رووی ئەوەی خەلقکراوە یان کۆن و ئەزەلییە بابەتێکی بنەڕەتی هزری هەندێك لە گروپ و رەوتەکانی هزری ئیسلامیان پێکدەهێنا و لە چوارچێوەی دەستەواژەی کەلامناسیی جێگەی کراوەتەوە, بە تایبەت موعتەزیلەکان؛ کە پێیان وابوو ئەم دەقە ئایینییە داهێنراوی نوێیە و ئەزەلی نییە. الأسدآبادي: الأصول الخمسة, ص٨٦-٨٧.

(٥٦٦) المقريء: أحاديث في ذم الكلام و أهله, دراسة و تحقيق: ناصر عبد الرحمن الجديع, دار أطلس للنشر و التوزيع, الرياض, ١٩٩٦, ص٩٧.

(٥٦٧) السلفي: معجم, ص١٢٢.

(٥٦٨) السلمي: جوامع آداب الصوفية, ص٥٤.

(٥٦٩) ابن يزدانيار: روضة المريدين, مخطوطة, ص٣.

دەکەن[٥٧٠]. هەروەها دەبینین لە هەندێ لەو تێزانەی جومگەی بنەڕەتین لە هزری ئەودا، وەك چەمکی "شەرم" کە دواتر باسی دەکەین، شێوازێکی تری تێکهەڵکێشکردنی دەقی شەرعی و دەقی حەقیقەتی هەیە؛ ئەو شارەزاییی لە راڤەی قورئان و فەرموودە و خوێندنەوەی تایبەتی بۆ سەرگوزشتەی پێشینان لە پێغەمبەران[٥٧١] و وتە و کرداری گەورە یاوەرانی پێغەمبەر خستۆتە گەڕ و بەپێی پێداویستی هزریانەی خۆی، بۆ روونکردنەوەی ئەو تێزە و جێگیرکردنی لە نێو فەرهەنگی چەمکە سۆفییەکاندا، سوودی لەو پاشخانە وەرگرتووە[٥٧٢].

دواجار دەبێ ئەوە بزانین، ئەگەر شەریعەت پاشخانێك بێت بۆ خۆناساندنی سۆفی، ئەوا بەو مانایە نییە پایەی شەریعەت لە هی حەقیقەت بەرزتر بێ و ئەوانەی تایبەتمەندن بە زانستە شەرعییەکان بالاٌتر بن لەوانەی تێکەڵ بە سۆفیگەری بوون و مەسەلەکە بریتی بێ لە سەرخستنی کایەیەك بەسەر ئەویترەوە. بەڵکو هەریەك لەو کەسانە رۆڵیان لە پانتایی ئایینیدا دیاری کراوە؛ رۆڵێك کە کوڕی یەزدانیار بە رۆڵی پاسەوانانی دەچووێنێ و رایدەگەیەنێ: ((فریشتەکان پاسەوانی ئاسمانن، فەرموودە گێڕەوان پاسەوانی سوننەتن، سۆفییان پاسەوانی خودان))[٥٧٣]، بەمەش کاری سۆفی لە سەرووی کاری فەرموودە گێڕەوانە؛ ئەو راستەوخۆ پەیوەندیی بە خوداوە هەیە و سەرەدەری لەگەڵدا دەکات، کەچی بابای ئەهلی شەریعەت لەگەڵ ئەو رێسا و دەستورانەی پێغەمبەر( وەك پێوەندی نێوان مرۆڤ و خودا) دەژی، کە دەشێ مرۆڤەکان بە هۆیانەوە خودا لە خۆیان رازی بکەن. هەر لەو سۆنگەیەوە ئەو سۆفییەی ورمێ - لە پەیوەندیی نێوان ئەهلی حەقیقەت و ئەهلی شەریعەتدا — ئەو بەسەرهاتە دەگێڕێتەوە کە باس لە هانا بردنی گروپی دووەم بۆ یەکەم دەکات لە پێناو تێگەیشتنی دروستی ئەو قەیرانانەی لە بوارەکەی خۆیاندا دووچاری دەبنەوە[٥٧٤].

---

(٥٧٠) السلمي: تفسير السلمي, ج١, ص١٢٩, ٢٨٤. هەروەها بڕوانە ئەو کتێبەی هەمان نووسەر: زيادات حقائق التفسير, ص١٤٦.

(٥٧١) لە شوێنی تر و بۆنەی تری جیاوازدا بۆچوونی تایبەتی لەبارەی سەرگوزشتەی پێغەمبەران هەبووە, بگەڕێوە بۆ: السلمي: زيادات, ص٩٠.

(٥٧٢) بۆ تەواوی دەقەکە بڕوانە: الخركوشي: تهذيب, ص ص٤٠٣-٤٠٧

(٥٧٣) الأنصاري: طبقات الصوفية, ص٤٣٢. ابن عساكر: تاريخ, ج٥, ص٨٢.

(٥٧٤) المكى: علم القلوب, ص٥١.

**ڕەخنەی کوڕی یەزدانیار لە گوتاری باوی سۆفیگەری:**

ئەگەر سۆفی دەیەوێ ڕەوتێکی نوێی سۆفیگەری بهێنێتە دی، دەبێ بەر لە هەموو شتێك بە گوتاری باوی سۆفیگەریدا بچێتەوە و لە هەندێ جومگەیدا دایبڕێژێتەوە، بێگومان ئەوەش کارێکی زۆر ئەستەمە ئەگەر سۆفی نەچێتە سەرووی ئەو سیستەمەی بیرکردنەوەی سۆفییانی پێشوو و، پەیوەست بە گوتاری باوی دەستنیشانکردبوو و گوتارەکەی ئارەستە دەکرد. لێرەدا دەبووا کوڕی یەزدانیار ئەو هەنگاوە باوێ و ئەو پێوەندە تێکبشکێنێ، کە ئەوی لە نێو سیستەمەکە دەهێشتەوە، بەڵام لەوە ناچێ بۆ ئەو دەربازبوون ئاسان بووبێ، هەر بۆیە کارەکەی بە ویستی خودایی بەستۆتەوە و رایدەگەیەنێ بە هاوکاری خوداوە "قەید و پێوەندی سۆفییان"ی لە دەستی خۆی داماڵیوە[٥٧٥].

لێرەدا داماڵینی ئەو پێوەندانە مانای دەرچوون لە تەواوی هزری سۆفیگەری ناگەیەنێت، بەڵکو بیرکردنەوەیە لەو هزرە لەودیو تێز و بۆچوونە باوەکانەوە، ئەگەرنا ئەو لە بۆنەی جیاوازدا پابەندی خۆی بەو هزرە راگەیاندووە[٥٧٦]. ئەو دەخوازێ بە داماڵینی پێوەندەکانەوە لە هزرەکە تێبگات، هەروەها ئەو کون و کەلەبەرانەش ببینێ کە لە هزر و هەڵسوکەوتی سۆفییانی تردا هەیە و لەوێوە بگەڕێتەوە سەر سۆفیگەریی دروستەوە، ئەوکارەش ناکرێ ئەگەر دەستنیشانی جۆری ئەو پێوەندە نەکات کە دەبێ خۆی لێ دەرباز بکات و لە هەمانکاتدا بیکاتە دستپێکێکیش بۆ جێبەجێکردنی پرۆژەکەی. ئەو بەو شێوەیە لە پێوەندی سۆفییان دواوە: ((حاڵی مەحاڵ و ئاماژەی بێ بنەما - الحال المحال و الإشارات الباطلة))[٥٧٧]، لێرەدا ئەگەر حاڵ بەخششێکی بەرزی ئاسمانی بێت بۆ سۆفی و لە نەبووەوە بێتە بوون[٥٧٨]، ئەوا ئەو جۆرەی کوڕی یەزدانیار رەتی دەکاتەوە وانییە و نواندنی حاڵە نەك حاڵ خۆی، بەمەش حاڵ ئەو بزاوتەی تێدا نامێنی کە لە هزری سۆفیگەریدا هەیەتی[٥٧٩]. بەهەمانشێوە ئەو ئاماژە بێ بنەمایەش کە کوڕی یەزدانیار بە پێوەندی دەزانێ خستنەڕووی تێزێك یاخود بیرۆکەیەکە بە

---

(٥٧٥) الأنصاري: طبقات الصوفية, ص٤٣٢. جامي: نفحات, ص١٨٧.

(٥٧٦) ابن خميس: مناقب, ج٢, ص١٢١.

(٥٧٧) الأنصاري: طبقات الصوفية, ص٤٣٢. جامي: نفحات, ص١٨٧.

(٥٧٨) القشيري: الرسالة, ص١٣٢-١٣٣. الرازي: حدائق الحقائق, ص٢٩٤.

(٥٧٩) لەمبارەوە بگەڕێوە بۆ: السهروردي: عوارف, ج٢, ص ص٢٦٤-٢٦٨.

پەنهانی و شاردنەوەی ماناکانییەتی بێ ئەوەی لە بنەڕەتدا ئەو تیژ و بیرۆکەیە هیچ مانایەك ببەخشێ، بەڵکو – وەك لە وتەکەی ئەودا دەردەکەوێ – جۆرێکە لە خۆدەرخستنی سۆفی بە بەکارهێنانی فەرهەنگی چەمك و دەستەواژەی سۆفییانە بێ ئەوەی توانای ئەوەی هەبێ بەسەر ماناکانی رابگات.

کەواتە رەخنەگرتنی ئەو لە سۆفیگەری فرە رەهەندە و زیاتریش خوێندنەوەی هەڵسوکەوتی سۆفییان دەگرێتەوە، بۆیە دەشێ بڵێین ئەو بۆچوونە راستی پێکاوە کە پێی وایە هەڵسەنگاندنەکانی ئەو بۆ حاڵی سۆفییانەیە نەك سۆفیگەریی لەخۆیدا[580]. ئەمەش وامان لێ دەکات لە دوو ئاراستەوە رەخنەکانی بخەینەڕوو:

## ١- نەگونجانی کردار و گوفتار:

کێشەی سەرەکی کوڕی یەزدانیار لەگەڵ کولتووری سۆفیگەری نەگونجانی حاڵی سۆفییانەیە لەگەڵ ئەو هزرەی بەرهەمی دەهێنن، بە دەستەواژەیەکی تر لەو جیاکارییە دەدوێ کە کەوتۆتە نێوان وتە و چەمکەکانی سۆفییان کە بە هۆیانەوە گوزارشت لە کایە ئایینییەکەیان دەکەن و تەنانەت بانگەوازی بۆ دەکەن، لەگەڵ کارو کردەوەیان لە ژیانی رۆژانەیاندا لە نێوان خۆیان و لەگەڵ دەوروبەرەکەیان. سەبارەت بەو بابەتە سۆفی ورمێ وتەیەکی بەناوبانگی هەیە کە دەستنیشانی ئەو پەیوەندییەی نێوان هزر و کرداری سۆفییان دەکات بەپێی قوتابخانە و رەوتە جیاوازەکانی دیاردەکە لە دەڤەر و شارە گەورەکانی جیهانی ئیسلامیدا؛ ئەو دەڵێ:

((سۆفییانی خوراسان کرداریان هەیە و گوفتاریان نییە، سۆفییانی بەغداد گوفتاریان هەیە و کرداریان نییە، سۆفییانی بەصرا هەم کردار و هەم گوفتاریان هەیە، سۆفییانی میصر نە کردار و نە گوفتاریان هەیە))[581].

بەر لە هەموو شتێك ئەو دەقە دەریدەخات کوڕی یەزدانیار خوێندنەوەی بۆ زۆربەی هەرە زۆری کولتووری سۆفیگەری لە سەردەمی خۆیدا کردووە، ئاگاداری وردەکاریەکانی تەواوی ئەو قوتابخانە سۆفییانە بووە و دەستنیشانی کەسایەتییەکانی کردوون، لەوێوە ئاوا

---

(٥٨٠) عبد الحسين زرين كوب: جستجو, ص١٢٩.

(٥٨١) (( صوفية خراسان عمل لا قَول, و صوفية بغداد قَول لا عمل, و صوفية البصرة قَول و عمل, و صوفية مصر لا قَول و لا عمل))؛ ابن الملقن: طبقات, ص ٢٤٤.

بڕیاری لەسەر داون. هەر بۆیە بۆچوونی توێژەرێك، كە لەو قۆناغەی مێژووی سۆفیگەریی ئیسلامی كۆڵیوەتەوە، لە جێی خۆیەتی كە رایدەگەیەنی كوڕی یەزدانیار راستگۆیانە گوزارشتی لە رەوشی سۆفیگەری لە جیهانی ئیسلامیدا كردووە(٥٨٢).

بێگومان ئەو جیاكارییەی لە دەقەكەدا لە نێوان كردار و گوفتار كراوە، زێتر جەختكردنەوەیە لەسەر نەگونجانی حاڵی سۆفییانی سەردەمەكە لەگەڵ ئەو بنەمایانەی لە سەریانە پەیڕەوی لێ بكەن، لە هزری یەزدانیارییشدا ئەوە دەخوێنینەوە كە حاڵی ناجۆری سۆفی زیاتر خووگرتنە بە خەڵكەوە و تێكەڵبوونی كۆمەڵایەتی و زاڵبوونی ئارەزووە دونیاییەكانە لە بەرامبەر بە لاوازی پەیوەندییەكانی سۆفی بە خودا و دووركەوتنەوە لە خوداناسی بە شێوەیەكی گشتی(٥٨٣)، لەلای ئەو دەبێ پەیوەندیی سۆفی بە خەڵكەوە پەیوەندییەكی هاوسەنگ بێ، بەو مانایە سۆفی چۆن دەخوازێ خەڵك سەرەدەری لەگەڵدا بكەن، ئاوا سەرەدەریان لەگەڵدا بكات(٥٨٤)، نەك بە جۆرێك كە خۆسەپاندن و خۆدەرخستنی لەگەڵدابێ، چونكە ئەو پەیوەندییە رەنگدانەوەی هزرێكە دەخوازێ كردە كۆمەڵایەتییەكەی چاكسازییانە بێ. بەڵام دواجار دەبێ ئەو كردە كۆمەڵایەتییە، كە حاڵی سۆفی بەرجەستە دەكات، سنووردار بێ تا بتوانێ رێگەی خودایی هەڵبژێرێ كە ناواخنی هزری سۆفیگەری پێكدێنێ، ئەوەی رێگای خودایی هەڵدەبژێرێ دەبێ پشت لەو حاڵە بكات كە پێشتر تێیدا بووە، جەربەزەیی ئەوەشی هەبێ لەو چوارچێوە نوێیەدا خۆی بناسێنێ و ئەو پاشخانەی بە هەند وەرنەگرێ كە دەشێ كاریگەریی بەسەر ئێستایی سۆفییانەی ئەوەوە هەبێ، بەڵكو تەنیا رەچاوی ئەوە بكات كە ژیانی خۆی بۆ تەرخانكردووە، ئەویش خودایە(٥٨٥).

(582) Ahmet. T. Karamustefa: Sufism, p.51.

(٥٨٣) القشيري: الرسالة, ص١١٣. حمد الله مستوفي: تاريخ گزيده, به أهتمام: عبد الحسين نوائى, چاپ دوم, انتشارات امير كبير, تهران, ١٣٦٢هـ.ش, ص ص٦٥٨-٦٥٩.

(٥٨٤) السلمي: كتاب الفتوة, حققه و علق عليه: سليمان آتش, منشور ضمن: مجموعة آثار ابو عبدالرحمن سلمي, گردآوري: نصرالله پورجوادى, مركز نش دانشگاهى, تهران, ١٣٦٩هـ.ش, ج٢, ص ٢٤٧.

(٥٨٥) ((سئل — أي ابن يزدانيار — عن العبد إذا خرج إلى الله على أي أصل يخرج إليه؟ فقال: على أن لا يعود إلى ما منه خرج ولا يراعي غير مَن إليه خرج, ويحفظ سره على ملاحظة ما تبرأ منه, فقيل له: هذا حُكم مَن خرج عن الوجود. فكيف حكم مَن خرج عن عدم؟ فقال: وجود الحلاوة في المستأنف عوضاً عن المرارة

## ٢- درکاندنی رازی خودایی:

کوڕی یەزدانیار نکۆڵی لە بەکارهێنانی هەندێك چەمك و دەستەواژە لە لایەن سۆفییانەوە کردووە[٥٨٦]، کە رێگە خۆشکەرن بۆ ئاشکرابوونی ئەو واتا شاردراوانەی گوتارەکە کاری پێ دەکرد و سیستەمی پەیوەندیی نێوان خودا و سۆفی لەسەر دامەزراوە و لە دوتۆێی چەمکی "رازەکانی خودا – أسرار الحق"دا دەخرێتەڕوو. لەم بوارەدا کوڕی یەزدانیار رایدەگەیەنێ رەخنەگرتنی ئەو لە سۆفییان و سۆفیگەری بە گشتی لەوەوە دێ کە ئەوان: (( رازە خوداییەکانیان درکاندووە، بە کەسانێکیان گوتووە کە شایستە نین))[٥٨٧]، بێگومان رازیش لە کولتووری سۆفیگەریدا ئاماژەیە بۆ حاڵەتێکی دیاری کراو، تەنانەت لە رۆح دەچوێنرێ و دەگوترێ لە نێو دڵی مرۆڤدا پارێزراوە و دەستنیشانی رووخسارەکانی ئەو پەیوەندییە دەکات کە، وەك پێشتر پێناسەمان کرد، لە نێوان خودا و سۆفیدا هەیە[٥٨٨]، هەر بۆیەشە راز پەیوەستکراوە بە ماناکانی خۆشەویستییەوە، ئەو خۆشەویستییەی بونیادی پەیوەندییەکەی لەسەر دادەمەزرێ، ئیدی ئەوکاتە راز بریتی دەبێ لە شاردنەوەی حاڵی خۆشەویستی[٥٨٩].

رازی خودایی باڵاترین رازە و نابێ ئاشکرا بکرێت، چونکە گرتنی ئەو رازە جەختکردنەوەیە لەسەر نهێنییەکانی پەیوەندیی گرێدانەکە، بەمەش پێگەی سۆفی بەرز دەبێتەوە و وەك پارێزەری خودا لەسەر زەوی چاویان لێ دەکرێ[٥٩٠]. بەڵام بە درکاندنی رازەکان هەم پەیوەندییەکە و هەمیش ناوەڕۆکی رازەکان لە مانا دروستەکانیان و ئەو پیرۆزییەی لەنێو سۆفیگەریدا پێیان بەخشراوە، بەتاڵ دەبنەوە. هەروەها ئەو ئاشکرابوونە ئاماژەیە بۆ دەستبەرداربوونی سۆفی و شکستهێنانی لەو رووبەڕووبوونەوەی – بەڕای ئەبوبەکری کوڕی یەزدانیار – لەگەڵ هێزی شەڕ کە شەیتانە هەیەتی، ئەوەی وا لە سۆفی دەکات رازەکان بدرکێنێ و بۆ کەسی نا شایستە ئاشکرا بن خودی شەیتانە، بەڕای ئەو

في السالف))؛ السلمي: عيوب النفس, بتحقيق: محمد فتحي السيد, ط ٢, دار الصحابة للتراث, طنطا, ١٩٩٣, ص١٠. ابن خميس: مناقب, ج٢, ص١٢٢.

(٥٨٦) القشيري: الرسالة, ص١١٢-١١٣. جامي: نفحات, ص١٨٧.

(٥٨٧) السلمي: طبقات, ص٤٠٨.

(٥٨٨) القشيري: الرسالة, ص١٧٦-١٧٧.

(٥٨٩) الهجويري: كشف, ج٢, ص٦٢٩.

(٥٩٠) السلمي: الملامتية, ص١١٢.

بدرکێنێ و بۆ کەسی نا شایستە ئاشکرا بێ خودی شەیتانە، بەڕای ئەو سۆفییەی ورمێ نەوکاتە سۆفی وای بەسەر دێ کە یادکردنی خودا و بیرکردنەوە لێی لاواز بێ، چونکە تەنیا بەو یادکردنە و بە بیرکردنەوەی بەردەوام دەشێ پارێزگاری لەو رازانە بکرێت[٥٩١].

لێرەوە درکاندنی راز دەرچوونە لە حاڵی باوی سۆفییانە، ئەو دوورابیەی دەیخاتە نێوان ئەو پەیوەندییەی عارف و خودا یەکێکە لەو دەردانەی دووچاری سۆفیگەری دەبێتەوە و ئەو بە توندی سۆفییانی لێ ئاگادار کردۆتەوە، چونکە پێی وایە ئەوەی هۆگری خودا دەخوازێ نابێ ئارەزووی هۆگری خەڵکی هەبێ، ئەوەی ئارەزووی خۆشەویستی خودایی هەبێ نابێ فزوڵی بێت، ئەوەیش دەخوازێ لەلای خودا پێگەی هەبێ نابێ خوازیاری پێگە بێ لە نێو مرۆڤاندا[٥٩٢]، کەواتە هەر کاتێك سۆفی مەیلە مرۆڤانەییەکانی بەهێز ببێ رازە خوداییەکان دەدرکێنێ و دەچێتە دەرەوەی ئەو پێناسە و تێگەیشتنەی یەزدانیاریی بۆ کەسێتی سۆفی.

## تێگەیشتنی ئەبوبەکری کوڕی یەزدانیار بۆ سۆفیگەری:

هەرچەندە سەرچاوەکان لەسەر هەبوونی رێبازێکی سەربەخۆی سۆفیگەری تایبەت بە کوڕی یەزدانیار رێکدێنەوە، بەڵام کەمتر پرژاونەتە سەر ئەوەی بە وردەکارییەکانی رێبازەکەیان ئاشکرا بکەن و برێك لەو خاڵانە دەربخەن کەوا هەم جومگە بنەڕەتییەکانی پێکدەهێنا هەمیش تایبەتمەندییان بە تێزەکانی لە بەرامبەر بە تێزی سۆفییانی تر دەبەخشی. لەگەڵ ئەوەشدا ئاماژە بە شارەزایی ئەو لە هەندێك زانستەکانی پەیوەست بە کایەکە کراوە، کە دەشێ ئەمەش هێڵێکی بنەڕەتی لە هێڵە پێکهێنەرەکانی رێبازەکە بێ. لەو زانستانەش کۆمەڵێکیان بواری کردەکی سۆفیگەری دەگرنەوە، هەندێکیش بوارە تیۆرییەکەی بەتایبەت خوداناسیی[٥٩٣].

بێگومان تاڕادەیەك شارەزایی یەکەمی، لە میانەی رەخنەکانی لە هەڵوێست و رێبازی سۆفییان و قوتابخانە باوەکانیان، دەردەکەوێ، بۆیە دەشێ پرۆسەی رەخنەگرتن لای ئەو — لە

---

(٥٩١) السلمي: زيادات, ص٤٨.

(٥٩٢) القشيري: الرسالة, ص١١٣. ابن الملقن: طبقات, ص٢٤٤.

(٥٩٣) ((كان عالماً بعلوم الظاهر, وعلوم المعاملات والمعارف))؛ السلمي: طبقات, ص٤٠٦. الأنصاري: طبقات الصوفية, ص٤٣١.

رووی کردەکییەوە - دەستنیشانی بونیادی ئەو قوتابخانەیە بکات کە ئەو ویستوویەتی دابیمەزرێنێ، دیارە ئەمەش خۆی لە گونجانی کردار و گوفتار، جوێ نەکردنەوەی حاڵەتی سۆفییانە لەگەڵ سۆفیگەری لەخۆیدا، نەدرکاندنی رازە خوداییەکان و...هتد، دەبینییەوە. لە دەرەوەی رەخنەکانیش، خوێندنەوەی ئەو بۆ چەند چەمکێکی سۆفیگەری، بۆ نموونە وەك "شەرم – الحياء" کە پێشتریش ئاماژەمان پێداوە، جەخت لەسەر ئەو شارەزاییەی دەکاتەوە، لەو خوێندنەوەیەدا دەردەکەوێ ویستوویەتی بە هۆی خستنەڕووی زۆرترین شرۆڤەی چەمکەکە( نزیکەی سی و چوار دەبێ) بەدوای ئەو جۆرە رەفتار و هەڵسوکەوتە چاك و خراپانە (وەك بۆ نموونە: خیانەتکردن، کەم و کوڕی، رێزگرتن، شکۆمەندی، چاوتێربیی، بەجێگەیاند، خۆبەکەمدانان، هیوا نەبوون بە دونیا، چاکەکردن، سەرزەنشت کردن، لەخۆبایی بوون و...هتد) بگەڕێ کە مرۆڤەکان پێی دەناسرێنەوە و بنکەی هاوبەشیشیان شەرمە، کە بە تێڕوانینی ئەو بە مانای خۆناسین و پابەندی دێت[٥٩٤].

بێگومان ئەوەی کوڕی یەزدانیار لە سۆفییانی دی جیادەکاتەوە هەر تەنیا دارشتنەوەی بواری کردەکیی نییە. لە بنەڕەتدا گوتاری سۆفیگەری بە شێوەیەکی گشتی لەسەر بنەماکانی ئەو کردارانە کۆکە و ئەگەر کەسانێك پابەندیان نین، ئەوا لە کۆی گوتارەکە رەخنەیان لێ دەگیرێ نەك هەر تەنیا لەلایەن شێخی ورمێ. بۆیە ئەوەی دەشێ لە هزری ئەو جێگەی هەڵوەستە لەسەرکردن بێ، بوارە تیۆرییەکەیە، یاخود بابڵێین هێنانە کایەی تێگەیشتنێکی جیاواز بۆ ئەو چەمك و دەستەواژانەی رەنگدانەوەی ئەزموونی رۆحانیی سۆفین و بەرجەستەی رایەڵەکانی پەیوەندی ئەو بە خودا دەکەن.

لەم بوارەدا، خوێندنەوەی ئەومان بۆ چەند هێڵێکی تایبەتمەندی ئەو رایەڵە لەبەردەستە؛ ئەو لەو گۆشەیەوە کایەکە دەبینێ کە گەڕانەوەی رەهایە بۆ لای خودا و پابەندبوونە پێیەوە، ئەمەش وەك پێشتر بینیمان لە رێگەی دەرچوون لە تەواوی پەیوەندییە دونیاییەکانەوە دەبێ، بەجۆرێك کە دەبێ سۆفی بتوانێ لە چوارچێوەی باوەڕداریی و راستگۆیی لەو باوەڕە و خۆتەندروستکردن، هەروەها نییەت پاکی و وەفادارییەوە دەربکەوێ[٥٩٥]؛ ئەو گۆڕینی حاڵەش

---

(٥٩٤) بۆ درێژەی بۆچوونەکەی بگەڕێوە بۆ: الخركوشي: تهذيب, ص ص٤٠٣-٤٠٧. ابن خميس: مناقب, ج٢, ص ص١٢٢-١٣٢.

(٥٩٥) الخركوشي: تهذيب, ص١٩.

بڕیارێکی سەرپێیی و سانا نییە، بەڵکو ئەمە دەرچوونە لە بوونی ئەو سۆفییە لە نێو جیهاندا و ڕەهابوونییەتی لە پەیوەستییەکانی تا دەرەقەتی پەیوەندییە خوداییەکە بێت. ئەمەش پێشمەرجی هەیە کە "ڕەزامەندی"یە و تەواوی پەیوەندییەکە لەسەر ئەو چەمکە دامەزراوە، ئەم بارەوە کوڕی یەزدانیار کاتێك ڕاڤەی ئایەتی {رضی الله عنهم و رضوا عنه}[596] دەڵێ: ((ڕەزامەندی خەڵك لە خودا بە دەرکەوتنی سەرلەنوێی تواناکانییەتی لەلایان، ڕەزامەندی ئەویش لەوان بەوە دەبێ کە لەو ڕەزامەندییەیان سەریان بخات))[٥٩٧].

کاتێکیش ئەو ڕەزامەندییە بەرجەستە ببێ، کەسێتی عارفانە دەردەکەوێ و لە کەسانی ئاسایی تەنانەت لەوانەش کە موریدن جیا دەبێتەوە، چونکە بوونی ئەو خواستێکی خوداییە و قەبوڵکراوە[٥٩٨]، هەروەها پەیوەندییەکەشی دەگاتە ئاستی هەرە باڵاوە، کە ئەویش بریتییە لە حاڵەتی "بینین — المشاهدة"؛ لێرە ئەو بینینە بە مانای ڕووبەڕووبوونەوەی ڕاستەوخۆی عارف و خودا نییە، ئەوەندەی ئامادەیی عارفە لە بەردەم کردە خوداییەکانەوە[٥٩٩]. بەدەستەواژەیەکی تر ئەوە بینینی خودایە لە نێو ئەو حەقیقەتانەی خۆی سەرچاوەیانە، ئەگەرنا — وەك کوڕی یەزدانیار باوەڕی وایە — خودا بێ وەسف و وێنە و شێوەیە[٦٠٠]. ئەو دەخوازێ بەو مانایە ئامادەیی عارفمان بۆ بخاتە ڕوو، بۆیە ڕایدەگەیەنێ ئەگەر بینراو(خودا) دەرکەوت، کە دەرکەوتنی چاکە و هەڵوێستەکانییەتی، لە ئاکامی ئەمەشدا بینەرەکان(عارفەکان) فەنا بوون (بەمانای لە دەستدانی خەسڵەت و کردەوە مرۆڤانەییەکان و جێگیربوون لە نێو خەسڵەتە

(٥٩٦) سورة التوبة, آية(١٠٠), چاو لێ بکە ئایەتەکە ئاراستەی {السابقون الأولون من المهاجرين و الأنصار والذين اتبعوهم بإحسان} کراوە, کەچی ڕاڤەکەی کوڕی یەزدانیار هەمەگیرکردنییەتی لە چوارچێوەی تێگەیشتنێکی عیرفانییانە.

(٥٩٧) السلمي: تفسير, ج١, ص٢٨٤.

(٥٩٨) الأنصاري: طبقات الصوفية, ص٤٣٢.

(٥٩٩) القشيري: الرسالة, ص١٧٣.

(٦٠٠) بگەڕێوە بۆ ناوەڕۆکی ئەو پارچە شیعرەی لە بەغداد بەدەستی هەندێك لە یاوەرانی شێخی ورمێ بینراوە؛ ابن خميس: مناقب, ج٢, ص١٨٧.

خودابیه‌کان)، هەروەها توانای هەست کردنیان نەما و دڵسۆزیان بۆ کاروکردەوە مرۆڤانەییەکانیان پووکایەوە، ئەو وەختە عارف خودا دەبینێ[٦٠١].

ئەو سێ جومگە بنەڕەتییەی بیری کوڕی یەزدانیار، واتا پەیوەندی مرۆڤ بە خودا و کەسێتی عارف و بینین، ساکار و دووبارە دێنە بەرچاو، ئەگەر نەیانبەستینەوە بە جومگەی هەرە سەرەکی و تایبەتمەندی ئەو بیرە کە بریتییە لە پێناسەکردنەوەی مرۆڤ و شیتەڵکردنی ئەو دوالیزمەی لە کەسێتییەکەیدا هەڵیگرتووە، وەك لەو دەقە گرنگەی دیارە کە باسی ململانێی هەریەك لە "رۆح" و "دەروون – نفس" و "جەستە – الجسد" دەکات و پێگەی عەقڵ و دڵ لەو پەیوەندییە دەستنیشان دەکات و رۆڵی توانای خودایی لە یەکلاکردنەوەی ململانێکە بەیان دەکات؛ ئەو پێی وایە لە بنەڕەتدا رۆح پاکە و سەرچاوەی چاکەکارییە، چونکە سروشتی رۆح لە ویستی چاکەکارییەوەیە[٦٠٢]. بەمەش وا خۆی نیشاندەدا لە حەقیقەتی رۆح تێگەیشتووە، ئەمە لە کاتێکدا سۆفییانی تر هەن پێیان وایە حەقیقەتێکی پەنهانە و مرۆڤ پەی پێ نابات، ئەوەتا سۆفییەکی وەك جونەید بە پشتبەستن بە دەقی قورئانیی کە جەخت لەسەر تایبەتمەندبوونی خودا بە زانینی ماهییەتی رۆح دەکاتەوە[٦٠٣]، رایدەگەیەنێ مرۆڤەکان ناتوانن باسی بکەن[٦٠٤]. هەروەها کوڕی یەزدانیار وای دەبینێ ئەوەی پەیوەندی نێوان رۆح و چاکەکاریی بەڕێوە دەبات توانا عەقڵییەکانی مرۆڤن، ئەو تواناییانەی ئەگەر دڵیان لەگەڵدا نەبێ تەواو نابن، بەمەش پێگەی لە دەرەوەی ئەو تێگەیشتنەیە کە دەیکاتە سەرچاوەی ئارەزووەکان، بەتایبەت ئەو ئارەزووانەی وەك لە چەندان شوێنی توێژینەوەکەدا دەیبینین دوژمنی سەرسەختی پرۆژەی سەرەکی سۆفین و بێ رووبەڕووبوونەوە و چەپاندنیان ئەزموونی رۆحانییەکەی کەمایەتی تێ دەکەوێ، بەڵکو لای ئەو دەشێ دڵ لە رووە چاکەکەیەوە ببینرێ و مەبەست لێی چاکیی دڵە بۆ چاکەکاریی، ئەمە سەرباری ئەوەی کە ئەوەی لە نێو دڵدا نیشتەجێیە توانای ناسینی خودا(المعرفە)یە و لە رێگەی دڵەوە مرۆڤ دەبێتە عارف، چونکە وەك دەڵێ مەعریفە خۆی بەڵگەی یەکتایی دەداتە دەست دڵەوە و هەر ئەویش بەڵگەی

---

(٦٠١) بڕوانە: الكلاباذي: التعرف, ص ص١٠٠-١٠١.

(٦٠٢) السلمي: طبقات, ص٤٠٨. ابن خميس: مناقب, ج٢, ص١٢١.

(٦٠٣) وەك لە ئایەتی(٨٥) لە سورەتی "الإسراء" هاتووە: {قل الروح من أمر ربي}.

(٦٠٤) الكلاباذي: التعرف, ص٤٤.

راستەقینەی ناسینی خودایە، چونکە بەو مەعریفەیە تەواوی راستییەکان ئاشکرا دەبن[٦٠٥]. بەمەش دەیەوێ پابەندی خۆی بە سرووشتی ئیلهامییانەی سۆفیگەری لە رێگەی سنووربەندکردنی عەقڵ بە دڵەوە دووپات بکاتەوە، نەك عەقڵییانەی پەتی کە کەلامناسانی موعتەزیلە بەتایبەت بانگەشەیان بۆ دەکرد.

ئەو پرۆسەی ناسینە، لە پێش ئەویش پاکی رۆح، رووبەرووی هێزێکی تری نێو مرۆڤ دەبێتەوە کە بەشی نەویستراوی دوالیزمەکە پێکدێنێ، ئەویش هەریەك لە دەروون و جەستەن، کە ئەگەر بەسەر مرۆڤدا زاڵبن پاکبوونەوەی رۆحی ئەستەم دەبێ، چونکە ئەوان سەرچاوەی شەڕن و لەوانیشەوە شەهەوتبازیی و ئارەزووەکان سەرچاوە دەگرن و بەرێوەیان دەبەن. لێرەدا کوڕی یەزدانیار رایدەگەیەنێ پێکدادانە راستەوخۆکە لە نێوان عەقڵ و ئارەزوودایە و ئەوەی ململانێکەش یەکلادەکاتەوە مرۆڤ خۆی نییە، بەڵکو مەسەلەکە زیاتر بە ویستی خوداوە بەندە و هەر ئەویش ئەو مرۆڤانە هەڵدەبژێرێ کە دەشێ رۆحیان پاك ببێتەوە[٦٠٦].

## بانگەوازکردنی ئەبوبەکری کوڕی یەزدانیار بۆ رەوتەکەی:

ئەگەرچی، وەك بینیمان، ئەو سۆفییە گشتگیرانە کولتووری سۆفیگەریی ئیسلامی هەڵسەنگاندووە و لە رەوشی ئەو دیاردە ئایینییە دواوە، بەڵام بە تێبینی کردنی دەقەکانی بەردەستمان ئەو زیاتر ئەو گوتارە رەخنەییەی خۆی ئاراستەی گەورە سۆفییانی قوتابخانەی بەغدادیی کردووە؛ لەسەرووی هەموشیانەوە هەریەك لە جونەید و ئەبوبەکری شبلی[٦٠٧]. لە رێگەی ئەبو نەصری سەڕاج و کتێبەکەی "اللمع"ەوە دەزانین کوڕی یەزدانیار بە تایبەت ئیشی لەسەر ئەو قوتابخانەیە کردووە، نەك هەر ئەو دوو سۆفییە بەڵکو لەسەر زۆرانێکی تر رەخنەی هەبووە، وەك لەو پارچە شیعرەدا دیارە کە سەڕاج تۆماری کردووە و هی سۆفییەکی لایەنگر بەو قوتابخانەیەیە، ئەویش عەلی کوڕی عەبدولرەحیمی قەنناد[٦٠٨]، کە لە میانەی داکۆکیکردن لە رێبازی قوتابخانەی بەغدادیی و

---

(٦٠٥) السلمي: طبقات, ص٤٠٩. الأنصاري: طبقات الصوفية, ص٤٣٢.

(٦٠٦) السلمي: طبقات, ص٤٠٨. ابن خميس: مناقب, ج٢, ص١٢١.

(٦٠٧) الأنصاري: طبقات الصوفية, ص ٤٣١. جامي: نفحات, ص١٨١.

(٦٠٨) توێژەرێك بە پەیڕەوکاری موعتەزیلەی دادەنێ ( پورجوادی: پژوهشهای عرفانی – جستجو در منابع كهن, نشر نی, تهران, ١٣٨٥هـ.ش, ص٨٩.)؛ ئەگەر وابێ ئەوا بێگومان پاڵنەرێکی تری رەخنەگرتنی قەناد

رەخنەگرتن لە کوڕی یەزدانیار، ناوی چەندان سۆفی هێناوە بەبەر رەخنەکانی شێخی ورمێ کەوتوون، وەك ئەبو حوسێنی نوری و سەمنونی موحیب و...هتد، تەنانەت سۆفییانێکی دەرەوەی ئەو قوتابخانەیەش وەك ذەنونی میصری سۆفی ناوداری میصر[609].

چڕکردنەوەی رەخنەکانی کوڕی یەزدانیار بە سۆفییانی بەغداد ئاماژەیە بۆ هەژمونی شێخانی ئەوێ بەسەر هزرەکەوە بە شێوەیەکی گشتی، لە نێویشیدا بەسەر سۆفییانی کوردستان وەك پێشتر بینیمان[610]، هەر بۆیە ئەگەر لەڕێلادانێك لە رەوتی ئەو قوتابخانەیە هەبێ بە تایبەت لە کرداریان، ئەوا کاریگەریی بەسەر تەواوی دیاردە ئایینییەکەوە دەبێ، رەنگە هەر ئەو هەژموون و کاریگەرییە وای لەو کردبێ زیاتر لەسەر ئەمان بدوێ و هەوڵبدات دەستنیشانی لەڕێ لادان و هەڵەکانیان بکات.

لەلایەکی ترەوە لەوەناچێ پرۆژەی ئەو سۆفییە هەر بە رەخنەگرتن و بونیادنانەوەی هزری سۆفیگەری وەستابێ، بەڵکو ئەو بە کردار هەوڵی بڵاوکردنەوەی ئەو بیروباوەڕ و هەڵوێستەی خۆی داوە؛ کاریکردووە بۆ بەرفرەکردنی ئەلقەی لایەنگر و موریدانی و بەرتەسککردنەوە هەژموونی سۆفییانی تر، بەتایبەت هی قوتابخانەی بەغداد، بەسەر کۆی هزرەکە. لە سەرەتای ئەو کارەیدا بەخۆی چۆتە بەغداد و لەوێ ویستوویەتی گفتوگۆی راستەوخۆ لەگەڵ سۆفییانی ئەوێ بکات و بۆچوونەکانی خۆی روونبکاتەوە، بەڵام وا دیارە مشتومڕی نێوان کوڕی یەزدانیار و شێخانی بەغداد لەوە دەرچووە تەنیا گفتوگۆیەکی هزریی بێ و بە ئاڕاستەیەکی تردا رۆیشتووە کە ململانێیی لێ کەوتۆتەوە، لەوەدەچێ خەڵکانێکیش هەبووبن هەوڵیاندابێ ناجۆریی پەیوەندیی نێوان هەردوولا تەڵخ تر بکەنەوە و بانگەشەی ئەوەیان کردووە، گوایە کوڕی یەزدانیار ئەو شێخانەی بە دەرچوو لە ئایین (کافر) داناوە[611]، ئەمە لە کاتێکدا ئەو لە بۆنەی جیاوازدا جەختی لەسەر ئەوە کردۆتەوە کە پەرۆشی بۆ سۆفیگەری وایلێکردووە لە دیدێکی رەخنەییەوە تەماشای گەورە سۆفییان بکات و بۆچوونەکانیان هەڵبسەنگێنێ، ئەگەرنا ئەو خۆی بە پەیڕەوکاری رێبازی ئەو سۆفییانە دەزانێ و رایدەگەیەنێ: (( بە

---

لە کوڕی یەزدانیار هەڵوێستی ئەو سۆفییەیە لە مەسەلەی هەرە بنەڕەتی هزری ئیعتیزالی کە خەلقی قورئانە, وەك پێشتر باسمان لێوە کرد.

(٦٠٩) اللمع, ص ص٥٠٣-٥٠٤.

(٦١٠) بگەڕێوە بۆ بەشی دووەمی ئەو توێژینەوەیە.

(٦١١) السراج: اللمع, ص٥٠٢.

خۆشەویستی ئەوانەوە لە خودا نزیك دەبێتەوە))[٦١٢]، هەر بۆیە نکۆڵی لەو تۆمەتانە کردووە. وادیارە لە بەرامبەر بەم کەسانە خەڵکانێکیش هەوڵیانداوە چارەی کێشەکان بکەن، بۆیە پەیوەندییەکە کەمێك ئارام بۆتەوە[٦١٣].

ئەو ئارامییە بە مانای کۆتایی پێهاتنی قەیرانەکە نەبوو، بە تایبەت واپێدەچێ دوای گەڕانەوەی کوڕی یەزدانیار بۆ ورمێ و جێگیربوونی لەوێ، دووبارە دەستی بە بانگەواز بۆ بیروبۆچوونەکانی کردۆتەوە، ئەمجارە – بەر لە هەموو شتێك – ویستوویەتی کۆنترۆڵی دەرکەوتەی سۆفیگەری لەو شارە بکات؛ هەر بۆیە دەبینین بە توڕەیی سەرەدەری لەگەڵ ئەو کەسانە دەکات کە دێنە شارەکەی و رازی نابن بەو هەڵوێستە رەخنەییەی ئەو لە تێگەیشتنی سۆفیگەلێکی وەك جونەید و نوری و شبلی لە یەکتاپەرستی هەیبووە[٦١٤]. دواتریش لە دەرەوەی ورمێ دەستی بە بانگەواز کردووە، بە تایبەتیش – جارێکی تر – لە بنکەی ئەو قوتابخانەیەی زۆرترین رەخنەی ئاراستە کردووە، واتا بەغداد، بەڵام ئەمجارە دەبینین یاوەرانی خۆی هەناردۆتە شارەکە و پەیامی نوسراوی لەگەڵدا ناردوون، تیایدا بیروباوەڕەکانی، بەتایبەت تیزەکانی لەسەر بینینی خودا و تایبەتمەندییەکانی حەقیقەت، خستبووەروو[٦١٥]، لەو پەیامەشیدا کە سەرەاج بە ناوی "کوردی سۆفی ورمێیی – الکردي الصوفي الأرموي" تۆماری کردووە، ئاماژە هەیە بۆ ئەو یاوەرانەی: (( لە مەیدانی خۆشەویستی خودادا بڵاوبوونەتەوە و... ئەوەی خودا هەیەتی روونیان کردۆتەوە و خۆشیان بە خودا دەرکەوتوون))[٦١٦].

دواجار دەبێ ئاماژە بۆ ئەوە بکەین کە ئەگەرچی ئەو رەخنانەی کوڕی یەزدانیار گشتگیر بوون و زۆربەی گەورە سۆفییانی گرتبۆوە، بەڵام بەو مانایە نا کە تەواوی کولتووری سۆفیگەری – پێش خۆی و هاوسەردەمی – رەتکردبێتەوە، بەڵکو تێبینی ئەوە دەکەین هەندێك لە سۆفییانی خستۆتە دەرەوەی رەخنەکانی، بەتایبەت لەو سۆفییە مەزنانەی سەر بە قوتابخانەی بەغداد نەبوون، یاخود کەمتر لەژێر هەژموونی ئەو قوتابخانەیە بوون. ئەوەتا دەبینین یەکێکە لەوانەی وتە و تیزە سۆفییەکانی بایەزیدی

---

(٦١٢) السلمي: طبقات, ص٤٠٨. ابن خميس: مناقب, ج٢, ص١٢١.

(٦١٣) السراج: اللمع, ص٥٠٢.

(٦١٤) السراج: اللمع, ص ص ٥٠٤-٥٠٥.

(٦١٥) ابن خميس: مناقب, ج٢, ص١٨٧.

(٦١٦) اللمع, ص٣١٦. بۆ تەواوی پەیامەکە بگەڕێوە بۆ پاشکۆی ژمارە(٢)

بسطامی دەگێڕێتەوە، بەتایبەت لەمەڕ پۆلێنکردنی پێگەی ئەهلی مەعریفەدا[٦١٧]، بەمەش دەردەکەوێ ئەو بە پایەی بایەزید لە دەمەزراندن و بەرهەمهێنانی هزری سۆفیگەری رازی بووە. بە هەمان شێوە رای لە کەسێتی سۆفی ناوداری ولاتی شام ئەبو عەبدوڵڵای جەلاء بووە و بە " پارێزەری رازی خودایی" داناوە[٦١٨]، ئەمە لە کاتێکدا – وەك پێشتر باسمان کرد – رەخنەیەکی سەرەکی ئەو لە سۆفییان درکاندنی ئەم رازانە بوو. دیارە پارێزگاری کردنی جەلاء لەو رازانە وایکردووە کوڕی یەزدانیار لەریزی ئەو سۆفییانەی دەربهێنی کە رەخنەی لیّ گرتوون. دەشێ هەمان شت لەمەڕ هەڵوێستی لە سۆفی ناوداری ولاتی میصر ئەبوبەکری زوقاق بڵێین، کاتێك بە "خەزێنەی راستگۆیی"[٦١٩] وەسفی دەکات. لێرەوە دەشێ بڵێین هەڵاوێردکردنی ئەو سۆفییانە رێك هاتنەوەی تێگەیشتنیانە لەگەڵ تێگەیشتنی ئەو، هەروەها ئاماژەیەکیشە بۆ وردبینی کوڕی یەزدانیار لە خوێندنەوەکەی بۆ تەواوی کولتووری سۆفیگەریی ئیسلامی.

## هەڵویستی سۆفییان لە بیروبۆچوونەکانی کوڕی یەزدانیار:

بێگومان گەلی سۆفییان، بەتایبەت ئەوانەی قوتابخانەی بەغدا و پەیڕەوکارانیان، لەو چالاکیانەی رەوتی یەزدانیاریی بێ دەنگ نەبوون، بەڵکو ویستوویانە سنوورێك بۆ بانگەوازی خۆی و یاوەرانی دابنێن، بۆیە دەبینین خوێندنەوەی خۆیان بۆ ئەو سۆفییە، لە هەردوو رووی حاڵی سۆفییانەی و هزرەکەی، هەبووە. زیاد لە سۆفییەك قسەی لەسەر کردووە و لە دیدێکی رەخنەیی و هەندێکجار پەرچەکردارانەوە هەڵوێست و بیروبۆچوونەکانی هەڵدەسەنگێنن، لە گرنگترین ئەو سۆفییانەش:

### ١ – ئەبوبەکری شبلی:

لەو قۆناغەی کوڕی یەزدانیار رەخنەی لە گوتاری سۆفیگەری دەگرت و بانگەشەی بۆ بیروباوەڕی خۆی دەکرد، ئەبوبەکری شبلی گەورەی سۆفییانی بەغدا و تەنانەت دەورووبەریشی بوو، بە تایبەت کە سۆفییانی تری وەك جونەید و نوری کۆچی دواییان کردبوو، حەلاجیش لەدار درابوو، هەر بۆیە

(٦١٧) السهلجي: النور, ص ١٣٤-١٣٥, ١٣٧.

(٦١٨) ابـن خمـيس: مناقـب, ج٢, ص١٣٢. ابـن عـساكر: تـاريخ, ج٦, ص٨٩. ابـن العـديم: بغيـة, ج٣, ص١٢٣٦.( لە سەرچاوەی دواییان نوسراوە "ابو بكر بن الزانيار" , کە ئەمە بە هەڵە خوێندنەوەی ناوەکەیە)

(٦١٩) ابن خميس: مناقب, ج٢, ص١٣٢.

چاوەڕێی ئەوە دەکرێ رووبەڕووبوونەوەی کوڕی یەزدانیار لەگەڵ سۆفییانی بەغدا بە پلەی یەك لەگەڵ شبلی و یاوەرەکانی بێ. لە راستیشدا دیارترین سۆفییەك کە راستەوخۆ دژایەتی کوڕی یەزدانیاری کردبێ و نکۆڵی لە بیرو بۆچوون و ڕێبازەکەی کردبێ شبلی یە؛ ئەو سۆفییەی ورمێ ئارەزووی ئەوەی هەبووە ئەم گەورە سۆفییەی بەغدا وەڵامی پرسیارەکانی بداتەوە، بۆ ئەم مەبەستەش لە بەغداد چۆتە لای[٦٢٠].

بێگومان لەبەر ئەو پێگەیەی شبلی هەیبووە، چاوەڕێی ئەوەی لێ دەکرێ وەڵامی پرسیاری هەر سۆفییەك بداتەوە بخوازی لە نێو هزرەکەدا قووڵ ببێتەوە، کەچی لەگەڵ کوڕی یەزدانیاردا وا دەرناکەوێ، بەڵکو بە بەهانەی ئەو جیاوازییەی لە نێوانیاندا هەیە، ئامادە نەبووە گفتوگۆی لەگەڵدا بکات، ئەو هەڵوێستەی شبلی جۆرێك لە خۆبەگەورەزانی پێوە دیارە، لەڕاستیشدا — بە خوێندنەوەی دەقە کۆنەکان دەرکەوتووە ئەو سۆفییەی بەغداد لەخۆبایی بووە و ڕێگای بە هەموو کەسێك نەداوە لە کۆڕیدا بە ئارەزووی خۆی پرسیار بکات یان ئەوەی لە دڵیەتی بیڵێ[٦٢١]، لەم گۆشەنیگایەوە رازی نەبووە بچێتە نێو ئەو بازنەیەی کوڕی یەزدانیار تیایدا بیری دەکردەوە، بۆیە هەڵوێست و تێزەکانی سۆفییەکەی ورمێ هیچ مانایەکی پێ نەبەخشراوە.

ئەمە لە کاتێکدا رەنگە بە خوێندنەوەی تێزە هزریەکانی هەردووکیان لەوە تێبگەین لە کوێدا بیرکردنەوەی ئەبوبەکری شبلی لەگەڵ هی کوڕی یەزدانیار تێکی نەکردۆتەوە، بەتایبەت تێڕوانینی جیاوازیان بۆ یەکێك لە بابەتە بنەڕەتییەکانی سۆفیگەری و هزریی ئیسلامی بەگشتی، ئەویش " مشاهدة الحق — بینینی خودا"یە، کە بەشێکی دیاری لە هزری یەزدانیاریی پێکهێنابوو. کەچی شبلی لەلای خۆیەوە ئەو بۆچوونە رەتدەکاتەوە سۆفی بتوانێ خودا ببینێ و رایدەگەیەنێ حاڵەتەکە پێچەوانەیە، واتا (( خودا ئەوان دەبینێ ))[٦٢٢]، بەمەش جەخت لەسەر زاڵبوونی خودا بەسەر دڵی سۆفیدا دەکاتەوە، بە جۆرێك کە وایلێدەکات — ئامادەبێ یان نا- سۆفی یادی بکات، ئەمەش دژە لەگەڵ بیرۆکەکەی کوڕی یەزدانیار، وەك پێشتر خستمانە روو.

بەڵام شبلی راستەوخۆ ئەو رەخنەیە لە کوڕی یەزدانیار ناگرێ، بە پێچەوانەوە پەیوەندییەکە دەباتە ئاستێکی نزم تەنانەت نەشیاوەوە؛ لە دوورەوە چاودێری هەڵسوکەوتەکانی دەکات و ناو و ناتۆرەی بۆ

---

(٦٢٠) السراج: اللمع, ص٥٢١.

(٦٢١) نصر الله پورجوادی: پژوهشهای عرفانی, ص٩١.

(٦٢٢) القشيري: الرسالة, ص١٧٣.

دادەتاشێ و بە "گای ورمێ - الثور الأرموي" ناوی دەبات[٦٢٣]. بێگومان ئەمەش دەرکردنی ئەم کوردەیە لەڕیزی سۆفییان و تەماشاکردنییەتی وەك کەسێکی بێزراو و ناشایستە.

**٢- ئەبو عەلی رۆژباری:**

ئەو سۆفییە راستەوخۆ گفتوگۆی لەگەڵ کوڕی یەزدانیار کردووە و لەبارەی بیروڕاکانی پرسیاری لێ کردووە. بەر لە هەموو شتێك رۆذباری لە چوارچێوەی تێگەیشتنی جونەید بۆ سۆفیگەری بیری کردۆتەوە و خۆی بە پەیڕەوکاری ئەو سۆفییەی بەغداد دادەنا[٦٢٤]، بۆیە دەبێ کاتێك کوڕی یەزدانیار رەخنەی لە مامۆستاکەی گرتبێ ئەو بەدەنگ هاتبێ و رووبەڕووی رەخنەکانی بووبێتەوە. ئەوکاتەی کوڕی یەزدانیاریش چۆتە بەغداد، لەوە دەچێ وەك جۆرێك لە تاقیکردنەوەی شارەزایی ئەو سۆفییە لە چەمکە سۆفییەکان، رۆذباری پرسیاری لەبارەی هەندێك لەو چەمکانە لێ کردووە، لەوانە "زانین" و "یەقین"، مەبەستیشی – وەك لە قسەی سەڕاج دەخوێندرێتەوە – بیسەلمێنێ ئەو سۆفییەی ورمێ شارەزایی لە زانستە سۆفییەکاندا کەمە و خۆی لە وەڵامدانەوەی هەندێ پرسیار دەدزێتەوە[٦٢٥]. لەوە بترازێ زانیاری ترمان لەسەر رەخنەکانی رۆذباری، هەروەها بۆچوونی سۆفییەکەی ورمێش لەسەر ئەو چەمکانەی پرسیاریان لێ کردووە، نییە.

**٣- بونداری شیرازی:**

دەشێ رەخنەی ئەو سۆفییە لە چوارچێوەی رەخنەی ئەبوبەکری شبلی بخوێنینەوە، بە تایبەت کە ئەو خۆی لەسەرەتادا موریدێکی ئەو سۆفییە بووە، هەروەها شبلی ئەم سۆفییەی بە گەورە دەزانی و لە کۆڕی خۆیدا وەك پایە بەرزێك باسی دەکرد[٦٢٦]. هەرچۆنێك بێت لەوە ناچێ بوندار راستەوخۆ کوڕی یەزدانیاری بینیبێ، بەڵام - وەك دەردەکەوێ – یاوەرانی ئەوی بینیوە، بەتایبەت ئەوانەی پەیامە شیعرییەکەی کوڕی یەزدانیاریان لە بەغدا بڵاو دەکردەوە. بوندار هەر بە شیعر وەڵامی ئەو

(٦٢٣) روزبهان بقلي: شرح شطحيات, ص ٣٢٧. الأنصاري: طبقات الصوفية, ص٤٢٣. هەروەها بڕوانە: نصر الله پورجوادی: پژوهشهای عرفانی, ص ص٩٠-٩٢.

(٦٢٤) الأنصاري: طبقات الصوفية, ص ٤٢٠. ابن خميس: مناقب, ج٢, ص٥٥. ابن الجوزي: صفة الصفوة, ج٢, ص٢١٣.

(٦٢٥) اللمع, ص ٥٠٤.

(٦٢٦) القشيري: الرسالة, ص ١٢٠. الأنصاري: طبقات الصوفية, ص ٤٥٧. جامی: نفحات, ص٢٣٠-٢٣١.

بیروبۆچوونانەی داوەتەوە کە لە شیعرەکەدا خرابوونە روو[٦٢٧]، ئەو رایدەگەیەنێ هزری کوڕی یەزدانیار پڕە لە دژایەتی و نەگونجانی وتەکان لە گەڵ یەکتر، دژایەتی هەرە گەورەش لە بیرۆکەی دەرچوونی حەقیقەتە لە هەقدا؛ بەرای شیرازی ناشێ بەرهەمهێنەری حەقیقەت کە خودایە لە نێو حەقیقەتەکەدا دەربکەوێ، چونکە ئەوەی وێنەی حەقیقەت دەکێشێ ناکرێ خۆی وێنەی -- لە نێو حەقیقەتەکەدا -- بکێشرێ[٦٢٨]، وەك کوڕی یەزدانیار لە دەقە شیعرییەکەی و لە تێزەکەی لەمەڕ بینینی خودا وای دەگوت. وادیارە شیرازی لەو بۆچوونەی دەگەڕێتەوە سەر تێڕوانینی رەوتی سوننەگەرا بۆ سیفەت و خەسڵەتی خودایی کە بەپێی ئەوان ناشێ بەرجەستە بکرێن و بخرێنە بۆتەی لێکچواندنەوە، بەڵکو هەمان ئەو سیفەت و خەسڵەتانەی بدرێتە پاڵ کە بە خۆی خۆی پێ ناساندووە[٦٢٩]، هەر بۆیە پێداگیری دەکات لەسەر ئەوە خودا نە حاڵ و نە وەسف و نە سەرچاوە و نە سیفەتێکی ئەوتۆی هەیە بەرجەستەی بکات[٦٣٠]. ئەمە لە کاتێکدا خوێندنەوەی یەزدانیار بۆ خودا و بەرجەستەبوونی لە سنووری چەمکی بینین دەرنەچووە و بینینیش -- وەك باسمان کرد -- پرۆسەیەکی ورد و مەرجدارە و تەنیا لە چوارچێوە عرفانییەکەدا ئەو مانایەی پێ دراوە نەك لە رەهەندە کەلامییەکەیەوە.

بونداری شیرازی دەیەوێ کوڕی یەزدانیار هزرێك بەرهەم بهێنێ بە موو سنوورە شەرعییەکانی نەبڕیبێ، بۆیە بە بیری دەهێنێتەوە کە بۆ ئەو باشترە بچێتەوە سەر باوەڕە سوننەتییەکە، کە بریتییە لە گوێڕایەڵی خودا و پێغەمبەر[٦٣١]، ئەمەش ئاماژەیە بۆ ئەو سنوورە شەرعییەی ئەم سۆفییە شیرازییە تێزەکانی کوڕی یەزدانیاری پێ دەخوێنێتەوە.

### ٤- ئەبو نەصری سەڕاج:

تا ئێرە ئەوانەی رەخنەیان لەو سۆفییە کوردە دەگرت، سۆفییانێك بوون هاوسەردەمی خۆی، راستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ مشتومڕیان لەگەڵدا کردووە، بەڵام وادیارە ئەو دیدە رەخنەییە بە مەرگی کوڕی یەزدانیار کۆتایی پێ نەهاتووە، کەسانێك لە دوای ئەویش کاریان بۆ هەڵوەشاندنەوەی

---

(٦٢٧) بۆ دەقی شیعرەکە بگەڕێوە بۆ: ابن خميس: مناقب, ج٢, ص١٨٧.

(٦٢٨) ابن خميس: مناقب, ج٢, ص١٨٧

(٦٢٩) بڕوانە: الشهرستاني: الملل, ق١, ص ص٨٤-٨٥.

(٦٣٠) ابن خميس: مناقب, ج٢, ص١٨٧.

(٦٣١) ابن خميس: مناقب, ج٢, ص١٨٧.

گوتارەکەی کردووە و جەختیان لەسەر راستیی ئەو گوتارەی سۆفیگەری دەکردەوە کە ئەو رەخنەی لێ دەگرت، بێگومان ئەبو نەصری سەڕاجی طوسی دیارترین کەسێکە ئەو کارەی کردبێ.

لە راستیدا رەخنەکانی ئەبو نەصری سەڕاج بەشێکی پرۆژەی گەورەی ئەو کەسەیە لە بواری سۆفیگەریی ئیسلامی وەك گشتێك. ئەو دەخوازێ بە کولتووری ئەو کایەدا بچێتەوە[٦٣٢]؛ بەر لە هەموو شتێك – وەك لە پێشەکی توێژینەوەکەشدا گوتمان – دەخوازێ لە چوارچێوەی تێروانینی شەریعەتدا جێی بکاتەوە، رەوتە نا ئاساییەکان دەکاتە دەرەوەی بیرکردنەوەی خۆی و رەوتە "شەرعییەکان" بەرز دەنرخێنێ[٦٣٣]، لە هەمانکاتدا کار دەکات بۆ داتاشینی وێنای دروستی سۆفیگەری، بۆیە هەر بۆچوونێك یان سۆفییەك لە سنووری تێگەیشتنی ئەو بەدەر بێ رەتدەکرێتەوە و رەخنەی توندی لێ دەگیرێ[٦٣٤]. کەسێکیش کە ئەو پێیوایە سنوورەکانی بەزاندووە ئەبوبەکری کوڕی یەزدانیارە، بۆیە دەبینین چەند لاپەڕەیەکی بۆ قسەکردن لەسەر ئەو کەسە و رەتکردنەوەی بۆچوونەکانی تەرخانکردووە[٦٣٥].

ئەو سۆفییە رازییە بە کوڕی یەزدانیاری خاوەن هزر، کە بۆچوون و وەڵامی خۆی بۆ پرسە بنەڕەتییەکانی زانین و حاڵ و مەقامەکان هەبووە[٦٣٦]، هەر لەبەر ئەوەشە ئەو راستەوخۆ قسە لەسەر تێزەکانی ئەو سۆفییە ناکات و رەخنەی لەسەر بیروباوەڕەکانی ناخاتە روو، ئەگەرچی پەنجە بۆ رەخنەی سۆفییانی تر لەو هزرە درێژ دەکات و دەیەوێ لەو رێگەیەوە دژایەتیەکانی نێو ئەو هزرە و لاوازی کوڕی یەزدانیار لە گفتوگۆی هزریدا دەربخات[٦٣٧].

بەڕای سەڕاج ئەوەی لەو سۆفییەدا جێگەی رەخنە و سەرکۆنەکردن بێ حاڵی سۆفییانەیەتی لەگەڵ هەڵوێستی لە گەورە سۆفییانی سەردەمەکەی؛ ئەو کوڕی یەزدانیاری بەوە تۆمەتبار دەکرد گوایە دەیەوێ دەسەڵاتداری بەسەر رەشەخەڵکدا پەیدا بکات، بە تایبەت لە ورمێ و لە نێو خەڵکەکەیدا، هەردوو پایەی دینی و دونیایی لە خۆیدا کۆبکاتەوە، لەوێوە لە گەورە سۆفییان هەڵگەڕاوەتەوە و لەو زەمینە کۆمەڵایەتییەدا کاری بۆ دروستکردنی وێنەیەکی نا ئایینی بۆیان کردووە و بە کوفر و

---

(632) Ahmet. T. Karamustafa: Sufism, pp.67-69

(٦٣٣) اللمع, ص١٨-٢٠.

(٦٣٤) اللمع, ص ص٤٩٧-٥٥٥.

(٦٣٥) اللمع, ص ص٥٠٢-٥٠٥.

(٦٣٦) اللمع, ص٥٠٢.

(٦٣٧) اللمع, ص٢٣٨.

لەڕێلادان تۆمەتباری کردوون[٦٣٨]. بەڵام ئەو هەڵسەنگاندنەی سەڕاج پێچەوانەی تێڕوانینی کوڕی یەزدانیارە بۆ دەسەڵاتی دونیایی، کە بە توندی ڕەخنەی لێ دەگرێ و بە پشتبەستن بە خوێندنەوە و ڕاڤەی خۆی بۆ قورئان ڕەتی دەکاتەوە[٦٣٩].

سەبارەت بە ڕەخنەکانی کوڕی یەزدانیاریش لە سۆفییانی سەردەمەکەی، سەڕاج ڕایدەگەیەنێ ئەو سۆفییانە، بەتایبەت کەسانێکی وەك جونەید و شبلی و ئەوانیتر، لە سەرووی هەر ڕەخنەیەکن کە یەکێکی وەك کوڕی یەزدانیار ئاڕاستەیان دەکەن، هەر بۆیە بۆ ئەو ئەم سۆفییەی ورمێ نموونەی کەسانێکە لە دەرەوەی باوەڕی ئایینییەوە تانە لە گەورە سۆفییان دەدەن و ڕەخنەکانیان هیچ بنەمایەکی هزریان نییە[٦٤٠].

## پاشماوەی کولتووری یەزدانیاریی لە مێژووی سۆفیگەریدا:

بێگومان کارکردنی قوتابخانەی بەغدا بۆ پەراوێزخستنی کوڕی یەزدانیار سنوورێکی بۆ کاریگەریی ئەو سۆفییە بەسەر هزری سۆفیگەری داناوە، ئەوان ڕێگەیان نەداوە بانگەوازی بۆ پێداچوونەوەی هزرەکە ببێتە پرۆژەیەکی هەمەگیر و کاریگەر، هەر بۆیەشە سەرنجەدەین جێکەوتەی بۆچوونەکانی لە نێو سۆفییانی ناوچەکەی خۆی و دەوروبەری –بەتایبەتیش سۆفییانی دینەوەر– دیار نییە و لە ئێمە پەنهانە، تەنانەت هیچ زانیاریمان لەسەر هەڵوێستی ئەوانیش لەو کەسە و تێگەیشتنەکانی نییە، تەنیا –وەك بینیمان- ئاماژە بۆ پاڵپشتی چەند کەسێکی شارەکەی خۆی دەکرێ. بەڵام بەدەر لە خەڵکی شارەکەی خۆی دەشێ بڵێین جۆرێك لە قەبوڵنەکردن و پشتگوێ خستنی بۆچوونەکانی بەرچاو دەکەوێ، بەتایبەت کاریگەریی و هەژموونی هزریی هەندێك لە ڕەمزە دیارەکانی سۆفیگەریی بەغدادی بەسەر سۆفییانی ناوچەکە وایکردووە قەبولکردنی ئەستەم بووبێ. هەر بۆیەشە ئەگەر دەبینین –دوور و نزیك– هەڵوێستیان لە ڕەوتی یەزدانیاریی نادیارە، ئەوا بەڵگەیەکە لەسەر پشتگوێ خستنی ڕەوتەکە و پابەندبوون بە هەڵوێستی ڕاگەیەندراوی بەغداوە.

ئەگەر وادێتە بەرچاو ئەو سۆفییەی ورمێ نەیتوانیوە لە سەردەمی خۆی و لە ئاستێکی بەرفرەدا ئەوانیتر بە تێزەکانی ڕازی بکات و تێگەیشتنەکەی بۆ سۆفیگەری برەو پێبدات، بەڵام ئەستەم بوو لە

---

(٦٣٨) اللمع, ص٥٠٢.

(٦٣٩) السلمي: زيادات, ص١٤٦. هەروەها بڕوانە بەشی پێنجەمی ئەو توێژینەوەیە.

(٦٤٠) اللمع, ص٥٠٤- ٥٠٥.

دووتوێی مێژووی سۆفیگەریدا تێگەیشتن و کەسایەتییەکەی پشتگوێ بخرێ، بەتایبەت کە هەر لە شارەکەی خۆیدا زوو چۆتە سەرووی کاتەوە و پیرۆزییەکی ئەوتۆی بەرهەمهێناوە لە خەیاڵدانی ئایینی شاردا بمێنێتەوە و ئەرکی باوەڕدارییانەی پێ بدرێ و هەژموونی ڕۆحانی بەسەر ئەو جڤاکە وەك بەسەرهات بگێڕدرێتەوە[641].

درەنگتریش لە چەند وێستگەیەکی جیاوازی مێژووەکەدا هەر باسی دەمێنێ؛ بەر لە هەمووشیان هەبوونی سۆفییەکی تر، کە لە ڕەسەنیدا باپیرەیەکی ناو یەزدانیاری هەیە، ئەگەری بەردەوامبوونی کولتووری سۆفییەکەی ورمێمان بۆ دەخاتەڕوو، دیارە ئەو سۆفییەش ئەبو جەعفەر محەمەدی کوڕی حوسێن کوڕی ئەحمەد کوڕی یەزدانیارە کە لەنیوەی یەکەمی سەدەی پێنجەمی کۆچی/یانزەی زایینی ژیاوە، شتێکی ئەوتۆی لەسەر نازانرێ ئەوەنەبێ خودان کتێبی "روضة المریدین"ە[642] لە بواری سۆفیگەری. لە ڕاستیدا زانیاری دروستمان لەسەر پەیوەندیی ئەو نووسەرە سۆفییە بە ئەبوبەکری کوڕی یەزدانیار لەبەردەستدا نییە[643]، ئەو خۆشی لە کتێبەکەیدا باسی هەبوونی پەیوەندی ناکات، ئەگەرچی لە یەکەمین ئەو سۆفییانەی وتەیان لێ دەگێڕێتەوە، تەنانەت پێش وتەی سۆفیگەلێکی وەك جونەید و شبلی، کوڕی یەزدانیارە[644].

پەیوەندیی نێوان ئەو دوو یەزدانیارە هەرچیەك بێ، ئەوا لە ڕووی هزریەوە جیاوازیان هەیە، نەك لە تێگەیشتنیان بۆ سۆفیگەری بەڵکو لە خوێندنەوەیان بۆ کولتوورەکەی؛ ئەبو جەعفەری کوڕی یەزدانیار لە کتێبەکەیدا نەك هەر ئەو گەورە سۆفییانەی ڕەت نەکردۆتەوە، بەڵکو لە زۆر شوێندا وتەکانی ئەوان وەك بەڵگە و نموونە دەهێنێتەوە[645]. لێرەوە ئەو کتێبە کەمتر ئەو دیدە ڕەخنەییەی

(٦٤١) السلفي: معجم, ص١١٥.

(٦٤٢) ئەو کتێبە لەلایەن "جۆن ئەلدن ولیەم – John Alden Wiliams", بە بەکارهێنانی ژمارەیەك دەستنوس, وەك نامەیەکی دکتۆرا, لە زانکۆی پرینستۆن, لێکدراوەتەوە و شرۆڤە کراوە بەو ناونیشانە:
Williams, John Alden. Rawḍat al-murīdīn. Shaykh Abu Jafar ibn-Yazdānyār. Thesis (Ph.D.). Princeton University, 1958.
بەڵام ئەو دەقە لێکدراوەمان دەست نەکەوت, بۆیە هانا بۆ دەستنوسەکەی هەمان زانکۆ دەبەین کە لەو سایتەدا بڵاوکراوەتەوە: http://diglib.princeton.edu

(٦٤٣) بگەڕێوە بۆ بۆچوونی "عبد الحسین زرین کوب"؛ جستجو, ص٣٩٤-٣٩٥.

(٦٤٤) روضة المریدین, ص٣.

(٦٤٥) بۆ نموونە بڕوانە لاپەڕەکانی ١٥-١٦, ١٩, ٢٨, ٣٣, ٣٦و چەندان لاپەڕەی تری دەستنوسەکە.

پێوە دەبینرێ کە ئەبوبەکری کوڕی یەزدانیار کولتووری سۆفیگەری پێ هەڵدەسەنگاند، خۆ رەنگە ئەو ماوەیەی لە نێوان هەردووکیان هەیە ببێتە هۆی کاڵبوونەوەی هەڵوێستەکانی کوڕی یەزدانیاری یەکەمین لە ناوەندەکە بەگشتی، چونکە هەر لەدوای خۆشی دۆست و یاوەرانی هەوڵیانداوە کاریگەریی ئەو دابڕانەی ئەو لە هێڵی گشتی سۆفیگەری کەم بکەنەوە و رابگەیەنن کە رەخنەگرتنی وی لە گەورە سۆفییان بۆ بێ بەهاکردنی تێزەکانیان نەبووە ئەوەندەی لە پێناو راستکردنەوەیان بووە[٦٤٦]، پاشانیش تەماشاکردنی هەمەگیرانەی ئەو کولتوورە لەلایەن کوڕی یەزدانیاری دووەم لەپێناو بەرهەمهێنانی گوتارێکی ئەوتۆ یاوەران و "مورید"ی سۆفی پێی رازی بێ و بەهۆیەوە وردەکاریەکانی سۆفییان و حاڵ و رەوشتیان ئاشنا ببێ[٦٤٧]، بەدەر لەو جیاوازییانەی دەشێ لەنێو ئەو گوتارە لە قۆناغی کوڕی یەزدانیاری یەکەمدا هەبووبێ؛ بەجۆرێك چیدی جیاکارییە هزرییەکان بابەتی دیاری نێو ئەو کایە نەماون ئەوەندەی پرۆسەی پەروەردەکردنی مورید لە سیستەمی تەریقەتیدا بۆتە بابەتی هەرە دیاری ئەو قۆناغەی کوڕی یەزدانیاری دووەمی تێدا ژیاوە، وەك دواتر دەیبینین.

ئەگەر پەیوەندیی نێوان هەردوو یەزدانیار ئاوا ناڕوونە و بەڵگەی تەواوی لەسەر نییە، ئەوا گەڕانەوەی گەورە سۆفیاتی تر بۆ کولتووری ئەبوبەکری کوڕی یەزدانیاری لەمەڕخۆمان و بەرز راگرتنی پایەی، گومانی لەسەر نییە. لەوە دەچێ بۆ سۆفیگەریی ئیسلامی ئەستەم بووبێ بتوانێ پشتگوێی بخات و گرنگی پێ نەدات، بە تایبەت لە مێژووی درەنگی کایە ئاینییەکەدا. بەر لە هەموو شتێك یەك لە سۆفییە دیارەکانی سەدەی حەوتەمی کۆچی/ سێزدەی زایینی رەسەنی خۆی دەگێڕایەوە سەر کوڕی یەزدانیار، ئەویش حوسامەدین حەسەن کوڕی محەمەد کوڕی حەسەنی ورمێیی چەلەبییە، کە لە ساڵی (٦٨٣ك/١٢٨٤ز) مردووە و رایەك هەیە دەڵێ لە خێڵی دونبەلی کوردییە[٦٤٨]، ئەو یەك لە مورید و یاوەرە هەرە نزیکەکانی گەورەی سۆفییانی فارس جەلالەدینی رۆمی بوو، تەنانەت شاکارەکەی رۆمی کە کتێبی شیعریی داستان ئامێزی "مثنوی معنوی"یە لەسەر داخوازی ئەو

---

(٦٤٦) السلمي: طبقات, ص ص٤٠٧-٤٠٨. ابن خميس: مناقب, ج٢, ص١٢١.

(٦٤٧) ابن يزدانيار: روضة, ص١.

(٦٤٨) زرار صديق توفيق: القبائل و الزعامات القبلية الكردية في العصر الوسيط, مؤسسة موكرياني للنشر, اربيل, ٢٠٠٧, ص ٩٧.

سۆفییە کوردە و بۆ ئەو نوسراوە[٦٤٩]،حوسامەدین لە هزری رۆمی رەنگدانەوەی جوانی و هێزی خودایی بووە و رۆمی گوتەنی:"شوێنی رۆح" بووە لە نێو جەستەیدا[٦٥٠]، هەر لەبەر ئەوەشە دوای ئەو بۆتە یەك لە جێنشینە دیارەكانی و برەوپێدەری رێبازەكەی[٦٥١]. بەپێی سەرچاوەكان حوسامەدین چەلەبی دەچێتەوە سەر ئەو سۆفییەی ورمێ كە گوتویەتی: "أمسیت كردیاً و اصبحت عربیاً"[٦٥٢]، كە پێشتر بینیمان كوڕی یەزدانیارە[٦٥٣]. جەلالەدینی رۆمی و كەسانی تریش ئەو رەسەنەی حر ' ،ەدینیان بەرز نرخاندووە، ئەوەتا لەبارەیەوە دەڵێ: ((رەسەنێكی هەیە خۆر بەرگی خۆی بەسەردا پۆشیوە))[٦٥٤].

بە هەمان شێوە لای سۆفییەكی وەك شێخ صەفیەدینی ئەردەبیلی كوڕی یەزدانیار سۆفییەكی ئاسایی نییە لە بیر بكرێ، بەڵكو بە "سوڵتانی سۆفییان"ی داناوە و بەبێ بەسەركردنەوەی گۆڕەكەی ورمێی جێنەهێشتووە، گوایە بە شێوەیەكی غەیبانی ئەو سۆفییەی ورمێ پێشوازی لێ كردووە[٦٥٥]، بێگومان ئەمەش جەختكردنەوەیە لەسەر ئامادەیی سەرووكاتی كوڕی یەزدانیار و دەریدەخات سۆفییەكانی دوای خۆی بە پێگەی بەرزی لەبواری سۆفیگەریدا رازی بوون.

---

(٦٤٩) بلخي: مثنوي معنوي, بر اساس: نسخه رينولد نيكلسن, چاپ سوم, انتشارات سايه نيما, تهران, ١٣٨٦هـ.ش, ص٣. هەروەها بگەڕێوە بۆ: أنيماري شيمل: الشمس المنتصرة – دراسة آثار الشاعر الإسلامي الكبير جلال الدين الرومي, ترجمة: عيسى علي العاكوب, مؤسسة الطباعة و النشر, طهران, ١٣٧٩هـ.ش, ص ص٨٢-٨٣.

(٦٥٠) مثنوي, ص٣-٤. آنا ماري شيمل: ابعاد صوفية, ص٤٢١.

(٦٥١) لەمبارەوە بڕوانە: الأفلاكي: مناقب العارفين, بكوشش: تحسين يازيجي, چاپ چهارم, دنياى كتاب, تهران, ١٣٨٥هـ.ش, ج٢, ص ٧٣٧- ٧٨٣.

(٦٥٢) بلخي: مثنوي, ص٣. الأفلاكي: مناقب, ج٢, ص ٧٣٧.

(٦٥٣) محمد قزويني: حواشي تذكرة هزار مزار, ص ص٢٥٤-٢٥٥. عبد الحسين زرين كوب: جستجو, ص ص١٢٨-١٢٩.

(٦٥٤) مثنوى, ص٣. هەروەها بڕوانە: الأفلاكي: مناقب, ج٢, ص٧٣٧.

(٦٥٥) ابن بزاز: صفوة, ص ص ٧٦٣-٧٦٤.

## یەکەم: سۆفیگەری وەك حەقیقەتی شاردراوەی عارف:

### مێژووی نادیاری سۆفیگەری لە هەمەدان و دەوروبەری:

سەرهەڵدانی سۆفیگەری و جێگیربوونی لە هەندێ ناوچەی کوردی، مانای ئەوە نەبوو تەواوی ئەو مێژووەی بۆ خۆی دروستی دەکات روونە و کەسایەتییەکانی نێوی کارابیەکی دیاریان هەیە، بەڵکو لە هەندێ شوێندا ئەو مێژووە لە دەرەوەی نوسینەوە بووە و کەوتۆتە پەراوێزی مێژووی نوسراوەی هزرەکە. لەو شوێنانەدا دەبینین بەرهەمهێنەرانی کایەکە و کار و کردەوە و بیروڕاکانیان، نەك هەر وەك خۆی نەگەیشتووە، بەڵکو لە هەندێ باردا ئەوەی لە بەردەستیش دایە بە رەهەندەکانی مێژووی ئەوانمان ئاشنا ناکەن و خەسڵەتی نامێژوویی بە تەواوی دیاردەکە دەبەخشن.

ئەوەندەی ئاگاداربین ئەو پانتاییە جوگرافییەی مێژووی سۆفیگەری تیایدا بەم چارەنوسە گەیشتبێ، ئەو ناوچەیەیە کە شاری هەمەدان چەقەکەیەتی و تاوەکو سنووری لوڕستان[٦٥٦]ی ئێستا درێژ دەبێتەوە. لەو شوێنەدا، بە نزیکیی لە کۆتایی سەدەی چوارەمەوە تا ناوەڕاستی سەدەی پێنجەمی کۆچی، رەوتێکی سۆفیگەری تێدا دەرکەوتووە، دوور لە رەوت و قوتابخانە دیارەکانی دیاردەکە گەشەی سەندووە و چەندان گەورە سۆفی لەخۆ گرتووە، لەوانە: بابا جەعفەری هەمەدانی، شێخ حەمشا، باباتاهیری هەمەدانی[٦٥٧]، هەروەها شێخ فەتحەی هەمەدانی[٦٥٨] و چەندانی تر. ئەمانەش، جگە لە باباتاهیر کە کەمێکی تر باسی دەکەین، لە نێو دەقەکاندا تەنها ناویان هەیە و ناوەڕۆکیان نییە؛ بەدەستەواژەیەکی تر هیچ کامێك

---

(٦٥٦) لەبارەی سروشتی جوگرافی ئەو ناوچەیە و تایبەتمەندییەکانی بگەڕێوە بۆ: ادریس محمد حسن الدوسکي: همدان من الفتح الإسلامي الى سقوطها بيد المغول, دار سپيريز, دهوك, ٢٠٠٦, ص ص٤٢-٤٦, ٥٤-٦٧.

(٦٥٧) راحة الصدور و آية السرور در تاريخ آل سلجوق, بسعي و تصحيح: محمد اقبال, چاپ دوم, كتابفروشی علي اكبر علمی, تهران, ١٣٦٣هـ.ش, ص٩٨-٩٩.

(٦٥٨) عين القضاة: نامەهای عين القضات همدانی, به اهتمام: علينقی منزوی و عفيف عسيران, انتشارات اساطير, تهران, ١٣٧٧هـ.ش, مج١, ص٤٥,٢٥٨.

لەوانەی مێژووی ژیانی سۆفییانی ئەو سەردەم و دواتریان نوسیوەتەوە لایان بەلای ئەو سۆفییانەدا نەکردۆتەوە، بەلکو ئەوان خراونەتە دەرەوەی مێژووی نوسراوەوە.

دەشێ ئەو پشتگوێ خستنە، تا ئەو شوێنەی پەیوەندیی بەم کارەوە هەیە، بۆ دوو خاڵی سەرەکی بگێڕینەوە، ئینجا بە پشتبەستن بەو خاڵانە و ئەو زانیاریە کەمەی بەردەست، هەندێك لە ئاماژەکانی رووخساری سۆفییەکانمان بۆ دەربکەوێ؛ رەنگە خاڵی یەکەم پەیوەست بێ بە تایبەتمەندیی ئەو ناوەندە ئایینییەی ئەوانی تێدا دەرکەوتوون، خاڵی دووەمیش تێگەیشتنی ئەو سۆفییانە و چۆنییەتی خوێندنەوە و بەرهەمهێنانیان بۆ هزرەکە بێ، کە ئەمەی دواییان لە رێگەی خوێندنەوەی تێزەکانی باباتاهیر روونتر دەبێتەوە.

سەبارەت بە خاڵی یەکەمیش، ئەو زانیارییەی هەیە، زیاتر لەبارەی رەوشی ناو شاری هەمەدانە؛ لەوێدا لە هەمان ئەو قۆناغە مێژوویییەی سۆفییە ناوبراوەکانی تێدا پێگەیشتوە، رەوت و رێبازی ئایینی جیاواز هەبووە(شیعە، سوننە، موعتەزیلە و...هتد)[٦٥٩]، بێگومان ئەمەش کاریگەریی بەسەر هەر گەشەسەندنێکی ئایینی و پێشوازی خەڵکە دەستەبژێرەکە، لە دیاردەی فرەجۆر هەبووە. بەتایبەتی کە دەبینین پەیوەندیی نێوان ئەو رەوت و رێبازانەی ئەوێ، ئەك هەر باش و دروست نەبووە، بەلکو ئەوەندە ناجێگیر بووە تا ئەو ئاستەی لە ناوەڕاستی سەدەی چوارەمەوە کوشتاری لێ کەوتۆتەوە[٦٦٠]. دیارە لە ناوەندێکی ئاوادا دیاردەی سۆفیگەری بە دوو ئاڕاستەدا دەڕوا؛ یەکێکیان تێکەڵ بەو رەوشە دەبێ و لە سنووری گروپ و رەوتە جیاواز و دژ بە یەکەکاندا خۆی دەناسێنێ، ئیدی دەبینین سۆفی ئەوتۆی تێدا دەردەکەوێ، هەندێکیان شیعە بوون[٦٦١] و هەندێکیشیان لەسەر بیروبۆچوونی رێبازی سوننی لە نێو شەریعەتدا کاریان کردووە[٦٦٢]، هەر بۆیە ئەو جۆرە سۆفییانە ناویان لە نێو ئەم مێژووەدا ماوەتەوە کە بە کاریگەریی ئەو رەوتە شەریعەتییانە دەنوسرایەوە. ئاڕاستەی دووەم، کە وا زەندەکەین ئەوانەی ناومان هێناون بگرێتەوە، رەنگە هەوڵیاندابێ لەنێو ئەو

---

(٦٥٩) ادريس محمد حسن الدوسكي: همدان, ص ص١٧٠-١٧١.

(٦٦٠) ابن الأثير: الكامل, ج٩, ص٥٤٤.

(٦٦١) الذهبي: تاريخ الإسلام, ج٢٧, ص٢٩٥.

(٦٦٢) القزويني: التدوين في أخبار قزوين, ج٤, ص٥٨. السمعاني: الأنساب, ج٥, ص٧١٠. اليافعي: مرآة الجنان, ج٣, ص٢٨.

کێشمەکێشەدا دەرنەکەون و پەیوەست بن بە کرۆکی رەسەنی سۆفیگەری، لەلایاندا گەڕان بەدوای حەقیقەت و خوداناسین جیاوازبووە لە تێگەیشتنە سادەکان و تێڕوانینەکانیان لەنێو ئەو تێگەیشتنانەدا جێی نەبۆتەوە یان نەکراوەتەوە. هەر بۆیە ئەوان دوور دەکەونەوە و پیادەی سۆفیبوونی خۆیان لە پەراوێزی مێژووی نوسراوی هێزەکەدا دەکەن و لە نێو ئەو مێژووە فەرمییەدا نابینرێن.

سەرباری ئەوەی گوتمان، خاڵێکی تری گرنگ هەیە دەشێ راڤەی ئەو ونبوونەمان بۆ بکات، ئەویش هەم بە پەرەسەندنی رەوشی ئایینی ناوچەکەوە گرێدراوە، هەمیش بەو تێگەیشتنەی ئەم پەرەسەندنە لەسەر هەمان ئەو بابەتانەی خەمی سۆفییان بووە و پێیەوە خەریك بوون لەگەڵ خۆی دەیهێنێ. هەرچۆنێك بێت، لە هەمان ئەو قۆناغەی ئەم سۆفییە گومناوانە دەردەکەون، لەدەرەوەی دەقە مێژووییە فەرمییەکان و لە چوارچێوەی کولتووری ئایینی "ئەهلی هەق"ەوە، ئاماژە بۆ چالاکییەکی بەرفراوان و قۆناغێکی گرنگی گەڵاڵە بوونی سێکتە ئایینییەکە لە نێو هەندێك لە خێڵە کوردییەکانی هەمان ئەو ناوچەیە دەکرێ، لەوانە (لوڕەکان، "گۆران — الجورقان")[٦٦٣]، بەتایبەتیش گەڵاڵە بوونی رەهەندە عیرفانییەکەی ئەو رەوتە لەسەر دەستی دامەزرێنەرێکی سەرەکی رەوتەکە، کە ئەویش "شاخوشین"ە، وەك دواتر باسی دەکەین، لەگەڵ چەندان کەسایەتی تر کە لە پاڵ ئەودا ناویان هەیە و سەر بە هەمان ناوچەی سۆفییەکانن و لەو پەرەسەندنە ئایینییەدا بەشداربوونە[٦٦٤].

سەبارەت بە پەیوەندیی نێوان ئەم دوو گروپە، ئەو سۆفییە مێژووییە بێ ناونیشانانە، لەگەڵ ئەم کەسایەتییە نامێژووییە( بەمانای باس نەکردنیان لە نێو مێژووی نوسراو و فەرمی) پڕ لە ناوەڕۆکی عیرفانییانە، تا ئێستا وەك نهێنییەکی گەورەی مێژووی بیروباوەڕی ئایینی پانتایی کوردی دەمێنێتەوە و توێژەر ناچار بە تەئویلکردنی دەقەکان و بەیەکەوە گرێدانی "مێژوویی" و "نامێژوویی" دەکەن، نەخاسمە ئەو کاتەی کولتووری نامێژوویی بەردەوامییەکی

---

(663) V.Minorsky: Ahl-I Hakk, EI, Vol.I, P.262.

لەبارەی رەوشی ئەم دوو هۆزە کوردییەش لە سەدەکانی ناوەڕاست بڕوانە: زرار صدیق توفیق: القبائل, ص ص٧١-٧٣, ١٣٤-١٣٦.

(٦٦٤) لەوانە: پیر شالیار, کاکا ردا, بابا بوزرگی لوڕی, بابا فەقیە, و چەندانی تر, بگەڕێوە بۆ: سەرنەنجام, کۆکردنەوە و لێکدانەوەی: طیب طاهری, ئینیستیتوتی کەلەپوری کورد, سلێمانی, ٢٠٠٧, (دەورەی شا خوشین), ل ل٢٠-٥٣.

مێژوویی دەبێت و تا ئێستا هەژموونی بەسەر خەیاڵدانی پەیڕەوکارانی دەمێنێ و وێنەکانی ئەو زەمەنە دوورە — وەك لەبەشی یەکەمیشدا شرۆڤەمان کرد — لە چوارچێوەی پرۆسەی بەخشینی پیرۆزی و پاراستنی بە زیندوویی، دەهێلرێنەوە. ئەوەی لێرە گرنگ بێ ئەوەیە کە چەند سۆفییەکی مێژوویيش، بەتایبەت باباتاهیر، دەخرێنە نێو هەمان ئەو ئەلقە باوەڕیە و لەو خەیاڵدانەدا جێیان بۆ دەکرێتەوە. دەشێ لەمەوە پاساوی ونبوونی کەسایەتییە مێژووییەکانمان دەست بکەوێ، کە بریتی دەبێ لە ئامادەیی بەهێزیان لە نێو ئەو خەیاڵدانە ئایینییە پڕ لە راز و نیازەی ئەهلی هەق، کە پەیڕەوکردنی لە باوەڕی "شاردنەوەی راز"[٦٦٥] و دوورە پەرێزی لە سەنتەرە شارستانییەکان، وایکردووە تەواوی کولتوورەکە بکەوێتە دەرەوەی مێژوو، هەر ئەمەشە حاڵی سۆفییەکانی خۆمان.

دۆزینەوەی زەمینەی هاوبەشی سۆفییانە لەو پەیوەندییە تەمومژەدا، ئەستەمە ئەگەر مەحاڵ نەبێت. لەگەڵ ئەوەشدا، ئەوەی هەردوولای لایەنی کەم لە رووکەشدا کۆکردبێتەوە، پەیڕەوی رێچکەیەکی تایبەتمەندە کە لە نێو کولتووری سۆفیگەریدا مانا دەبەخشێ، ئەویش رێچکەی "قەلەندەری"یە[٦٦٦]، ئەو رێچکەیەی مانای بێباکیە بەرامبەر بە پێداویستییە دونیاییەکان و وەك چەمکێکی سۆفییانە لەو ناوەندەدا بەکارهێنراوە، تەنانەت دەڵێن باباتاهیری هەمەدانی لە یەکەمین ئەو سۆفییانەیە ووشەکەی بەکارهێناوە[٦٦٧]، بەتایبەت بۆ گوزارشتکردن — بێگومان لەچوارچێوەی دەقی شیعرییەوە - لە حاڵ و رەوشی ناهەمواری کۆمەڵایەتی خۆی کە بە ویستەوە هەڵیبژاردوە، وەك لەو چوارینە شیعرییەی دیارە کە دەڵێ:

مـو آن رنـدم کـه نامـم بی قلنـدر نه خون دیرم نه مون دیرم نه لنگر
چو روز آیه بگردم گردی گیتی چـو شـو گـرده بـخشـتـی وانـهم سـر[٦٦٨]

---

(665) C. J. Edmonds: The Beliefs and Practices of the Ahl-i Ḥaqq, of Iraq, Iran, British Institute of Persian Studies,1969,Vol. 7, p. 89.

(٦٦٦) و. ئیڤانۆڤا: پێڕەوانی راستی, ل٢٥.

(663) Tahsin Yazici: Kalandar, EI, Vol.V, pp. 472-473

(٦٦٨) (( من ئەو ڕەندەم کە ناوم قەلەندەرە, نە ماڵ و نەسامان و نەلەنگەرم هەیە, کە رۆژ دادێ لەسەر زەوی دەخولێمەوە, کە شەو دەکشێ سەرم دەخەمە سەر خشتێکەوە))؛ بڕوانە:
Edward Heron – Allen: The Lament of Baba Tahir, Gilbert & Rivington, London, 1902, P.35.

لە بەرامبەریشدا، شاخۆشین لەنێو دەقە ئایینییەکاندا وەك قەلەندەرێك پێناسەی خۆی دەکات، تەنانەت رایدەگەیەنێ خۆی و پەیڕەوکارانی لە یەکەمین قەلەندەرەکانن و ئەمە ڕێبازی تایبەتی ئەوانە و بە کەسی تری نیشان نادەن، ئەوەتا دەڵێ:

اول قلندر ما بویدم آخر هم ما ئیم بلی راه قلندران به کس ننمائیم[٦٦٩]

رەنگە لە میانەی خوێندنەوەی ژیان و تێزەکانی ئەو دوو کەسایەتییەش، پەیوەندیی نێوان هەردوولا و بڕێك لە تایبەتمەندییەکانی ئەو ڕێچکەیەمان بۆ دەربکەوێ:

## شاخۆشین و ئەگەرەکانی دابڕانی هزری عیرفانیی و باوەڕی جیاوازی ئایینی:

رەنگە نادیارترین و ئاڵۆزترین کەسایەتییەك لەم قۆناغەدا ڕووبەڕووی ببینەوە خوشینی لوڕستانی ناسراو بە "شاخۆشین"[٦٧٠] بێ؛ کەسایەتییەك کە لە چەندان جەمسەرەوە تەموومژاوییە؛ بەتایبەت ڕووداوەکانی ژیانی، پەیوەندی بە ناوەندی سۆفیگەری، تێڕوانینە عیرفانییەکانی، وێنای ئایینی لای پەیڕەوکارانی "ئەهلی هەق – یارسان" وەك داڕێژەرێکی بنەماکانی ئایینییەکە و چەندان بواری تر.

بێگومان سەرچاوەی ئەو ئاڵۆزیی و نادیارییەش ناگەڕێتەوە بۆ کەسەکە لە خۆیدا، ئەوەندە پەیوەستە بە ئائامادەیی ئەو لە نێو دەقی نوسراوی مێژوویی – ئایینی سەردەمەکەی و دەرکەوتنی بەهێزیی لە چوارچێوەی کولتووری زارەکی ئەهلی هەقەوە، بەجۆرێك کە ئەگەر سەرچاوە مێژووییەکان لە باسی ئەلقەی سۆفییانی هەمەدان کورتیان هێنابێت، ئەوا لە باسی ئەودا بەیەکجارەکی بێ دەنگن، تاکە ئاماژەیەك بۆ هەبوونی مێژووییانەی ئەو لەو دەقانە هەبێ پەیوەندییەتی بە سۆفی و شاعیری ناودار بابا تاهیری هەمەدانی[٦٧١] (م.دوای ٤٤٧ك/١٠٥٥ز)، بەڵام لێرەشدا ڕۆژهەڵاتناس "ڤ. مینۆرسکی – V.Minorsky"، وەك

---

(٦٦٩) (( یەکەم قەلەندەر ئێمەین و دوا قەلەندەریش هەر ئێمەین، بەڵام ڕێگای قەلەندەری بە کەسی تر نیشان نادەین))؛ سەرئەنجام، ل٤٦.

(٦٧٠) بەپێی دەقەکانی ئەهلی هەق ناوی ڕاستەقینەی ئەو کەسە موبارەك و خوشین نازناوییەتی، ناوی دایکیشی جەلالەیە لە ناوچەی لوڕستان دەرکەوتووە و بانگەشەی بۆ بیروباوەڕی نوێ کردووە. نعمة الله جیحون آبادي: شاهنامه، ص ص٢٧٤-٢٩٧. نور علي الهي: برهان، ص٣٠-٣١.

(٦٧١) سەرئەنجام، ل ل٤٩-٥٠.

شارەزایەك لە كولتووری ئەو بیروباوەڕە ئایینییە، چاودێری ئەوەی كردووە كە گێڕانەوەكان زەمینەیەكی پتەویان نییە [٦٧٢]، ئەگەرچی – وەك كەمێكی تر دەیخەینە روو – پەیوەندییەكە جۆرێكە لە نواندنی عیرفانیی نەك گێڕانەوەی مێژوویی.

بەهەرحاڵ، ئەوەی لە دەرەوەی ئەو پەیوەندپەشەوە هەبێ و دەشێ جەخت لەسەر هەبوونی ئەو كەسایەتییە بكاتەوە ئەوەیە كە لەو قۆناغەی گوایە شاە خوشینی تێدا ژیاوە و لەگەڵ باباتاهیر یەكتریان بینیوە، كەسێك كە "خوشین"ی ناو بێ و سەر بە هەمان پانتایی جوگرافی و پێكهاتەی مرۆیی و روانگەی ئایینییەوە بێ میر خوشینی كوڕی مەسعودی كوردییە؛ ئەو میرە كوردەی لەلایەن مێژوونوسێكی نەناسراو، ئاوا ناوەكەی تۆماركراوە و لە رووداوەكانی ساڵی (٤٠٥ك/١٠١٤ز) لە پەیوەندی بە میری بەناوبانگی كورد بەدری كوڕی حەسنەوەی بەرزیكانییدا ناوی هاتووە [٦٧٣]. ئەوەی جێگەی سەرنجە لە بەسەرهاتی مێژوویی ئەو میرە و بەسەرهاتی ئایینی خوشینەكەی لەمەڕخۆمان چەند خاڵێكی هاوبەش هەیە كە وامان لێ دەكات پتر بڕوا بەوە بهێنین ئەوان یەك كەسن: لە رووی كاتەوە وادیارە ئەوان سەر بە هەمان ماوەی زەمەنین، كە كۆتایی سەدەی چوارەم و سەرەتای سەدەی پێنجەمی كۆچی دەگرێتەوە [٦٧٤]، لە رووی رەگەزیشەوە خوشین مەسعود لە رووداوی پەیوەست بە هۆزی گۆرانەوە ناوی هاتووە و رەنگە یەكێك لە میرەكانی ئەو هۆزە بووبێ [٦٧٥]، وەك دەشزانین هۆزەكە بە گشتی پەیوەندی پتەویان بە باوەڕی ئەهلی هەقەوە هەیە و بونیادی مرۆیی و كولتووری باوەڕەكە پێكدێنن و شێوەزاریان زمانی بەشی زۆری دەقە ئایینییەكانیانە، لەوانەش ئەو بەشەی كتێبی سەرئەنجام كە بەناوی "دەورەی شاە خوشین" ناسراوە و گوایە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی ئەو [٦٧٦]. بە هەمان شێوە لەوەدەچێ لە تێگەی ئیسلامییانەشیاندا هاوشێوە بن؛ بە

---

(672) Ahl-I Hakk, EI, Vol.I, P.260

(673) مجمل التواريخ والقصص، بتصحيح: ملك الشعراء بهار، چاپ دوم, تهران،١٣١٨, هـ.ش, ص٤٠١. شایانی باسە سەرچاوە عەرەبییەكان بەشێوەی "حسن بن مسعود" و "حسين بن مسعود" ناوی ئەو میرە كوردەیان هێناوە, بڕوانە: ابن الجوزي: المنتظم, ج١٥, ص١٠٦. ابن الأثير: الكامل, ج٨, ص٨١.

(٦٧٤) مجهول: مجمل التواريخ, ص٤٠١. محمد مكري: مقدمۀ شاهنامۀ حقيقت, ص سيهم.

(٦٧٥) مجهول: مجمل التواريخ, ص٤٠١. هەروەها بڕوانە: زرار سديق تۆفيق: چەند لێكۆڵینەوەیەك دەربارەی مێژووی كورد لە سەدەكانی ناوەڕاستدا, ئەكادیمیای كوردی, هەولێر, ٢٠٠٨, ل٥٤.

(٦٧٦) و. ئیڤانۆڤا: پیرەوانی راستی, ل١٦١. هەروەها بڕوانە:

بەڵگەی ئەوەی لە کاتی کوژرانی میر بەدری کوڕی حەسنەوەی، لە زستانی (٤٠٥ك/١٠١٤-١٠١٥ز)دا، خوشین مەسعود فەرمان دەدات تەرمەکەی ببەنە مەزارگای عەلی کوڕی ئەبو طالب لە نەجەف[٦٧٧]، لەلای خۆشیەوە رەهەندی ئیسلامییانەی بیروباوەڕی شاە خوشین و گرۆیە ئایینییەکە بە گشتی بەلای شیعیی دایە، ئەو خۆی ئەو پابەندییە مەزهەبییەی لە بۆنەی جیاواز رادەگەیەنێ و ستایشی ئیمامەکان دەکات[٦٧٨]. هەروەها رۆڵی سەربازیشیان لەیەکدەچێ و هەردووکیان وەك دوو سەرکردە باس دەکرێن کە خەریکی ململانێ و شەڕن لەگەڵ هێزەکانی دەوروبەریان[٦٧٩].

لەگەڵ ئەوەشدا، بە تەواوی ناتوانین بڵێین ئەم دووانە هەمان کەسن، خۆ وێنەی شاە خوشین لە دەقەکانی ئەهلی هەقیشدا جۆرێك لە پەشێوی پێوە دیارە، بەتایبەت کە "دەورەی شاەخوشین" وەك تێکستێکی سەربەخۆ نەماوەتەوە، بەڵکو لە دووتوێی "دەفتەر"ەکانەوە پارێزراوە و — وەك لێکۆڵەرێکی ئەو دەقانە بۆی دەچێ - بەشێکی کەمی ماوەتەوە و دووچاری شێواندن بووە[٦٨٠]. بێگومان مانەوەی باوەڕە ئایینییەکەش بە نهێنی و جەختکردنەوەی باوەڕییانە لەسەر نەدرکاندنی بنەماکانی بۆ ئەو کەسانەی لە دەرەوەی بازنەی پەیڕەوکارانن، بەجۆرێك کە ئەو رازگرتنە بۆتە بەشێکی کارەکتەری ئایینیان[٦٨١]، وایکردووە بە تێپەڕبوونی کات جیاکردنەوەی راستی مێژوویی و خەیاڵی ئایینی ئەستەم بێ ئەگەر مەحاڵ نەبێ، ئیدی وێنەی دروستی کەسەکان — چ شاە خوشین بێ یان بابا طاهر کە کەمێکی تر باسی دەکەین — خۆی بەدەستەوە نەدات و زۆر لە رەهەندەکانیان بە پەنهانی دەمێنێتەوە.

---

Ziba Mir-Hosseini: Inner Truth and Outer History: The Two Worlds of the Ahl-i Haqq of Kurdistan, International Journal of Middle East Studies, Cambridge, 1994, Vol. 26, No. 2 , p.268.

(٦٧٧) مجهول: مجمل التواريخ, ص٤٠١. بۆ زانیاری زیاتر بگەڕێوە بۆ: حسام الدين علي غالب نەقشبەندی: شارەزوور, ل ل٢٥٣-٢٥٥.

(٦٧٨) سەرئەنجام, ل٥٣. نعمة الله جيحون آبادي: شاهنامه, ص ٢٨١. نور علي الهي: برهان, ص ١٨٩.

(٦٧٩) مجهول: مجمل التواريخ, ص٤٠١. سەرئەنجام, ل١٩. و.ئیڤانۆڤا: پیڕەوانی راستی, ل-١٦٠-١٦١.

(٦٨٠) طيب طاهری: پێشەکی سەرئەنجام, ل١٠-١١.

(٦٨١) Ziba Mir-Hosseini : Inner Truth, p.268.

بەھەرحاڵ، ئەوەی لە نێو کولتووره ئایینییەکە لەبارەی شاە خوشین بۆ ئەم توێژینەوەیە گرنگ بێت، دەرکەوتە عیرفانییەکەیەتی؛ بەر لە هەموو شتێك ئەو بەپێی ئەو کولتووره لەو قۆناغە ئایینییەدا دەرکەوتووەسەری هەڵداوە کە (ماریفەت)ی پێ دەڵێن و پەیوەستە بە خوداناسین و خۆناسینەوە و بەشێکە لە پرۆسەی بوونی رەگەزی خودایی لە نێو مرۆڤدا[٦٨٢]، کە ئەمەش جۆرێکە لە حلولی عیرفانیی و تیایدا شاەخوشین وەك بەرجەستەکارێکی ئەو رەگەزە دەردەکەوێ؛ گوایە لە رێگەی تیشکی خۆرەوە خودا هاتۆتە نێو جەستەی دایکی و بەھۆی ئەم تیشکەوە ئەو دروست بووە[٦٨٣]، کە ئەمەش تارادەیەك هاوشێوەی تێگەیشتنی مەسیحییانەیە لەبارەی مەسیح، لەگەڵ ئەوەشدا جیاوازییەکی گرنگ لە نێوان هەردوو حاڵەتدا هەیە، بەپێی هەندێك لە گروپە مەسیحییە فەرمییەکان مەسیح خودا خۆیەتی، کەچی شاەخوشین رایدەگەیەنێ ئەو بەرجەستەیەکی خودایە و هەڵگری خەسڵەت و تایبەتمەندیی خوداییە، ئەوەتا لە سەرئەنجامدا هاتووە شاە خوشین بە یەکێك لە یاوەرانی، بەناوی بابا فەقیە، دەڵێ:

فقیە ما خودا نیستیم بلی خوداییم
أصلمان خـــورن ژ خـــورە زاییـــم[٦٨٤]

ئەو چەشنە حلولەش وەك شێوەیەکی جێگیربوونی رۆح و گۆڕینی لە جەستەیەکەوە بۆ جەستەیەکی تر خراوەتە روو[٦٨٥].

لێرەدا حلولی خوشین نزیکە لە حلولی حەلاجیی و جۆرێکە لە ئاوێزان بوون، ئەوەنەبێ حەلاج لە ئاکامی خۆدیتنەوەی لە نێو ئەو حاڵەدا دووچاری قەیرانی دەروونیی و نامۆیی کۆمەڵایەتی و ئایینی ببۆوە، تەنانەت خۆشی بەرگەی خۆی نەدەگرت و زمانحاڵی دەیگوت:

---

(٦٨٢) نور علي الهي: برهان, ص٢٧٨.

(٦٨٣) سيد محمد علي خواجه الدين: سر سپردگان, ص ص١٢-١٣.

(٦٨٤) (( فەقیە, ئێمە خودا نین, بەڵکو خوداین, رەسەنمان خۆرە و هەر لەو لـەدایك بووینـە))؛ سـەرئەنجام, ل٤٦. هەروەها بڕوانە: نور علي الهي: برهان, ص١٨٣.

(٦٨٥) محەمەد موکری: پەنجاو دوو بەیتی شێخ ئەمیر بە دیالێکتی گۆرانی, بڵاوکراوەتەوە لە کتێبـی: چـەند باسێك دەربارەی ئەهلی هەق, وەرگێڕانی لە فەرەنسییەوە: ئەجاتی عەبدوڵا, دەزگای موکریـانی, کوردسـتان, ٢٠٠٥, ل١٤١-١٤٢.

((بمکوژن...))[٦٨٦]، کەچی ئەوەی شاە خوشین وایلێدەکات لە ناوەندەکەی خۆیدا وەك کەسێکی باوەڕپێکراو دەربکەوێ و رەزامەندی ئەوانیتری بەدەست هێناوە و زۆربەی سنوورە باوەکان دەبەزێنێ و دەتوانێ باوەڕێکی تایبەتمەندی ئایینی دابڕێژێ[٦٨٧].

دواجار ئەوەی جێگەی سەرنجە، لەگەڵ شاەخوشیندا ئەوەندەی دەرخستنی حاڵەتی عیرفانییانە و بەکردەکیی کردنی دیاردەکە دەبینین، ئەوەندە وەك نموونەی سۆفییان کەسێکی دوورەپەرێزی بەرهەمهێنی هزر دەرناکەوێ، رەنگە ئەمەش بگەڕێتەوە بۆ ئەوەی لەمەڕ کورتبینی سەرچاوە مێژوویی و ئایینییەکانەوە گوتمان. ئامادەییە عیرفانییەکەشی – سەرباری حاڵەتی حلولیی کە سەرتاپای وجودی ئەو و جیهانبینیی باوەڕە ئایینییەکە راڤە دەکات – بریتی دەبێ لە گفتوگۆ و گۆڕینەوەی بیروبۆچوون لەگەڵ عارفەکانی هاوسەردەمی وەك بابا طاهر و هی تر، هەروەها بەگەڕخستنی ئەو سیستەمەی لە پرۆسەی بوونە سۆفی و بەیانکردنی ناسنامەکەیدا دەبینرێ، لەوانەش مەسەلەی ئاهەنگسازی و ژەنینی ئامێری مۆسیقا (تەنبور، دەف...هتد) بۆ گوزارشتکردن لە کردەی خوداناسیی و...هتد[٦٨٨]. بەڵام ئەو خۆی لە دەرەوەی ئەو جیهانبینییەشدا پێناسە دەکرێ؛ ئەگەرچی چەمکە سۆفییەکان (وەك: باطن، ظاهر، تەریقەت) لە هزری ئەودا جێگەیان هەیە[٦٨٩]، بەڵام هەڵەیەکی زانستییە ئەگەر ئەو کەسە – بە گەڕانەوە بۆ دەقەکانی ئەهلی هەق – تەنها لە سنووری سۆفیگەریدا بهێڵینەوە، چونکە دەقەکان کەسێتییەکەی فراوانتر لە کەسێتی عارفێك دەخەنەڕوو، بەجۆرێك ئەو چەمکانەی بەکاریان دەهێنێ ماناکانیان لەگەڵ ئەو کەسێتییەدا دەگۆڕێ تا لەگەڵ ئەو تێگەیشتنەی ئەوی تێدا وێناکراوە بگونجێن، هەروەها لەناوکۆی چەمکە تایبەتییەکانی ئەوێش (وەك: دوونادوون – تناسخ الأرواح) مانای نوێ هەڵبگرن، تا وایان لێدێت ئەوەندەی وەك چەند یەکەیەکی سیستەمێکی کولتووری سەربەخۆ مانا دەبەخشن ئەوەندە بەشێك نابن لە دیاردەی عیرفانیی ئایینێکی تر، کە شێوە فەرمییەکانی ئایینی ئیسلامە.

---

(٦٨٦) دیوان الحلاج, ص ٣٤. ابن الساعي: أخبار الحلاج, ص٧٤.

(٦٨٧) و. ئیڤانۆڤا: پێڕەوانی راستی, ل ل١٦١-١٦٤.

(٦٨٨) بۆ درێژدی ئەو بابەتە بڕوانە: ژان دورینگ: موسیقی و عرفان, ص ص٥٧-٦١.

(٦٨٩) سەرئەنجام, ل ٤٥, ٥٢, .

— لەبەرامبەر بەمەدا، کەسێك کە هاوسەنگییەك لە نێوان دەرکەوتنی عیرفانیی و دەرکەوتنە ئایینییە جیاوازەکەدا چێ بکات و خودان کەسێتییەکی روونتری سۆفییانە بێ بابا طاهری هەمەدانییە.

## بابا گاهری هەمەدانی :

### ١- کێشەی ناسینەوەی بابا گاهر:

رەنگە دیارترین و بەناوبانگترین سۆفی ناوچەکە بابا طاهری هەمەدانی یاخود بابا طاهری لوڕی ناسراو بە "عوریان" بێت. سۆفییەك، کە بە بەراورد لەگەڵ هەموو ئەوانەی لەو توێژینەوەیەدا قسەمان لەسەر کردوون، لە ناوەندی رۆشنبیری کوردیدا، ناسراوترینیانە و گرنگی زۆری پێدراوە، بەجۆرێك کەم سەرچاوەی تایبەت بە مێژووی ئەدەب یاخود زمان یانیش رۆشنبیری کوردی لە سەدەکانی ناوەڕاست بە گشتی، دەبینی لایەکی بەلای ئەو سۆفییەدا نەکردبێتەوە. زیاتریش کار لەسەر دەستنیشانکردنی سەردەمەکەی و پێگە ئەدەبییەکەی لە برەوپێدانی زمان و شێوەزاری نێوخۆیی کراوە، ئەمە سەرباری هەوڵی ساخکردنەوە و دارشتنەوەی دەقی چوارینە شیعرییەکانی بە شێوەزاری تری کوردی جیاواز لەوەی خۆی پێی نوسیوە (کە زیاتر لەوە دەچێ "لوڕی" بێت)، بەتایبەت کرمانجی خواروو(سۆرانی)[٦٩٠]، هەروەها تایبەتمەندی ئەدەبی و زمانەوانییەکانی ئەو دەقە شیعرییانەی خراونەتە بەرباس و لێتوێژینەوە.

لەگەڵ ئەو گرنگیدانەش، کەچی کەمتر باباتاهیری سۆفی ناسراوە، تەنانەت ئەو کاتەی لەو ناوەندە رۆشنبیرییەدا وەك سۆفییەکیش توێژینەوەی لەسەر دەکرێ، ئەوا زیاتر بە پشتبەستن بە چوارینەکانی بووە و لە دووتوێی ئەو دەقە شیعرییانەیدا، بەدوای چەمك و تێزی سۆفییانەدا گەڕاون[٦٩١]، ئەمەش وا دەکات تێگەیشتنێکی هەمەگیری هزری عیرفانیی ئەومان بۆ

---

(٦٩٠) هەر بۆ نموونە چەندان شاعیر و نووسەر ئەم کارەیان کردووە, وەك: (عەلی کەمال باپیر, مەلا محەمەدی غەزایی, رازی, دڵزار, عیزەدین مستەفا رەسول و...هتد), رەنگە دواترینیشیان "ئەحمەد تاقانە" بێت, بڕوانە: ئەحمەد تاقانە: بابا تاهیری هەمەدانی — ژیان و بەرهەمی, بڵاوکراوەی ئاراس, هەولێر, ٢٠٠٧, ل٢٩بەدواوە.

(٦٩١) بۆ نموونە بڕوانە: مارف خەزنەدار: مێژووی ئەدەبی کوردی, بڵاوکراوەی ئاراس, هەولێر, ٢٠٠١, بەرگی یەکەم, ل٢٠٣.

بەرجەستە نەبێ. بەتایبەت کە لەم شیعرانەدا دیاریکردنی سنووری نێوان تێگەیشتنی سۆفییانە و تێگەیشتنی دونیایی، لە هەست و سۆز و رۆحانییەتدا، ئەستەمە[692]. ئەمە لە کاتێکدا لە وتە سۆفییەکانیدا — وەك کەمێکی تر باسی دەکەین — وردتر لەم بابەتانە، بەتایبەت پەیوەندیی نێوان سۆفیبوون و دونیایی بوون، دداوە و سنوورەکانی تێکچڕژان و جیابوونەوەیانی دیاری کردووە.

هەرچۆنێك بێت لە بەرامبەر گرنگیدانی زۆری رۆشنبیریی کوردی بەو کەسایەتییە، دەبینین لە سەردەمی خۆی و لەدوای خۆی، لە ناو کولتووری سۆفیگەریدا کەمترین گرنگی پێدراوە، بە جۆرێك کە رەنگە ژیان و بەسەرهاتی لەهەموو ئەو سۆفییانەی پێش و پاش ئەو قسەمان لەسەر کردوون و دەیکەین، نادیارتر بێت. ئەوەتا دەبینین هیچ کامێك لەوانەی مێژووی ژیانی سۆفییانی هاوسەردەمی ئەویان نوسیوەتەوە باسیان نەکردووە. هەر بۆیە بۆچوونی جیاجیا و دژ بەیەك لەسەر رەگەزی، سەردەمی ژیانی، زمانی شیعرەکانی، پەیوەندیی بە ناوەندی ئایینی و غەیرە ئایینی سەردەمەکەی و دواتر و...هتد، هەیە[693]. رەنگە هەر ئەمەش بێت وایکردووە سەربوردەی ژیانی تێکەڵ بە ئەفسانە ببێت، یاخود بەسەرهاتی ژیانی سۆفییانی تری تێدا جێ بکرێتەوە، وەك ئەوەی هەمان ئەو بەسەرهاتی پەرینەوە لە نەزانی و سادەیی بیرکردنەوە بۆ زانایی و قووڵبوونەوەی زانستییانە (لە کوردبوونەوە بۆ عەرەببوون): وتەی " امسیت کردیاً و اصبحت عربیاً" دراوەتە پاڵ و وەك راستییەکی مێژوویی، لایەنی کەم تا کۆتایی سەدەی نۆزدەی زایینی، دەگێڕدرایەوە[694].

ئەوەی زانراوە و بەردەوام ئاماژەی پێ دەدرێ، تاکە بەسەرهاتێکی مێژوویی، کە بە دروستی دەستنیشانی سەردەمی ژیانی بابا طاهر بکات، بریتییە لە ئاماژەیەکی مێژوونوس راوەندی(م٥٩٩ك/١٢٠٢ز)یە؛ کاتێك باس لەوە دەکات لە کاتی تێپەڕبوونی سوڵتانی سەلجوقی طوغرل بەگ(٤٢٩- ٤٥٥ك/١٠٣٧-١٠٦٣ز) بە هەمەدان، کە بەپێی سەرچاوەکان

---

(692) V.Minorsky: Baba – Tahir, EI, Vol.I, P.840.

(٦٩٣) لەم بارەوە بڕوانە: حسام الدین علی غالب نەقشبەندی: شارەزوور, ل٤٩١-٤٩٢. زرار صدیق تۆفیق: زمانی کوردی لە سەدەکانی ناوەڕاست — لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی, گۆڤارا زانکۆیا دهوك, پەربەندا(١١), ژمارە(١), ٢٠٠٨, ل١٠٥-١٠٦.

(694) Edward Heron – Allen: The Lament, P.xiv-xv.

دەبێ لە ساڵی (٤٤٧ك/١٠٥٥ز) بووبێ[٦٩٥]، چاوی بە بابا طاهر و یاوەرانی کەوتووە و لەو دیمانەیەدا بابا طاهر لەگەڵ سوڵتان دواوە[٦٩٦]. بەمەش ئەو دەقە مێژووییە دەستنیشانی سەردەمەکەی دەکات، لەگەڵ دیاری کردنی جێکەوتەکانی حاڵی سۆفییانەی ئەو وەك رێنیشاندەری دەسەڵاتی سیاسی و هەڵویستی ئەرێنییانەی دەسەڵاتیش لەم سۆفییە و یاوەرانی[٦٩٧]، بەڵام دەقەکە بەلای هزری سۆفییانەیدا نەچووە.

بەهەرحاڵ، بونیادی ئەو هزرە لە شوێنێکی تردا، لە چوارچێوە ئەو راڤەیەدا دەردەکەوێ کە سۆفی بەناوبانگ عەینولقوضاتی هەمەدانی(م٥٢٥ك/١١٣١ز)، بۆ کتێبی ناسراوی ئەم سۆفییە کە "الکلمات القصار"ە کردووە، بەناوی "شرح کلمات باباطاهر العریان". لەڕاستیدا دەقی سەربەخۆی کتێبەکەی باباتاهیر دیار نییە، بۆیە تەنیا لە رێگەی ئەو راڤە و هی تری قۆناغی درەنگترەوە[٦٩٨]، دەشێ بە هزرەکە ئاشنا ببین. هەرچۆنێك بێت عەینولقوضات خۆی ئەم کارەی لەسەر داخوازی سۆفییانی هەمەدان کردووە و ویستویەتی لەم رێگەیەوە رەهەندە

(٦٩٥) بگەڕێوە بۆ: ابن الأثیر: الکامل, ج٩, ص٦٠٩. هەروەها بڕوانە: نیشتمان بەشیر محەمەد: کورد و سەلجوقیەکان – لێکۆڵینەوەیەك لە پەیوەندییە سیاسییەکان(٤٢٠-٥٢١ك/ ١٠٢٩-١١٢٧ز), وەرگێڕانی: ئیدریس عەبدوڵڵا مستەفا, چاپی دووەم, دەزگای موکریانی, هەولێر, ٢٠٠٦, ل١٤١-١٤٢.

(٦٩٦) راحة الصدور, ص٩٨-٩٩.

(٦٩٧) لە بەشی پێنجەمدا, باس لە مەغزاکانی پشت ئەو بینینەی "بابا طاهر" بۆ سوڵتان و ناوەڕۆکی گفتوگۆی نێوانیان دەکەین.

(٦٩٨) سەرباری راڤەکەی "عین القضاة الهمدانی", کە دەڵێن جگە لە عەرەبی بە فارسیش وتەکانی لێکداوەتەوە, چەند راڤەیەکی تری کتێبەکە کراوە و لە قۆناغە درەنگەکانی مێژووی سۆفیگەریی ئیسلامی – فارسیدا بۆتە دەقێکی خوازراوی ناو ئەلقەی سۆفییان, لەو راڤانەش ئەوەی جان بەگی عەزیزی لە ساڵی (٨٩٠ك/١٤٨٥ز) بە فارسی کردویەتی بەناوی " الفتوحات الربانیة فی الإشارات الهمدانیة", لەگەڵ ئەو شەرحەی بە هەردوو زمانی فارسی و عەرەبی مەلا سولطان عەلی گونابادی بەناوی "ایضاح" کردویەتی. بۆ زانیاریی زیاتر بگەڕێوە بۆ: عبد الحسین زرین کوب: جستجو, ص١٩٠. هەروەها بڕوانە: عین القضاة هەمەدانی: گوتە کورتەکانی بابا تاهیری هەمەدانی, وەرگێڕانی: ابراهیم احمد شوان, چاپخانەی زانکۆ, هەولێر, ٢٠٠٦, ل٤.

نادیارەکانی بیروبۆچوونەکانی روونبکاتەوە، ئەمەش بە دوودڵی و بە ترسەوە، نەوەك نەتوانێ پەی بە مانا دروستەکانی وتەکانی بابا تاهیر بەرێت[٦٩٩].

لە راڤەکەیدا عەینولقوضات، سەرەڕای ستایشی کەسێتی عارفانەی باباتاهیر[٧٠٠]، کەچی نەپرژاوەتە سەر لایەنەکانی ژیان و پێگەیشتنی ئەو کەسێتییە، لە چوارچێوەی وتەکانەوە نەبێت هیچ زانیاریەکی نەداوەتە دەست. ئەگەرچی لەوانەیە - ئەگەر بمانەوێ بە لایەنی تری کەسێتییەکە ئاشنا بین - لەناو نوسینە بە بڕشتەکانی عەینولقوضاتدا، بەتایبەت پەیامەکانی - کە بە"نامەهای عین القضات همدانی" ناسراوە - دەستمان بکەوێ؛ لەوێدا دەبینین ئاماژەی تەمومژاوی بۆ سۆفییەکی هەمەدان بەناوی طاهر هەیە، ئەویش شێخی یاخود یاوەری شێخ فەتحەی هەمەدانی بووە[٧٠١]، کە ئەمیش مامۆستای مامۆستایەکی عەینولقوضات خۆیەتی[٧٠٢]. بەو پێیەش ئەو طاهرە لە هەمان کات(سەدەی پێنجەمی کۆچی) و شوێن(هەمەدان) بووە کە بابا طاهری تێدا ژیاوە، بۆیە هەندێك لە توێژەران، هەرچەندە ئاماژە بۆ نەبوونی هیچ بەڵگەیەك دەکەن، وا گومان دەبەن کە رەنگبێ ئەم دووانە هەمان کەس بن[٧٠٣]، دەشێ بەڵگە لەسەر ئەو بۆچوونە ئەوەبێ، کە ئەو هەڵسەنگاندنەی شێخ فەتحەی هەمەدانی دەیخاتەڕوو لەبارەی ئەستەمی راگەیشتن بەسەر راز و راستییە رۆحانییەکانی حاڵی طاهر[٧٠٤]، هاوشێوەی هەڵویستی ئەو سۆفییانەی هەمەدانە کە لەمەڕ باباتاهیر بە عەینولقوضاتیان گوتووە، ئەویش پەنهانی بۆچوون و ئەستەمی تێگەیشتنە لە هەمان حاڵ، بەڕای عەینولقوضات سۆفییەکەی خۆشمان لەو جۆرەیە کەوا دەستەواژەی سەختیان داهێناوە و لە داڕشتنی بیروبۆچوونەکانیان بەکاریان هێناوە، تا نەیاران لە رازەکانی نێو ئەو بیروبۆچوونانە نەگەن، بۆیە ئەو سۆفییانە لە ئاستی"ئاماژە — الإشارة"دا ماونەتەوە و بە نادیاری

---

(٦٩٩) شرح كلمات بابا طاهر العريان — مسائل حكمية في المعارف و المشاهدات الربانية, ضبطه و صححه: عاصم ابراهيم الكيالي, دار الكتب العلمية, بيروت, ٢٠٠٧, ص١١.

(٧٠٠) شرح كلمات, ص١١.

(٧٠١) نامەها, مج١, ص٤٥,٢٥٨.

(٧٠٢) نصر الله پورجوادي: عين القضاة, ص١٠٥-١٠٦.

(٧٠٣) عبد الحسين زرين كوب: جستجو, ص١٩٣. نصر الله پورجوادي: عين القضاة, ص١٠٢.

(٧٠٤) عين القضاة: نامەها, مج١, ص٢٥٨.

گوزارشتیان لەخۆیان کردووە[٧٠٥]. بێگومان کە هەردوو "طاهر"یش لەو جۆرە سۆفییانەن. ئەوا گومان لەسەر یەکبوونیان کەمتر دەبێتەوە.

بەدەر لەو سەرچاوانە، زانیارییەکی ئەوتۆ لەسەر باباتاهیر نامێنێ، ئەوەندەی ئاشکرایە پاش راوەندی بە نزیکەی سەدە و نیوێك حەمەدوڵڵای مستەوفی قەزوینی (م٧٥٠ك/١٣٤٩ز) لە کتێبە مێژووییەکەیدا تەنها ناوی هێناوە[٧٠٦] و لە کتێبە جوگرافییەکەشیدا تەنها ئاماژەی بۆ مانەوەی گۆڕەکەی لە هەمەدان کردووە بە "باباتاهیری دیوانە" ناوزەدی کردووە[٧٠٧]. رەنگە ئەمەش راڤەی نازناوەکەی "عوریان – رووت" ی ئەو سۆفییەمان بۆ بکات؛ گوایە بە سەرگەردانی بە کۆڵانەکانی شارەکەدا سوڕاوەتەوە، بۆیە وایان پێ گوتووە[٧٠٨].

**٢- ئامادەیی باباتاهیر لە کولتووریی ئایینی کوردیدا:**

لەدەرەوەی ئەو ئامادەییە مێژووییەی بابا طاهر، لە کولتووری ئایینی ئەهلی هەقیشدا، کە بەگوێرەی بۆچوونەکان لە هەمان ئەو سەردەمەی ئەم سۆفییەی تێدا ژیاوە بەرهەمهێنراوە، ئامادەییەکی سەروومێژوویی هەیە و بەشێکە لە پرۆسەی نواندنی بیروباوەڕ بۆ کەسانی خودان پێگەی نائاسایی وەك بابا طاهر. ئەو ئامادەییەش بە دوو ئاڕاستەی سەرەکیدا بووە: ئاڕاستەی جێکردنەوەی لە ناوکۆی گێڕانەوەی ئایینیدا، لەگەڵ ئاڕاستەیەکیش کە بریتییە لە بەکارهێنانی وەك رەمزێکی خودان ئەرکێکی دیاریکراو و بەگەڕخستنی دەقە شیعریەکانی وەك دەقی پیرۆز.

بەپێی ئاڕاستەی یەکەم؛ ئەوکاتە باباتاهیر دەرکەوتووە، کە شاە خوشین خۆی و یاوەرانی لە هەمەدان سەردانی دەکەن[٧٠٩]. لە ئاکامی ئەو سەردانە، بابا طاهر کەوتۆتە ژێر کاریگەریی شاە و هەردوولاش شادومان بوونە بەو کاریگەر بوون و یەکتر ناسینە، ئەوەتا هەر لە

---

(٧٠٥) شرح کلمات, ص١٠-١١.

(٧٠٦) تاریخ گزیده, ص٦٧٧.

(٧٠٧) نزهة القلوب, ص٧١.

(٧٠٨) بگەڕێوە بۆ: Edward Heron - Allen: The Lament, P.xiv.

(٧٠٩) بڕوانە: نعمة الله جیحون آبادي: شاهنامه, ص ص٢٩٥-٢٩٦. و.نیڤانۆڤا: پێڕەوانی راستی, ل١٦٢.

بەشی"دەورەی شاە خوشین"ی سەرئەنجامدا، لەسەر زاری باباتاهیر، لەبارەی بینینی بۆ ئەو کەسایەتییە هاتووە:

یا شاە تیری زدی بر جان و جگرم　　　من از زخم تـیری تـو جـان درنــــبـرم
تـو شــادمــان بـر من تـــیر زدەای　　　من هم شادمانم کە زخم تیر تو خوردم[۷۱۰].

لەمەدا دەردەکەوێ ئەو دەقە ئایینیانە دەخوازن رەوایی بە پایەی سەرووئاسایی شاە خوشین ببەخشن، لەرێگەی پێداگیری لەسەر گوێڕایەڵی کەسێکی وەك باباتاهیر بۆ دەسەڵاتە رۆحانییەکەی، وەك لە گفتوگۆی نێوانیاندا دیارە، لەوێدا باباتاهیر خوشین بە شای خۆی دەزانێ و رایدەگەیەنێ کە تەنانەت دوای مەرگیشی ناتوانێ میهری ئەو لە یاد بکات[۷۱۱].

وەنەبێ ئەو دانپیانانە بە پێگەی شاەخوشین، ئاسوودەی بکات، بەو مانایەی ئاسوودەگی مرۆڤانە لە ئاستی تێگەیشتنی گشتی و لە دەرەوەی بازنەی عیرفانییدا هەیەتی، بەڵکو ئاسینەکە دەیخاتە نێو حاڵێکەوە، کە "قەلەندەرانە"یە و جۆرێکە لە داشۆران لە هەموو پێداویستییە ژیانییە دونیاییەکان. ئەوەتا دەڵێن باباتاهیر بە شیعر گوتویەتی:

یا شاە هر کس شاهش تویی حالش همینە　　　سرینش خشت و بالینش زمینە
جـورمم اینــست کە تــو را دوســت دیــرم　　　هر آن یارش تویی حالش چنینە[۷۱۲]

لە ئاراستەی دووەمیش، کە بەکارهێنانی باباتاهیرە وەك رەمزی ئایینی؛ ئەو وەك کەسێکی ئاسایی نامێنێتەوە، بەڵکو بە پرۆسەی پیرۆزکردندا تێدەپەڕێ و لە ناو باوەڕە ئایینییەکە، لەسەرووی شوێن و کاتەوە، جێگیردەبێ[۷۱۳]، تەنانەت خەسڵەتی کەسایەتی مرۆڤانە لە دەست دەدات و دەیبینین لە قۆناغی بەرجەستەبوونی خودایەتیی لە شاەخوشیندا، کە وەك ئاماژەمان پێدا بەپێی تێگەیشتنی ئایینەکە قۆناغی مەعریفەتە، بۆتە یەکێك لە "یارانی چوار مەلەك"، ئەمەش ئەو فریشتانە دەگرێتەوە لە کاتی بەرجەستە بوونەکەدا

---

(۷۱۰) (( ئەی شاە, تیرێکت لە گیان و دڵم داوە, لە برینی ئەو تیرە گیانم دەرچـووە, تـۆ شـادومانی بـەوەی تیرت لەمن داوە, منیش شادومانم بەوەی ئازاری تیری تۆ دەچێژم)). بڕوانە: سەرئەنجام, ل٥١.

(۷۱۱) سەرئەنجام, (دەورەی شاە خوشین), ل٤٩.

(۷۱۲) سـەرئەنجام, ل٤٩. ماناکەی: (( ئەی شاە, هەرکەس تۆی شاە بـێ حـاڵی وادەبـێ, سـەرینی خـشت و رایەخی زەمین دەبێ, تاوانم ئەوەیە کە دۆستی تۆم, ئەوەی تۆی دۆسـت بێ ئەمە حاڵی دەبێ)).

(713) The Lament, P.xiii. Edward Heron -- Allen:

دەردەکەون[٧١٤]. ئیدی ئەوانەی لەسەر زەوی نوێنەرایەتی ئەو فریشتانە دەکەن، کە باباتاهیر لەوانە، ئاسایی نابن، چونکە فریشتەکان خۆیان بەشێکن لە خودا و ئەرکێکی خودایش جێبەجێ دەکەن[٧١٥]. لەم ناوەندەدا بابا بەرجەستەکاری فریشتەی مەرگ(عزرائیل)ە، ئەو فریشتەیەی — بەپێی دەقەکانی ئایینەکە — خودا لە تورەیی خۆی دروستی کردووە وجەلادی دەرباری خودایە[٧١٦]، بەڵام ئەو دەقانە زانیاریی ئەوتۆمان نادەنێ لەسەر هۆی دانانی ئەو بە فریشتەی مەرگ.

لەگەڵ ئەوەشدا دانانی مرۆڤ بە فریشتە، یان بە دەستەواژەیەکی تر، جێکردنەوەی سروشتی فریشتەیی لە سروشتی مرۆڤانە، کردەیەکی عیرفانییانەیە و بەشێکە لە هەوڵی خوداناسینی باطنیانە، کە ئەو کولتوورە ئایینییەی پێ ناسراوە و تیایدا ناسینی فریشتەیی بۆ خودا یەکەمین جۆری هەقناسییە[٧١٧] و دەستپێکە بۆ هەر هەوڵێکی تری "ناسین " کە دەشێ لە قۆناغەکانی تری بەرجەستەبوونی خودایدا فەراهەم ببێ. لە دەرەوەی ئەم دەقانەشەوە بابا طاهر لە "الکلمات القصار"ەکەیدا، ئاماژە بۆ هەبوونی رەوشتی فریشتەیی لە دەروونی مرۆڤانەدا دەکات و پێی وایە خودا لە ساتی ئەفراندنی "دەروون — النفس"، هێندێك بنەمای رەوشتییانەی فریشتەکانی وەك "گوێڕایەڵی" و "خوداپەرستی"، تێدا داناوە[٧١٨]. رەنگە ئەو هاوڕاییەی نێوان دەقی ئایینی و دەقی عیرفانیی، سەرباری مانا باطنیەکەی، بەهانەیەکیش بێ بۆ چاودێری کردنی پەیوەندیی تەواوکارانەی نێوان هزری باباتاهیر وەك خۆی گوزارشتی لێکردووە، لەگەڵ رەسەنی ئەو هزرە و نواندنی لەلایەن ئەهلی هەق و بەکارهێنانی لە چوارچێوەی جیهانبینی ئایینی هەمەکییانەیاندا.

---

(714) V.Minorsky: Ahl-I Hakk, EI, Vol.I, P.260.

سید محمد علی خواجه الدین: سرسپردگان, ص١٣١.

(٧١٥) لەبارەی ئەمەوە تەماشای ئەو توێژینەوەیە بکە: موحەمەد موکری: لەدایکبوونی جیهان لەلایەن کوردانی ئەهلی هەق, وەرگێڕانی: موحسین ئەحمەد عومەر, گۆڤاری "کوردۆلۆجی", سلێمانی, ٢٠٠٨, ژمارە(١), ل ل١٢٨-١٢٩.

(٧١٦) و. نیڤانۆڤا: پێڕەوانی راستی, ل ل١٥٠-١٥٤.

(٧١٧) بڕوانە: نعمة الله جیحون آبادی: شاهنامە, ص ص٣٥-٤٠.

(٧١٨) عین القضاة الهمداني: شرح کلمات, ص٤٦.

### ٣- سەربوردەی رۆحانیی بابا گاهری هەمەدانی بەپێی "الکلمات القصار":

بێگومان خوێندنەوەی وردی وتە کورتەکانی ئەو سۆفییە و بەستنەوەیان بە یەکتر و هەوڵی دۆزینەوەی بونیادی هاوبەشی چەمك و دەستەواژەکان، نەك هەر کارێکی ئاسان نییە بەڵکو – وەك کاتی خۆی عەینولقوضات بۆی چووە – پێویستی بە کەسی ئازادە تێی بگات[٧١٩]، واتا ئەو کەسەی کە دەتوانێ لە پشت راز و ئاماژەکانەوە ئەو مانایانە ببینێ کە باباتاهیر ویستوویەتی راستییە خوداییەکانی پێ بخاتە بەرباس کە وەك عارفێك پێی گەیشتووە. بۆیە ئەو خوێندنەوەیە توێژینەوەی سەربەخۆی پێویستە، نەك وەك ئێمە دەخوازین لە چوارگۆشەی خوێندنەوەیەکی هەمەگیردا جێی بکەینەوە.

رەنگە ئەوەی کاری خوێندنەوەی سەختتر کردووە تەمومژاوی بوونی هزری باباتاهیر بێ، کە تەنانەت لەدوای خۆی بۆ مورید و پەیڕەوکارانی تێگەیشتنی ئەستەم بووە و پێویستی بە گەورە سۆفییەکی وەك عەینولقوضات بووە راڤەی بکات. ئەمە لە لایەك، لە لایەکی ترەوە لەوە دەچێ هەر پاش بابا طاهرەوە بیروبۆچوونەکانی گۆڕانیان بەسەر هاتبێ و تێکەڵ بە هزری ئەوانیتر بووبێ، ئەوەتا لە "الکلمات القصار"دا چەندان وتە هەن کە لە بنەڕەتدا هی ئەو نین، بەڵکو هی سۆفییانی بەر لەون وەك ئەبوبەکری شبلی و ئەبو عەلی روذباری و بونداری شیرازی و...چەندانی دی، کەچی لە نێو وتەکانی ئەودا جێ کراونەتەوە و پۆلێن کراون[٧٢٠].

هەرچۆنێك بێت لە رووکەشدا وا دەردەکەوێ کە باباتاهیر گشتگیرانە چەمك و دەستەواژەکان دەخاتە روو، بە جۆرێك کە وادەرناکەوێ وتەکانی رەنگدانەوەی گەڵاڵەبوونی باوەڕی تایبەتی خۆی بووبێتن. لەگەڵ ئەوەشدا لە نێو هەندێکیاندا، سەربوردەیەکی باباتاهیر دەبینین کە هەم دەقە مێژووییەکانی تر لێی بێدەنگن، هەمیش بە جۆرێك لە جۆرەکان تەواوکەری ئەوەیە کە لەم دەقانەدا وێنای کەسێتی عارفانەی ئەوی پێ کراوە؛ ئەویش گەشەسەندنی کەسێتیە رۆحانییەکەیەتی لە رێگەی هەڵوەستەکردنی لەسەر ئەزموونی خۆی لە هێندێك حاڵ و دەرکەوتەی سۆفییانە و بەرجەستەکردنی بیرکردنەوەی لە ناو ئەو بۆچوونانەی جیهانبینی سۆفییان پێکدێنێ‌و ئەو بە ناپێگەیشتووی زانیون. تەنانەت لە چەند وتەیەکیشیدا

---

(٧١٩) شرح الکلمات, ص١٠.

(٧٢٠) بۆ نمونە وتەکانی لاپەڕەکانی: ٥٠, ٦١, ١٥٢, بەراورد بکە لەگەڵ: الخرکوشي: تهذیب, ص٢٩٢, ٤٥٥. القشیري: الرسالة, ص٤٢٩. ابن خمیس: مناقب, ج٢, ص١٨٧.

تارمایی خوێندنەوەی ناوەندێکی کۆمەڵایەتی – ئایینیش دەبینین، کە وادیارە ئەو خۆی تێیدا ژیاوە و پێیەوە -- بە ڕەتکردنەوەی یان قەبوڵکردنی – کاریگەر بووە.

ڕووخسارەکانی ئەو کەسێتییەی باباتاهیر، لە باسکردنی بۆ "دونیا" و کاریگەریەکانی لە دەستنیشانکردنی ڕەوتی ڕۆحانی عارفدا دیارە؛ لای ئەو بوونە عارف هەر لەخۆوە نابێ و پرۆسەیەکی دوور و درێژە، ئاکامی بڕیارێکی پێشینەیە کە بریتییە لە دەرچوون لە دونیا، لە میانەی بەرزەفتکردنی دەروونی مرۆڤانەوە کە پەیوەستی ئەو دونیایەیە. لەم هاوکێشەیەدا دونیا ئەو شوێنە نییە ڕێگە بە کەس بدات خوداناسی دروست بێت، یاخود وەڵامی ئەو پرسیارانە بداتەوە کە دەشێ پەیوەندییەکی دروستی مرۆڤانەی – خودایی لەسەر دابڕێژرێ، ئەوەندەی کەسانی وەك باباتاهیر بە جەنجاڵییەکانی ژیانێکەوە گرێ دەدات کە تەنیا لایەنە مرۆڤانەییەکەی پەیوەندیی بینراوە، پەیوەندییەك کە مرۆڤ ناچار بە پابەندی بە ئارەزوو و پێداویستییە ژیانییە نارۆحانییەکانەوە دەکاتەوە، لەکاتێکدا ئەو دەیەوێ سنووری ئەو پابەندی و پێداویستییانە ببڕێ و هیچ شتێك لە داڕشتن و شێوەگیرکردنی پەیوەندییە خوداییەکە سەرقاڵی نەکات. بۆیە لە دەستپێکدا دێ سنوورەکانی "دونیایی بوون" دەستنیشان دەکات، تا بزانێ چەندە خۆی لە نێویاندا ماوەتەوە و چۆن بتوانێ بچێتە ئەو دیویانەوە، رایدەگەیەنێ هەموو ئەوەی لە مرۆڤ نزیك بێتەوە و قەبوڵی بکات ئەوە دونیای مرۆڤەکەیە، هەر ئەمەشە لە خوداناسی دووری دەخاتەوە[٧٢١].

بەو پێیە ئەو دەوروبەرەی ئەوی سۆفی تێدایە مەترسییەکی گەورەیە بەسەر بنەمایەکی بنەڕەتی کایە ئایینییەکە، بۆیە دەبێ تا بۆی بلوێ خۆی لەو دونیا ناڕێکە دابڕێ، یانیش هەوڵبدات پێناسەیەکی جیاواز لەوەی لە ئاستی گشتیدا بۆی دەکرێ، بیکات. باباتاهیر خۆی ڕێك وایکردووە، بە جۆرێك لای ئەو دەبێ سۆفی وا لە دونیا تێ بگات کە بەرجەستەکاری ژیانی ئاخیرەتە بەو شێوەیەی لە کولتووری ئیسلامیدا وێناکراوە؛ دونیا وەك پردی "صراط" وابێ کە ڕەنگە بەسەریدا ببورێ یانیش بکەوێتە خوارەوە (ئەمەش ڕێبازی سۆفییە = دەرچوون یان تێچوون)، لەگەڵ هەبوونی تەرازوویەك ( کە دڵی سۆفییە) بە هۆیەوە چاکە و خراپە لە یەکدی جیا بکاتەوە و ڕێگەی ڕاستی خۆی لەسەر ئەو پردە (لە ناو ڕێبازی سۆفیگەریدا)

---

(٧٢١) شرح کلمات, ص٥٠-٥١.

ببینێتەوە[٧٢٢]. ئەو وێنایە بۆ دونیا، بەدەر لە دەلالەتە ئایینییە پەتییەکانی، وا لە سۆفی دەکات هەردەم لە حاڵەتی ئامادەباشی دابێ، ئامادەیی دەرچوون لەو دونیایە و زاڵبوون بەسەر سەرقاڵییەکانی، ئەو سەرقاڵییانەی باباتاهیر لە وشەی تاریکیی باشتری نەدۆزیوەتەوە وەسفی پێ بکات، ئیدی پێی وایە ئەوەی دونیا بۆ مرۆڤی هەیە تاریکییە، ئەوەی سۆفیش بە لاڕێ دادەبات و وایلێدەکات لەسەر پردی بوونە عارفدا بکەوێ ئەو تاریکییەیە، کە — وەك عەینولقوضات راڤەی کردووە — بریتییە لە حەز و ئارەزوو و خۆشییەکانی دونیا[٧٢٣].

کاتێك دەڵێین "دەرچوون لە دونیا"، دیارە مەبەستمان کۆتایی هێنان نییە بەو ژیانە دونیاییەی پێوەندێکی دەستی مرۆڤایەتیە، بەڵکو دەستنیشانکردنی ئەرکەکەیەتی لە پرۆسەی بوون بە عارفدا، چونکە لەدوا مانایدا دونیا ئەو پەردەیە کە مرۆڤ بە خودا دەگەیەنێ[٧٢٤]، بمانەوێ یان نەمانەوێ دەبێ بەسەریدا بڕۆین، بەو شێوەیەی متمانەی ئەوەمان بۆ دروست ببێ بپەڕینەوە، متمانەش لەوەوە دێت لەو سەرقاڵییە تێ بگەین کە مرۆڤی پابەندی دونیا دەکرد نەك خوداناسین، بێگومان ئەو سەرقاڵییەش لەوەوە نایەت مرۆڤ بە دروستی لە خودا نەگەیشتبێ و کردە ئایینییەکانی سەر زەوی (بەجێگەیاندنی ئەرکە ئایینییەکان) بە بەس بزانێ بۆ راستیی خوداپەرستی و پاشانیش خوداناسین، ئەوەندەی لەمپەرێك هەیە لەبەردەم تێگەیشتنەکە کە لە خودی مرۆڤەکەدایە، ئەویش "دەروون — نفس"یەتی.

دونیایی بوون لە رووبەکیدا (ئەو رووەی بۆ سۆفییان گرنگە) رەنگدانەوەی زاڵبوونی دەروونە بەسەر قەوارەی مرۆڤدا؛ دەروونیش لای باباتاهیر جۆرێکە لە زیندان و قەیدی رۆحی مرۆڤی کردووە، ئەمەش لەوەوە نایەت کە ئەو دەروونە توانایەکی بێشوماری هەبێ و بتوانێ بە ئاسانی رکێفی مرۆڤەکان بگرێتە دەستەوە، بەڵکو لە سروشتی دەروونەوە دێت کە خۆی لە ئارەزووکردنی قەدەغەکراوەکان دەبینێتەوە، ئەو ئارەزووانەی لە بەرامبەریاندا دەروون بێ

---

(٧٢٢) شرح کلمات, ص٥٢.

(٧٢٣) شرح کلمات, ص٥١.

(٧٢٤) شرح کلمات, ص٥٢-٥٣. جێگەی سەرنجە لای بابا طاهر گەیشتن بە خودا هەمان ئەو مەبەستەی لە پشتە, کە لەلای سۆفی کرماشان ئیبراهیمی کرماشانی بینیمان؛ ئەمە گەیشتنێك نییە بە بەهەشت و چێژە ئەبەدییەکانی, بەڵکو لەوێدا عارف بەندی بینینی خودا و گفتوگۆی خودایی دەبێ.

ویستە و ئاراستەکردن و پەروەردەکردنی بەدەست ئەوانەوەیە[725]. رەنگە هەر ئەمەش بێ وادەکات ناساندنی دەروون و دیاری کردنی رەهەندەکانی کارێکی ئەستەم بێت، بۆیە وەك دەڵێ دواجار هەوڵی ناسینی دەروون بە نەناسینی دەگات[726]، مەگەر تەنیا لە هەندێك لە دەرکەوتە رەوشتییەکانییەوە نەبێ، یان با بڵێین لەوەدا نەبێ کە دەروون بەرجەستەکاری ئەو شێوە و جۆرە بنەما رەوشتییانەیە کە دەشێ مرۆڤ بیاننوێنێ و پێی بناسرێتەوە.

لێرەوە باباتاهیر دەچێتە نێو وردەکارییەکانی جۆری رەوشت، نەك پۆلێنکردنی بنەماکان بەو شێوەیەی لە کایەکانی تردا هەیە، بەتایبەت لە هەردوو کایەی ئایینی — شەریعەتی و فەلسەفیدا. بەڵکو دەستنیشانکردنی خودایی بۆ ئەو بنەمایانە و جێگیرکردنی لەنێو زاتی مرۆڤانە لەساتی خەلقکردنی دەرووندا. بەپێی تێڕوانینی باباتاهیر، لەو پرۆسەی خەلقکردنە، بنەمای رەوشتیی گیانەوەریی و فریشتەیی و خودایی و تەنانەت شەیتانیش لە نێو دەرووندا جێی بۆ کراوەتەوە، بۆیە دەبینین لەیەك کاتدا (خوداپەرستی، بەندایەتی، هەڵپەکردن و توندوتیژی و توڕەبوون و تێکشکاندن و بڕین، خواردن و خواردنەوە و خێرایی و خۆبەگەورەزانین و...هتد)ی لەخۆ گرتووە[727]، ئەمەش پێچەوانەی ئەو بۆچوونەی نێو بڕێك لە سۆفییانە کە پێیان وایە دەروونی مرۆڤ بەس خەسڵەتی شەیتانیی هەیە و خراپەیەکی رەهایە[728]. بەڵام لای ئەو سۆفییە هەر بنەمایەکی رەوشتی پەیوەستە بەوەی لێی وەرگیراوە و ئەمەیە وایکردووە مرۆڤ هەم باش بێ و هەمیش خراپ؛ هەم خودایی بێت هەمیش شەیتانیی. واتا رەوشتی مرۆڤانە ناجێگیرە و ئەو جۆری رەوشتەکەی دیاری ناکات و خەسڵەتێکی ئەزەلییانەی هەیە.

سەبارەت بە دەروونی باباتاهیر خۆی، ئەوە لە چەند کورتە وتەیەکدا دەردەکەوێ بەدەست ئەو سروشتەی دەروونییەوە تەواو شەکەت بووە و نەیزانیوە چی لەگەڵدا بکات و چۆن مەرزەکانی دیاری بکات و کاریگەرییەکانی سنووربەند بکات، بۆیە وەك نەیارێکی سەرسەختی خۆی چاوی لێ کردووە و لەو باوەڕە بووە کە ئەگەر هانای خودایی نەبێت ناتوانێ بەتەواوی بەسەریدا رابگات و کاریگەرییە ناجۆرەکانی نەهێڵێ، بۆیە ناچار ئەو رێگەیەی

(٧٢٥) شرح كلمات, ص ص٤٥-٤٦.

(٧٢٦) شرح كلمات, ص٤٨.

(٧٢٧) شرح كلمات,ص٤٦.

(٧٢٨) بۆ نموونە بڕوانە: ابن شاهاور: منارات السائرين, ص٢٩٧.

گرتووه که هەر مرۆڤێکی باوەڕدار دەیگرێتە بەر، ئەویش نزا و پاڕانەوەیە؛ لەمیانەی ئەمەشدا چاوەڕێی ئەوەی لە هێزی خودایی هەبووە بە فریادی بێ و بەنهێنی تۆڵەی باباتاهیری بەندە لە "دەروون" بکاتەوە، لایەنی کەم ئەگەر لەسەر زەویش نەبێ، کە دەبووا ئەو بتوانێ بەرزەفتی بکات، با لە چوارچێوەی جیهانبینی گشتی ئایینیانەوە بێت و ئەو کاتە بێت کە زاتی مرۆڤانەی لەبەردەم زاتی خودایی دەوەستێتەوە، واتا لە رۆژی پەسلان(قیامەت)، ئەوکات باباکەمان بەمجۆرە لەگەڵ خودا دەدوێ: (( خودای من، دەروونی خۆم - کە دوژمنمە - بەراستی پێ نیشاندە، هەرکە ببینم لە بەردەستی خودای گەورە سەری دەبڕم))[٧٢٩].

وا پێدەچێ ئەو تێڕامانەی باباتاهیر لە هەستکردن بە بێهێزیی و ناجێگیریی دەروونییەوە بێت، بەجۆرێك متمانەی ئەوەی نەبووە دەروونی هاوکاری بێت لە خوداناسین و پرۆسەی بوون بە عارف لەسەر زەوی، ترسی زۆری لەو دەروونەی وا دەکات تەنانەت — لەهەندێ کاتدا — لە باسی خۆشییەکانی بەهەشتیش بێ دەنگ بێت، چونکە باسی لەوجۆرە دەروونی پڕ لە ئارەزوو دەکات و رکێفی بەدەست ئەوەوە نامێنێ[٧٣٠]، لەمەشدا دیارە ئەوەندەی ئەو سۆفییە هەوڵیداوە دەروونی خۆی پشتگوێ بخات و نەیوورووژێنێ، ئەوەندە نەیتوانییەوە تەواو بەرزەفتی بکات و نەهێڵێ لە چرکەساتی ئامادەیی ئارەزووەکاندا لێی هەڵگەڕێتەوە.

جێگەی باسە، لەدەرەوەی دەقی "الكلمات القصار" و لەچوارچێوەی دەقەکانی ئەهلی هەقیشدا باسێکی ئەو لاوازییە دەروونییە، بەڵام لەچوارچێوەی گێڕانەوەیەکی چیرۆك ئامێزدا، هەیە و بریتییە لە خۆشەویستی بابا طاهر بۆ موریدێکی ئافرەتی کە تەرکی دونیای کردبوو و لە خانەقاکەی ئەودا دەژیا و بە فاطمە لوڕە ناسراوە؛ ئەوکاتەی شاەخوشین دێتە لای باباتاهیر، ئەو ژنە واز لە خزمەتی سۆفییەکەی خۆی دەهێنێ و بڕیاردەدا لەگەڵ خوشیندا بڕوا، سۆفییەکەی هەمەدانیش ئۆقرەی لەبەر دەبڕێ و ناتوانێ بەسەر ئارەزووە دەروونییەکانی زاڵبێ، بۆیە شاەخوشین -- وەك نوێنەری هێزی خودایی — بەڵێنی بەیەکگەیشتنی ئاخیرەتیی

---

(٧٢٩) عين القضاة: شرح كلمات, ص٩٩.

(٧٣٠) شرح كلمات, ص٩٨.

پێدەدات[٧٣١]، کە ئەمەش لە ناوکۆی ئەو دەقە ناپینیانەوە ئاماژەیە بۆ بەرزەفتی دەروونیی بە کردەی خودایی، کە وەك تازە بینیمان باباتاهیر خۆی قسەی لەسەر دەکرد.

هەرچۆنێك بێت، ئەوەی باباتاهیر و سۆفییانی هاوشێوەی دووچاری ئەو پەشۆکانە دەروونییە دەکات، لە دژایەتی نێوان بنەما رەوشتییەکان دەرناچێ، کە ئەو سروشتە نەیارێتییەی بە دەروون بەخشیوە و بەو ئاراستەیەی دەبات بکەوێتە ژێر باری دونیا و وروژانی ئارەزووە جەستەییەکان و ئاوا ویستی خۆی لەدەست بدات، بۆیە کاری مرۆڤی دروست (دیارە مەبەست سۆفییەکانن)، ئەگەر بیەوێ چاوەڕێی رۆژی پەسلان و هانای خودایی ئەوکات نەکات، بریتی دەبێ لە گوێڕایەڵی نەکردنی ئەو دەروونە و جیهادکردنە لە دژی[٧٣٢]، لە پێناو بەرزەفتکردنی و کەمکردنەوەی کاریگەرییەکانی بەسەر کردەی بوونە عارفەوە. لێرەشدا بەکارهێنانی ووشەی "جیهادکردن — المجاهدة" بۆ گوزارشتکردن لە جەنگان دژ بە دەروون، رێك خۆدیتنەوەی بابا طاهرە لە نێو خوێندنەوەی باوی سۆفییانە بۆ ووشەکە و دارشتنەوە و بەکارهێنانییەتی لە ناوکۆی گشتی هزرەکەیاندا؛ لەو ناوکۆیەی بەرزەفتی دەروون ئەو شێوە جیهادەیە کە سۆفییان باوەڕیان پێی هەبووە و لە نێو کۆمەڵی ئیسلامیدا بانگەشەیان بۆ کردووە و بۆتە کۆڵەگەیەکی بنەڕەتی هەر ئەزموونێکی سۆفییانە، تەنانەت وای بۆ دەچن سۆفیگەری وەك هزر و وەك کردار بەبێ جیهادی دەروونیی راست دەرناچێ[٧٣٣].

ئەو رێگەیەی باباتاهیر دەیەوێ بەهۆیەوە ئەو جیهادە بکات و دەروونی بەرزەفت بکات، هەژارکردن و بەجێنەهێنانی داخوازییەکانییەتی، لەمەشدا دیسان خۆی دەداتەوە دەست خودا، بەو مانایەی کە چەمکی تەوەکول ئاماژەی پێ دەدات. ئیدی پشت لە خەڵك دەکات[٧٣٤]، چونکە دەبێ "بوون لەگەڵ خودا" بەس بێت تا ئەو سۆفییە پێویستە مرۆییەکانی نەمێنێ؛

---

(٧٣١) لەم بارەوە بگەڕێوە بۆ: صديق صفی زاده: دانشنامه نام آوران يارسان, انتشارات هيرمند, تهران, ١٣٧٦هـ.ش, ص٧٠.

(٧٣٢) عين القضاة: شرح كلمات, ص٤٦.

(٧٣٣) لەبارەی "جیهادی دەروون" لای سۆفییان بەگشتی بگەڕێوە بۆ: محمد الرحموني: الجهاد من الهجرة إلى الدعوة إلى الدولة — بحث في مواقف العلماء المسلمين في القرنين الرابع و الخامس للهجرة, دار الطليعة, بيروت, ٢٠٠٢, ص ص ١١٦-١٢١.

(٧٣٤) عين القضاة: شرح كلمات, ص١١٣.

وەك قەلەندەرێکی بێ ماڵ و بێ لەنگەر لە بەیانییەوە تا ئێوارە بخولێتەوە و باکی بەژیانی ئەوانیترەوە نەبێ[٧٣٥]. بێگومان ئەمە بەمانای "بەرەنگاربوونەوەی دەروون بە دەروون" نییە، کە کارکردن و ماندووبوونە لەپێناو زاڵبوون و چەپاندنی جەستە[٧٣٦]، بەڵکو دەبێ هەڵبژاردنی ئەو شێوە ژیانە هەژارانەیە لەخۆوە بێ، چونکە رەنگە "هەژاری – الفقر" خۆی ببێتە مەبەستێك و جارێکی تر سۆفی لە ناسینی خودا سەرقاڵ ببێ. بۆیە دەبێ باشترین جۆری سەرەدەری لەگەڵ دەروون فەرامۆشکردنی بێ، تا بەمە سۆفی بتوانێ بەتەواوی خۆی بۆ خودا تەرخانبکات و کاتی ئەوەی نەمێنێ بیر لە ئارەزووە دەروونییەکانی بکاتەوە؛ ئەگەر مرۆڤ دەیەوێ دەروونی خۆی بکوژێ، با پشتگوێی بخات[٧٣٧].

تا ئێرە بۆچوونەکانی باباتاهیر لەسەر دەروون و خەوشەکانی و هەوڵی بەرزەفتکردنی، کەم تا زۆر، دووپاتکردنەوەی کرۆکی هەمان ئەو بۆچوونانەیە کە لە کولتووری سۆفیگەریدا لەسەر دەروون هەبووە[٧٣٨]، هەروەها لەپانتایی کوردیشدا خرابووە روو، بەتایبەت وەك لە باسی مظەفەری کرماشانی و ئەبوبەکری کوڕی یەزدانیاردا بینیمان. تەنانەت سۆفی هەمەدان بە شێوەی کوڕی یەزدانیار، بەڵام بە دەستەواژەی ساکارتر و بە رۆحانییەتێکی پتر لە گوزارشتکردندا، هەمان ئەو بەراوردکارییەش دەکات کە سۆفییەکەی ورمێ لە نێوان رۆح و دەروون[٧٣٩] کردبووی. لە کورتە وتەکانیدا دیارە ئەو بە ئاگادار بوون لەو کولتوورە پێشینەیە بەگشتی و وەك گفتوگۆیەك لەگەڵیدا تێزەکانی خۆی دارشتوە و قسە لەسەر ئەو چەمکە سەرەکییە دەکات. خۆ رەنگە ئەو – جگە لە کولتووری سۆفیگەری – ئاگاداری تێگەیشتنی فەلسەفەی ئیسلامیش بۆ دەروون، لە رووی چییەتی و دەرکەوتەکانییەوە، بووبێ، بەتایبەت ئەگەر ئەو بۆچوونە راست بێ کە باس لە پەیوەندیی ئەو بە فەیلەسوفی هاوسەردەم و هاوشاری

---

(٧٣٥) ئەمە ناودرۆکی چوارینەکەی بابا طاهر بوو, کە لەسەرەتای ئەو بەشەدا, وەك نموونە لەسەر حاڵی قەلەندەری هێنامانەوە.

(٧٣٦) عين القضاة: شرح كلمات, ص٩٩.

(٧٣٧) شرح كلمات, ص٨٥.

(٧٣٨) هەر بۆ نموونە بگەڕێوە بۆ: السلمي: عيوب النفس, ص ص ٥-٣٧. القشيري: الرسالة, ص ص٢٦٤-٢٦٨.

(٧٣٩) عين القضاة: شرح كلمات, ص٤٥.

خۆی ئیبن سینا (٣٧٥-٤٢٨ك/٩٨٦-١٠٣٧ز)دەکات[٧٤٠]، کە "دەروون" کۆڵەگەیەکی بنەڕەتی کۆی فەلسەفەی ئەوی پێکدەهێنا[٧٤١]. لەگەڵ ئەوەشدا، ئەوەی بابا طاهر لەو تێگەیشتنانە بۆ "دەروون" جیا دەکاتەوە بەکارهێنانی ماناکانە بۆ تێگەیشتن لە دەروونی خۆی و دەرچوون لەو حاڵە راڕاییە دونیاییەی تێیدا بووە.

ئەگەرچی رەنگە سنوورداربوونی کاریگەریی دونیا و بەرزەفتبوونی دەروون، خۆتەرخانکردنی سۆفی بۆ خودا فەراهەم بکات، بەڵام مەرج نییە مرۆڤ، لایەنی کەم کەسێکی وەك باباتاهیر، ئاسوودە بکات. چونکە ئەو جۆرە ژیانەی لە ئاکامی ئەم پرۆسەی سنووردانان و بەرزەفتکردنە دێنە ئاراوە، تاڵێتی خۆی هەیە و وا لەو کەسە دەکات بە دەوروبەرەکەی نامۆ بێت. نامۆییش بارێکە هەموو کەسێك بەری ناگرێ، بەتایبەت ئەو جۆرەیان کە باباتاهیر پێناسەی دەکات و گەڕانەوەیە بۆ لای خودا، بەڵام هەم رێگا و هەمیش شێوەی ئەو گەڕانەوەی تێدا ون دەبێ، ترسی هەرە گەورەی ئەویش لەو نامۆ بوونەیە؛ چونکە وەك خۆی شەرحی حاڵی لەگەڵ نامۆیی دەکات و دەڵێ: (( هەموو جۆرە تاڵییەکم چەشتووە، لە نامۆیی تێکەڵ بە سەرسامی تاڵترم نەبینیوە))[٧٤٢]. لەگەڵ ئەوەشدا پێدەچێ ئەو لە کۆتاییدا لەگەڵ نامۆییش راهاتبێ، نەك هەر ئەمە بەڵکو چێژی لە تاڵییەکەشی وەرگرتبێ، وەك پێشتریش لە پەیوەندیی ئەو بە "شاه خوشین" هەمان حاڵمان بینی، چونکە ئەوە نامۆییە دەبێتە هۆی ئەوەی بە تەواوی دوور بکەوێتەوە و بۆ هەمیشە لە حاڵی "وەجد"دابێ و بیکاتە رێبازێکی خوداناسین و تێکەڵبوون بە ناوە خوداییەکان[٧٤٣].

بێگومان بەدەر لەو وتانەی شرۆڤەی ئەزموونی رۆحانی بابا طاهرمان پێ کرد، کورتە وتەکانی تریش گرنگی خۆیان هەیە لە پەی بردن بە جومگە بنەڕەتییەکانی تێگەیشتنی ئەو لە سۆفیگەری بە گشتی، جا چ ئەو وتانە بن کە جەخت لەسەر بواری تیۆری هزری سۆفیگەری دەکەنەوە وەك: " زانست، ناسین، بینین، حەقیقەت، عەقڵ، رۆح، ئاماژە، فەنا و بەقا،

---

(740) V.Minorsky: Baba – Tahir, EI, Vol.I, P.839.

(٧٤١) بۆ نموونە بڕوانە: کتاب الشفاء - الفن السادس من الطبیعیات(علم النفس), المؤسسة الجامعیة للدراسات و النشر, بیروت, ١٩٨٨.

(٧٤٢) شرح کلمات, ص١٦٣.

(٧٤٣) شرح کلمات, ص١٦٣.

یەکتایی و...هتد"[٧٤٤]، ئەمانەش زۆربەیان پتر روونکردنەوە و بەرجەستەکردنی ئەو تێزانەن کە ئەو ویستوویەتی عیرفانی سۆفییانەی پێ روونبکاتەوە. یانیش ئەو وتانەی دەچنە بواری کردەکیی سۆفیگەرییەوە وەك: "مەقام و حاڵەکان، ملکەچی، گوێڕایەڵی، تەرکەدونیایی، مەرگ و ژیان، کات و...هتد"[٧٤٥]. خۆ ئەمە کتێبێکە لەبارەی تەواوی تەصەوفەوە، ئەو تەصەوفەی لای ئەو لە سەرووی ژیان و مەرگەوەیە، ئەگەرچی لە نێو ئەو دوو چەمکەوە خۆی دەناسێنێ و جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە ژیانێکە لەگەڵ هەقدا و مەرگی هەر جۆرە ژیانێکە کە دەشێ بابای سۆفی لەو لەگەڵ بوونە دووربخاتەوە[٧٤٦].

## دووەم: هەژموونی شەریعەت و پاشەکشەی دەرکەوتە هزرییەکانی سۆفیگەری

### ١- زەمینەی ئایینی گەشەسەندنی سۆفیگەری سوننی لە کوردستاندا

ئاسان نەبوو ئەو رەوتەی سۆفیگەری کە جەختی لەسەر راڤەی باطنی و جیاوازی لەگەڵ ئەوانیتری نێو کایەی ئایینی، لەسەر بنەمای حەقیقەت و شەریعەت و پشتگوێ خستنی "بنەما شەرعییەکان"، دەکردەوە، بە بەهانەی پابەندبوونی رەها بە حەقیقەت، هەژموونی بەسەر هزری ئایینی وڵاتەکە بسەپێنێ، رەنگە ئەمەش بگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە رەوتەکە زێتر لە رەوتەکانی تر بە پەراوێزخراوە. لە لایەن دەسەڵاتی سیاسی و لە پشتیەوەش دەسەڵاتی ئایینی — فیقهی و پەیڕەوکارانی شەریعەت، نەك هەر رێیان لێ دەگرتن بەڵکو سنووریشیان بۆ تەشەنەکردن و بەریەککەوتنیان لەگەڵ خەڵکی ئاسایی دادەنا.

ئەوەی کە هاوکاری ئەو بە پەراوێزخستنەش بوو، رەوشی سیاسی — ئایینی خەلافەت و بەشی رۆژهەڵاتی جیهانی ئیسلامی بوو، کە لە سەدەی پێنجەمی کۆچیدا بە ئاراستەی

---

(٧٤٤) شرح کلمات, ص ص١١-٤٩, ٥٤-٦٢, ١٤٥-١٤٦, ١٤٩-١٥٢.

(٧٤٥) شرح کلمات, ص ص٦٢-٨٤, ٩٠-١٠٤, ١٠٧-١٤٣.

(٧٤٦) شرح کلمات, ص١٥٢.

گەشەسەندن و هەژموونی ڕێبازە فیقهییە سوننەکان بوو[٧٤٧]. ڕەمزە دیارەکانی نێو ئەو ڕێبازانەش، لە فەقیە و زانا ئوسوڵییەکان، گومانی زۆریان لە تەواوی کولتووری سۆفیگەری کردووە و خستویانەتە ژێر باری پرسی ڕەوایی هەبوون لە پانتایی ئیسلامیدا. هەروەها بانگەشەی هەڵوەشاندنەوەی ئەو چەمکانەیان دەکرد کە گوتاری سۆفیگەری بەرهەمی دەهێنان و پێگەی ئایینی خۆی لەسەر دامەزراندبوو و بە هۆیەوە خوێندنەوەیەکی جیاواز و ناباوی پەیوەندیی نێوان مرۆڤ و خودا و پرۆسەی خوداپەرستی بە گشتی دەکرد[٧٤٨]، بە هەمان شێوە ئەو حاڵەشیان قەبوڵ نەبوو، کە گەلی سۆفییانی پێ دەناسرایەوە و گۆشەگیری و دوورەپەرێزی ببووە ناونیشانی بنەڕەتییان، ئەمە سەرباری دژایەتیکردنی ڕاستەوخۆیان بۆ ئاهەنگسازی ئایینی(سەماع) و نواندنی دیاردەی سەروو ئاسایی (کەرامەت) و...هتد[٧٤٩].

ئەگەر سۆفیگەری دەیویست لە بەردەم بەم گوتارە فیقهییەدا خۆی ڕابگرێ و لە پانتایی ئیسلامیدا نەکەوێتە بەر توندو تیژی ئەوانەی بە "فەرمی" خۆیان بە بەرپرسی " باوەڕداریی دروست" دادەنا، وەك هەندێك لە ڕەمزەکانی وایان لێ بەسەر هات ( کە دیارترینیان حەلاج و پەیڕەوکارانی بوون)، دەبووا بە تیژەکانی خۆی دابچێتەوە، لەو بازنە هزرییەی کاری تێدا دەکرد بچێتە دەرەوە و شێوەیەکی ئەوتۆ وەربگرێ کە لە میانەیدا خۆی بداتە دەست ئەو دراوە عەقیدەییانەی گوتاری شەریعەتیی بەرهەمی هێنابوون و ڕەوایی پێ بەخشیبوون.

تەنانەت لەنێو ئەلقەی سۆفییان خۆشیاندا سەرباری فەقیهەکان، کەسانێك دەردەکەون بانگەشەی چاکسازی و پێداچوونەوەی بنەما جێگیرەکانی هزرەکەیان دەکەن و دەیانەوێ لە دیدی شەرعییەوە تەواوی کولتووری سۆفیگەری هەڵبسەنگێننەوە، پرۆسەیەك دەست پێدەکەن کە بریتی دەبێ لە هەڵاوێردکردنی تێزی سۆفییانەی گونجاو لە هی نەگونجاو بەپێوەری

---

(٧٤٧) لەبارەی ئەم گۆڕانانە بگەڕێوە بۆ: عبد المجيد أبو الفتوح بدوي: التاريخ السياسي و الفكري للمذهب السني في المشرق الإسلامي, عالم المعرفة, جدة, ١٩٨٣, ص١١٥ بەدواوە.

(٧٤٨) هەر بۆ نموونە بڕوانە: الملطي: التنبيه و الرد على اهل الأهواء و البدع, تقديم و تحقيق: محمد زينهم محمد عزب, مكتبة مدبولي, القاهرة, ١٩٩٣, ص ص٩٢-٩٣. الأسفراييني: التبصير, ص ص١٣٢-١٣٤. بلخي: بيان الأديان, ص ص٨٧-٨٨.

(٧٤٩) الملطي: التنبيه, ص٩٣. الطبري: الرد على من يحب السماع, تحقيق: مجدي فتحي السيد, دار الصحابة للتراث, طنطا, ١٩٩٠, ٢٧-٣٦

شەریعەت، هەروەها پێکبەستنەوەی ڕەوتی سوننی و دیاردەی سۆفیگەریی، پاشان پێداگرتن لەسەر هەبوونی پەیوەندییەکی تەواوکاریی لە نێوان هەردووکیان، ئەمە سەرباری گەڕان بەدوای هاومانایی چەمکەکانیان لەگەڵ ئەوەی لە دەقە ئایینییەکان (قورئان و فەرموودە)دا هەیە، تا بەمە بیسەلمێنن ئەو زانستەی ئەوان قسەی لەسەر دەکەن ڕەسەنێکی شەرعی هەیە[٧٥٠] .

بێگومان سۆفیگەری لە کوردستانیش لەم گۆڕانانە بەدەر نەبوو، هەژموونی ڕەوتی سوننەگەراش بەسەر تەواوی جیهانی ئیسلامی، سنووری بڵاوبوونەوەی ڕەوتەکەی لە نێو دەستەبژێری ئایینی وڵاتەکەی بەرفرە کردووە، ئیدی هەر دیاردەیەکی تری وەك سۆفیگەری، ئەگەر دەخوازێ بە ئاشکرا کاربکات و لە نێو ئەو دەستەبژێرەدا پایەی هەبێ، دەبووا جۆرێك لە پابەندی بە ڕەوتەکە هەبووایە یاخود لایەنی کەم لە چوارچێوەی سنوورەکانیدا خۆی بناساندبووایە، ئەگەرنا کەسی سۆفی جێی گومان دەبێ و لە گوتاری فیقهیدا ڕووبەڕووی ڕەخنەی توند و بە پەراوێز خستن دەبۆوە[٧٥١]، تەنانەت کەمێك دوای قۆناغی توێژینەوەکەمان، لەداردانیشی لێ دەکەوێتەوە[٧٥٢]، یانیش لایەنی کەم ئەو تەرزە سۆفییە لەنێو مێژوو وەدەردەنرا و تەواوی کولتوورەکەی پشتگوێ دەخرا، وەك لە حاڵەتی شاخوشین و باباتاهیر و ئەوانیتردا بینیمان.

ئەو لە قالبدانەی سۆفیگەری کاریگەریی بەسەر چەندایەتی و چۆنییەتی هزرەکەدا هەبووە، بەتایبەت لەسەدەی پێنجەمدا، ئەگەرچی لەوە ناچێ ئەو مۆدێلە قەبولکراوەی سۆفیگەری

---

(٧٥٠) لە دیارترین ئەوانەش کە لەم گۆشەنیگایەوە سۆفیگەریان خوێندۆتەوە: ئەبو نەصری سەڕاج، خەرگوشی، قوشەیری هجویری، بگەڕێوە بۆ: اللمع، ص ص ١٨-١٩، ٢٨، ٥١٦-٥٥٥ . تهذيب الأسرار، ص ص ٣٩٨-٤٠٢. الرسالة القشيرية، ص٦-٣١. كشف المحجوب،ج١، ص ص٢٠٣- ٢١٣، ج٢، ص٥-١-٥٠٢. هەروەها، بۆ شرۆڤەی بۆچوونەکانیان، بڕوانە: عبد الرحمن بدوي: تاريخ التصوف، ص ص٩١- ١٠٣.
Ahmet. T. Karamustafa: Sufism, pp87-108.

(٧٥١) هەر بۆ نموونە بڕوانە ڕەخنەی ئیبن حەزمی ئەندەلوسی (م٤٥٦ك/١٠٦٤ز) لە سۆفییەکی شاری نصێبین و هاوسەردەمی خۆی، بە ناوی ئەبو حاضر، کە گوایە باوەڕی بە ناوێتەبوونی خودایەتی و مرۆڤایەتی هەبووە. بڕوانە: الفصل، ج٣، ص١٤٣. لەوەدەچێ هەر ئەو بۆچوونانەی ئەبو حاضری نصێبینی یە وای کردووە جگە لە ئبن حەزم و دیدە ڕەخنەییەکەی، لە سەرچاوەی تردا زانیاری لەسەر نەبێ.

(٧٥٢) ڕەنگە نموونەی هەرە دیار هەر ئەو عەینو لقوضاتی هەمدانی یە بێت کە پێشتر پێناسەمان کرد؛ لە هەمەدان بە کوفر و زەندەقە و بانگەشەی پێغەمبەری تۆمەتبارکرا و لە داردرا. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: نصر الله پورجوادي: عين القضاة، ص ص١٢-٣٨.

پانتاییەکی بەرفرەی لە گۆڕەپانەکە گرتبێ، بەڵکو وا دیارە لە ناکامی ئەو گۆڕانانە بە گشتی سۆفیگەری لە پانتایی کوردیدا پاشەکشەی کردبێ، بۆیە بەدەگمەن ناوی سۆفییانی وڵاتەکە دەبینین. لەلای ئەو نووسەرانەش کە پەرۆشی نوسینەوەی هزر و سەربوردەی سۆفییانن نەپرژاونەتە سەر کەسایەتییە سۆفییەکانی ئەوێ؛ هەر کەسێك چاو بە "كشف المحجوب"ی هجوەیری بخشێنیت قەوارەی ئەو پاشەکشەیە دەبینێت. لەوێدا، لەو بەشەی بۆ بەسەرهاتی سۆفییانی هاوسەردەمی نووسەر لە دەڤەرە جیاکانی جیهانی ئیسلامی تەرخانکراوە، ناوێکی ئەوتۆمان بەرچاو ناکەوێ سەر بە وڵاتەکە بێ یانیش - وەك سۆفییانی پێشووتر - خودان بۆچوون و تیژی سۆفییانە بووبێ[٧٥٣].

بێگومان شاری دینەوەر، وەك بنکەی سەرەکی هزری سۆفیگەری لە پانتاییەکە، زوو کەوتۆتە ژێر باری ئەو گۆڕانکارییانەوە، ئەو تێکەڵبوونەی لە نێوان حەقیقەت و شەریعەت لەوێدا هەبوو و بانگەوازی سۆفییانی ئەوێ بۆ پابەند بوون بە بنەما شەرعییەکان وەك پێشمەرجێکی بوونە سۆفی[٧٥٤]، وایکردووە زۆرینەی سۆفییەکانی لە سنووری شەریعەتەوە هزری خۆیان دابڕێژن، بەمەش لە زوویەکەوە لەوێدا دیاردەی کەسی سۆفی فەقیهمان بەرچاو دەکەوێ. بێگومان — وەك لە سەرەتای توێژینەوەکە ئاماژەمان بۆ کرد — ئەو یەکانگیرییەی لەوێ لە نێوان ڕێبازی فیقهی "سوفیانیی" و سۆفیگەریدا هەبووە، ڕێگەی دەرکەوتن و چەسپینی ئەو جۆرەی سۆفیگەری پتەو کردبوو، تا ئەوکاتەی ڕێبازەکە لە شاردا پەیڕەوکاری هەیە، هەر سۆفی سوفیانیی دێنە بەرچاو، وەك لەگەڵ سۆفی بەناوبانگ و خاوەن پێگەی بەرزی ئەوێ ئەبولعەباس ئەحمەدی کوڕی حەسەنی کوڕی عەنانی کونکەشی(٣٥٩ — ٤٤٩ك/ ٩٧٠- ١٠٥٧ز) دیارە، کە وەك سۆفی و فەقیهێکی ئەو مەزهەبە قسەی لەسەر دەکرێ و بە خاوەن کتێب و قەڵەم دەناسرێ، تەنانەت دەڵێن نزیکەی شەست بەرهەمی نوسراوی هەبووە[٧٥٥].

---

(٧٥٣) كشف المحجوب, ج١, ص٣٧٥-٣٩٢.

(٧٥٤) الأنصاري: طبقات, ص٣٠١.

(٧٥٥)السلفي: معجم, ص١٠٤. الذهبي: تاريخ الإسلام, ج٣٠, ص١٩٨. الصفدي: الوافي, ج٦, ص١٨٩. جێگەی باسە ئەو سۆفییە لە دوای خۆشیدا کوڕ و نەوەکانی بەردەوامیان بە کلتوری ئەو داوە, تا ئێستا پاشماوەی گۆڕی یەك لەنەوەکانی بەناوی مەحمود کە لەساڵی (٥٥١ك/ ١١٥٦ز) مردوە, لە گۆڕستانێکی کۆنە شوێنی دینەوەر ماوەتەوە, بڕوانە: مسعود گلزاري: كرمانشاهان, ص٢٨٤.

بێگومان لەدوای برەوسەندن و تەشەنەکردنی ڕێبازی شافعی لە نێو کوردان و لە وڵاتەکەیاندا و هەژمونی ئەو ڕێبازە بەسەر کایەی فیقهی و بەرتەسك بوونەوەی ڕێباز و ڕەوتە ئاینییەکانی تر، ئەگەری دەرکەوتنی سۆفیی شافعی مەزهەب فراوان بووە. لە شوێنی جودا جودای ئەم توێژینەوەیە ئاماژە بۆ جۆرێك لە پەیوەندیی لە نێوان ئەو ڕێبازە فیقهییە و هزری سۆفیگەری کراوە؛ هەر لە مەیلی زانایانی شافعی بە تایبەت فەقیهێکی وەك ئبن گەج بۆ حەلاج بگرە تا یاوەرێتی سۆفییەکی وەك ئیبراهیمی کرماشانی لەگەڵ فەقیهانی شافعی و گرنگیدانی ئەبوبەکری کوڕی یەزدانیار بە دید و بۆچوونەکانی شافعی و چەندان نموونەی تر، کە هەموویان ئاماژەن بۆ سەرەتاکانی یەکانگیریی ڕێبازەکە و دیاردە ئاینییەکە.

لە ڕاستیدا گوتاری گشتی سۆفیگەری سوننی هەوڵی جێکردنەوەی شافعی لە نێو بازنەی بیرکردنەوەی داوە و ویستوویەتی پێگەی ئەو کەسایەتییە لە نێو شەریعەت وەك بەهانەیەك بۆ بەخشینی ڕەوایی بەم بیرە بەکاربهێنێ، ئەو خوێندنەوەیەی شافعی بە ئاشکرا لە کتێبێکی سوللەمی دیارە بە ناوی "كلام الشافعي في التصوف"، لەوێدا ئەو ڕابەرەی ڕێبازە فقهیەکە، لە ڕێگەی بەستنەوەی تێگەیشتنی ئەو بۆ ڕەوشتی ئایینی و بەستنەوەی بە ڕەفتاری سۆفییانە، وەك دۆستێکی سۆفییان و گوتەبێژێگ لەسەر ڕێباز و نەریتی سۆفییانە خراوەتە ڕوو [٧٥٦]. ئەمە لەکاتێکدا زۆر لەو بۆچوونانەی شافعی لە بارەی سۆفیگەری و بنەماکانی، لە نێوەندی فیقهیەوە، بە گومانەوە تەماشا دەکرێ و بە ڕاست نازانرێ [٧٥٧]. هەر چۆنێك بێت هەر لە کتێبەکەی سوللەمی ئاماژە بە کەسایەتی پانتاییەکە، بە تایبەت یەك لە دینەوەرییەکان بە ناوی ئەبوبەکر محەمەدی کوڕی یەعقوبی دینەوەری، کراوە کە گرنگی بەو پەیوەندییەی شافعی و سۆفیگەری داوە [٧٥٨]، کە دەشێ ئەمەش بەڵگەیەك بێ لەسەر ئیشکردن و خستنە بەرباسی پەیوەندییەکە لە نێوەندی سۆفیگەری لە وڵاتەکەدا.

ئەوەی لە گەشەسەندنی هزری سۆفیگەری ئەو شارە ڕامێنێ درك بەو یەکانگیرییەی ڕێباز و کایەکە دەکات و دەبینێ لە زوویەکەوە سۆفی شافعی پانتاییەکی بەرفرەی دیاردە

(٧٥٦) كلام الشافعي في التصوف, تحقيق: احمد طاهری عراقی, ضمن: مجموعة آثار, ج٢, ص ص١٧٤-٢٠٥.

(٧٥٧) بۆ زانیاری زیاتر لەم بارەوە بڕوانە: ابو الخیر تراسون: التصوف في القرنين الثاني و الثالث الهجريين و موقف الفقهاء الأربعة منه, اطروحة دكتوراه, جامعة ام القرى, مكة المكرمة, ٢٠٠٢, ص ص٣٤٠-٣٦٤.

(٧٥٨) السلمي: كلام الشافعي, ج٢, ص ١٨٣.

تایبنییەکەیان گرتووە، ئەوەتا سۆفی دەبینین خەریکی خوێندنی ئەو ڕێبازە فیقهییەیە، وەك ئەبولقاسم عەبدولصەمەدی دینەوەری( م٣٩٧ك/١٠٠٦ز )، کە وەك فەقیهێکی وتارخوێن و جێبەجێکاری بنەماکانی شەریعەت دەردەکەوێ[٧٥٩]، بگرە هی وایان تێدایە بوونەتە زانای دیاری بواری زانستە شەرعییەکان، وەك عەلی کوڕی موسای دینەوەری ناسراو بە ئەبولحەسەنی سۆفی، کە بۆتە فەرموودەگێڕەوەیەکی بەرچاوی نەك هەر شارەکەی خۆی، بەڵکو لە دەرەوەی ئەوشارەشدا ناوی دەرکردووە[٧٦٠]. ئەو ویستویەتی وێنەیەکی دروستی شافعی لە نێو گوتاری فیقهییدا بخاتە ڕوو، بۆیە هەوڵیداوە تۆمەتی شیعەبوونی شافعی ڕەتبکاتەوە، بۆیە بە پشتبەستن بە خەوبینین بە پێغەمبەر و ئەو هێزە مینۆکییەی لەمجۆرە خەونەدا هەبوو، جەختی لەسەر پاکیی باوەڕی شافعی و پەیڕەوکارانی کردۆتەوە[٧٦١].

هەر چۆنێك بێت، بە وردبوونەوە لە سەربوردەی سۆفییانی قۆناغەکە، دەردەکەوێ برەوسەندنی سۆفیگەری سوننی لەسەر حیسابی پاشەکشەکردنی تیز و وتە و گوتارە سۆفییانەکانی ئەو کەسانەیە، بەجۆرێك کە هیچ کامیان وەك بەرهەمهێنەری هزری سۆفیگەری دەرنەکەوتوون و سۆفیبوونیان زیاتر بریتی بووە لە بەرجەستەکردنی حاڵەتی سۆفییانە، ئەوەتا وەك کەسیی خواپەرست و تەرکەدونیا بەرچاودەکەون، هەروەها وەك پابەند بە ژیانی نەداری و پەیڕەوکاری توندڕەوی بنەما ڕەوشتییەکان وێنا دەکرێن[٧٦٢]، ئەگەر بەتایبەت باسیش بێتە سەر ڕەهەندی سۆفییانەی کەسێتیان، ئەوا تەنها هەندێکجار ئاماژە بۆ توانای کەرامەتنوێنیان کراوە[٧٦٣].

کەواتە لێرە بەدواوە ئەوەی لە کەسێتی سۆفیدا گرنگ بووە پابەندبوونەکەی بووە بە شەریعەت، لەگەڵ خۆخەریکردن و بەرهەمهێنانی ئەو زانستانەی لە دووتوێی ئەم شەریعەتەدا جێیان دەبۆوە، نەك هزرێك کە دەشێ سنوورەکانی بەزاندبێ و بە لەڕێ لادەر بخوێنرێتەوە. بە دەستەواژەیەکی تر، لێرە بەدواوە سۆفیگەریی تیۆریی کە لە نێو بازنەیەکی سەربەخۆدا بیری

---

(٧٥٩) سبط ابن الجوزي: ذيل, ص ص٢٧١-٢٧٣. السبكي: طبقات الشافعية, ج٣, ص٣٢٩-٣٣٠.

(٧٦٠) القزويني: التدوين, ج٤, ص١١٧.

(٧٦١) القزويني: التدوين, ج٣, ص٤٢٩.

(٧٦٢)السلفي: معجم, ص١٠٤. سبط ابن الجوزي: ذيل, ص ص ٢٧١ – ٢٧٣.

(٧٦٣) الخطيب: اخبار الصوفية, ص٧٢. السمعاني: الأنساب, ج٢, ص٥٣١ . سبط ابن الجوزي: ذيل, ص٣٨٠.

دەکردەوە، جێگەی خۆی بۆ سۆفیگەریەکی پراکتیکی چۆڵ دەکرد، کە تەنیا هەڵسوکەوت و ڕەفتاری ئایینی پەیڕەوکارانی خەسڵەتەکانی ناسنامەکەی دەردەخست، ئەگەرنا ئەو خۆی لە نێو بازنەی هەژموونگەرای شەریعەتدا بیری دەکردەوە.

**٢- شێخی ئیسلام ئەبولحەسەنی هەکاری و برەوپێدانی سۆفیگەریی سوننی:**

سۆفییەك کە دەقاودەق دەربڕی ئەو گۆڕانانە بێت کە بەسەر هزری سۆفیگەری لە پانتایی کوردیدا هاتووە ئەبولحەسەن عەلی کوڕی ئەحمەدی هەکاری(٤٠٩ – ٤٨٦/ ١٠١٨- ١٠٩٣)ە، کە بە گشتی بە "شێخی ئیسلام – شیخ الإسلام"[٧٦٤] و لە نێوەندی سۆفییان بە "جمال الإسلام"[٧٦٥] ناسراوە، ئەو ڕەچەڵەکی خۆی دەگێڕایەوە سەر ئومەوییەکان[٧٦٦]، لەو سەرچاوەی ژیاننامەیان نوسیوەتەوە زیاتر وا دەناسێنرێ کە زانایەکی گەڕۆك بووە، بە شار و دەڤەرە جیاجیاکاندا (مەککە، صەیدا، صور، حەلەب، موسڵ، ئەسفەهان و ...هتد) گەڕاوە، زیاتریش کاری بۆ کۆکردنەوەی فەرموودەی پێغەمبەر و گێڕانەوەی کردووە[٧٦٧]. بەڵام دواتر لەو ناوەندە ئایینییەی تێیدا وەك فەرموودە گێڕەوە و شەرعناس ناسرابوو دوور کەوتۆتەوە، دەڵێن تا مردنی وەك سۆفییەك و بۆ خوداپەرستی نیشتەجێی چیاکانی "هەکاری"، بەتایبەت گوندی "دێرەش"، بووە[٧٦٨]، هەر لەوێش مردوە و نێژراوە و تا هەنوکەش گڵکۆکەی لەوێ ماوە[٧٦٩].

---

(٧٦٤) ئەو خۆی ڕاڤەی تایبەتی بۆ ئەو نازناوە هەبووە و بەو دارشتنەی رازی نەبووە, کاتێك پێیان گوتوە: تۆ شێخی ئیسلامی, گوتوویەتی: نەخێر من شێخێکم لە ئیسلامدا( أنا شیخ فی الإسلام ). ابن خلكان: وفيات, ج٣, ص٣٤٥. الصفدي: الوافي, ج٢٠, ص١٢٠.

(٧٦٥) ابن عربي: الفتوحات المكية, تحقيق: عثمان يحيى, الهيئة المصرية العامة للكتاب, القاهرة, ١٩٨٦, ج١٢, ص٣٠٦.

(٧٦٦) ابن الأثير: اللباب, ج٣, ص٣٩٠. ابن خلكان: وفيات, ج٣, ص٣٤٥.

(٧٦٧) ابن عساكر: تاريخ, ج٦, ص٤٣. ج٩, ص١٩. ابن النجار: ذيل تاريخ بغداد, تحقيق: مصطفى عبد القادر عطا, دار الكتب العلمية, بيروت, ١٩٩٧, ج١٨, ص١٧٢.

(٧٦٨) السمعاني: الأنساب, ج٥, ص٦٤٥.

(٧٦٩) أنور المائي: الأكراد في بهدينان, مطبعة الحصان, الموصل, ١٩٦٠, ص٧٣.

سەبارەت بە کەسێتی سۆفییانەی شێخی هەکاری، ئەوە دەزانین کە لە گەورە سۆفییانی سەردەمەکەی دەژمێردرا، تەنانەت بە شێخی سۆفییان دادەنرا[٧٧٠]، توانیویەتی لەو بوارەدا جۆرێك لە نێوەندگەری بەو شوێنە ببەخشێ کە تیایدا دەژی، تا ئاستێك کە سۆفییانی ناوچەکانی دی لە هەکاری دەچوونە خزمەتی تا سوود لە زانستی ئەو وەربگرن[٧٧١]. لێرەدا دەردەکەوێ کە گرنگی ئەو شێخە هەر لە برەوپێدانی سۆفیگەری سوننییدا قەتیس نەماوە، وەك کەمێکی تر لێی دەدوێین، بەڵکو — هاوکات — لە بەرفرەکردن و گۆڕینی سنووری جوگرافی ئەو هزرەشە لە پانتایی کوردیدا؛ ئەگەر تا ئێستا بینیمان سۆفیگەری زیاتر لە ئاوابیەکانی رۆژئاوای هەرێمی چیا و بەشێك لە ناوچە هاوسنوورەکانی لە هەرێمی ئازربێجان ( بەتایبەت ورمێ)، چەقی بەستبوو، ئەوا ئەو دەیگوازێتەوە بۆ هەرێمی پان و پۆڕی جەزیرە ، کە — وەك پێشتر باسمان کردووە — کەمتر سۆفیگەری تێدا دەرکەوتبوو و بە دەگمەن لە زەمینەی ئاینی و کۆمەڵایەتی ئەوێ توانیبووی خۆی بناسێنێ، بەڵام ئەبولحەسەنی هەکاری بونیادێکی پتەو بۆ هزرەکە لەوێ دادەمەزرێنێ، کە زیاتر دوای خۆی بەرجەستە دەبێ، هەر بۆیە ئاساییە ئەگەر دەبینین دوای ئەو هەرێمی جەزیرە بە گشتی بۆتە سەنتەرێکی بەرچاوی گەشەسەندنی سۆفیگەریی[٧٧٢] تەنانەت تا رۆژگاری ئەورۆش لەسنووری نیشتەجێبوونی ئەودا (دەڤەری بادینان)، مەزاری چەندان شێخی لێیە، گوایە لە موریدانی ئەو بوونە[٧٧٣]. نەك هەر ئەمە بەڵکو کاریگەری بەسەر دەرەوەی ئەوێش هەبووە، ئەوەتا ئاخافتنی وا لە ئارادایە کە ژمارەیەك لە گەورە سۆفییان، بەتایبەت لە کوردەکان، لە بنەڕەتدا موریدی ئەون، لەوانە

(٧٧٠) ابن النجار: ذيل, ج١٨, ص١٧٢. ابن العديم: بغية, ج١٠, ص٤٥٦٩.

(٧٧١) ابن عساكر: تاريخ, ج٥٢, ص٣٥٧.

(٧٧٢) بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: آكو برهان محمد: الحياة العلمية في دياربكر و جزيرة ابن عمر(من القرن ٥-٧هـ/١١-١٣م), رسالة ماجستير, كلية الآداب, جامعة صلاح الدين, اربيل, ٢٠٠٠. عبد الله بن ناصر بن سليمان الحارثي: الأوضاع الحضارية في اقليم الجزيرة الفراتية في القرنين السادس و السابع للهجرة, الدار العربية للموسوعات, بيروت, ٢٠٠٧, ص ص٤٨٣-٤٨٧.

(٧٧٣) لەوانە: شێخ محەمەدی بەرواری, شێخ پیراموس لە گوندی زێوە لە رۆژئاوای بامەڕنی, شێخ محەمەد متەوەکیل لە گوندی مانی و چەندانی تر. لەم بارەوە بگەڕێوە بۆ: أنور المائي: الأكراد, ص ٧٥-٧٦.

ئەبوبەکری هاواری و ئەبو محەمەدی شەنبەکی و ئەبولوەفای حولوانی و...هتد[٧٧٤]، وەك دوای کەمێکی تر باسیان دەکەین.

بەهەرحاڵ، زانیاری ئەوتۆ لەسەر گەلاڵەبوون و پێگەیشتنی کەسێتی سۆفییانەی تێکهەڵکێشی شەریعەتیی شێخی هەکاری نییە، لەگەڵ ئەوەشدا دەشێ ئەو کەسێتییە و تێگەیشتنەکەی بە درێژەپێدەری پەرەسەندنەکانی سۆفیگەری شاری دینەوەر بزانین، ئەو خۆی پەیوەندیی بە یەك لە گەورە سۆفییانی ئەو شارە هەبووە، ئەویش ئەبوبەکر محەمەدی کوڕی عەلی دینەوەری (م٤٣٠ك/١٠٣٨ز) ناسراو بە "بەرهان" کە یەکێك لە سۆفی و فەرموودەگێڕەوە دیارەکانی سەردەمی خۆی بوو[٧٧٥]، شێخی هەکاری فەرموودەگەلێکی دەگێڕانەوە، بەتایبەت ئەوانەی دەدرانە پاڵ یاوەری پێغەمبەر سەلمانی فارسی (م٣٦ك/٦٥٦ز)، لەو شێخە دینەوەرییەی وەرگرتبوو، ئەگەرچی فەرموودەکانیش بە هەڵبەستراو لە قەڵەمدەدرێن[٧٧٦]. هەرچۆنێك بێت، رەنگە هەکاری لە رێگەی بەرهانی دینەوەرییەوە توانیبێتی کۆمەڵێك لە تایبەتمەندییەکانی سۆفیگەری سوننی لە شاری سۆفییانەوە لەخۆ بگرێ و لێرە بەدواوە لە پانتاییەکی نوێی جوگرافی کە چیاکانی هەکاری یە برەوی پێبدات، لەرووی هزرییەوەش گرنگی پەیوەندییەکە لە دەرخستنی رەهەندی سۆفییانەی کاری ئەو تەرزە سۆفییەیە لە بواری فەرموودەدا، بەتایبەت گەڕانەوەیان بۆ سەر سەلمانی فارسی و دانانی بە

---

(٧٧٤) لەو پارچە دەستنوسەی لەلایەن تەقیەدین کوڕی محەمەد کوڕی عیسای شیرانی, کە گوایە لە وەچەی شێخی هەکارییە, لە ساڵی (١٢١٣ك/١٧٩٨ز), لە بارەی رەچەڵەکی ئەو شێخە نوسراوە, ناوی ئەم شێخانە و چەندانی تر هاتووە, کە بە موریدی ئەو دانراون و کۆبیبەکی لە نێو مەزاری شێخی هەکاری لە دێرەش هەڵواسراوە.

(٧٧٥) لە بارەیەوە بگەڕێوە بۆ: الخطيب البغدادي: اخبار الصوفية, ص٢٧٢-٢٧٣. ابن ماكولا: الإكمال, دار الكتب العلمية بيروت, ١٩٩٠, ج١, ص٢٤٦. السمعاني: الأنساب, ج٢, ص٥٣١. ابن ناصر الدين: توضيح المشتبه, حققه: محمد نعيم العرقسوسي, مؤسسة الرسالة, بيروت, ١٩٩٣, ج١, ص ٤٨٢.

(٧٧٦) الذهبي: تاريخ الأسلام, ج١٩, ص٢٩٦-٢٩٧.

سەرچاوەی فەرمووده؛ کە کەسێتییەکەی لە گوتاری سۆفیگەریدا ئامادەیە[٧٧٧]، وەك ئەلقەیەکی زنجیرەی سۆفییانە لە سیستەمی تەریقەتییدا تەماشای دەکرێ[٧٧٨].

لە سەربوردەی شێخی هەکاری بەرچاودەکەوێ، کە چەندە بالادەستی سۆفیگەریی سوننی کاریگەریی بەسەر پاشەکشەکردنی دەرکەوتە هزرییەکانی کایەکە هەبووە، لەگەڵ ئەودا ئەو دیاردەیە بە زۆری حاڵەت و هەڵسوکەوتە، ئەو وەك چاکەکار و زاهید و مرۆڤێکی خودایی و بە شکۆ دەناسێنرێ[٧٧٩]، لەگەڵ ئەودا سۆفیبوون بریتی دەبێ لە دروستکردنی خانەقا[٧٨٠] و پێگەیاندنی مورید[٧٨١] و یاوەرێتی کردنی گەورە سۆفییان[٧٨٢] و گێڕانەوەی بۆچوونی هەندێکیان[٧٨٣]. لەوە بترازێ، لە دووتوێی سەرچاوە گشتیەکاندا، هیچ شتێکی ئەوتۆی شێخی هەکاری نەخراوەتە روو تێزی سۆفییانە بن و وتەی ئەوتۆشی لێ ناگێڕدرێتەوە ئاماژەبن بۆ بۆچوون و کارکردنی لەسەر چەمك و دەستەواژە سۆفییەکان، تەنانەت لەو سەرچاوانەش کە بۆ ژیانی سۆفییان تەرخانکراوە، هەر هیچمان لەسەر هزری سۆفییانەی دەست ناکەوێ، بەڵکو لەوێشدا جەخت لەسەر تواناکانی ئەو وەك زانایەکی شەریعەتناس دەکرێتەوە[٧٨٤].

بێگومان ئەوە پابەندبوونی ئەو شێخەیە بە بنەماکانی شەریعەت وایکردووە جیهانبینی ئایینییەکەی سنووردار بێ و خۆ بەدوور بگرێ لە هەر تێگەیشتنێکی ئایین، کە لەم سنوورەدا

---

(٧٧٧) هەر بۆ نموونە: السراج: اللمع, ص١٨٥, ٣٩٧. الهجويري: كشف, ج١, ص٢٤٢, ٢٨٦. ج٢, ٤٦٩, ٥٩٠.

(٧٧٨) لەمبارەوە بڕوانە: لويس ماسينيون: سلمان الفارسي و البواكير الروحية للإسلام في ايران, ضمن: شخصيات قلقة, ص٥٣.

(٧٧٩) الذهبي: العبر, ج٣, ص٣١٤. اليافعي: مرآة الجنان, ج٣, ص١٤٢. الحنبلي: شذرات, ج٣, ص٣٧٨.

(٧٨٠) ابن الجوزي: المنتظم, ج١٧, ص٧.ابن النجار: ذيل, ج١٨, ص١٧٢.

(٧٨١)السلفي: معجم, ص٤٤. البغدادي: تكملة الإكمال, حققه: عبد القيوم النبي, مطبعة جامعة ام القرى, مكة المكرمة, ١٤١٠, ج١, ص٤٦٧. انور المائي: الأكراد, ص ٧٥-٧٦.

(٧٨٢) الصفدي: الوافي, ج٧, ص١٢٣. الوتري: روضة الناظرين و خلاصة مناقب الصالحين, المطبعة الخيرية, مصر, ١٣٠٦هـ, ص٤٢.

(٧٨٣) ابن العديم: بغية, ج١٠, ص٤٥٦٩.

(٧٨٤) ابن الملقن: طبقات, ص٣٠٣.

به بیدعەکار دادەنرێ، ئەو خۆشی – ئەگەر گوێڕایەڵی ئەو خەونە بووبێ کە بە پێغەمبەری بینیوە -- نەدەبووا لە کۆڕی ئەوانەی پێیان دەڵێن "بیدعەکاران" دابنیشێ، بەڵکو هەوڵبدات وەك پەیڕەوکارێکی ڕێبازی "سونەت و جەماعەت" وەسف بکرێ[٧٨٥]. ئەگەرچی ئەو خۆبەدوورگرتنە بە مانای ڕەتکردنەوەی ئەو بیروباوەڕانە نایەت کە دەشێ خاوەن جیهانبینی ئایینی جیاواز بووبێتن و پەیڕەوکارانیی تێگەیشتنی ناباویان هەبێ تا ئاستی گومان کردن، بەتایبەت گومان لە هەندێك لە پەیڕەو و سرووتە ئایینییەکان، لەم بارەوە پەیوەندییەك کە شێخی ئیسلام هەیبێ و جێگەی سەرنج بێ لەگەڵ شاعیر و هزرڤانی بەناوبانگی عەرەب ئەبو لعەلای مەعەڕی (٣٦٣-٤٤٩ك/٩٧٤-١٠٥٧ز)یە، لەمەڕ ئەو پەیوەندییەش هەر ئەوەندە دەزانین کە مەعەڕی بینیوە و یەکێك بووە لە گوێگرانی، بەڵام لەوە ئاگادارنین ئەگەر گفتوگۆ و ڕاگۆڕینەوەیەك لە نێوانیاندا هەبووبێ، ئەگەرچی ئەمە بە دوور نازانین، وەك لە هەڵسەنگاندنی بۆ کەسایەتییە دیارە، کاتێك لە وەڵامی پرسی بەشێك لە یاوەرانی ڕایدەگەیەنێ کە ئەو "پیاوێکی موسڵمانە"[٧٨٦]، بێگومان ئەو قەبولکردنەی بەرامبەر ئاماژەیەکە بۆ هاوسەنگی شێخی هەکاری لە نێوان پابەندبوون بە شەریعەت و کارکردن بە جیهانبینی سۆفییانە، جیهانبینییەك کە تیایدا قەبولکردنی باوەڕی جیاواز و دوورکەوتنەوە لە دەمارگیریی ئایینی جێگەی خۆی هەیە[٧٨٧].

## گەڕان بەدوای حەقیقەت لەودیو شەریعەتەوە:

ڕەنگە ئەستەم بێ بتوانین بە وردی نەخشی شەریعەت لای شێخی هەکاری بکێشین، لەوەش ئەستەمتر ڕوونکردنەوەی ئەو پەیوەندییە دەبێ کە لە بیری ئەودا لە نێوان شەریعەت و حەقیقەتی سۆفییانەدا هەبووە، پەیوەندییەك کە تەنانەت ئەگەر سەرچاوەکانیش هاوکارمان بن، هێشتا دەچێتە خانەی "نادیار"ەوە و بە زەحمەت دەکارێین هێڵە بنەڕەتییەکانی دەستنیشان بکەین.

---

(٧٨٥) ابن الجوزي: المنتظم, ج١٧, ص٧. ابن كثير: البداية, ج١٢, ص١٦٤. ابن تغري بردي: النجوم الزاهرة, ج٥, ص١٣٨.

(٧٨٦) ابن العديم: بغية, ج٢, ص٨٩٨. ابن خلكان: وفيات, ج٣, ص٣٤٧. الصفدي: الوافي, ج٢٠, ص١١٩-١٢٠.

(٧٨٧) هەر بۆ نموونە بڕوانە: القشيري: الرسالة, ٣٨٦.

هەرچۆنێك بێت، هەكاری لە چەند تەوەرەیەكەوە سەرەدەری لەگەڵ شەریعەتدا كردووە، رەنگە یەكێك لە تەوەرە سەرەكییەكانیش كاركردنی بێ لەسەر فەرموودەی پێغەمبەر بە كۆكردنەوەی و گێڕانەوەی، بەڵام — ئەوەی جێگەی لێوردبوونەوەیە — لە نێوەندی پیاوانی فیقھ و فەرمووددەدا تێبینی زۆر لەسەر ئەو كارەی هەبووە و بە دانان و گێڕانەوەی فەرموودەی نادروست تۆمەتبار دەكرێ[788]، فەرموودەكانی بە "سەیر و سەمەرە" و " نەشیاو" وەسفدەكرێن، دەڵێن گێڕانەوەكانی: ((لە چەشنی هی راستگۆیان نەبوون، دەقی دانراوی هەن كە خراونەتە سەر دانەپاڵ (إسناد) ی دروستەوە))[789]، بێگومان ئەو كارەی هەكاری لەو نێوەندەدا هیچ پاساوێكی بۆ نەبووە و وەك ئبن ئەثیری مێژوونوس دەڵێ: ((هۆكاری نازانرێ))[790]، مەگەر لە دووتوێی تێڕامانی سۆفییانە بۆ پێغەمبەر و فەرموودەكانی بە شێوەیەكی گشتی نەبێ، چونكە وەك دەزانین گێڕانەوەی فەرمووده لە هزری ئەواندا مەبەستێكی سۆفییانەی لە پشتە و زیاتر بریتییە لە پرۆسەی وێناكردنەوەی پێغەمبەر بۆ گونجاندنی لەگەڵ ئەو هزرە نوێیە، كە لەوێد ئەو عارفێكە و بانگەوازی ئایینێكی زاهیدانەی كردووە[791].

هەر بۆیە ئەو فەرموودانەی لە كۆڕی سۆفییان و لەسەر زاریان دەگێڕدرێتەوە لە زۆربەی كاتدا - وەك ئەوانەی شێخی هەكاری - هەم بە "نادروست" و هەمیش بە "سەیر و سەمەرە" ناو دەبرێن و گەلی زانایان ( فەقیھ و فەرموودەگێڕەوان) رەتیان دەكەنەوە و كەمتر پشت بە گێڕەرەوەی سۆفی دەبەستن[792]، رەخنەگرتن لە سۆفییەش لەو چوارچێوەیە دایە، ئەگەرنا هەمان ئەو كەسانەی ئەو تۆمەتانەی دەخەنە پاڵ، جەخت لەسەر چاكەی زۆر و خوداپەرستی و

---

(788) ابن عساكر: تاريخ, ج٤١, ص٢٣٩. الذهبي: ميزان الأعتدال في نقد الرجال, حققه: علي محمد معوض, دار الكتب العلمية, بيروت, ١٩٩٥, ج٥, ص١٣٨.

(789) ابن النجار: ذيل, ج١٨, ص١٧٣.

(790) الكامل, ج٨, ص٤٩١.

(791) السراج: اللمع, ص١٣٤-١٦٥. الهجويري: كشف, ج١, ٢٢٧-٢٢٩. ابن القيسراني: صفوة التصوف, تحقيق: غادة المقدم عدوة, دار المنتخب العربي, بيروت, ١٩٩٥, ص ص١٥٣-١٨٩.

(792) بۆ نموونە بڕوانە: الجرجاني: الكامل في ضعفاء الرجال, تحقيق: يحيى مختار, ط٣, دار الفكر, بيروت, ١٩٨٨, ج٣, ص٣٢٧. ابن الجوزي: الموضوعات, باعتناء: توفيق حمدان, دار الكتب العلمية, بيروت, ١٩٩٥, ج١, ص١٧٥. تلبيس إبليس, ص٣٧٨-٣٧٩.

زاهیدیی ئەو دەکەنەوە و بە شێخی سەردەمی خۆی لە سۆفیگەری – بەتایبەت لە وڵاتەکەی – دایدەنێن[793]، وەك ئەوەی بیانەوێ ئاماژە بۆ جیاوازی نێوان کەسێتی عارفانەی ئەو (حەقیقەت) و کەسێتی زانستیانەی (شەریعەت) بکەن و بەیانی بکەن کە ئەگەرچی شێخی سۆفییانە، بەڵام لە بواری زانستێکی وەك فەرموودەناسی لاوازە و جێی متمانەی تەواو نییە.

بەهەر حاڵ ئەو هەڵوێستە رەخنەییە لە شێخی ئیسلام بە مانای دەرکردنی لەنێو بازنەی شەریعەت نییە، بەڵکو هەر لەوێ دەمێنێتەوە، بەتایبەت ئەو کاتەی شەریعەت راستەوخۆ قسە لەگەڵ خەڵکی ناوچەکەی ئەودا دەکات، واتا هەکارییەکان. ئەمە رێك لە گوتاری ئایینی زانایەکی ناوداری وەك ئبن تەیمیە(م۷۲۸/۱۳۲۷ز) دیارە، کە بە گشتی رەخنەگرێکی سەرسەختی سۆفیگەرییە و دەرکەوتە ئایینی و کۆمەڵایەتییەکانی بە توندی رەتدەکاتەوە و دەیەوێ ئەو رەوایەتییەی لە پانتایی ئیسلامیدا بە دەستی هێنابوو لێی وەرگرێتەوە و چەمکەکانی گوتارە ئایینییەکەی هەڵبوەشێنێتەوە[794]. گروپێکیش کە ئەو کێشەی لەگەڵدا هەبوون کوردە هەکارییەکان بوون، ئەوانەی مورید و پەیڕەوکار و موریدی شێخی بەناوبانگ عەدی کوڕی موسافری هەکاری(٤٦٧-٥٥٧ك/ ١٠٧٤-١١٦٢ز) بوون. ئبن تەیمیە لە فەتوا و پەیامە ناودارەکەی بەناوی "رسالة الی العدوية" ناسراو بە "الوصية الكبرى"[795]، شێخی ئیسلامی هەکاری کردۆتە ئامرازێکی دامەزراندنی گوتاری شەریعەتی ئاڕاستەکراو بۆ ئەو ناوەندە کۆمەڵایەتییەی ئەوی تێدا ژیاوە، دەخوازێ لە میانەی جەختکردنەوە لەسەر پەیڕەوکردنی شێخ عەدی بۆ رێبازی شێخی هەکاری، وا لە لایەنگر و موریدەکانی بکات پاشگەزببنەوە لەو وێنایەی بۆ شێخ عەدی و ئەو تێگەیشتنەی بۆ بیروباوەڕەکانی هەیانبووە، کە وەك لە نوسینەکانی ئبن تەیمیە دەخوێندرێتەوە، زێتر باوەڕبوونە بەو "حەقیقەتە" عیرفانییەی "شێخ عدی" گوزارشتی لێ کردووە

---

(٧٩٣) ((وكان شيخ وقته في بلاده في التصوف))؛ ابن عساكر: تاريخ, ج٤١, ص٢٣٩. هەروەها بڕوانە: ابن النجار: ذيل, ج١٨, ص١٧٤. ابن حجر: لسان الميزان, ج٤, ص١٩٥.

(٧٩٤) لەمبارەوە بگەڕێوە بۆ: ابن تيميه: فقه التصوف, ص١٠ بەدواوە.

(٧٩٥) بۆ دەقی پەیامەکە بڕوانە: مجموع الفتاوى, ط٢, مكتبة ابن تيميه, القاهرة, ١٩٨٩, ج٣, ص ص٣٧٦-٣٨٠.

و ئەوان لە دامەزراندنی باوەڕی ئاییینیاندا بەرجەستەیان کردووە[٧٩٦]، تا بچنە سەر ئەو ڕێبازەی ئەو بە دروستی دەزانێ و بریتییە لە ڕێبازی "ئەهلی سوننە و جەماعەت".

وادیارە یاد و هزری کەسێکیش کاریگەریی بەسەر ئەم خەڵکەوە هەبێ شێخەکەی دەڤەرەکەی خۆیانە ئەبولحەسەنی هەکاری؛ کەسێك کە لای ئبن تەیمیە لە ریزی "وەلییەکانی خودا" و "ڕاستگۆکان" و چاکەکار و پەیڕەوکاری سوننە دەژمێردرێ[٧٩٧]. هەر بۆیە ئەو وا تێگەیشتووە – بە سوود وەرگرتن لەو پێگەیە – دەکارێ چارەی ئەوەی دەشێ بە لۆژیکی خۆی پێی بڵێین "لەرێ لادان لە شەریعەت"ی ئەم کوردە هەکارییانە بکات. ئەوەی لێرەدا گرنگە پێدانی ئەو پێگەیەیە بە شێخی ئیسلام لە نێو بازنەی شەریعەت و بەکارهێنانییەتی بۆ ڕووبەڕووبوونەوە و بەرتەسکردنەوەی بازنەی پەیڕەوکراوی حەقیقەت لە نێو کوردە هەکارییەکاندا. هەر بۆیە ئەگەر شێخی هەکاری فەرموودەی لاواز و پێوانەی نادروستیشی هەبووبێ[٧٩٨]، ئەوا نابنە بەهانە بۆ ڕەتکردنەوەی لە نێو گوتارێکی توند و پەرگیری سوننی وەك هی ئبن تەیمیە.

بە گەڕانەوە بۆ بیروباوەڕی شێخی ئیسلام، دەبینین ئەو سۆفییە لە خوێندنەوەی بۆ شەریعەت هەر بە گێڕانەوەی فەرموودە ناوەستێ، بەڵکو ویستوویەتی لە نێو کایەی تری شەریعەتدا بیروبۆچوونی خۆی هەبێ، لە بوارەشدا زیاتر کار لەسەر "بیرو باوەڕ – الإعتقاد"دەکات و کەمتر دەپرژێتە سەر لایەنە فیقهی و ئوسوڵییەکانەوە، بێگومان ئەمەش لەگەڵ کەسێتی سۆفییانەی ئەودا ڕێکدێتەوە، ئەو جەختکردنەوەیەش لەسەر بیروباوەڕ دەستگرتنە بەو هێڵەی کایە سۆفیگەری بە کۆی بیری ئاییینی ئیسلامی دەبەستێتەوە و پابەندبوونە بە کۆمەڵێك قەیرانی ثیولۆجی کە هەموو ئەوانەی دەخوازن لە نێو ئاییندا کاربکەن ڕووبەڕووی دەبنەوە و بۆتە ئەو زەمینە هاوبەشەی گرۆ و ڕەوتە جیاجیاکانی – بە جیاوازی بۆچوونەکانیان – بە یەکەوە کۆدەکردەوە. بۆ کەسەکەی لەمەڕ

---

(٧٩٦) هەر بۆ نموونە بگەڕێوە بۆ ئەو نرسینانەی: درء تعارض العقل و النقل, حققه: محمد رشاد سالم, دار الكنوز الأدبية, الرياض, ١٩٧٠, ج٧, ص٢٦٤. الجواب الصحيح لمن بدل دين المسيح, تحقيق: علي حسن ناصر و آخرون, دار العاصمة, الرياض, ١٩٩٣, ج٢, ص ص٣٢٤-٣٢٦. مجموع الفتاوى, ج٣, ص٣٩٥.ج١٩, ص٧٠.

(٧٩٧) مجموع الفتاوى, ج٣, ص٣٧٧.

(٧٩٨) مجموع الفتاوى, ج٣, ص٣٧٨.

ئێمەش لە نێو بیروباوەڕدا کەسێتی سۆفییانە و کەسێتی شەرعناسییانەی بەیەك دەگەن، تەنانەت یەکتر تەواو دەکەن.

شێخی هەکاری لەم بوارەدا چەندان کتێبی داناوە[799]، ئەوەی لە ئێستادا لەبەردەستدا ماوە ئەوەیانە کە لە تێگەیشتنی شافعی بۆ بیروباوەڕ دەکۆڵێتەوە بەناوی " إعتقاد الإمام أبي عبدالله محمد بن إدريس الشافعي"[800]. لەم نامیلکەیەدا زیاتر ئەو بۆچوونانە دەخاتە روو کە پەیوەستن بە بواری خوداناسییەوە، هەوڵدەدا رێبازی شافعی لە چوارچێوەی خوێندنەوەی خەسڵەتە خوداییەکان و ناوەکانی خودا و سیفەتەکانی ئەو ناوانە، بخاتەڕوو. ئیدی رێبازی شافعی، بە رای شێخی ئیسلام، بریتی دەبێ لە پابەند بوون بە دەقی قورئانی و فەرموودەی پێغەمبەر لە ناسینی خەسڵەتەکان، رایدەگەیەنێ وەسفی خودا بەوە دەبێ کە خۆی بۆ خۆی کردووە نەك راڤەی مرۆڤانەی بۆ بکرێ[801]. هەکاری، جگە لەم کتێبە، لە شوێنی تریشدا بە دوای ئەم بۆچوونانەی شافعی گەڕاوە، بە تایبەت لەو وەسیەتەی لێی دەگێڕێتەوە، جەخت لەسەر هەمان ئەم تێزانە دەکاتەوە[802]. بێگومان ئەو بۆچوونانە تەواو دەرناچێ ئەگەر قسە لەسەر سروشتی ناخەلقکراوی قورئان نەکات[803]، بەهەمان شێوە تیشك نەخاتە سەر باوەڕداریی بە کار و گوفتار و مانا شەرعییەکانی یەکتاپەرستی[804].

لێرەدا هەکاری وای دەبینێ بۆ جێگیرکردنی ئەو رێبازەی شافعی و تێگەیشتن لە خوداناسی، پێویستی بەوەیە بە دوو ئاڕاستە کار بکات؛ ئاڕاستەیەك بریتییە لە رەخنەگرتن و بە کەم تەماشاکردنی تێز و بۆچوونەکانی زانایانی کەلامناس، کە راڤەی مرۆڤانەی خەسڵەتە خوداییەکان و دەقی ئایینی بە گشتی دەکەن[805]، ئاڕاستەی دووەمیش ئەهلی فەرموودە دەگرێتەوە، ئەوانەی شەو و رۆژیان خستۆتە سەر یەك لە پێناو کۆکردنەوە و هەڵاویردکردنی فەرموودەکان و دەرهێنانی

---

(٧٩٩) ابن النجار: ذيل, ج١٨, ص١٧٢.

(٨٠٠) إعتقاد الإمام أبي عبدالله محمد بن إدريس الشافعي, ضمن كتاب: مجموع فيه ثلاث رسائل, تحقيق و تعليق: عبد الله بن صالح البراك, دار الوطن, مكة المكرمة, ١٩٩٨.

(٨٠١) اعتقاد, ص١٩-٢٤. هەروەها بڕوانە: الذهبي: سير اعلام النبلاء, ج١٠, ص٧٩.

(٨٠٢) ابن قدامة المقدسي: صفة العلو لله الواحد القهار, دار الصحابة للتراث, طنطا, ١٩٩٣, ص ص ٨٢-٨٤.

(٨٠٣) الهكاري: إعتقاد, ص٢٢.

(٨٠٤) إعتقاد, ص ص٢٥-٢٦.

(٨٠٥) إعتقاد, ص٢٧-٣٠.

کۆمەڵێك بنەمای باوەڕداریی، کە جەخت لەسەر بۆچوونە دروست و شەرعییەکان لە بواری خوداناسی دەکەنەوە[٨٠٦].

ئەو خوێندنەوەیەی ڕەهەندە ثیولۆجیەکانی بیرکردنەوەی شافعی، بەو مانایە دێت کە هەکاری ویستوویەتی زێتر ئیش لەو بوارەی شەریعەتدا بکات، هەر ئەمەش وایکردووە بچێتە سەر بابەتێکی بنەڕەتی نێو گوتاری سوننی کە لەم قۆناغەدا برەوی سەندبوو، تەنانەت ببووە مەترسیەك بەسەر قەوارەی گوتارەکە؛ ئەویش ئەو گفتوگۆ و مشتومڕانەی کەوتبووە نێوان "حەنبەلیەکان" و "ئەشعەریەکانەوە"، تەوەرە سەرەکیەکەشی زیاتر هەر بابەتە ثیولۆجییەکان بوو[٨٠٧]. شێخی هەکاری بە وردی لە جیاکاری نێوان هەردوولای ڕوانیوە و دستنیشانی کردوون، هەروەها مۆڵەتی بە سۆفی و فەقیهێکی شافعی شاری هەولێر ی داوە، کە ناوی عیسای کوڕی لەل (م ٥٥٨ك/١١٦٣ز)ە، حەقدە مەسەلەی جیاوازی نێوان ئەم دوو ڕەوتە بگێڕێتەوە[٨٠٨]،ئەو مەسەلانە لەبەردەستدا نین کە شێخی هەکاری لێیان دواوە، تەنیا ئەوەندە دەزانین کە ئەو بە جۆرێك لە میانڕەویەوە تەماشای هەردوو ئاراستەی کردووە، ئەگەرچی ئەو بۆخۆی لە شافعییەکان بووە و ئەو پەیوەندییە پتەوەی نێوان ئەو ڕێبازە و ئەشعەرییەکان هەیە[٨٠٩]، وامان لێ دەکات وا زەن بکەین مەیلی بەلای ڕاڤەی ئەوانەوە بێ. بەڵام، بە پشتبەستن بە خەو بینین بە پێغەمبەر - وەك بەڵگەیەکی ڕەها لەسەر بۆچوونەکانی - بیروباوەڕی حەنبەلی پێ دروست بووە و لە پاڵ ڕێبازی شافعی پەیڕەوی کردووە[٨١٠].

هەرچۆنێك بێت لە چوارچێوە گشتییەکەی سۆفیگەریدا نزیك بوونەوەیەك لە نێوان ئەو هزرە و ڕاڤەی ئەشعەری بۆ باوەڕی ئایینی هەیە، هەندێك لە گەورە سۆفییەکان ( وەك قوشەیری)، لە

---

(٨٠٦) إعتقاد, ص٣٢-٣٤.

(807) George Makdisi: Ash'arī and the Ash'arites in Islamic Religious History II, Studia Islamica, No. 18 (1963), p. 37.

(٨٠٨) ابن المستوفي: تاريخ إربل المسمى نباهة البلد الخامل بمن ورده من الأماثل, حققه: سامي بن السيد خماس الصقار, دار الرشيد للنشر, بغداد, ١٩٨٠, ق١, ص٢٧٢.

(٨٠٩) ابن عساكر: تبيين كذب المفتري فيما نسب إلى الإمام أبي الحسن الأشعري, عنى بنشره: القدسي, مطبعة التوفيق, دمشق, ١٣٤٧هـ, ص٣٥, ٥٤, ١٢٤, ١٤٠. ابن درباس: رسالة في الذب عن ابي الحسن الأشعري, ط٢, مطبعة دائرة المعارف الإسلامية, حيدر آباد الدكن, ١٩٤٨, ص ص١-٦.

(٨١٠) ابن الجوزي: المنتظم, ج١٧, ص٧. ابن كثير: البداية, ج١٢, ص١٦٤.

بیروباوەڕ و بنەڕەتییەکانی ئاییندا پەیڕەویان لە بۆچوونەکانی ئەو ڕەوتە دەکرد و کردبوویانە پاشخانێك بۆ ئەو تەرزە سۆفیگەرییە سوننییەی بانگەشەیان بۆ دەکرد[٨١١]، لەبەرامبەردا کەمتر ئەو پەیوەندییە تەواوکارییە لە نێوان سۆفیگەری و ڕێبازی حەنبەلیدا هەبووە، ڕێبازێك کە بە گومانەوە و لە دیدێکی ڕەخنەییەوە لەو دیاردە ئایینییەی دەڕوانی و کەمتر دانی بە جیهانبینیی ئایینی سۆفییانە دادەنا[٨١٢]. لەو نێوەندەدا هیچ هەڵوێستێکی روونی هەکاریمان لەبەر دەست نییە، بۆیە ناتوانین بە دروستی لە بۆچوونی ئەو شێخە لەسەر جیاوازییەکان تێبگەین و دواتریش دەربیخەین کە چەندە لێرەشدا سۆفیبوونی وی دیدگا و بیروبۆچوونەکانی ڕەنگرێژ کردووە، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو هەڵوێستە ئەرێنیانەی لە ڕێبازی حەنبەلی وامان لێ دەکات بڵێین ناوەندگیریی خەسڵەتێکی بیرکردنەوەی بووە لە پەیوەندیی هزری سۆفییانەی لەگەڵ ڕەوت و ڕێبازە سوننییەکان و کەمتر لەسەر بنەمای جیاوازی نێوانیان هزری خۆی داڕشتووە.

## سێیەم: ڕێگرە کوردەکانی نیوەی دووەمی سەدەی پێنجەم – سۆفییانی قۆناغێکی جیاواز :

### ١- لە ڕێگرییەوە بۆ حەقیقەتناسی:

ئەو سنوورە شەرعییانەی لە زەمینەی ئایینیدا بۆ هزری سۆفیگەری دانرابوون، هەروەها ڕازی بوونی سۆفییانیش بەو سنوورانە و بە باڵاتر دانانی بنەماکانی شەریعەت لە بنەماکانی هزرەکەی خۆیان، تەواوی سۆفیگەری خستبووە نێو کۆمەڵێك قەیرانەوە، کە ڕەنگە سەرەکیترینیان قەیرانی خۆناساندت بێ. ئەوەبوو بینیمان ئەوەندەی سۆفی سەرقاڵی بابەتەکانی نێو شەریعەت بوو، ئەوەندە نەپرژاوەتە سەر بەرهەمهێنانی هزرەکەی و بەرفرەکردنی کایەکەی. بۆیە، ئەگەر لەو قۆناغەدا سۆفیگەری لە نێو کورداندا دەیویست خودان جیهانبینییەکی تایبەتی ئایینی بەردەوام بێت، ئەوا پێویستی بەوە بوو خۆی پێناسە بکاتەوە و دووریی نێوانی لەگەڵ بازنەی شەریعەتدا دەستنیشان بکاتەوە، هەروەها هەوڵبدات واخۆی بنوێنێ کە لەگەڵ ڕەوشی باوی باوەڕداریدا بگونجێ.

---

(٨١١) ابن عساكر: تبيين, ص ص١٠٩-١١٣. العمري: مسالك, ج٨, ص١٧٤.

(٨١٢) لە بارەی ئەو هەڵوێستەی حەنبەلییەکان, هەروەها پەیوەندیی ڕێبازەکە بە سۆفیگەرییەوە بەگشتی بگەڕێوە بۆ:

Christopher Melchert: The Ḥanābila and the Early Sufi, Arabica, 2001, Vol. 48, pp. 352-367.

ناوی سێ سۆفی ناوداری کورد دەهێنرێ، کە پتر لە نیوەی دووەمی سەدەی پێنجەمی کۆچی/ یانزەی زایینی دەرکەوتوونە، ژیان و بیروبۆچوونەکانیان دەشێ وەك خاڵی وەرچەرخان لە قۆناغێکەوە بۆ قۆناغێکی تری مێژووی سۆفیگەریی ئیسلامی ببینرێ، جا چ لە رووی پەیوەندیی نێوان شەریعەت و حەقیقەتەوە بێت، یانیش لە رووی گۆڕانی سۆفیگەری خۆی لە کایەیەکی خودان پاشخانێکی هزریی دەوڵەمەند، بۆ دیاردەیەکی ئایینی – کردەکیی کە دەخوازێ بە گەڕانەوە بۆ ئەو پاشخانە و بەگەڕخستنی لە ژیانی رۆژانەی ئایینی، لە ژێر ناوی "تەریقەتی سۆفیگەریی" جێی بکاتەوە؛ ئەو سێ سۆفییەش بریتین لە هەریەك لە ئەبوبەکری هاواری، ئەبو محەمەد تەلحەی شەنبەکی، کە لە دەوروبەری ساڵی (٤٩١ك/١٠٩٨ز) مردووە[٨١٣]، لەگەڵ تاجولعارفین ئەبولوەفا محەمەدی حولوانی (٤١٧-٥٠١ك/١٠٢٦-١١٠٧ز) ناسراو بە "کاکیس"[٨١٤].

لەڕاستیدا لەیەکچوونێکی زۆر لەنێوان ژیان و بیرکردنەوەی هەرسێکیاندا هەیە، ئەمە سەرباری هەبوونی پەیوەندییەکی پتەو لە نێوانیان و زەمینەی گشتی دەرکەوتن و پێگەیشتنی سۆفییانەیان، تا ئەو رادەیەی دەکرێ ژیان و بیرکردنەوەیان بە تەواوکەری یەکتر دابنێین و بە شێوەیەکی گشتی، لە میانەی چەند خاڵێکی سەرەکی و پەیوەست بەم توێژینەوەوە، لێیان بدوێین.

بەر لە هەموو شتێك، خەسڵەتێکی هاوبەشی ئەو سۆفییانە؛ دوورکەوتنەوەیانە لە قوڵایی ناوچە کوردییەکان، بە تایبەت ئەو ناوچانەی سروشتێکی چیایی بەسەریاندا زاڵ بوو و وەك بینیمان تا درەنگانێك سۆفییەکان لەوێ نیشتەجێ بوون یان دەمانەوە. کەچی ئەو نەوە نوێیەی سۆفییان، لە رووی شوێنی نیشتەجێبوونەوە ناویان لەگەڵ ناوی گوند و ئاواییەکانی ناوچەی "البطائح" دێت[٨١٥]؛ کە ناوچە زۆنگاوەکانی نێوان بەصرا و واسطی دەگرتەوە[٨١٦]. ئەگەرچی ناوچەکە کەمێك کەوتۆتە پەڕگەی کوردستانەوە، بەڵام لە قۆناغێکی زووی دوای هەژموونی دەسەڵاتی

(٨١٣) الوتري: روضة الناظرين, ص٢٧.

(٨١٤) الشطنوفي: بهجة الأسرار و معدن الأنوار في مناقب القطب الرباني سيدي محيى الدين ابي محمد عبد القادر الجيلي, مطبعة الدولة التونسية, تونس, ١٤٠٣هـ, ص٢٠٧. الوتري: روضة الناظرين, ص٢٨.

(٨١٥) الشطنوفي: بهجة الأسرار, ص١٩٣, ١٩٧-١٩٨, السبكي: طبقات الأقطاب, ص ص١١١-١١٣ . التادفي: قلائد الجواهر في مناقب تاج الأولياء و معدن الأصفياء و سلطان الأولياء الشيخ عبد القادر الكيلاني، المطبعة الحميدية، القاهرة، ١٣٥٦هـ, ص٧٩, ٨٠.

(٨١٦) ياقوت الحموي: معجم, مج١, ص ص٤٥٠-٤٥١.

ئیسلامیدا، هەندێك کوردی لیَ دەبینریَ و بۆتە بنکەی چالاکی میر و گرۆ و زانای ئایینیان[٨١٧]، هەروەها هەندێك لە سۆفییەکانیش، بەتایبەت لە دینەوەرییەکان، چوونەتە ئەویَ و تێیدا نیشتەجیَ بوونە[٨١٨]. لەلایەکی ترەوە، لە قۆناغی دەرکەوتنی ئەم سێیەشدا، یەکێك لە هۆزە کوردییە گەورەکان لەوێدا بووە و ناوچەکە هەر لە حیللە تا دەگاتە واسط و نەهرەوان، ببووە گۆڕەپانی تەراتێنی سەرۆك و میرەکانی؛ دیارە کە ئەویش هۆزی "جاوانی"یە[٨١٩]. پێمان وایە هەر سێ سۆفی – ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ- بەو هۆزەوە پەیوەست بوونە؛ بەپێی سەرچاوەکان بیَ ئەبوبەکر سەر بە خێڵی "هواری – هاواری!" کوردییە[٨٢٠]، کە لەوەدەچیَ ئەمانە تیرەیەکی "جاوانی" بن[٨٢١]، هەرچی شەنبەکییە ئەوا دەگەڕێتەوە بۆ سەر خێڵی "شنبکی" کوردی، کە تەنیا ئەوەندەیان لەسەر دەزانین لە هەمان ناوچە، واتا "البطائح" نیشتەجیَ بوونە[٨٢٢].ئەبولوەفاش لە "النرجسیە – نەرگسییەکان"ە، کە ئەمانەش بە تیرەیەکی جاوانی دەژمێردرێن و لە حیللە و دەوروبەری نیشتەجیَ بوون[٨٢٣].

ئەوەی لەو زەمینە کۆمەڵایەتییە – خێڵەکییەدا گرنگ و کاریگەر بیَ لە داڕشتنی کەسێتی سۆفییەکان و بەکارهێنانیان لە گوتاری سۆفیگەری دواتردا، دوو شتە: یەکەمیان پەیوەندیی بە

---

(٨١٧) بۆ نموونە بڕوانە: بحشل: تاریخ واسط, تحقیق: کورکیس عواد, عالم الکتب, بیروت, ١٩٨٦, ص٢٣٤. القرطبي: صلة تاریخ الطبري, تحقیق: محمد ابو الفضل ابراهیم, دار سویدان, بیروت, د.ت, ص١٢٧-١٢٨. هەروەها بۆ زانیاری زیاتر بگەڕێوە بۆ: زرار صدیق توفیق: القبائل, ص ص٥٤-٥٥.

(٨١٨) السلفي: معجم, ص٨٩.

(٨١٩) لەبارەی چالاکی جاوانییەکان لە ناوچەکە, بە تایبەت لە سەدەی پێنجەمی کۆچی, بگەڕێوە بۆ: مستەفا جەواد: هۆزی لەبیرکراوی گاوان و گاوانییە بەناوبانگەکان, وەرگێڕانی: مامۆستا هەژار, چاپی دووەم, دەزگای ئاراس, ٢٠٠٨, ل٢٥-٥٠. زرار صدیق توفیق: القبائل, ص ص٥٦-٦٥.

(٨٢٠) الشطنوفي: بهجة الأسرار, ص١٩٣. التادفي: قلائد الجواهر, ص٧٩.

(٨٢١) آواز محمد علي عبد الکریم: الکورد الجاوانیون, ص٢٥.

(٨٢٢) الشطنوفي: بهجة الأسرار, ص١٩٧-١٩٨. الوتري: روضة الناظرین, ص٢٤.

(٨٢٣) العماد الأصفهاني: خریدة القصر و جریدة العصر, تحقیق: محمد بهجة الأثري, مدیریة الثقافة العامة, بغداد, ١٩٧٣, ج٤, مج٢, ص٥٣٤-٥٣٥. هەروەها بڕوانە: مستەفا جەواد: هۆزی لەبیرکراوی گاوان, ل٥٠. آواز محمد علي عبد الکریم: الکورد الجاوانیون, ص٢٣-٢٤.

هۆزی "جاوانی"و مێژووی ئاینییانەوە هەیە؛ هۆزێك كە بەرەبەرە لەو قۆناغەوە لە ناوەندە كوردییەكەی دادەبڕا و تێكەڵ بە ناوەندێكی عەرەبی دەبوو، لە ناو زۆربەی هۆز و خێڵە كوردییەكان — وەك لەبەشی یەكەمیشدا ئاماژەمان بۆی كرد — بەوە جیادەكرایەوە هەندێك لە ئەندامەكانی، لایەنی كەم لە دەستەبژێرەكەی، پەیڕەوییان لە ڕێبازی شیعەی ئیمامی دەكرد[٨٢٤]، لە پاڵ ئەوانیشدا كەسانێكیان تێدا بوو سوننە مەزهەب بوون[٨٢٥]، بێگومان ئەو كۆكردنەوەیەی دوو ڕێبازی جیاواز لە یەك هۆزدا، دیار و نادیار، كاریگەریی بەسەر ڕەوشی باوەڕداری و چۆنییەتی وەرگرتنی دیاردەی ئاینی وەك سۆفیگەری، لە جڤاكی كوردی نیشتەجێی ناوچەكە هەبووە و ڕەنگدانەوەی بەسەر كەسێتی ئەو سۆفییانەش — وەك كەمێكی تر تێبینی دەكەین — هەبووە.

خاڵی دووەم؛ هەر سێ سۆفی لە نێو ژینگەیەكی خێڵەكییدا پێگەیشتوون، ڕەفتار و هەڵسوكەوتی ژینگەكەیان گرتووە. ئەوەتا، بەپێی سەرچاوەكان بێت، بەر لە بوونیان بە سۆفی، پیشەیان ڕێگریی — وەك ڕەفتاری هەرە باو و شێوەگیركراوی كوردان لە تەواوی قۆناغە مێژووییەكە — بووە و لەو پاشخانەوە هاتوونەتە ناو جیهانی سۆفیگەرییەوە[٨٢٦]، بێگومان ئەمەش ئاماژەیە بۆ زەمینەی دەركەوتن و پێگەیشتنیان، هەروەها توانای تێگەیشتنی ئەوانمان لە بارەی شەریعەت بە گشتی بۆ دەخاتە ڕوو، ئەمە سەرباری دیاریكردنی ئەو ئاستەی لە سۆفیگەریدا پێی دەگەن یاخود بەرهەمی دەهێنن.

هەرچۆنێك بێت، پەیوەندیی تەواوكارییانەی نێوان ئەم سێیانە، لە قۆناغی سۆفیبوونیاندا ڕوونتر دەردەكەوێ؛ لێرە پەیوەندییەكە لە چوارچێوە پەیوەندیی نێوان شێخ و موریدەوەیە و ئەوان لەسەردەستی یەكتر هاتوونەتە ناو ئەلقەكەوە. ئەگەر ئەبوبەكری هاواری بە نوێكەرەوەی ڕەوتی

---

(٨٢٤) بۆ نموونە بڕوانە: ابن الساعي: الجامع المختصر في عنوان التواريخ و عيون السير, تحقيق: مصطفى جواد, المطبعة السريانية الكاثوليكية, بغداد, ١٩٣٤, ج٩, ص٢٧١-٢٧٢. ابن الفوطي: مجمع الآداب في معجم الألقاب, تحقيق: محمد الكاظم, مؤسسة الطباعة و النشر, وزارة الثقافة و الإرشاد الإسلامي, طهران, ١٤١٦هـ, ج٣, ص٩٩-١٠٠. هەروەها بڕوانە: آواز محمد علي عبد الكريم: الكورد الجاوانيون, ص ص٩٥-٩٧.

(٨٢٥) بحشل: تاريخ واسط, ص٢٦٤. الصفدي: الوافي,ج٤, ص ص١١٢-١١٣. السبكي: طبقات الشافعية, ج٦, ص ص١٥٢-١٥٣.

(٨٢٦) الشطنوفي: بهجة الأسرار, ص١٩١, ١٩٦. السبكي: طبقات الأقطاب, ص١١٢. الشعراني: طبقات, ص ص١٩٦-١٩٧. الوتري: روضة الناظرين, ص ص٢٦-٢٧.

سۆفیگەری و دامەزرێنەرەوەی شێخایەتی لە هەرێمی عێراق دادەنرێ، کە: (( ڕێگەی پێشینانی ڕوونکردۆتەوە))[٨٢٧] و شایستەی ئەوەیە بە "ئیمامی سۆفییان" ناوبنرێ[٨٢٨]، ئەوا ئەبومحەمەدی شەنبەکی بەهۆی ئەو شێخەوە وازی لە ڕێگری هێناوە و بۆتە مورید و جێنشینی[٨٢٩]، هەروەها بەردەوامیش بووە لەسەر هەمان کاری شێخەکەی، کە زیندوو کردنەوەی شێخایەتی سۆفییانە بوو لە دەڤەرەکەدا[٨٣٠]. هەر شەنبەکیش شێخی ئەبولوەفای حولوانی یە و ئەمەیان بە فەرمانی ئەو شێخەی دەستی لە ڕێگری هەڵگرتووە و بۆتە سۆفی، هەر لەلایەن ئەو شێخەشیەوە نازناوی ئەبولوەفای پێدراوە[٨٣١].

هەرچۆنێك بێت، بە گەڕانەوە بۆ بابەتی دەستپێکی ئەو تەوەرەیە دەڵێین ئەو سێ گەورە سۆفییە ڕێك خۆیان لەبەردەم ئەو قەیرانانەدا بینیوەتەوە کە سۆفیگەری دووچاری ببۆوە، بەجۆرێك ئەوان لە قۆناغێکدا چالاکی دەنوێنن کە ئیدی سۆفیبوون پێویستی بەوەیە بگەڕێتەوە سەر کولتووری پێشینە و نەریتە ڕەسەنەکانی ببوژێنێتەوە[٨٣٢]. ئەو سۆفییە کوردانەش بەو ئاڕاستەیە کاریان کردووە، وەك گوتمان لە دەقە مێژووییەکاندا وەك نوێکەرەوەی سۆفیگەری لە عێراق، بە تایبەت ئەبویەکری هاواری سەردەستەیان، دەردەکەون[٨٣٣]؛ کە گەڕاوەتەوە بۆ کاری گەورە سۆفییانی ناوچەکە وەك بشری کوڕی حارثی حافی و جونەید و چەندانی دی، کە بە کۆڵەگەکانی عێراقیان

---

(٨٢٧) الشطنوفي: بهجة الأسرار, ١٩٠.

(٨٢٨) الوتري: روضة الناظرين, ص٢٨.

(٨٢٩) ابن الوردي: تاريخ ابن الوردي, دار الكتب العلمية, بيروت, ١٩٩٦, ج٢, ص٧٢. التادفي: قلائد الجواهر, ص٨٠. الزبيدي: تاج العروس, ج٢٧, ٢٣٤.

(٨٣٠) الوتري: روضة الناظرين, ص٢٥.

(٨٣١) الشطنوفي: بهجة الأسرار, ص٢٠١. السبكي: طبقات الأقطاب, ص ١١٤. الوتري: روضة الناظرين, ص٢٧.

(٨٣٢) ئەمە یەکێکە لەو تێبینیانەی نووسەرانی سۆفی لەسەر گەشەسەندنی سۆفیگەری بەگشتی هەیان بوو و هەوڵیانداوە دەستنیشانی قەیرانەکانی بکەن, لەم بوارەدا بگەڕێوە بۆ: القشيري: الرسالة, ص ص٧-٨. الهجويري: كشف, ج١, ص ص ١٩٧-٢٠٠.

(٨٣٣) الشطنوفي: بهجة الأسرار, ١٩٠. هەروەها بڕوانە: عمر سليم عبد القادر التل: متصوفة بغداد في القرن السادس الهجري/ الثاني عشر الميلادي – دراسة تاريخية, دار المأمون للنشر, عمان, ٢٠٠٩, ص٧٠.

دادەنێ و بە پشتبەستن بەو پاشخانەوە دەگەڕێتەوە نێو کایەکەوە[٨٣٤]. جگە لەمە، هەم ئەو و هەم دوانەکەی تر، چوونەتەوە سەر چەمکەکانی سۆفیگەری و بۆچوونی خۆیان لەسەر دەربڕیوە؛ ئەوەتا هاواری لە چەمکی "یەکتایی – التوحید" دواوە و پێی وابووە ئەمە دەرچوونە لە تەواوی گەردوونەکان و چەختکردنەوەیە لەسەر ئامادەیی "هەق" لە هەموو شوێنێکدا[٨٣٥]. بەهەمان شێوە لە چەمکانێکی وەك "دەروون" و "یاوەرێتی"و...هتد، دواوە[٨٣٦] و بۆچوونەکانی هاوشێوەی ئەوانەیە کە لە بەشەکانی پێشوودا باسمان کردووە. هەرچی شەنبەکییە ئەوا پێداگیری لەسەر واتاکانی خوداپەرستیی کردۆتەوە و بەستویەتیەوە بە پرۆسەی بەرزەفتکردنی دەروون لە ڕێگەی "ترس – الخوف"ەوە[٨٣٧]. ئەبولوەفاش قسەی لەسەر چەمکانێکی وەك "روح" و "دەروون" و "وەجد" و چۆنییەتی زاڵبوون بەسەر بانگەشەی درۆزنانە و...هتد، کردووە و شرۆڤەی کردوون و تێگەیشتنی خۆی- کە زیاتر وەك هی سۆفییانی دەستەی یەکەم وایە – لە بارەیانەوە دەربڕیوە[٨٣٨].

بێگومان بەرهەمهێنانەوەی چەمکەکان، کاریگەریی هەبووە بەسەر مەودای ئامادەیی چەمك و دەستەواژەکانی شەریعەت لە گوتاری ئایینیاندا، لەو بوارەدا ئەبوبەکری هاواری هەوڵیداوە سنوورەکانی شەریعەت لەلایەك و لەلایەکی ترەوە ئەو پانتاییە نوێیەی سۆفیگەری گرتبووی، دیاری بکات، ئەمەش بەوە دەبێ سۆفیگەری لەخۆیدا پێناسە بکاتەوە، نەك وەك پاشکۆیەك و یەکەیەکی نێو گوتاری شەریعەت، بۆیە دێت لە دووتوێی چەمکە سۆفییەکانەوە دەیناسێنێ، نەك لەوەی چەندە زانستێکی شەرعییە یان نا[٨٣٩]. ئەبوحەمەدی شەنبەکیش، ئەگەرچی پێی وایە دەبێ دەرکەوتەکانی سۆفیگەری - وەك کرۆکیك - شەرعی بن، بەڵام هیچ ئاماژەیەك بۆ پەیوەندیی ئەو کرۆکە بە شەریعەتەوە ناکات، ئەوەنەبێ کە رایدەگەیەنێ بەڵگە لەسەر هەبوونی رازێك لە نێوان مرۆڤ و خودا دروستی پەیڕەوکردنی بنەما شەرعییەکانە، لێرەدا ئەو دروستی کارکردنی سۆفی لە

---

(٨٣٤) الشعراني: الطبقات, ص١٩٧.

(٨٣٥) الشطنوفي: بهجة الأسرار, ص١٩٠.

(٨٣٦) الشعراني: طبقات, ص١٩٦.

(٨٣٧) الشعراني: طبقات, ص١٩٧.

(٨٣٨) الشطنوفي: بهجة الأسرار, ص٢٠٥. الوتري: روضة الناظرين, ص٢٨.

(٨٣٩) الشعراني: الطبقات, ص١٩٧.

سەر زانستەکەی پەیوەست کردووە بە رەفتار و ئاکاری کەسەکە خۆی، کە زیاتر رەفتار و ئاکاری ئایینین وەك دڵسۆزی و دوورکەوتنەوە لە ریایی و خۆدەرخستن و...هتد[٨٤٠]، لەم حاڵەتەدا شەریعەت بۆتە ئەو پاشخانە ئایینییەی رەفتاری تاك سنووربەند دەکات و دەبێ پێیەوە پابەند بێ و کەسی سۆفی خۆی لەوانەی حاڵیان لە دەرەوەی شەریعەتەوەیە بەدووربگرێ[٨٤١]، ئەمە بێ ئەوەی سنوورێکی دانابێ بۆ حاڵەتی سۆفییانە و دەرکەوتەکانی لە ژیانی رۆژانەی سۆفیدا، تەنیا ئەوە نەبێ کە – وەك بەخۆی رایدەگەیەنێ – ئەوەی بنەماکانی شەریعەت جێبەجێ بکات و لە "ظاهر" و "باطن" خراپەکاری نەکات، ئەوا بە راستەقینەی باوەڕ گەیشتوە[٨٤٢].

بەمجۆرە ئەو نەوەیەی سۆفییان، کەمتر لەوانی پێش خۆیان، بە تایبەت شێخی هەکاری، پرژاونەتە سەر شەریعەت و لقە زانستەکانی. شەریعەت زیاتر وەك شوناسێکە نەك کایەیەکی زانستی، کە تێگەیشتنی تایبەتییان بۆی هەبێ، بۆیە ئەوان پەیڕەوی شەریعەت دەکەن لە بری ئەوەی بەرهەمی بهێنن. ئەمە لە گوتاری هاواریدا روونە، کە بەوە ناسرابوو پەیڕەوی توندی بنەما و سرووتە شەرعییەکانی دەکرد[٨٤٣]. پێدەچێ کەسانی دەوروبەری ئەو سۆفییانەش درکیان بەو ئاستەی تێگەیشتنی ئەوان لە شەریعەت کردبێ، بە بەڵگەی ئەوەی بۆ نووسەرەکانیش ئاسان نەبووە بتوانن بە وردی دەستنیشانی رێبازی فیقهییان بکەن کە پەیڕەویان کردووە، یان دەشێ بڵێین گرنگ نەبووە بزانن پەیڕەوی کامە رێبازیان کردووە، بۆیە – بۆ نموونە – دەبینین بۆچوونی جیاواز هەیە لەسەر ئەوەی ئەبولوەفا شافعی بووە یان حەنبەلی[٨٤٤]، تەنانەت – وەك دواتر زیاتر باسی دەکەین – بۆچوونی ئەوتۆ هەیە کە رەسەنی شیعەی بۆ دروستکراوە. رەنگە لە سەرەتادا بۆشیان گرنگ نەبووبێ ئەو مەسەلەیە یەکلا بکەنەوە، ئەوەندەی ویستوویانە کەسایەتی سۆفییانەی، وتەکانی، کەرامەتەکانی و پەیوەندیی بە گەورە سۆفییانی سەردەمەکەی و دوای خۆی دەربخەن.

بێگومان ئەو هەڵوێستە لە شەریعەت لەخۆوە نەهاتووە، بەڵکو پەیوەستە بە ئاستی تێگەیشتنی هەرسێکیانەوە لە کۆی زانستە ئایینییەکان، ئەوان وەك شێخەکەی هەکاری ئەو

---

(٨٤٠) الشعراني: الطبقات, ص١٩٧.

(٨٤١) الشطنوفي: بهجة الأسرار, ص١٩٥. الوتري: روضة الناظرين, ص٢٥.

(٨٤٢) الوتري: روضة الناظرين, ص ص٢٥-٢٦.

(٨٤٣) الشطنوفي: بهجة الأسرار, ص١٩٠. التادفي: قلائد الجواهر, ص٧٨.

(٨٤٤) التادفي: قلائد الجواهر, ص٨١. الوتري: روضة الناظرين, ص٢٧.

زانستانەیان نەخوێندووە، لە سەرچاوەکانی بەردەست هیچ ئاماژەیەك نییە دەریبخات کە خەریکی فێربوونی ئەو زانستانە یاخود سەرقاڵی کۆکردنەوەی فەرموودە بووبن، بە پێچەوانەوە ژیان و رەفتاری هەرسێکیان وانیشاندەدات ئەو تێگەیشتنەیان لە ئاستی تێگەیشتنی میللییانە بووە نەك دەستەبژێر، وەك پێشتر بینیمان ئەوان کوڕی خێڵەکانیان بوون و لە رێگرەوە بوونەتە سۆفی؛ لە پابەند نەبوون بە بنەما شەرعییەکانەوە بۆ گەڕان و پابەندبوون بە حەقیقەت، کەواتە بوونیان بە سۆفی خاڵی دەستپێکردنی کەسێتی ئاینیانە و لەوێوە گوزارشت لە بیروباوەڕەکانیان دەکەن: گوزارشتێك کە ئەوەندەی چوارچێوە سۆفییانەکەی دیارە ئەوەندە بونیادە شەرعییەکەی نابینرێ. خۆ جەختکردنەوە لەسەر ئەوەی ئەبولوەفا خاوەن وتەی "أمسيت عجمياً و أصبحت عربياً "نە[845].

ئەگەرچی وتەکە — وەك چەند جارێك ئاماژەمان بۆ کردووە — بەر لەو، لایەنی کەم بە سەد ساڵ لە ئارادا بوو، بۆچوونی ئەو نێوەندەی ئەوی تێدا ژیاوە لەسەر ساکاریی تێگەیشتنی لە شەریعەت دەردەخات، لە نێو ئەلقەی سۆفییانیشدا ویستویانە لە پشت شەریعەتەوە رەوایی بە کەسێتی ئەو سۆفییە بدەن و — بۆ نموونە - بانگەشەی ئەوەی بۆ بکەن بە شێوەیەکی غەیبی وەڵامی تەواوی ئەو پرسیارە شەرعییانەی زانیوە و داوەتەوە کە فەقیهەکانی بەغدا، بۆ تاقیکردنەوەی، ویستویانە لێی بکەن و بەهۆیەوە ناشارەزایی ئەوی سۆفی لەم بوارەدا بسەلمێنن[846].

کەواتە بەکورتی دەڵێین ئەو نەوە نوێیەی سۆفییانی کورد ویستوویانە لە دەرەوەی شەریعەتدا کار بکەن، بەڵام بێ ئەوەی رەتی بکەنەوە یاخود سنووره باوەڕییەکانی ببەزێنن، وەك لە قۆناغی سەرەتادا لای هەندێ سۆفی و رەوتی جیاوازی سۆفیگەریدا بینیمان، بەڵکو بە مانای قووڵنەبوونەوە لە شەریعەت و چڕکردنەوەی لە کۆمەڵێك نەریت و سرووت، کە تەواوکەری نەریت و سرووتەکانی نێو بازنەی حەقیقەت بوون.

### ٢- بەرەو دامەزراندنی سۆفیگەری تەریقەتیی:

بەگەڕخستنەوەی چەمکە سۆفییەکان و گەڕانەوە بۆ جیهانبینی ئاینی سۆفییانە، بە مانای پەیڕەوکردنەوەی کولتووری پێشووی سۆفیگەری وەك خۆی نەبوو، بەڵکو زیاتر لە چەند تەوەرەیەکدا

---

(٨٤٥) الشطنوفي: بهجة الأسرار, ص٢٠٦. التادفي: قلائد الجواهر, ص٨١. تێبینی ئەوە دەکرێ لە کاتی هێنانەوەی ئەو وتەیە لەسەر زاری "ابو الوفا", لە جیاتی "أمسيت كرديا"ەوە "امسيت عجميا" نوسراوە.

(٨٤٦) لەم بارەوە بڕوانە: الوتري: روضة الناظرين, ص٢٨.

بەرەویان بە کولتوورەکە داوە و هزرەکەیان بە ئاراستەیەکدا بردووە جیاوازبێ لە ئاراستەکانی پێشووتر؛ بووژاندنەوەی چەمك و تێزە سۆفییەکان زیاتر ئەوانەی گرتۆتەوە کە جەخت لەسەر حاڵی سۆفییانە و چۆنییەتی بەرجەستەکردنی دەکەنەوە، کەمتر پرژاونەتە سەر ئەو مەسەلانەی بابەتی بنەڕەتی بوون و سۆفییەکانی پێدەناسرایەوە و زیاتر پێداگیریان لەبارەی قووڵبوونەوەی پەیوەندیی نێوان مرۆڤایەتی و خودایەتی دەکردەوە لەرێگەی چەمکانێکی وەك فەنا و بەقا و ئیتحاد و حولول و...هتد. کەچی ئەوانە بیرکردنەوەی خۆیان لەسەر چۆنییەتی خوداپەرستیی و دەرکەوتەکانی چڕ کردۆتەوە، نەوەك چییەتی ناسین و مەرزەکانی، ئەگەر باسێکیش لەو ناسینە هەبێ، ئەوا بریتی دەبێ لە نواندنی کردەی خودایی لەمیانەی "کەرامەتنوێنی"یەوە، وەك بەڵگە لەبارەی ئەو ناسینە و پەیوەندی گرتن بە خودایەتیەوە[٨٤٧]، ئەوەش بەگشتی دەستپێکی دامەزراندنی بەکارهێنانێکی نوێی دیاردە ئایینییەکە دەبێ، کە لەسەردەمانی دواتردا بابەتێکی بنەڕەتی بیرکردنەوەی ئایینی بەشێك لە کوردان پێکدێنێ.

لە راستیدا ئەو سۆفییانە نەیانتوانیوە، یاخود نەیانویستوە، بوژانەوەی سۆفیگەری تەنها بریتی بێ لە بەگەڕخستنەوەی چەمکەکان و دانانی سنوورێك بۆ کاریگەریی بڕیارە شەرعییەکان بەسەر بیروباوەڕ و هەڵسوکەوتیان، بەڵکو دەبینین زیاتر کار لەسەر لایەنێکی دیاریکراوی دەکەن و دەیکەنە ناونیشانێکی نوێی دیاردەکە، کە ئەویش لایەنە کردەکییەکەیەتی؛ ئەو لایەنەی هزرەکە بەرەو هێنانەکایەی سیستەمێکی رێکخراوەیی دەبات، کە پێی دەگوترێ تەریقەت.

بەر لەوەی بچینە سەر کاری ئەو سۆفییانە لەم بوارەدا، دەبێ ئاماژە بۆ ئەوە بکەین کە چەمکی "تەریقەت – الطريقة"، چەمکێکی نوێ و ناباوی نێو گوتاری سۆفیگەری نەبوو لەو سەردەمەدا دەرکەوتبێ، بەڵکو زووتریش بەر لە مانا کرداریيە – سیستەماتیکییەکەی، یەکەیەکی پێکهێنەری دەزگای چەمکەکانی گوتارەکە بووە، ئەوەنەبێ تەریقەت لە هزری سۆفییانی دەستەی یەکەم، زێتر ئاماژەیە بۆ کۆمەڵێك بنەمای رەفتاری و باوەڕداریی کە شێخ و موریدەکان پەیڕەویان لێ دەکردن، مەبەست لێیان پێگەیاندنی کەسێتی سۆفییانەیان بوو لە رووی دەروونی و

(٨٤٧) بڕوانە: الشطنوفي: بهجة الأسرار, ص ص ١٩٠-١٩٢, ١٩٧-١٩٨, ٢٠٦-٢٠٧. السبكي: طبقات الأقطاب, ص ص١١١-١١٤. التادفي: قلائد الجواهر, ص ص٧٨-٨١.. الشعراني: طبقات, ص ص١٩٦-١٩٧, ١٩٩. الوتري: روضة الناظرين, ص ص٢٥-٢٩.

ڕەفتارییەوە[848]. لێرەوە تەریقەت هەم پەی بردنێکی باطنیانەیە بە واتا نادیارەکانی شەریعەت، هەمیش دەبێتە سیستەمێکی هەمەگیر دەخوازێ بەرەبەرە دەروونی پەیڕەوکارانی پاك بکاتەوە[849]، ئەمەش سانا نەبوو ئەگەر پەیوەندیی نێوان سۆفییەکان لەگەڵ یەکتر، بەپێی ئەو پایە ڕۆحانییەی پێی گەیشتبوون، ڕێك نەخرێ و بە یەکترەوە پابەند نەبن، بەتایبەتیش پابەندی مورید بە شێخەکەی، شێخیش بەو مەقام و حاڵانەی ئەویان بەو پایە گەیاندوە.

بەڵام لێرە بەدواوە، واتای تەریقەت — جگە لەمانە - فراوانتر دەبێ و دەبێتە ڕێبازی چوون بەرەو خودا، لە ڕێگەی بڕینی چەندان قۆناغی ڕۆحانی و پێشڤەچوون لە مەقامە سۆفییەکان[850]، هەروەها دەبێتە تاکە شێوازی ڕەوای پەروەردەکردنی مورید و ڕێبازی بنەڕەتی بۆ ناسینی حەقیقەت[851]، چەندان ڕەگەز و خەسڵەتی دەبێ، کە بە کۆی هەموویان سیستەمێك لە پەیوەندیی ڕۆحانی و دونیایی لەگەڵ چوارچێوەیەکی دیاریکراوی بیرکردنەوە لە هەردوو بواردا پێکدێنن. بنەمای سەرەکی ئەو جۆرە سیستەمەش تواندنەوەی "من"ی موریدە لە بۆتەی "ئێمە"ی سۆفیدا، بەمەش هەم خوداناسین، وەك کۆڵەگەی سەرەکی هزرەکە، هەمیش بڕینی حاڵ و مەقامەکانی ڕێگای ئەو ناسینە، دەخرێنە نێو ئەو بنەمایە و لەوێوە جارێکی تر پێناسە دەکرێنەوە.

بە گەڕانەوە بۆ سەر سێ سۆفییەکە دەڵێین ئەوان ڕاستەوخۆ ئیشیان لەسەر گەڵاڵەکردنی ئەو تێگەیشتنە لە سۆفیگەری و داڕشتنی بنەماکانی تەریقەت نەکردووە، بەڵام ناڕاستەوخۆ، لە هەردوو بواری تیۆری و کردەکیدا، بیروبۆچوون و هەڵسوکەوتیان بەو ئاڕاستەیە بردراون، تا ببنە بەشێك لەو بنەمایانەی جومگە بنەڕەتییەکانی سیستەمی تەریقەتیی پێکدەهێنن، بەهەمان شێوە خوێندنەوەی ئەوانیتریش بۆ کەسایەتییان بەشێوەیەك بووە تا لە چوارچێوەی سیستەمێکی ئاوادا جێنشین بکرێن و وەك سۆفی کارا و پاشخانی هەندێك لە یەکەمین تەریقەتەکانی جیهانی ئیسلامی، کە هەر کەمێك دوای ئەوان لە سەدەی شەشەمی کۆچیدا دادەمەزرێن، سەرەدەریان لەگەڵدا بکرێ.

---

(٨٤٨) بۆ نموونە بگەڕێوە بۆ: المكي: قوت القلوب, ص٢٢٨, ٢٥١. التوحيدي: ثمرات العلوم, ص٢٨. القشيري: الرسالة, ص٧.

(٨٤٩) Tarika, EI, Vol. x, p.244 .: E.Geoffry

(٨٥٠) القاشاني: معجم اصطلاحات الصوفية, تحقيق: عبد العال شاهين, دار المنار, القاهرة, ١٩٩٢, ص٨٥.

(٨٥١) محمد بن الطيب: إسلام المتصوفة, ص١٣٠-١٣١.

لەڕووی بیروڕاوە، لای ئەوان خوداناسیی سۆفییانە بەو شێوەیە باسی لێوە کراوە کە دواتر لەلای ئەهلی تەریقەتەکاندا پەیڕەوی دەکرێ؛ ئەبوبەکری هاواری پێی وابوو سۆفیگەری بوونە لەگەڵ خودا بێ هیچ نێوەندێك، تەنیا ئەوە نەبێ کە ئەم هەبوونە تاکگەرایانە نییە، بەڵکو دەستەجەمعییانەیە و لەسەر "یاد – الذکر" کردنی بەکۆمەڵ دامەزراوە[852]. لای ئەبولوەفاش ئەو یادکردنە جێگەی گرنگی پێدان بووە و بە هەمان شێوە بەستراوەتەوە بە ئامادەیی سۆفی لەبەردەم خوداوە، ئاکامی ئەمەش دەرکەوتنی حەقیقەت و پەنهان بوونی خودی مرۆڤە[853].

بەهەمان شێوە ئەوان گرنگییان بەو لایەنانەش داوە کە دواتر پەیوەندییەکانی نێو سیستەمی تەریقەتیی لەسەری دەڕوا، بەتایبەت پەیوەندیی نێوان شێخ و مورید؛ پەیوەندییەك مەرجی دروست بوونی لەوەدایە ئەوەی دواییان کۆمەڵێك ئەرك بەجێ دەگەیەنێ تا شایستەی موریدێتی و پێگەیشتنی روحانی بێت. ئەبومحەمەدی شەنبەکی رایدەگەیەنێ ئەو دروستیە ئەوکاتە فەراهەم دەبێ کە مورید بزانێ لە هەردوو ناوەندی سۆفییانە و کۆمەڵایەتیدا چی بکات و چی نەکات؛ چونکە دواجار سۆفیگەری خۆی لە گەیشتن بە خواپەرستی دروست دەبینێتەوە، ئەمەش لەرێگەی چەپاندنی دەروون و دوورکەوتنەوە لە هەموو ئەو دەوروبەرەی مورید لە بەدیهێنانی ئەم کردە ئایینییە سەرقاڵ دەکەن[854].

لەپاڵ هەبوونی بۆچوونەکانی ئەوان لە کولتووری سۆفیگەری تەریقەتیدا، ئەوان خۆشیان لەناو ئەو کولتوورە، وەك شێخی سەرچاوە و رابەری شێخانی تەریقەت تەماشا کراون. دروستتر بڵێین ئەوان خراونەتە نێو ئەو پرۆسە وێناکارییەی دواتر تەریقەتەکان بۆ خۆناساندن و رەوایی بەخشین بە سرووتەکانیان، ئەنجامیان داوە.

رەنگە یەکێك لەو لایەنانەی نوێکردنەوەی دەدرێتە پاڵ ئەوان و بۆتە بەشێکی پێویستی بوونە تەریقەت، "خیرقە پۆشین" بێت، کە تایبەتمەندبوون و پیرۆزکردنی پۆشاکی سۆفییانەیە. ئەم خیرقەیە لە زوودا وەك رەمزێك بۆ جیاکردنەوەی سۆفی لە خەڵکی تر بەکارهێنراوە، رێگەیەك بووە بۆ نیشاندانی بەرزەفتکردنی جەستە و نواندنی حاڵی هەژاری و زوهدگەری، هەروەها بۆ ئەوەی لەو ناوەندە کۆمەڵایەتییەی تێیدا ژیاون بناسرێنەوە و لەلایەن ئەوانیتری غەیرە سۆفی چاودێری رەفتار و

---

(٨٥٢) الشطنوفي: بهجة الأسرار, ص ص١٩٠-١٩١.

(٨٥٣) الشطنوفي: بهجة الأسرار, ص ٢٠٦.

(٨٥٤) الشطنوفي: بهجة الأسرار, ص١٩٥. الوتري: روضة الناظرين, ص٢٥.

هەڵسوکەوتیان بکرێ[٨٥٥]. دواتر خیرقەپۆشی، دەستنیشانی ئەو پەیوەندییەی دەکرد، کە لە نێوان "شێخ" و"مورید"دا هەبووە، جۆری پەیوەندییەکەی دەکردە پەیوەندیی دەسەڵاتدار و ژێردەستە و ڕەوایی شەرعیشی، لەرێگەی گێڕانەوەی کردەکە بۆ قۆناغی پێغەمبەری، بە بەردا دەکرا[٨٥٦]. پێدانی خیرقە لەلایەن شێخەوە وەك بەخششێکە بۆ مورید و بەشێکە لە پرۆسەی گەڕانەوەی مورید بۆ سەرمایەی ڕەمزی ئەو شێخە، گەڕانەوەی لەمجۆرەش گۆڕانی ریشەیی بەسەر ڕەوشی ئایینی و پێگە کۆمەڵایەتییەکەی کەسەکە دەهێنێ، کە ئەمەش هاوتاستە لەگەڵ ئەوەی "میرسیا ئیلیاد – Mircea Eliade" پێی دەڵێ(( گۆڕانی ئەنتۆلۆژی لە سیستەمی هەبوونی کەس))دا[٨٥٧].

ئەو تێڕوانینە لەمەڕ ئامادەیی و کاریگەریی خیرقە، لەسەر ئەو سۆفییە کوردانە، بەتایبەت ئەبوبەکری هاواری دروست دەردەچێ. بەر لەهەموو شتێك لە رووی مێژووییەوە واباسی لێوە دەکرێ کە ئەو جارێکی تر سروتی خیرقەپۆشی لە ناو کولتووری سۆفیگەریی ئیسلامیدا بەگەڕ خستۆتەوە. جا لەبەرئەوەی مەغزای خیرقەپۆشین دۆزینەوەی راستەڕێی سۆفیبوونە لەسەر دەستی شێخێکەوە، ئەویش خیرقەی لە هیچ شێخێك وەرنەگرتوە و لە ئاکامی پەشیمانی لە رێگریی چۆتە سەر ئەو رێگایە[٨٥٨]، هەر بۆیە خیرقەپۆشینیشی دەخرێتە ناو قالبێکی نامێژووییەوە و رایدەگەیەنن بە رێگەیەکی سەرووئاساییەوە پۆشیویەتی؛ گوایە لە خەوندا رەمزێکی گرنگی نێو خەیاڵدانی ئیسلامی کە ئەبوبەکری صدیقە، پێی بەخشیوە و بۆتە شێخی[٨٥٩]. بەمەش خیرقە پۆشیی ئەو و هی هەریەك لە شەنبەکی و ئەبولوەفا کە لەویان وەرگرتوە[٨٦٠]، دەیانخاتە نێو ئەو بازنە پیرۆزییەی کەسە یەکەمینەکەی نێو خەیاڵدانی ئیسلامیی (ئەبوبەکری صدیق) تێیدایە. بەمەش ئەو پرۆسە غەیبانییە و کردەی "گەڕانەوە" بۆ پێشینان وەك سەرچاوەی پیرۆزیی، لەدایکبوونی رۆحانیانەی سۆفی یەکەم و دوو جێنشینەکەی( کە هەر ئەوان سەرچاوەی گێڕانەوەی

---

(٨٥٥) الهجویري: كشف, ج١, ص٢٤٥.

(٨٥٦) لەبارەی ئەو تێگەیشتنەی خیرقەپۆشیی بگەڕێوە بۆ: ابـن القیسـراني: صـفوة التـصوف, ص ص٢٢٢-٢٢٦. السهروردي: عوارف, ج١, ص ص١٧٢-١٧٨.

(٨٥٧) التنسیب و الولادات الصوفیة, ترجمه: حسیب كاسوحة, منشورات وزارة الثقافة, دمشق, ١٩٩٩, ص١٦.

(٨٥٨) الشطنوفي: بهجة الأسرار, ص١٩١. الشعراني: طبقات, ص١٩٦.

(٨٥٩) الشطنوفي: بهجة الأسرار, ص١٩٠, ١٩١-١٩٢. التادفي: قلائد الجواهر, ص٧٩.

(٨٦٠) ابن الوردي: تاریخ, ج٢, ص٧٢.

خەونەکەی ئەون) رادەگەیەنێ[٨٦١]، ئەمەش وا دەکات بوونی دوای خیرقەپۆشییان لە قۆناغی پێشین جیاواز بێ و لەو ناوەندەی تێیدان، لەسەر بنەمای ئەو جیاوازییە دەخوێنرێنەوە و کەسێتییەکانیان بەکار دەهێنرێ[٨٦٢].

ئەو دەرکەوتنەی ئەوان نائاساییە و ئاماژەیە بۆ هێزی روحانییانەی سەرووسروشتی، ئەمەش تایبەتمەندییەکی تری سیستەمی تەریقەتییە، تایبەتمەندییەك کە بریتییە لە پەراندنەوەی شێخی سۆفی لە خوداناسێکی ئاسایی و خودان هەبوونێکی مێژووییەوە [٨٦٣]، بۆ شێخێکی پیرۆزکراو کە لە سەربوردەی ژیانیدا راستیی مێژوویی تێکەڵ بە خەیاڵ دەبێ و - وەك توێژەرێك بۆی دەچێ - سنوورێك لە نێوان راستی و ناڕاستی نامێنێ[٨٦٤]، ئەوەتا هەرسێکیان وەك خاوەنی ئەو هێزە رۆحانییە وێنا دەکرێن، کە کاریگەریان هەر بەسەر موریدانی خۆیان و خەڵکی ئاسایی نەبووە، بەڵکو شێخانی وەك خۆشیان کەوتونەتە ژێر هەمان کاریگەریی؛ درکیان بەو هێزە کردووە و وەك راستییەك گێڕاویانەتەوە و کردویانەتە پاڵپشت و بەڵگە لەسەر دروستیی باوەڕی سۆفییانە[٨٦٥].

باوەڕبوون بەو شێخە کوردانە و وێناکردنیان لە نێو یادەوەریی سۆفیگەریی تەریقەتیدا، لەگەڵ ئەو زەمینە ئیتنی -کۆمەڵایەتییەی ئەوانی تێدا بووە رێك نەدەهاتەوە. بەدەستەواژەیەکی تر، لە پرۆسەی وێناکردنیاندا رەسەنی کوردانەیان و پایە کۆمەڵایەتییەکەیان (رێگر) بایی ئەوە نەبووە ببێتە پارسەنگی پێگەیشتنە رۆحانییەکەیان. بۆیە دەبوایە رەهەندی سۆفییانەی خەیاڵدانی ئایینی بەدوای پارسەنگێکی تردا بگەڕێ، کە هەم بەهاکانی ئەو پێگەیشتنە لەخۆ بگرێ و هەمیش لە هەردوو زەمینەی ئایینی و کۆمەڵایەتییدا رەوایی بە دەرکەوتنەکانی ببەخشێ. ئەمەش دەمانخاتە بەردەم پرۆسەیەکی تری نێو کولتووری سۆفیگەری تەریقەتی، کە بریتییە لە دروستکردنی یادەوەری

---

(٨٦١) الشطنوفي: بهجة الأسرار, ص١٩٠. التادفي: قلائد الجواهر, ص٧٩.

(٨٦٢) بەراوردی بکە لەگەڵ: میرسیا الیاد: التنسیب, ص١٦.

(٨٦٣) لێرە مەبەستمان ئاسایی بوونە بە پێوەری سۆفییانە, ئەو پێوەرەی تیایدا کەرامەتنوێنی و کردەوەی سەروو سروشتی, ئاساین.

(٨٦٤) بگەڕێوە بۆ: J.Spencer Termingham: The Sufi Orders in Islam, Oxford Uneversity press, Great Britain, 1971, p.37.

(٧) هەر بۆ نموونە بڕوانە: الشطنوفي: بهجة الأسرار, ص ص١٩٦-١٩٧, ٢٠٦. الوتري: روضة الناظرين, ص ص٢٥- ٢٦, ٢٩.

مێژوویی – ئاینی گونجاو لەگەڵ پایەی شێخ و رابەرانی تەریقەت، لە رێگەی بەستنەوەی بە رەسەنێکی پیرۆزی رۆحانی ئەوتۆ تا بە کەسی یەکەمی نێو خەیاڵدانی ئیسلامیی (کە پێغەمبەرە) بگەیەنێ(٨٦٦). بێگومان ئەمەش کەڵەکەکردنی سەرمایەیەکی رەمزیە، دەخرێتە سەر ئەو هێزە رۆحانی و خەرمانە پیرۆزیەی بە دەوری شێخی سۆفیدا دروستکراوە. لە حاڵەتی ئەو سێ سۆفییەدا، دارشتنەوەی یادەوەری خۆی لە هەڵبەستنی رەسەنی پێغەمبەرانە، وردتر بڵێین شیعییانە، دەبینێتەوە. ئەگەرچی ئەو گێراندنەوەیە لە کولتووری تەریقەتیدا هەمەگیرە و بۆتە بەشێك لە سیستەمەکە(٨٦٧)، بەڵام رەنگە هی ئەوان کە لە قۆناغەی پێش سەرهەڵدانی تەریقەتەکانن، ئاکامی ئامادەیی شیعەگەریش بووبێ لەو پانتاییە کۆمەڵایەتییەی ئەوانی تێدا بووە، وەك پێشتر باسمان کرد.

گێرانەوەی ئەبوبەکری هاواری بۆ سەر ئەو رەسەنە روون نییە، تەنیا ئەوەندە دەزانین یەك لە نەوەکانی ئەو لە قۆناغێکی درەنگتر نازناوی "العلوي" خستۆتە پاڵ"الهواري"یەوە(٨٦٨)، بەڵام لەگەڵ شەنبەکیدا پرۆسەی دروستکردنی رەسەنی پیرۆز روونترە؛ ئەو لە باوکیەوە براوەتەوە سەر یاوەری ناوداری پێغەمبەر ئەبوئەیوبی ئەنصاری(م٥٢ك/٦٧٢ز)، لە دایکیشیەوە بۆ سەر رەمزی هەرە باڵای نێو خەیاڵدانی شیعی حوسێنی کوری عەلی(٨٦٩). پاساویش بۆ کوردبوون و گەرانەوەی بۆ سەر خێڵی شەنبەك ئەوە بووە گوایە بە گەنجی تێکەڵ بەو خێڵە بووە و لەو ناوەندە کوردییە گەورە بووە، بۆیە لە نازناویدا خراوەتە سەر ئەوان و پێی گوتراوە "الشنبكي"(٨٧٠). بەهەمان شێوە ئەبولوەفاش هەر بە نەوەی حوسێن دانراوە و لە چوارچێوەی ئەو رەسەنەوە قسەی لەسەر کراوە و نازناوی "الحُسيني" خراوەتە پاڵ(٨٧١).

---

(866) Tarika, EI, Vol. X, p.244-245 .: E.Geoffry

(٨٦٧) بروانە: Seyyed Hosain Nasr: Sofi Esseys, pp.106-107.

(٨٦٨) ابن الفوطي: مجمع الآداب, ج٥, ص٧٨. هەروەها بروانە: زرار صديق توفيق: القبائل, ص١٩٣.

(٨٦٩) الرفاعي: الوصايا, تقديم و تحقيق: محمد زينهم محمد عزب, مكتبة مدبولي, القاهرة, ١٩٩٣, ص٤٥. الوتري: روضة الناظرين, ص٢٤. هەروەها بروانە: محمد ابو الهدى الرفاعي: الكليات الأحمدية المؤلفة من كلمات الإمام الرفاعي غوث البرية, مطبعة الواعظ, القاهرة, ١٩٠٨, ص٢٢.

(٨٧٠) (( إلتحق بقبيلة الشنابكة من الاكراد شاباً و نَشاء بينهم و نُسب اليهم فيقال الشنبكي))؛ الوتري: روضة الناظرين, ص٢٤.

(٨٧١) الحسيني: غاية الأختصار في البيوتات العلوية المحفوظة من الغبار, منشورات المطبعة الحيدرية, النجف الأشرف, ١٩٦٣, ص١١٢. التادفي: قلائد الجواهر, ص٨١. الزبيدي: مزيل نقاب الخفا عن ساداتنا بني الوفا,

بێگومان دروستکردنی ڕەسەنی ئاوا نەك هەر پێچەوانەی دەقەکانی ترە، بەڵکو هەڵوەشاندنەوەی بەشێك لەو شوناسەشە کە لەپانتایی سۆفیگەری سەردەمەکەیان پێی دەناسرانەوە، ئەو هەڵوەشاندنەوەیە لە حاڵەتی ئەبولوەفا بەڕوونی دەردەکەوێ، چونکە کوردبوونی ئەو تەواوکەری سۆفیبوونی بووە و دەبێتە یەکێك لەوانەی تەواوی میللەتی کوردی پێ دەناسرێتەوە[٨٧٢]، ئەو لە کەسێکی سادە و ڕێگرەوە کراوەتە باوەڕداری یەکەمی کوردان، وەك لەو وتەیەی شێخ عەبدولقادری گەیلانییەوە دیارە کە دەڵێ: (( لەبەردەم دەرگای هەقدا پیاوێکی کورد نییە وەك شێخ ئەبولوەفا بێت))[٨٧٣].

لەلایەکی ترەوە، دەبێ ئاگاداری ئەوەبین کە ئەگەرچی ئەو ڕەچەڵەك هەڵبەستانە کاریگەریی خەیاڵدانی ئایینی شیعەی پێوە دیارە، بەڵام هەمان ئەو مەغزایەی نییە کە لە کولتووری شیعیدا هەیەتی، ئەگەرنا هەر ئەو سەرچاوانە جەخت لەسەر شوناسی سوننییانەیان دەکەنەوە، بەتایبەت هی ئەبولوەفا، کە بەپەیڕەوکاری ڕێبازە سوننییەکان دەژمێردرێ[٨٧٤]. بەڵکو لێرەدا پرۆسەکە بریتی دەبێ لە بەرزکردنەوەی پایەی شێخ لە میانەی پێدانی ئەو خەسڵەت و تایبەتمەندییە پیرۆزانەی بە ئیمامی شیعی دەبەخشرا، ئەوانەی ئەم ڕەسەنەی بۆ دادەڕێژن دەخوازن لە ڕێگەیەوە ڕوحانییەتی پێغەمبەر و بنەماڵەکەی لە ئێستای سۆفی و کردەوەکانی، لەگەڵ داهاتووی وێناکەی لەلای مورید و پەیڕەوکارانی، بخەنە گەڕ.

دەبێ ئاماژە بۆ ئەوە بکەین، کە ئیشکردن لەسەر تەریقەت بەو مانایە نییە سۆفییەکان لەدوای خۆیان بوونەتە بناغەیەك بۆ سیستەمێکی تەریقەتیی تایبەت بەخۆیان، هەرچەندە هەرسێکیان دواتر لە لایەن بنەماڵەکانیانەوە جێگەیان گیراوەتەوە و پارێزگاری لە ناو و کولتووری سۆفییانەیان

---

تحقيق: احمد فريد المزيدي, دار الكتب العلمية, بيروت, ٢٠٠٧, ص ٧٤. هەروەها بڕوانە: مستەفا جەواد: هۆزی لەبیرکراوی گاوان, ل ل ٥٠- ٥١.

(٨٧٢) ابن عنبه: الأصول الفخرية في أصول البرية, بتصحيح: سيد جلال الدين محدث ارموى, تهران, ١٣٤٦هـ.ش, ص٣٧.

(٨٧٣) (( ليس على باب الحق رجل كُردي مثل الشيخ أبو الوفا))؛ التادفي: قلائد الجواهر, ص٨١. الشعراني: طبقات, ص١٩٩.

(٨٧٤) التادفي: قلائد الجواهر, ص. الوتري: روضة الناظرين, ص٢٧.

کراوە[٨٧٥]، بەڵام لەوەناچێ ئەو جێنشینانەیان توانیبێتیان بە سوود وەرگرتن لەو ناو و کولتوورە لە سیستەمی زنجیرەبەندی سۆفیگەریەوە بپەڕنەوە بۆ سیستەمی تەریقەتی، ئەگەرچی – ئەگەر هەر سێکیشیان نەبێ – یەکێکیان چاوەڕێی ئەوەی لێ دەکرا بکرێتە ئەو کەسێتییە کاریزمییەی تەریقەتێکی سۆفیگەری لەسەر دابمەزرێ، دیارە مەبەستمان ئەبولوەفای حولوانییە؛ کەسێتییە نا ئاساییەکەی و ژمارەی لەڕادەبەری ئەو مورید و شێخانەی لەسەر دەستیدا خوێندوویانە و یاوەرێتیان کردووە و پەیرەویان لەڕێبازەکەی کردووە[٨٧٦]، ئەو ئەگەرەی بەهێز دەکرد، تەنانەت وایلێهاتووە بە " شێخی هەرە گەورە – الشیخ الأکبر" ناوزەد بکرێ[٨٧٧]. ئەوەتا زۆربەی گەورە سۆفییە کوردەکانی سەدەی شەشەمی کۆچی/دوانزەی زایینی لە مورید و یاوەرانی ئەو بوونە[٨٧٨].
ئەو پێگەیەی ئەو هەر لە ئاستی سۆفیگەری کوردیدا نەبووە، بەڵکو لە ئاستی جیهانی ئیسلامیشدا ئامادەیی هەیە، وەك لە وتەکەی شێخ عەبدولقادری گەیلانییدا بینیمان، لەلای خۆیەوە شاعیری ناوداری فارس حەکیمی سەنائی (م. ٥٢٥ك/١١٣١ز) تێڕوانینێکی هاوشێوەی بۆ هەبووە و پێی وابووە، نەك هەر لە ئاستی کوردی بەڵکو لە ئاستی تەواوی جیهاندا، تاقانە و بێهاوتای سەردەمەکەی بووە، شاعیر دەڵێ:

---

(٨٧٥)ابن الفوطي: مجمع الآداب, ج٥, ص٧٨, ٦٣٨٠. الحسيني: غاية الإختصار, ص١١٢. الزبيدي: مزيل نقاب الخفا, ص ٧٤.

(٨٧٦) الوتري: روضة الناظرين, ص٢٨.هەروەها بڕوانە:

J.Spencer Termingham: The Sufi Orders, p.50.

وەریگرتووە لە: الواسطي: ترياق المحبين في طبقات خرقة المشايخ العارفين, القاهرة, ١٨٨٨, ص٤٤.

(٨٧٧) الرافعي: سواد العينين في مناقب الغوث أبي العلمين, دار الطباعة العامرة, القاهرة, ١٣٠١هـ, ص١٨.

(٨٧٨) لەوانە: "شيخ بقا بن بطو"(م ٥٥٣ك/١١٥٨ز), "شيخ عدى بن مسافر", "شيخ ماجد الكردی"(م٥٦٢ك/١١٦٦ز), "شيخ مطر الباذراني", "شيخ جاگير" (م٥٩٠ك/١١٩٤ز) و...هتد. بگەڕێوە بۆ: ابن المستوفي: تاريخ اربل, ق١, ص١١٤. ابن خلكان: وفيات, ج٣, ص٢٥٤. الشطنوفي: بهجة الأسرار, ص٢٠٥. ابن الوردي: تاريخ, ج٢, ص٧٢. الوتري: روضة الناظرين, ص٢٨.

روزها باید که تا یك مشت پشم از پشت میش

زاهدی را خرقه گردد یا حماری را رسن

عمرها باید که تا یك کودکی از روی طبع

عالمی گردد نکو یا شاعری شیرین سخن

قرنها باید که تا از پشت آدم نطفه‌ای

بوالوفای کُرد گردد یا شود ویس قرن(٨٧٩).

بێگومان هەر ئەمەش وایکردووە سەربوردەی ژیانی جێگەی سەرنجی چەندان کەس بێت و بینوسنەوە(٨٨٠).

لەگەڵ ئەوەشدا تەریقەتێك دانەمەزراوە کە ئەو پاشخانەکەی پێکهێنابێ، ئەگەرچی رەنگە هەر ئەو ناوبانگەی وایکردووە جۆرێك لە تێکەڵی هەبێت لە نێوان ئەو و شەمسەدین محەمەدی کوڕی ئەحمەدی وەفا(٧٠١-٧٦١ك/ ١٣٠١-١٣٥٩ز) دامەزرێنەری "تەریقەتی وەفائی"، بۆیە دەبینین ئەو سۆفییە کوردە بە دامەزرێنەری تەریقەتەکە دانراوە، کە لە نێو تورکەکانی ئاسیای بچووکدا لەدوای دامەزرانی دەوڵەتی عوسمانی(٦٩٩ك/١٢٩٩ز) کاریگەریی هەبووە، لەوێدا وەك شێخی ئەو سۆفییە تورکانە دادەنرێ کە لەو قۆناغە ژیاون(٨٨١). بەڵام بێگومان ئەو ماوە درێژەی لەنێوان

---

(٨٧٩) دیوان سنائی, به اهتمام: پرویز بابایی, انتشارات نگاه, تهران, ١٣٧٥هـ.ش,ص.

(٨٨٠) الشطنوفي: بهجة الأسرار, ص٢٠٥. السبكي: طبقات الأقطاب, ص١١٤. الوتري: روضة الناظرين, ص٢٨. یەکێك لەوانەی سەربوردەیان نوسیوەتەوە " شهاب الدين ابى الهدى احمد بن عبد المنعم الواسطي" ناسراو بە "السمديسي", بەناوی "تذكرة المقتفين لآثار اولى الصفا وتبصرة المقتدين لطريق السيد تاج العارفين ابى الوفا", کە لە ساڵی (٧٧٧ك/١٣٧٥ز)نوسیویەتی, ئێستا دەستنوسێکی لە کتێبخانەی نیشتیمانی لە پاریس, بەم ناونیشانە:" ibliotheque Nationale, De Slane, ara. Nr. 2036." پارێزراوە. بەداخەوە نەمانتوانی ئەم دەستنوسە بەدەست بخەین, بێگومان ناوەڕۆکەکەی کاریگەریی بەسەر رەوتی ئەو بەشەی توێژینەوەکەمان دەبوو.

(٨٨١) لەم بارەوە بگەڕێوە:

Riza yildirm: Dervishes in early Ottoman society and politics - A study of Velayetnames as a source for history, M.A thesis, Dp. History, Bilkant University, Ankara, 2001, pp.48,50,103.

ئەبولوەفا و ئەو سۆفییانە هەیە بۆچوونەکە لاواز دەکات، لە بەرامبەردا ئەو بۆ چوونە راست دەردەچێ کە پێی وایە تێکەڵییەك لە نێوان ئەو سۆفییە و "وەفا"کەی تر کراوە(٨٨٢)، نووسەری ناوداری درەنگ وەخت مرتەضای زوبەیدی (م١٢٠٥ك/١٧٩٠ز)، کە خۆی پەیڕەوکاری تەریقەتی وەفائی بووە، ئەو تێکەڵییەی یەکلا کردۆتەوە و بە جیاواز باسی لە ئەبولوەفای حولوانی کردووە(٨٨٣)، ئەگەر ئەو سۆفییە کوردەش لە نێو تەریقەتەکەدا ئامادەیی هەیە، ئەوا هەر وەك رەمزێك کاری پێکراوە و ژیان و کەرامەتەکانی لە نێو سیستەمەکەدا بەکارهێنراوە، نەك دامەزرێنەری تەریقەتەکە بێت.

دانەمەزراندنی تەریقەتێکی دوور مەودا مانای ونبوونی ئەو سۆفییە کوردانە لە نێو مێژوو ناگەیەنێ، بەڵکو وەك ئاماژەمان بۆ کرد ئامادەییەکی بەهێزیان لەنێو ئەو جۆرە سیستەمەدا هەیە، بەتایبەت لە نێو ئەو تەریقەتانەی لەسەدەی شەشەمدا گەڵاڵە دەبن. ئەوان لە نێو تەریقەتی قادریدا بە سێ یەکەمین ئەو شێخانە دادەنرێن کە گوایە پەیوەندیان بە شێخ عبد القادر هەبووە؛ ستایشیان کردووە یان ستایشی کردون، ئەگەرچی یەکێکی وەك ئەبوبەکری هاواری، لەسەردەمی ئەودا نەژیاوە. هەر بۆیە ئەوانەی سەربوردەی ژیانی شێخ عەبدولقادریان نوسیوەتەوە پەیوەندیی هاواریان بەو شێخە خستۆتە چوارچێوەی کەرامەتنوێنییەوە؛ دەڵێن ئەو سۆفییە کوردە پێشبینی دەرکەوتنی عەبدولقادری لەدوای خۆی کردووە(٨٨٤)، بێگومان ئەمەش — لە دەرەوەی ئەو لۆژیکەی کەرامەتی سۆفییانەی پێ دەخوێندرێتەوە — بە پلەی یەکەم ئاماژەیەکە بۆ گەڕان بەدوای رەوایی پێگەی بەرزی شێخ عەبدولقادر، نەك وەك کەسێکی مێژوویی بەڵکو وەك شێخی دامەزرێنەری تەریقەتێك کە زیاتر سیستەمەکەی لەدوای ئەو گەڵاڵە بووە و تیایدا وێنایەکی ئەفسانەیی بۆ کراوە و لە کەسێکی ئاساییەوە کراوەتە کەسێکی سەرووئاسایی(٨٨٥)، ئیدی گەڕانەوە بۆ ئەو سۆفییە

---

هەروەها بڕوانە: أحمد ت. قرە مصطفى: تصوف سدەهای ششم و هفتم در اناطولی, در: میراث تصوف, ویراستەی: لئونارد لویزن, ترجمەی: مجد الدین کیوانی, نشر مرکز, تهران, ١٣٨٣هـ.ش, ج١, ص٢٨٠.

(882) Termingham: The Sufi Orders, p.49 .

(٨٨٣) مزیل نقاب الخفا, ص ٧٤.

(٨٨٤) الشطنوفي: بهجة الأسرار, ص١٩٤, ١٩٨. التادفي: قلائد الجواهر, ص٧٨. الشعراني: طبقات, ص١٩٧.

(٨٨٥) لەم بارەوە بگەڕێوە بۆ:

کورده جەخت لەسەر کاریگەریی بۆچوون و پێشبینییە غەیبانییەکانی ئەو لە ناوەندیی سۆفیگەریی دەکاتەوە، بەتایبەت کە ئەو خۆی مایەی ستایشی شێخی گەیلانی بووە[886].

پەیوەندیی نێوان ئەبولوەفا و تەریقەتی قادری لە ئاستێکی تردایە، ئەگەرچی عەبدولقادر لەسەر دەستی ئەو نەبۆتە سۆفی، تەنانەت بەڕای هەندێك لە قادرییەکانیش پایەی نەگەیشتۆتە پایەی هەندێك لە موریدە گەورەکانی ئەبولوەفا[887]، بەڵام باس لەوە دەکرێ کە عەبدولقادر بەردەوام سەری لە کۆڕی ئەو سۆفییە داوە و تەقیەدین واسطی (م٧٤٤ك/١٣٤٣ز) گوتەنی: ((لە بەرەکەتی سوودمەند بووە))[888]، هەروەها کەرامەتی لێ دەگێڕایەوە[889] و وەك بینیمان بە باوەڕدارترین کوردی داناوە. لە گۆشەنیگای ئەو پەیوەندییەوە لە کولتووری قادریدا وێنای ئەبولوەفا دەکرێ کە ئەو کاتەی هێشتا عەبدولقادر گەنج بووە زانیویەتی لە داڕۆژدا شێخێکی گەورەی لێ دەردەچێ، هەر بۆیە لەو زووەوە ڕێزی لە پایەی دوا ڕۆژی گرتووە و دیاری پێشکەش کردووە[890].

بەهەمان شێوە هەریەکە لە شەنبەکی و ئەبولوەفا لەنێو کولتووری تەریقەتی ریفاعیدا ئامادەییان هەیە. ئەمەش تا رادەیەك ئاساییە، بەتایبەت کە دەزانین زەمینەی جوگرافی گەلاڵەبوون و سەرهەڵدانی تەریقەتەکە هەمان ناوچەی "البطائح"ە[891]، کە ئەو سۆفییانە هەژموونیان کردبووە سەر دەرکەوتەکانی دیاردە ئایینییەکە و بەر لە پێگەیشتنی دامەزرێنەر و دەرکەوتنی موریدانی ئەو تەریقەتە، زەمینەسازیان بۆ دروستبوونی سیستەمێکی ڕێکخراوی سۆفییانە کردبوو. بۆیە دەبینین ئاوا بەهێز لە دووتوێی کولتووری تەریقەتەکەدا بوونیان هەیە و

---

Jacqueline Chabbi: 'Abd al-Ḳādir al-Djīlānī personnage historique: Quelques Éléments de Biographie, Studia Islamica, , (1973), No. 38, pp. 75-106.

(٨٨٦) الشطنوفي: بهجة الأسرار, ص١٣١.

(887) Termingham: The Sufi Orders, p.50

وەریگرتووە لە: الواسطي: ترياق, ص٤٤.

(888) Termingham: The Sufi Orders, p.50

وەریگرتووە لە: ترياق, ص٤٢.

(٨٨٩) الشطنوفي: بهجة الأسرار, ص١٤٤.

(٨٩٠) الشطنوفي: بهجة الأسرار, ص ص٢٠٧-٢٠٨. السبكي" طبقات الأقطاب, ص١١٤. الوتري: روضة الناظرين, ص٤١.

(٨٩١) الرافعي: سواد العينين. ص٤-٥. ابن خلكان: وفيات, ج١, ص١٧١.

ژیانیان بەبەردا کراوەتەوە؛ ئەوەتا دامەزرێنەری تەریقەت شێخ ئەحمەدی ریفاعی خۆی بە پەیڕەوکاری شەنبەکی زانیوە و وەك شێخی خۆی ناوی دەهێنێ و کەرامەتی لێ دەگێڕێتەوە(٨٩٢). بەهەمان شێوە لە زۆر بۆنەدا ستایشی ئەبولوەفای دەکرد(٨٩٣). هەروەها بەهەمان شێوەی قادرییەکان، ریفاعییەکانیش پێیان وایە ئەو سۆفییە یەکێکە لەو شێخانەی مژدەی دەرکەوتنی شێخ ئەحمەدی ریفاعی راگەیاندووە، گوایە گوتوویەتی: ((لەپاش مەرگم..پیاوێك دەردەکەوێ خەڵك بۆ لای کۆچدەکەن و پیاوان ملکەچی دەبن))(٨٩٤). بەو پێودانگەشەوە ئەو بۆچوونە دروست دەردەچێ کە ئاماژە بۆ ئەوە دەکات لەو زنجیرە سۆفیگەرییانەی تەریقەتی ریفاعی پێوە پابەندە، لایەنی کەم لەرێی خرقەپۆشییەوە، زنجیرەی "شەنبەکی — وەفائی"یە(٨٩٥).

ئیدی وادەردەکەوێ تەریقەتەکان دەخوازن لەسەر ناوی ئەو سۆفییە کوردانە و لە میانەی پرۆسەیەکی وردی وێناکردنی کەسایەتییە رەمزی - روحانییەکەیان، بەدەر لە راستی و ناڕاستییەوە، هەم بونیادی پیرۆزکراوی تەریقەتەکەیان دابرێژن و هەمیش بەردەوامیی مێژوویی پێ ببەخشن.

---

(٨٩٢) الرفاعي: الوصايا, ص٤٥. هەروەها بڕوانە: محمد ابو الهدى الرفاعي: الكليات, ص٢٢.

(٨٩٣) الوتري: روضة الناظرين, ص٢٨.

(٨٩٤) الرافعي: سواد العينين, ص١٩. هەروەها بڕوانە: الفاروثي: النفحة المكية في السلالة الرفاعية, مطبعة محمد اسعد نمرو, الأستانة, ١٣٠١هـ, ص١٠. المخزومي: صحاح الأخبار في نسب السادة الفاطميين الأخيار, مطبعة نخبة الأخبار, بمبى, ١٣٠٦هـ, ص١٣٦.

(895) Termingham: The Sufi Orders, p.49

## یەکەم: جێکردنەوەی سۆفیگەری لەچوارچێوەی کۆمەڵایەتی

هەر سەرەدەرییەك لەگەڵ دەرکەوتە کۆمەڵایەتییەکانی سۆفیگەری لەو قۆناغەی باسی لێوە دەکرێ، جۆرێکە لە دابڕینی دیاردە ئایینییەکە لە ناسنامەکەی، کە تایبەتمەندییە هزرییەکەی بۆی رەنگرێژ کردووە و زێتر بریتی بووە لە گەڕان بەدوای واتا دیار و نادیارەکانی پەیوەندیی نێوان مرۆڤ و خودا، وەك بۆمان دەرکەوت رەنگدانەوەی ئەو ئەزموونە روحییەی تاك بوو کە لە ئاکامی ئەو گەڕانەدا چێ بووە. بۆیە ئەگەر سۆفیش دەیویست پابەند بێ بەو چەمکانەی دەستنیشانی "حاڵ" و "مەقام"ەکانی ئەویان لە نێو دیاردەکەدا دەکرد و بەرهەمی پەیوەندیی و گەڕانەکەی ئەو بوون، ئەوا دەبووا کەمتر لە دەرکەوتە کۆمەڵایەتییەکان بڕوانێ و دووربکەوێتەوە لە شرۆڤە و هەڵوێست وەرگرتن لەو دیاردانە. تا ئەوکاتەی سۆفیگەری دەخوازێ وەك هزرێك و راڤەیەك بۆ باوەڕداریی بمێنێتەوە و نەبۆتە سیستەمێکی تەریقەتیی، دەبێ خۆی بداتە دەست ژیانی دوورەپەرێزیی و زوهدگەرییەوە و لە دەرەوەی کایە کۆمەڵایەتییەکانەوە بگوزەرێ. لە ئاستی تیۆرییەوە ئەو بۆچوونە راست دەردەچوو؛ سۆفییەکان رایاندەگەیاند ئەو زانینەی هەیانە لەمپەر بووە لەبەردەم بە تێکەڵبوونی کۆمەڵایەتی، گوتاری ئەوان هەرگیز نەدەبووا ئاڕاستەی خەڵکی ئاسایی بێت، ئەگەر ئەو خەڵکەش وا تێدەگەن گەلی سۆفییان دەیاندوێنن وا نییە، بەڵکو ئەوان لەگەڵ خودادا دەدوێن[٨٩٦]، گوتاری ئەوان گوتارێکی خودایيە نەك مرۆڤانە، راستە رووبەڕووی خەڵکن بەڵام لەو ساتەشدا وتەکانیان جەخت لەسەر پەیوەندیان بە خودا دەکاتەوە و گەڕانە بەدوای واتاکانی نێو پەیوەندییەکە.

ئەو تایبەتمەندیە نا کۆمەڵایەتیانەی هزری سۆفیگەری لەلایەن چەند سۆفییەکی کوردستاندا، بەتایبەت ئەوانەی بەرهەمهێنەری چەمك و وتەکانی نێو ئەو هزرە بوون و هەژموونیان کردبووە سەر رەوت و دەرکەوتەکانی دیاردە ئایینییەکە، جەختی لەسەر دەکرایەوە. لە پێشەنگی ئەوانە مەمشادی دینەوەری دێت، کە پێی وابوو خۆشگوزەرانترین کەس ئەوەیانە توانیویەتی خۆی لە دیدی خەڵك بەدوور بگرێ[٨٩٧]، تەنانەت پێناسەی سۆفیگەریش لەلای ئەو شێخە پەیوەستە بەو سنوورانەی سۆفی بۆ ناسینی خەڵکی

---

(٨٩٦) الكلاباذي: التعرف, ص ص١٠٧-١٠٩.

(٨٩٧) السلمي: طبقات, ص٣١٨. ابن خميس: مناقب, ج٢, ص١٣. الشعراني: الطبقات, ص١٥٣.

داناوه[٨٩٨]، چونکه چەندە سۆفی خەڵك ناس بکات ئەوەندە لە واتا دروستەکانی ناسین، کە لە ناسینی خودایی چڕ دەبێتەوە، دوور دەکەوێتەوە.

ئەو بۆچوونە لەلایەن مظفەری کرماشانی، بە دەستەواژەیەکی کەمێك جیاواز، جەختی لەسەر کراوەتەوە؛ بەلای ئەو - وەك پێشتریش قسەمان لەسەری کرد - تەنیا جەستەی عارف بۆ خەڵکە، ئەگەرنا دڵی هی خودایە و رۆحیشی هی بەڵاکانییەتی، ئەو بەکۆمەڵایەتی کردنەی جەستەش مەرجدارە و دەبێ رەزامەندی خودایی لەگەڵدابێ[٨٩٩]، بێگومان ئەمەش موکڕبوونە لەسەر مەرجی نامۆبوونی سۆفی بە ویستەوە لە نێو جڤاکدا، چونکە لێرە جەستە بێ گیانە و دەیەوێ کەمترین بەشداری کۆمەڵایەتیانەی هەبێ، بە تایبەت کە سۆفی زێتر سەرقاڵی بەهێزکردنی دڵە تا لەگەڵ خودا بە تەبایی بمێنێتەوە. بۆیە ئەگەر سۆفی — بە هۆی پاڵەپەستۆی ئەو زەمینەیەی تێیدایە — ناچارە کۆمەڵایەتی بێت، ئەوا دەبێ ئەو کردەیەی وەك ئەزموونێك بخوێنێتەوە و وەك ناچارییەکی ژیان تێی بڕوانێ، ئەگەر ئەو کردەیەش رەتدەکاتەوە ئەوا دەبێ بە هەڵبژاردنی خۆی بێ و بە ئارەزووەوە پشت لە دونیا بکات و رەتی بکاتەوە[٩٠٠].

سۆفی ورمێ ئەبوبەکری کوڕی یەزدانیاریش لەو ئارەزووە دواوە و بە سۆفیبوونەوە پەیوەستی کردووە و — وەك پێشتریش لێی دواین — پێی وایە هەرگیز ئەو دەرکەوتەی بوونە لەگەڵ ئارەزووی گێڕانی رۆڵی کۆمەڵایەتی رێك نایەتەوە، رۆڵێك کە دەشێ رێگر بێ لەبەردەم هۆگربوونی سۆفی بە خوداوە، چونکە ئەوەی خواستی پلە و پایەی کۆمەڵایەتی هەبێت ناتوانێ ببێتە خودان پلە و پایەی خودایی[٩٠١]، دژایەتیەك لە نێوان ئەو دوو پلەیە هەیە و بە یەکدی ناگەن. هەر لەبەر ئەوەیە ئەو سۆفییە تێکەڵبوونی کۆمەڵایەتی بە خراپ دەزانێ و سۆفییان لەو کارە ئاگادار دەکاتەوە[٩٠٢]. ئاکامی ئەو تێکەڵاییەتیە هاوشێوەبوونی سۆفی و کەسانی ئاسایی دەبێ، کە تەنانەت رووخسار و پۆشاکیشی دەگرێتەوە و وەك ئەوان ئەوەندەی وێڵی دوای

---

(٨٩٨) ((أحسن الناس حالاً مَن أسقط عن نفسه رؤية الخلق, وكان صافي الخلوات لسره راعياً))؛ الخركوشي: تهذيب, ص١٨. ابو نعيم: حلية, ج١٠, ص٣٥٣. ابن خميس: مناقب, ج٢, ص١٤.

(٨٩٩) المكي: علم القلوب, ص١٢٧. الأنصاري: طبقات الصوفية, ص٤٤٨.

(٩٠٠) ابن خميس: مناقب, ج٢, ص١١٤.

(٩٠١) ابو نعيم: حلية, ج١٠, ص٣٦٣.

(٩٠٢) ابن خميس: مناقب, ج٢, ص١٣٢.

روخساری دەرەوەی خۆیەتی ئەوەندە کار بۆ بەهێزکردنی باطنی ناکات، یان بە دەستەواژەی ئەبو عەبدوڵڵای دینەوەری ئەوانەی رووخساری خۆیان جوان دەکەن ئەوانەن کە کرۆکیان وێرانەیە[٩٠٣].

هەندێکی تر لە سۆفییەکان، ئەگەرچی جەخت لەسەر هەمان ئەو بۆچوونانە دەکەنەوە، بەڵام مەیلیان بەلای ئەوەدایە جۆرێك لە هاوسەنگی دروست بکەن لە نێوان سۆفیبوون و رۆڵی کۆمەڵایەتیدا، رایان وایە دەشێ ئەو سۆفیبوونە پارسەنگ بێت بۆ دەستنیشانکردنی سنوور و چییەتی رۆڵەکە. بێگومان راگرتنی هاوسەنگییەکی لەو جۆرە سانا نییە ئەگەر پارسەنگەکە گرانتر نەبێ لە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان، ئەگەر سۆفی لە پەیوەندیی بە خوداوە نەگەیشتبێتە ئەوپەڕی ئەوا گەلێك زوو دەکەوێتە بەر کاریگەریی پانتاییە کۆمەڵایەتییەکەوە، ئیدی وەك ئەبولعەباسی نەهاوەندی رایدەگەیەنێ دەبێ سۆفی زۆربەی کاتی خۆی بۆ خودا تەرخانبکات و کەمێکیشی بۆ خەڵك[٩٠٤].ئیبراهیمی کرماشانیش لەلای خۆیەوە وای بۆچووە جڤاك جێگەی ئاشوب و ئافاتە، بەڵام ئەوەی لەو جڤاکە بە ئافاتتر بێت ئەو کەسەیە کە مەیلی بەلایانەوە بێت و لەگەڵیاندا بژی[٩٠٥]، رەنگە هەر لەبەر ئەوەش بووە ئەو خۆی لە دەرەوەی شاردا، لە گوندێك نیشتەجێ ببوو.

بێگومان ئەو دوورکەوتنەوەیە بەمانای دابڕانی تەواو نییە، ئەمە زیاتر دوورکەوتنەوەیەکی رۆحییە نەك جەستەیی، تا سۆفی نەکەوێتە ژێر باری هەمان ئەو سیستەمە کولتوورییەی جڵەوی جڤاکەکەی بەدەستەوەیە و وایلێکردووە پڕ لە ئافات بێ و ئەو پاکێتییەی لە دەست دابێ کە سۆفی دەیخوازێ، ئەگەرنا ئەو کاتەی کەسێتی رۆحانییانەی سۆفی پێگەیشتوە دەبێ هەوڵی بە کردەکی کردنی تێزەکانی نێو گوتارە ئایینییەکەی خۆی لە پانتاییەکە بدات، ئەوە ئیبراهیم مەرجی گەیشتن بە "الورع"[٩٠٦]ی بەستۆتەوە بە خزمەتکردنی خەڵکەوە، خەڵکێك کە هەر هەموویان لە دووتوێی چەمکی "هەژار – الفقیر"ی سۆفییانەدا جێگەیان دەکرێتەوە؛ ئیدی

---

(٩٠٣) الأنصاري: طبقات الصوفية, ص٥٠٠.

(٩٠٤) فريد الدين عطار: تذكرة, ج٢, ص٢٦٨.

(٩٠٥) ابن عساكر: تاريخ, ج٦, ص٤٤٤.

(٩٠٦) "الورع" لای ئیبراهیم بریتییە لە دەستبەرداربوونی ئەو بیر و ئارەزووە ناجۆرانەی بەدڵی مرۆڤدا دێن, هەروەها ئەمە مەقامێکە کەسی باوەڕدار لە خراپەی دیار و نادیارەکانی ئەندامەکانی لەشی بەدوور دەگرێ؛ بڕوانە: الأنصاري: طبقات, ص٤٤٣.

لای ئەو هەموو خەڵك هەژارن و ئەوەی دەخوازێ بە مەقامی "الورع" بگات دەبێ خزمەتی تەواوی ئەو خەڵکە بکات نەك بە تەنیا گەلی سۆفییان[٩٠٧].

تا ئێرە ئەوەی گوتمان، ئاماژەیە بۆ دیاردەیەکی ئایینی داخراو بەسەرخۆیدا و ڕێگە بە خۆی نادا پەیوەندییەکی تەواو کراوەی لەگەڵ ئەو زەمینە کۆمەڵایەتییەدا هەبێ کە تێیدایە، بەڵام مانەوە بەم داخراوییە کارێکی ئاسان نەبوو، چونکە لەلایەك سۆفیگەری وەك خوێندنەوەیەکی باطنی باوەڕی ئایینی، پێویستی بەوە بووە شێوەیەك لە شێوەکانی ئەو جیهانە وەربگرێ هەتا تێیدا بمێنێتەوە[٩٠٨] و نەخرێتە قالبی ڕەوت و ئاراستەی نەویستراو و تەنانەت هەڵگەڕاوە. لەلایەکی ترەوە زەمینەکەش تا ئەو کاتەی ئایین و باوەڕداریی بەشێکی سەرەکی و هەژموونگەرای سیستەمە کولتوورییەکەی پێکدێنێ سەرەدەری لەگەڵ هەموو ئەو دیاردانەدا دەکات کە لەوێدا ئامادەن، لەوانەش سۆفیگەری. دیارە کە هەندێك ڕووخسار و دەرکەوتەی ئەو دیاردە ئایینییە و سروشتی زەمینە کۆمەڵایەتییەکەش کە زیاتر جڤاکی کوردیە، لەبار بووە بۆ دروستبوونی ڕایەڵەیەك لە پەیوەندیی، کە هەردوو جەمسەر تێگەیشتن و خوێندنەوەی خۆی بۆ هەبووە و هەوڵیداوە بەرامبەرەکەی لەگەڵ ئەو جیهانبینییەی هەیەتی و کاری پێکردووە بگونجێنێ. بۆیە دەبینین نەوەی دوای جێگیربوونی وەك دیاردەیەك، ڕۆڵی کۆمەڵایەتیان بە هەند وەردەگرن و تێڕوانینی جیاواز لەوەی پێشووتریان بۆ کارایی خۆیان لە نێو جڤاکدا دەبێ، وەك لە تێڕوانینی ئەبوبەکری هاواری دەردەکەوێ کە پێی وابووە نابێ دوورکەوتنەوە لە ناوەندی کۆمەڵایەتی بەمانای نەفرین و ڕق لێبوونەوە بێ، چونکە ڕقی لەوجۆرە دەردێکی گەورەی بێ دەرمانە[٩٠٩].

ئەگەرچی سۆفییان لەو پانتاییەی تێیدا جێگیر بوون، خۆیان وەك چینی "تایبەت - الخواص" دەخستەڕوو و بانگەشەی جیابوونی خۆیان لە ڕەشەخەڵك و تێگەیشتن و جیهانبینییە ئایینییەکەی دەکردەوە، بەڵام ئەو تایبەتمەندبوون و جیاوازیە پەیوەست نەبووە بە پایەی کۆمەڵایەتی، هەروەها ڕەنگدانەوەیەکی ئاستی کۆمەڵایەتی خۆیان نەبووە، ئەوەندەی تایبەتی و جیاوازی بووە لە ئەزموونی ڕۆحانی و ئاستی بەرزی ناسینی خودایی بووە بە بەراورد لەگەڵ

---

(٩٠٧) السلمي: طبقات, ص٤٠٤-٤٠٥. البيهقي: الزهد الكبير, ص٣١٤. ابن الملقن: طبقات, ص٥١.

(٩٠٨) بەراورد بکە لەگەڵ: فرتجوف شيئون: الإيمان و الإسلام و الإحسان في مقارنة الأديان, ترجمة: نهاد خياطة, المؤسسة الجامعية للدراسات و النشر, بيروت, ١٩٩٦, ص٤٣.

(٩٠٩) الشطنوفي: بهجة الأسرار, ص١٩١. الشعراني: طبقات, ص١٩٧.

ئەوانیتری رەشەخەڵك و تەنانەت چینی تایبەتی کۆمەڵگاش(دەسەڵاتداران، فەقیە و زانایانی شەریعەت). بۆیە دەیانبینین لەو ئاستەدا سەر بە چینێکی دیاریکراوی کۆمەڵایەتی نەبون، هەندێکیان خودان پایەی بەرزی کۆمەڵایەتین کە وازیان لێ هێناوە و ژیانێکی هەژارانەی سۆفییانەیان هەڵبژاردووە[910]، هەندێکیشیان نەك هەر ئەو پایەیەیان نییە، بەڵکو لایەنی نەویستراوی جڤاکەکەیان پێکدەهێنا و سادە و ساکار و بەر لە بوونیان بە سۆفی لەسەر جەردەیی و رێگری دەژیان[911]. بەهەمان شێوە لەرووی ئاستی تێگەیشتنیان لە زانستە ئایینییەکان و شارەزاییان لە بنەماکانی شەریعەت، هی وایان تێدا بووە فەقیە و فەرموودە گێڕەوەی باوەڕپێکراو و بەرچاوی سەردەمەکەیان بوون[912]، هی واش هەنە لەوەناچێ شارەزاییان لە بنەما سەرەتاییەکانی ئەو زانستانە هەبووبێ، ئەوەندەی خۆیان لە نێو کرۆکی هەقیقەتناسییانەی باوەڕی ئایینیدا دۆزیوەتەوە و گوزارشتیان لێ کردووە[913].

لەلایەکی ترەوە زەمینەی کۆمەڵایەتی هزرەکە فراوانتر دەبێ، کاتێك دەبینین لەپاڵ پیاوان کە گەورە سۆفییەکان لەو رەگەزەن، ئافرەتانی پانتاییە جوگرافییەکەش تێکەڵ بەو جیهانبینییە ئایینییە بوونە، ئەگەرچی هەڵوێستی سۆفییان لە هەبوونی رەگەزی مێینە لە نێو ئەوان و وەك بەرهەمهێنەرێکی گوتارە ئایینییەکەیان، ناجێگیرە[914]. تەنانەت لای ئەو سۆفییانەی باس کران هەروا دیارە؛ ئەوەتا مظفەری کرماشانی بە رقەوە لە یاوەرێتی ئافرەتان دواوە و پێی وایە بێبەهایە و دەشێ سۆفی لە رێگەی گەیشتن بە پایە رۆحانییەکان دوور بخاتەوە[915]، بەڵام ئەو پابەندی بۆچوونەکەی خۆی نەبووە و دەبینین لەگەڵ هاوسەرەکەی چۆتە حەج[916].

---

(٩١٠) السراج: اللمع, ص٢٥٣. ابن تغري بردي: النجوم الزاهرة, ج٣, ص١٧٩.

(٩١١) المقدسي: التوابين, ص ص٢٢٢-٢٢٣. الشطنوفي: بهجة الأسرار, ص١٩١, ١٩٦. السبكي:طبقات الأقطاب, ص١١٢.

(٩١٢) السلمي: طبقات: ص٤٠٢. ابن عساكر: تاريخ, ج٦, ص٤٣.

(٩١٣) هەر بۆ نموونە بڕوانە: أبو الحسن ديلمي: سيرت, ص٢٠٣. شيرازي: تذكرة, ص ص٢٠٥-٢٠٦.

(٩١٤) لەبارەی نامادەیی رەگەزی مێینە لە نێو سۆفیگەری بەگشتی بڕوانە: أنيماری شيمل: أبعاد صوفية, ص ص٥٧٣-٥٨٨.

(٩١٥) القشيري: الرسالة, ص١١٠. الشعراني: الطبقات, ص١٦٨.

(٩١٦) الأنصاري: طبقات الصوفية, ص٣١٣.

چەندان نموونەی ژنمان هەیە لە کۆڕی سۆفییانی ولآتەکە ئامادەن، تەنانەت هەندێکیان سۆفی بەرچاوی سەردەمەکەیان بوونە؛ ئەمە بەتایبەت لە شاری دینەوەر دەردەکەوێ کە وادیارە لە ئاکامی بەرفرەیی دیاردەکە چۆتە سەرووی جیاوازییە رەگەزییەکەوە؛ ئەوەتا لە کۆڕی ئەبولعەباسی دینەوەری ئافرەت هەیە ئەوەندە چۆتە حاڵی وەجدەوە کە دەڵێن گوایە لەگەڵیدا مردووە[٩١٧]، ئەمەش دەبێتە پەندێکی نێو دەقە سۆفییەکان لەسەر قووڵی و کاریگەریی حاڵی سۆفیبوون بەسەر مرۆڤەوە دەگێڕدرێتەوە. رەنگە نموونەی ئافرەتی سۆفیش لە پانتایی شاردا عائیشەی دینەوەری بێ، کە لە کەسە نزیکەکانی ئیبراهیمی کرماشانی بووە، کاتێك عائیشە چۆتە حەج بەلای ئەو سۆفییەدا تێپەڕیوە و ئەویش وەسیەت و ئامۆژگاری کردووە، بەهەمان شێوە لەسەرەمەرگی ئەو سۆفییەی کرماشانیشدا (٣٣٧ك/٩٤٨ز) لەلای بووە[٩١٨]، ئەمەش – وەك توێژەرێك بۆی چووە – بەڵگەیە لەسەر نزیکی عائیشە لە شێخی کرماشانەوە[٩١٩].

جگە لەو شارە، لە نصێبینیش ئافرەتی سۆفی بەرچاو دەکەوێ، وەك مەرهائی نصێبینی، کە یاوەرێتی گەورە سۆفییانی سەدەی چوارەمی کردووە، لەوانە ئەبوبەکری دینەوەری و چەندانی تر، نەك هەر ئەمە بەڵکو خودان تێڕوانینی سۆفییانەی خۆشی بووە، بەتایبەت لەسەر بەهای هەژاریی سۆفییانە[٩٢٠]. بەدەر لەو مێژووە نوسراوەشدا فاطمة لوڕەی هاوسەردەمی شاخوشین و باباتاهیرمان بەرچاوکەوت، کە هەم ئامادەییەکی مێینانەی هەبوو وەك لە عەشقی باباتاهیر دیار بوو، هەمیش – لە دەقە ئایینییەکانی ئەهلی هەقدا – وەك یەکێك لەوانەی رازەکانیان زانیوە دەردەکەوێ، کە لە حەقیقەتی ئایینی شاخوشین ئاگادار بووە[٩٢١].

بێگومان ئەو ئامادەییەی ژنان، بەدەر لە مەغزا سۆفییانەکەی، پێمان دەڵێ دیاردەکە لە زەمینەکەدا جێنشین بووە و نەیتوانیوە خۆی بە دوورەپەرێزی بهێڵێتەوە و خۆی لە بازنەی هزری ئایینیانەیدا قەتیس بکات، بەڵکو دەبووایە لەو بازنەیەدا دەربچێ و راستەوخۆ و

---

(٩١٧) القشيري: الرسالة, ص٤٦٠. الرازي: حدائق الحقائق, ص١٥٤.

(٩١٨) السلمي: ذكر النسوة, ص٦٨.

(٩١٩) مريم حسيني: نخستين زنان صوفي, نشر علم, تهران, ١٣٨٥هـ.ش, ص٢٧٥.

(٩٢٠) السلمي: ذكر النسوة, ص٩٩.

(٩٢١) سەرئەنجام, ل ٥٠-٥١.

ناڕاستەوخۆ لەگەڵ بازنە و جیهانبینییە کۆمەڵایەتییەکەدا یەکانگیر بێ و جارێکی دی پێناسەی خۆی و ئەو بازنەیەش بکاتەوە، دەستنیشانی تایبەتمەندی و ئاستی قەبوڵکردن و کارلێکردنیان بکات.

### سۆفیگەری وەك سیستەمێکی ڕێکخراو:

هەژموونی خەسڵەتی کۆمەڵایەتیبوون سۆفییانی ناچار بە تێکەڵ بوون دەکرد، لایەنی کەم ژیان لەگەڵ هاوشێوەکانیان و ئەوانەی بەو تێگەیشتنەی ئایین ڕازی دەبوون و دەبوون بە مورید، ئەگەری دروستبوونی کۆمەڵگەیەکی ئایینی سەربەخۆی خودان سیستەمێکی ڕێکخراوی بەهێز دەکرد. لەوێدا جۆرێك لە پەیوەندی دادەمەزرا، کە ئەگەرچی لە کڕۆکدا مەبەست لێی پەروەردەکردن و پێگەیاندن و ڕۆشنکردنەوەی ڕێگاکانی سۆفیبوون بوو، بەڵام لە ڕوخساری دەرەوەیدا جۆرێکی نوێی پەیوەندی کۆمەڵایەتی بوو کە سیستەمێکی دەسەڵاتییانە( پتر دەسەڵاتی ڕەمزی) بەڕێوەی دەبرد، ئەمەش لەسەر بنەمای داڕشتنەوەیەکی پلە بە پلەی پەیوەندی دامەزراوە و دەستنیشانی جۆری ڕەفتاری هەریەك لە شێخی سۆفی و موریدەکانی کردووە، وەك لە باسی هزر و هەڵسوکەوتی سۆفیانی وەك مەمشاد و ئیبراهیمی کوڕی شەیبانی کرماشانی و ئەبولعەباسی نەهاوەندی و شێخی هەکاری و سۆفییانی درەنگ وەخت ئەبوبەکری هاواری و ئەبو محەمەدی شەنبەکی و ئەبولوەفای حولوانی بینیمان، بۆیە دووبارە کردنەوەی بۆچوونەکانیان بە پێویست نازانین. ئەوەندە دەڵێین ئەوان جەختیان لەسەر ئەوە کردۆتەوە پەیوەندی نێوان سۆفی و سۆفی، شێخ ومورید و دواتریش سۆفی و کەسی ناسۆفی، پێویستی بە لە قالبدان و ڕێکخستن بووە، بۆ ئەوەی دەرکەوتە هزرییەکانی کایەکە لەخۆ بگرێ و تەنیا وەك دیاردەیەکی رووکەشییانەی بێ ناوەڕۆك نەبێ، وەك دواتر لە قۆناغی تەریقەتیی زیاتر وای بەسەر دێت. بێگومان ئەو جۆرە پەیوەندییانە – کەم تا زۆر – کاریگەرییان کردە سەر ڕەهەندی تاکگەرایی و ژیانی تەنیایی و مەسەلەی دوورکەوتنەوە لەو فەزا مرۆییەی گوایە لەبەردەم ئەم شێوە ژیانە ڕێگر بووە.

لەلایەکی ترەوە، ئەوەی لە نێو ئەو سیستەمەدا ئەگەری کۆمەڵایەتیبوونی بەهێزتر دەکرد، سەرهەڵدانی شێوەیەکی نوێی پەیوەندی نێوان شێخ و مورید بوو، ئەویش بریتی بوو لە شێخی باوك و موریدی کوڕ؛ یان بابڵێین هاتنە مەیدانی بنەماڵەی شێخەکان و دامەزراندنی پێگەی خۆیان لە نێو دیاردەکە بە سوود وەرگرتن لە ئەزموون و پێگەی ڕۆحانی باوکیان، بەمەش

بوونیان بە سۆفی زیاتر وەك بڕیارێكی پێشینەی باوكیان دێتە بەرچاو نەك وەك ئاكامێكی بڕیاری سەربەخۆ و تاكگەرایانە. دەشێ ئەو جۆرەی سۆفیگەریش(كە سیستەمی پشتاوپشتە) ڕەنگدانەوەی تێگەی باوی كۆمەڵایەتیی لە چوارچێوەی سیستەمی خێڵەكی بێ كە سوودمەندبوونی پاشینانی لە سەرمایەی(مادی، ڕەمزی) پێشینانی بە ڕەوا دەبینی. لە یەكەمین ئەو سۆفییانەی كوڕەكانیان بوونەتە جێگرەوەیان مەمشادی دینەوەری بوو، كە ئەبوبەكری كوڕی باسی لێوە دەكرێ[(٩٢٢)]، هەروەها ئیسحاق كوڕی ئیبراهیمی كرماشانی لە چەندان بۆنە وەك موریدێكی باوكی و گێڕەرەوەیەكی وتەكانی ناوی دێت[(٩٢٣)]، بە هەمان شێوە ناوی بنەماڵەی ئەبولعەباسی نەهاوەندیش دێت كە لە پانتایی نەهاوەندا لەدوای ئەو شێخە برەویان بە سۆفیگەری داوە[(٩٢٤)]. لە قۆناغی دوای ئەمانەش، بەكارهێنانی سەرمایەی شێخ لەلایەن بنەماڵەكەیەوە فروانتر بووە و هەندێكیان دەتوانن بەو سەرمایەیە پێگەی باڵای كۆمەڵایەتی بەدەست بهێنن؛ ئەوەتا كوڕ و نەوەكانی شێخی ئیسلامیی هەكاری لە پادشایان نزیك بوونە و پلەوپایەی بەرزیان هەبووە، هەندێكیان بوونەتە فەقێ و هەندێكیش بوونەتە میر[(٩٢٥)]. هەروەها هەر سێ سۆفی ئەبوبەكری هاواری و ئەبو محەمەدی شەنبەكی و ئەبولوەفای حولوانی، لە لایەن بنەماڵەكانیانەوە پارێزگاری لە ڕێچكەكانیان كراوە و سوود لە ناو و پایە ڕۆحانییەكانیان وەرگیراوە[(٩٢٦)].

پەرەسەندنی تری نێوخۆی سۆفیگەری بەو ئاڕاستەیە بوو كە ببێتە دیاردەیەكی ئامادەی پانتاییە كۆمەڵایەتیەكە، بەتایبەت ئەو پەرەسەندنانەی پەیوەستن بە شوێنی نیشتەجێبوونی سۆفی؛ چونكە ئەگەر لە قۆناغی دەستپێكدا گەڕان و سوڕان و سەفەركردن لەگەڵ شێخانی سۆفی لە شوێنێكەوە بۆ شوێنێكی تر خەسڵەتێكی زاڵبوو[(٩٢٧)]، ئەوا دواتر مانەوە لە

---

(٩٢٢) السلمي: طبقات, ص٤٠٩. الخطيب البغدادي: أخبار الصوفية, ص١٥٣. ابن حجر: لسان الميزان, ج٢, ٣١٤. الحنبلي: شذرات, ج٢, ص٢٥٧.

(٩٢٣) البيهقي: الزهد الكبير, ص ص٣١٣-٣١٤. ابن خميس: مناقب, ج٢, ص١١٨.

(٩٢٤) السلفي: معجم, ص٢١, ١٣٠.

(٩٢٥) ابن خلكان: وفيات, ج٣, ص٣٤٥. الصفدي: الوافي, ج٢٠, ص١٢٠.

(٩٢٦) ابن الفوطي: مجمع الآداب, ج٥, ص٧٦, ٦٣٨. الحسيني: غاية الإختصار, ص١١٢.

(٩٢٧) لەم بارەوە بگەڕێوە بۆ: السراج: اللمع, ص ص٢٣١-٢٣٣ . الخركوشي: تهذيب, ص ص٢٣٦-٢٤١.

شوێنێكی دیاریكراو جێگەی ئەو خەسڵەتە دەگرێتەوە، تەنانەت لە قۆناغی درەنگدا، ئەوكاتەی شوێنی مانەوەی شێخ دەبێتە بەشێك لە پیرۆزییەكەی و باوەڕی دەوروبەرەكەی لەسەر بونیاد دەنرێ، ئیدی سەفەر كردن مانای كەم دەبێتەوە، بە پێچەوانەوە خەڵك لە شوێنی دوورەوە دێنە سەردانی سۆفی[(٩٢٨)].

بەپێی سەرچاوەكان چەندین جۆری شوێنی سۆفییان هەیە؛ ئەوەی لە قۆناغی توێژینەوەكامان لە ناوچە كوردییەكان باوە "رباط" یاخود "خانەقاه"یە، كە لە رووی دەستەواژەییەوە هەردووكیان بۆ شوێنی نیشتەجێبوونی ئەو گروپە ئایینییە بەكار هاتوون، ئەوەنەبێ ئەوەی یەكەم زیاتر لە هەرێمی عێراق و حیجاز بەكار دەهات، ئەوەی دووەمیش لە وڵاتی فارس و شام و میصر بەكار دەهێنرا[(٩٢٩)]. بەهەرحاڵ ئەو كاتەی پەیوەستن بە جیهانی سۆفیگەرییەوە وا پێناسە دەكرێن كە بریتیین لە شوێنی حەوانەوەی سۆفییان، تیایدا سەرقاڵی فێربوون و پەیڕەوكردنی ئەو سرووت و هەڵوێستانەن كە حاڵی ئەوان دروست دەكات[(٩٣٠)]. لە چوارچێوە گشتییەكەیدا ئەو خانەقایانە دەبنە شوێنێك بۆ بەجێگەیاندنی سرووتە ئایینییەكان، جا چ ئەوانەبێ كە تەواوی موسڵمانان ئەنجامیان دەدا، وەك نوێژ و...هتد، یانیش ئەوانەی كە رووە كردەكییەكەی گوتاری سۆفیگەری دایهێنابوو وەك زیكری دەستەجەمعی و...هتد و ببوونە بەشێك لەو سیستەمە رێكخراوەییەی پەیوەندی نێوخۆیی و دەرەكی ئەوانی رێك دەخست[(٩٣١)]. دواتریش وەك بنكەیەكی زانستی و ئاڵوگۆڕی بنەما زانستییە حەقیقەتییەكان و شەریعەتییەكان ناو دەردەكات و لە ئاستی گشتیدا رۆڵێكی بەرچاویان لە پێشڤەبردنی ئەو زانستانە دەبێ.

بە ووردی مێژووی دروستكردنی خانەقا لە ناوچە كوردییەكان دیار نییە، بەڵام ئەوە دەزانین پێشتر مزگەوتەكان شوێنێك بوونە بۆ مانەوەی سۆفی، وەك مزگەوتی دینەوەر، كە سۆفییان

---

(٩٢٨) الشطنوفي: بهجة الأسرار, ص١٩٠, ١٩٢. الوتري: روضة الناظرين, ص٢٦.

(٩٢٩) بۆ زانیاریی پتر بڕوانە: مصطفى جواد: الرُبط الصوفية البغدادية و أثرها في الثقافة الإسلامية, الدار العربية للموسوعات, بيروت, ٢٠٠٦, ص٧.

(٩٣٠) السهروردي: عوارف, ج١, ص١٨١-١٨٢.

(٩٣١) لە بارەی هەندێك لەو سرووتانەی پەیوەست بە خانەقا بگەڕێوە بۆ: السهروردي: عوارف, ج١, ص ص١٨٧-١٩٢.

کۆڕیان تێدا گرتووە[٩٣٢]. بەڵام بێگومان بوونی سۆفی لە مزگەوت ئەگەری ڕووبەڕووبوونەوەی ئەوان و پیاوانی سەر بە کایەی تری ئایینی بە تایبەت فەقیهەکان بەهێز دەکات، لەو جۆرە ڕووبەڕووبوونەوەیەش سۆفییان ناچار دەبن مزگەوت چۆل بکەن، یان لایەنی کەم هەوڵبدەن مزگەوتی تایبەتی خۆیان هەبێ، وەك چۆن مەمشاد لە هەمان شاردا هەیبوو[٩٣٣].

بەڵام دواجار خانەقاکان سەرهەڵدەدەن، ڕەنگە لە یەکەمین ئەو کەسانەی ئەوکارەی کردبێ هەر مەمشاد بێ، کە ئاماژە هەیە بۆ شوێنی تایبەت بەو و موریدەکانی و هاتنی کەسانێك بۆ ئەوێ و مانەوەیان تیایدا، ئەگەرچی بە ڕوونی ناوی خانەقای ئەو نەهاتووە[٩٣٤]. دوای ئەو و لە قۆناغەکانی درەنگتر شاری دینەوەر و دێهاتەکانی دەوروبەری، بێگومان بە حوکمی زۆربوونی ژمارەی سۆفی، چەندان خانەقای لێ دروستکراوە؛ سیلەفی (م٥٧٦ک/١١٨٠ز)، کە لە کۆتایی سەدەی پێنجەم چۆتە ئەوێ، پاشماوەی هەندێکیان و نوژەنکردنەوەی هەندێکی تری بینیوە، لەوانە خانەقاکەی ئەبولعەباسی کونکەشی و کافی دینەوەری و ئەبویەعقوب یوسفی کوڕی ئەحمەدی کوماسی کە لە گوندێکی ئەوێ دروستی کردووە[٩٣٥]. لە شاری نەهاوەندیش ئەبولعەباسی نەهاوەندی زوو خانەقای تێدا دروست کردووە[٩٣٦]، هەروەها دوای ئەویش ئەبو سەعیدی نەهاوەندی لە دەوروبەری ساڵی (٤٧٠ك/١٠٧٧ز) لە گوندێکی نزیك بە شارەکە خانەقایەکی بونیادناوە[٩٣٧]. بەناوبانگترین خانەقاکانی سەدەی پێنجەمیش ئەوانەیان بوون کە شێخ ئەبولحەسەنی هەکاری لە دەڤەرەکەی خۆی، بەتایبەت لە گوندی "دێرەش" دروستی کردوون[٩٣٨]. شاری هەمەدانیش لە هەمان سەدەدا چەند خانەقایەکی تێد هەبووە[٩٣٩].

---

(٩٣٢) ابن الساعي: أخبار الحلاج, ص٤٩.

(٩٣٣) ابن الملقن: طبقات, ص٤٩.

(٩٣٤) بڕوانە: القشيري: الرسالة, ص٤٦٠. ابن الجوزي: تلبيس ابليس, ص١٩٨ . فريد الدين عطار: تذكرة, ج٢, ص١٣٣.

(٩٣٥) معجم, ص١٣٧, ٤٥٦-٤٥٧.

(٩٣٦) فريد الدين عطار: تذكرة, ج٢, ص٢٧٠.

(٩٣٧) السلفي: معجم, ص٣٩١.

(٩٣٨) السمعاني: الأنساب, ج٥, ص٦٢٥. ابن النجار: ذيل, ج١٨, ص١٧٢. الذهبي: تاريخ الإسلام, ج٣٣, ص١٨٣.

جگە لە خانەقا جۆرێکی تری شوێنی نیشتەجێبوونی سۆفییان هەبوو، ئەویش "گۆشە – الزاویە"کان بوون؛ کە تایبەت بووە بە یەك سۆفی و واپێدەچێ زیاتر لە دەشت و دەر و ناوچەکانی دوور لە ئاوەدانییە گەورەکان دەرکەوتبێ[940]. وادیارە ئەو جۆرەش درەنگ لە نێو سۆفییانی کورد دەرکەوتووە، لەوانەی گۆشەیان هەبووە هەریەك لە ئەبوبەکری هاواری و ئەبو محەمەدی شەنبەکی و ئەبولوەفای حولوانین؛ کە لەو شوێنەدا مورید و سۆفییەکانی تر سەردانیان دەکردن و لێیان کۆدەبوونەوە[941].

ئەگەرچی سۆفییەکان بۆ پێداگیری لەسەر رەهەندی دوورەپەرێزییانەی بیروبۆچوونەکانیان، خانەقا و گۆشەکانیان لە شوێنی دوورە دەست دادەمەزراند، لایەنی کەم لە گوند و دێهاتەکان[942]، بەمەش پەیوەندیان بە سروشت نەدەپچڕاند و کەمتر تێکەڵ بە ژیانی شاری دەبوون و زیاتر پشتیان بە سروشتەکە دەبەست[943]، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەبوونی ئەو شوێنانە کۆمەڵێك ئەرکی دەخستە سەر شانی شێخی سۆفی و مورید و پەیڕەوکارانی؛ هەر لە دروستکردنییەوە بگرە تاوەکو دابینکردنی بژێوی ژیان و ئەو ئەرکە ئایینیانەی بەو شوێنە دەبەخشرێ. بەداخەوە لەبارەی ژیان و چالاکی نێو خانەقاکانی ناوچەکە زانیاری کەمە و ناتوانین وێنەیەکی دروستی بۆ بکێشین، تەنیا ئەوەندە دەزانین لە هەندێك شوێندا لە کاتی دروستکردنیدا سۆفییەکان لەگەڵ کرێکارەکان کاریان دەکرد[944]. دوای دروستکردنیشی شێخ وەك خودان باڵاترین دەسەڵاتی رەمزی خۆی کاروبارەکانی رێکدەخست، تەنانەت هەر ئەویش – خانەقا و گۆشەی هەبوایە یان نا – بژێوی ژیانیان، بەتایبەت خۆراکی بۆ سۆفییەکان پەیدا دەکرد، وەك لە کاری مەمشادی دینەوەریدا دیارە[945]،

---

(٩٣٩) بۆ زانیاریی زیاتر بگەڕێوە بۆ: ادریس محمد حسن الدوسكي: همدان, ص ص٢٢٢-٢٢٣.

(٩٤٠) السبكي: معيد النعم و مبيد النقم, حققه: محمد علي النجار و آخرون, دار الكتاب العربي, القاهرة, ١٩٤٨, ص١٢٦

(٩٤١) الشطنوفي: بهجة الأسرار, ص٢٠٧. التادفي: قلائد الجواهر, ص٨٠. الوتري: روضة الناظرين, ص٢٦-٢٧.

(٩٤٢) السلفي: معجم, ص٣٩١, ٤٥٦-٤٥٧. الشطنوفي: بهجة الأسرار, ص٢٠٧. ابن كثير: البداية, ج١٢, ص١٦٤. الوتري: روضة الناظرين, ص٢٦-٢٧.

(٩٤٣) الغزالي: احياء, ج٤, ص٤٨٢.

(٩٤٤) السلفي: معجم, ص١١٩.

(٩٤٥) السراج: اللمع, ص٢٥٤.

کافی دینەوەرییش بەخۆی خزمەتی ئەو سۆفییانەی دەکرد کە دەهاتنە خانەقاکەی و تێیدا دەمانەوە[٩٤٦].

لە راستیدا خانەقاکانی پانتایی کوردی هەر شوێنێك نەبوون بۆ نیشتەجێبوونی شێخ و حەواندنەوەی ئەوانەی بە لایدا گوزەریان دەکرد[٩٤٧]، بەڵکو وەك پێشتریش گوتمان بەرەبەرە خەسڵەتی دەزگای ئایینی — زانستییان وەردەگرت، بەمەش ئەو شوێنانە وەك دامەزراوەی تایبەتمەند لەو پانتاییەی تێیدا هەن بەردەوامیی بۆ خۆیان مسۆگەر دەکەن، وەك لە حاڵەتی خانەقاکەی ئەبولعەباسی نەهاوەندی دەردەکەوێ، کە تا ئەوکاتەی کەسانێك دەمێنن و پەیڕەوی لە رێبازەکەی ئەو دەکەن، گرنگی دامەزراوەکە دەهێڵنەوە، بە جۆرێك کە لەسەدەی شەشەمی کۆچیدا ئەبولحەسەن عەلی کوڕی طاهری نەوەی دەبینین هەمان کاری باپیرەی دەکات؛ خانەقا دروست دەکات یاخود نوژەنی دەکاتەوە[٩٤٨]، دەشێ هەمان شت لە بارەی خانەقاکانی شێخی هەکاری بڵێین کە تا درەنگانێك وەك بنکەی زانستی و خوداپەرستن ناویان لە ناوچەکەدا دەمێنێ[٩٤٩].

بەدەر لەو گرنگییەی ئەو خانەقا و گۆشانە، ئەم گۆڕانانەی سۆفییەکان بەسەر شوێنیان داهێنا، رێگە خۆش دەکات تا ببێتە مەنزڵگای خەڵکانێك کە باوەڕیان پێیان هەیە و لەلای ئەواندا هەست بە ئاسوودەیی دەکەن. هەروەها ئەو دەست کورت و نەدارانەی لە نێو جڤاك بژێوی ژیانیان دەست نەدەکەوت روویان دەکردە لای شێخانی سۆفی بەڵکو بە هانایانەوە بێن؛ ئەوەتا لەلای ئیبراهیمی کرماشانی هەر یەك لە هەژارانی سۆفی و هەژاری ئاسایی بۆ نانخواردن کۆدەبوونەوە و مورید و شاگردەکانی شێخیش خزمەتیان دەکردن[٩٥٠]. بەمەش خەڵکی ئاسایی — تا ئەوکاتەی سۆفییەکان لە نزیکییانەوە جێگیرن — لێیان کۆ دەبوونەوە و ئەرکی تری کۆمەڵایەتی و ئایینیان دەخستە سەر ئەرکەکانی تریان و رەوایەتییان بەو کردە کۆمەڵایەتییەیان دەبەخشی و ناچار بە بەشداری کۆمەڵایەتییان دەکردن.

---

(٩٤٦) السلفي: معجم, ص١٣٧.

(٩٤٧) ابن النجار: ذيل, ج١٨, ص١٧٢. جامي: نفحات, ص١٥٠.

(٩٤٨) السلفي: معجم, ص١١٩.

(٩٤٩) ابن النجار: ذيل, ج١٨, ص١٧٨.

(٩٥٠) ابن عساكر: تاريخ, ج٦, ص٤٤٤.

**رازیبوونی سۆفی بە باوەڕی میللیی کوردانە:**

بێگومان دوان لە ڕەهەندی کۆمەڵایەتیانەی سۆفیگەری، زیاتر دەرخستنی ئەرك و جێکەوتە کۆمەڵایەتییەکانی ئایینە بە گشتی، یان با بڵێین ئەو ئایینەی بڕێك لە ماناکانی لە هەڵسوکەوتی ڕۆژانەی پەیڕەوکارانی چڕ دەکاتەوە، چالاکی و هەڵوێستە کۆمەڵایەتییەکان لەو مانایانەدا دەبینێ و دواجاریش ڕەوایەتییان پێ دەبەخشێ. ئەمەش وادەکات جڤاك لەنێو فەزایەکی ئایینیدا بخولێتەوە و هەردوولا (ئایین، جڤاك) بە رایەڵە هێڵێکی دیار و نادیارەوە بەیەکەوە پەیوەست بن.

بەهەرحاڵ، ئەوەی پەیوەندیی بە بابەتەکەوە هەبێ، یەکێك لەو هێڵانەی جڤاکی کوردی و سۆفییانی بەیەکەوە دەبەستەوە، ئاستی بەرهەمهێنانی ئەو جڤاکەیە بۆ باوەڕ و قەبولکردنی ئەم سۆفییانەشە بۆ باوەڕەکەی. بەر لە هەموو شتێك، ڕەنگە ئەستەم بێت بتوانین دەستنیشانی چییەتی و دەرکەوتەی باوەڕ لە ئاستی میللییدا بکەین، بەتایبەت لە قۆناغێکی مێژوویی ئەوتۆ کە تیایدا ئەو ئاستە کۆمەڵایەتییە خراوەتە دەرەوەی مێژووی نوسراوەوە و بە شایستەی ئەوە نەزانراوە لە نێو دەقەکاندا، لەوانەش ئەو دەقانەی گرنگی بە بیروباوەڕی ئایینی دەدەن، جێگەی هەبێ، نەخاسمە ئەو گرۆ کۆمەڵایەتییانەی لە دەرەوەی بنکە شارستانییەکاندا دەژین، یاخود خودان بونیادێکی خێڵەکییانەن و نیشتەجێی جیهانبینیی ئەو سیستەمە کۆمەڵایەتییەن. ئەگەر باسێکی ئەو ئاستەی کۆمەڵایەتیش هەبێ، ئەوا بۆ ئەوە نییە ڕاستییەکانی دیاربخرێ، ئەوەندەی لە تێڕوانینێکی دەستەبژێرانە و خۆبەگەورەزانینەوە سەرچاوە دەگرێ و دەیەوێ وێنای ئەوانە، وەك گرۆی نەشیاو و قێزەون، بخاتە ڕوو و بەکەم تەماشایان بکات[٩٥١].

لەگەڵ ئەوەشدا، هەر لەمیانەی ئەو تێڕوانینە دەستەبژێرییانەوە، تێدەگەین کە شێوەی باوەڕی کوردی نەك هەر قەبوڵ نەکراوە، بەڵکو جەخت لەسەر پێگەی لاوازی ئەو ڕەگەزە — ئیتنییە لە تەواوی گوتاری ئایینی کراوەتەوە، تەنانەت ئەمە بە دەقی ئایینی(قورئان و فەرموودە) بەستراوەتەوە[٩٥٢]، لەوێوە وەك ڕاستییەك خراوەتە ڕوو، نەك وەك وێناکردنێکی

(٩٥١) بەراوردی بکە لەگەڵ: محمد أرکون: نزعة الأنسنة في الفکر العربي, ترجمة: هاشم صالح, دار الساقي, بیروت, ١٩٩٧, ص٥٧٨.

(٩٥٢) بۆ نموونە بڕوانە: نعیم بن حماد: الفتن, تحقیق: سمیر أمین الزهیري, مکتبة التوحیدي, القاهرة, ١٩٩١, ج٢, ص١٦٨٤. الأصفهاني: محاضرات الأدباء, ج١, ص٧٦, ٤٢٦.

پەیوەست بەو تێڕوانینەی دەستەبژێرەوە. ئیدی ئەگەر باوەڕی میللیی کوردان لە مێژوودا دەربکەوێ ئەوا وەك نموونەی لاوازی عەقڵیی و دەبەنگی دەهێنرێتەوە و بە گاڵتەوە باسی لێوە دەکرێ[953].

بەهەرحاڵ، ئەوەی لێرەدا گرنگ بێ هەڵوێستی سۆفییانە لە هەندێك لە دەرکەوتەکانی ئەو باوەڕە؛ ئەگەر کەسانێك کۆمەڵی کوردی بە سادەیی بیروباوەڕ و ئاستی نزمی تێگەیشتنی ئاییـ ـی تۆمەتبار دەکەن، ئەوا لەلای سۆفی بەشێوەیەکی تر و لە ئاستێکی تردا خوێندراوەتەوە و خراوەتەگەڕ، بەجۆرێك کە دەبینین نەك هەر قەبوڵکراوە بەڵکو ئەو بەسەرهات و گێڕانەوە سەروو ئاساییانەی لەو پانتاییە کۆمەڵایەتییەدا دەگێڕدرێنەوە — بەدەر لە راستی و ناڕاستییان -- کەسێ سۆفی "وەرگر — متلقی"یێکی هەرە بەهێزی دەبێ؛ بۆیە کاتێك — بە نموونە — دەڵێن لە نێو خێڵە کوردییەکانی نزیك بە دینەوەر منداڵێك لەلایەن ئاسکێکەوە بەخێو کراوە و بە شیری ئەو ئاسکە گەورە بووە، ئەوا ئەو خەڵکە ڕوو دەکەنە لای سۆفییەکی شارەکە بەسەرهاتەکەی بۆ دەگێڕنەوە تا باوەڕیان پێ بکات[954]، هەروەها ئەگەر منداڵە کوردێکی تر هەر بە سروشتی خۆی ئەوەندە "خوداناس — عارف" بێت و تەرکی دونیای کردبێت کە دواجار بەرەو ئاسمان بەرز بووبێتەوە، ئەوا بۆ گەورەی سۆفییانی فارس ئەبو عەبدوڵڵای کوڕی خەفیفی شیرازی، نەك هەر نائاسایی و خورافە نییە، بەڵکو حاڵێکە لە نێو مرۆڤدا و دەشێ تەواو وەك ئاماژەیەکی سۆفییانە ببینرێ[955]. بەمەش سۆفی هەر بە قەبوڵکردنی ئەو باوەڕە میللییەی کوردان نەوەستاوە، بەڵکو لە بۆچوونی خۆشیدا بەکاری هێناوە و بۆ باوەڕهێنان و بەڵگە هێنانەوە لەسەر راڤەی سۆفییانەی "پیرۆزبوونی مرۆڤ" بەگەڕی دەخات، چونکە بەسەرهاتی لەو جۆرە رەوایی دەبەخشێتە ئەو پیرۆزییەی سۆفییان دەخوازن لە کەسێتی خۆیاندا بەرجەستەی بکەن و دەوروبەری کۆمەڵایەتیشی پێ رازی بکەن. لە هەندێ جاریشدا دەبینین سۆفی نەك باوەڕی کوردی، بەڵکو شێوە ژیانی ئەوانی پێ نزیکە لە جیهانبینییەکەی خۆی بۆیە لە نێو هەموو ئەو جۆرە پۆشاکانەی باون، ئەو جل و بەرگی کوردی دەپۆشێ[956].

(٩٥٣) ابن الجوزي: المنتظم, ج١٦, ص٨٧.

(٩٥٤) ابن خميس: مناقب, ج٢, ص٢٣٥.

(٩٥٥) أبو الحسن ديلمي: سيرت, ص ص٢٠٣-٢٠٤.

(٩٥٦) الأنصاري: طبقات الصوفية, ص٢٨٩.

بێگومان ئەو بەسەرهات و ئەزموونە رۆحانییە - کۆمەڵایەتیانە لەو ئاستەدا چەندین مانای رەمزی لەخۆوە دەگرێ و راڤەی ئەو جیهانبینییەمان بۆ دەکات کە لەو ناوەندەدا کاری پێ دەکرێ و ئاماژەیە بۆ ئەو بەرهەڤکردنەی بۆ حەقیقەت و باوەڕداری لە ئارادایە، بێگومان ئەمەش جومگەیەکی بنەڕەتی مێژووی بیروباوەڕی ئایینی کوردی لەسەدەکانی ناوەڕاستدا پێکدێنێ، کە لەبەر پابەندی زانستی بە بابەتەکەی خۆمان ناتوانین بچینە نێو وردەکارییەکانەوە. ئەوەی لێرەدا گرنگ بێ رازی بوونی سۆفییانە بەو ئەزموونانە، ئەمەش بەو مانایە دێ ئەوان حەقیقەتەکەیان پێ قەبووڵ بووە و بردوویانەتە ئاستی ئەو جۆرە حەقیقەتەی هزرەکەی خۆیانیان لەسەر دامەزراندوە، ئەمە لە زەینی هەردوولا حەقیقەتی دەرکەوتنی خوداییە لە کار و کردەوەی رۆژانە، ئامادەیی ئەو هێزە نائاساییەیە لە دیاریکردنی رەوتی ژیانی ئاسایی و زەقکردنەوەی رەهەندی پیرۆزیی کردەی مرۆڤانەیە لە رێگەی جێگیرکردنی لە نێو رووداوی ناسروشتی، هەر ئەمەشە تێگەیشتن و پرۆسەی بەرهەمهێنانی کەرامەت لە کولتووری سۆفیگەریدا، ئەوە نەبێ کەرامەتی میللیی هەمەکییە و تەواوی گرۆیە کۆمەڵایەتییەکەی تێدا بەشدارە و ئەوەی سۆفی پەیوەستە بە پێگەیشتنی حاڵی سۆفییانە و قووڵبوونەوەی پەیوەندیی مرۆڤایەتی و خودایەتی.

ئەو کاتەی سۆفیش دان بە دیاردەکانی نێو خەیاڵدانی کۆمەڵایەتی دەنێ، ئەوا دەیخاتە نێو هەمان چوارچێوە و بەڵگەیەکیش دەبێ لەسەر سەلماندنی ئەو قووڵبوونەوەیە و ماقوڵ بوونی. لەلایەکی تر گێڕانەوەی دیاردە نائاساییەکانیش رەنگدانەوەی ئەو چاوەڕانییەیە کە ئەو پانتاییە لەو شێخانەی هەیە لەگەڵ ئەو تێگەیشتنەی لەسەر باوەڕی ئەوان گەلاڵە بووە، تێگەیشتنێک کە رێگە بە هەبوونی دیاردەی ئاوا دەدات و قەبوڵی دەکات.

## دووەم: قەبوڵکردنی جڤاکی کوردی بۆ دیاردەی سۆفیگەری

خوێندنەوەی سۆفیگەریی ئیسلامیی لە ئاستی میللیی، پەیوەستە بە هەریەك لە سروشتی دیاردە ئایینییەکە و ئەو چوارچێوە کۆمەڵایەتییەی تێیدا نیشتەجێیە؛ چەندە ئەو دیاردەیە دەتوانێ لە پانتایی کوردیدا بۆچوونەکانی خۆی بچەسپێنێ و کاریگەریی باوەڕیانەی هەبێ و چەندەش جڤاکەکە ئامادەیی قەبولکردنی دیاردەکەی دەبێ و بەپێویستی دەزانێ بۆ کردەی ئاینداری و پارێزگاری کردن لە ڕێکخستنە کۆمەڵایەتییەکانی؟

بەشێوەیەکی گشتی، شێوە ژیانی سۆفییانە؛ دوورکەوتنەوە لە ماڵ و سامان و هەڵبژاردنی هەژاری وەك باشترین شێوەی ژیان و ڕەوایی بەخشین بەو هەژارییە کە لەلای هەندێك سۆفی وڵاتەکەش بینیمان، ڕاستەوخۆ ئەوان لەو گرۆیە کۆمەڵایەتیانە نزیك دەخاتەوە کە بە کردار هەژاری و نەداری هیوابڕانە شێوەی ژیانیان پێکدەهێنێ. ئیدی نزیکبوونەوەی زۆرینەی ڕەشەخەڵك لە شێخی سۆفی کە لە بژێوی ژیانیدا لەوان دەچێ و لە باوەڕدا جیاواز و دەشێ ڕێنیشاندەر بێ، ئاسایی دەبێ. جڤاکی کوردی کە خاوەن بونیادێکی خێڵەکی بووە و زۆرینەی پێکهاتەکەی لە ئاستێکی نزمی بژێوی بوون، تا ئەو ڕادەیەی کە لەگەڵ نزمترین ئاستە کۆمەڵایەتییەکاندا پۆلێن دەکران و ناویان لە ریزی ئەوانە دەهات کە چینی هەرە ژێرەوەی جڤاکی ئیسلامییان پێکدەهێنا[٩٥٧]، ڕەنگە ئەو ئاستە کۆمەڵایەتییە بێ وایکردووە بەدوای ئەو کەسایەتییە ئاینییانەدا بگەڕێن کە لێیان نزیکن و دەشێ لە ژیانی ڕۆژانەیاندا هاوکاریان بن.

ئەوەی بڕوانێتە هەندێك لە دەقە مێژووییەکانی سەردەمەکە، بۆی ڕووندەبێتەوە کە جۆرێك لە پێشوازی کۆمەڵایەتی لە دیاردەکە و جیهانبینییەکەی هەیە؛ ئەوەتا لە شاری دینەوەر کوردە خێڵەکییەکان دەچنە لای سۆفییەکی ئەوێ تا پێداویستییەکانیان بۆ بکڕێ، بەمەش ئەو دەبێتە ئەو پێوەندەی ئەوان بە بازاڕ دەبەستێتەوە[٩٥٨]. لە شوێنی تریشدا ئافرەتی کورد هەیە

---

(٩٥٧) لەسەر ئەو پۆلێنکردنەی کوردان، هەر بۆ نموونە، بگەڕێوە ئەو سەرچاوانەی خوارەوە کە هی هەمان قۆناغی توێژینەوەکەی ئێمەن: البیهقي: المحاسن و المساويء، تحقیق: محمد أبو الفضل ابراهیم، مطبعة نهضة مصر، القاهرة، د.ت، ج٢، ص٧١. الآبي: نثر الدرَ، حققه: منیر محمد المدني، الهیئة المصریة العامة للكتاب، القاهرة، ١٩٩٠، ج٧، ص٧٢. یحیی بن مسعدة: رسالة یحیی بن مسعدة في الرد علی الشعوبیة، ضمن: نوادر المخطوطات، بتحقیق: عبد السلام هارون، ط٢، مكتبة الخانجي، القاهرة، ١٩٧٣، ج١، ص٢٧٥.

(٩٥٨) ابن خمیس: مناقب، ج٢، ص٢٣٥.

دەچێتە لای سۆفی تا لەو دیاردە ناناساییانەی ئاگادار بکاتەوە کە لە قۆشەنی هۆزەکەیدا ڕوویانداوە[959]. لەگەڵ شێخی ئیسلامی هەکاری ئەو پێویستییە کۆمەڵایەتییە فراوانتر بووە و خەڵکەکە لە ناوچەی هەکاری روویان تێدەکرد و باوەڕی زۆریان پێی هەبووە[960]. هەروەها ناوەندە کۆمەڵایەتییەکەی هەر یەك لە ئەبو محەمەدی شەنبەکی و ئەبولوەفای حولوانی بە تەواوی پێیانەوە پابەند بووە و لە کاتی پێویستدا هانایان بۆ بردوون[961].

کوردەکان هەر بە هانا بردنە بەر کەسی سۆفی نەوەستاون، بەڵکو هەوڵیانداوە لە زەمینەکەی خۆیاندا جێگیریان بکەن، دیارە ئەمەش بە خزمەتکردنیان و هاوکاری کردنیان دەبێ، بۆیە هەوڵدەدەن بژێوی ژیانی سۆفییەکان دابین بکەن؛ هەندێکیان خۆراکیان پێ دەدەن[962]، تەنانەت دەخوازن پەیوەندیی کۆمەڵایەتیشیان لەگەڵدا گرێ بدەن و کچی خۆیان پێشکەش دەکەن[963]، هەندێکیشیان رایدەگەیەنن ئەوان پەیڕەوی لە ڕێبازی سۆفییان دەکەن و پارێزگارییان لێ دەکەن[964].

بێگومان ئەو پێشوازییە کۆمەڵایەتییە لە سۆفییان، وادەکات خۆیان و بیروباوەڕیان لە ناوەندی کۆمەڵایەتیدا وەك تەنێکی نامۆ نەمێنێتەوە و خۆماڵی بکرێ، ئەگەرچی دەبێ ئەوەمان لەبەرچاو بێ کە ئەو خۆماڵیکردنە، لایەنی کەم لە قۆناغی سەرهەڵدان و جێگیر بوونی دیاردەکە، کاری سۆفییەکان نییە وەك لە هەڵوێستی ئەوان لە تێکەڵیی کۆمەڵایەتی دەرکەوت، نەوەندەی رەنگدانەوەی پێداویستییە کۆمەڵایەتییەکە خۆیەتی لەپێناو نوێکردنەوەی تێگەیشتنی ئایینی و تەنانەت ڕێگەیەك بۆ باوەڕداریی — کۆمەڵایەتی، ئەگەرنا ئەوان کۆمەڵێك بەربەستیان لە بەردەم نزیکبوونەوەی خەڵکی ئاسایی لە ئەلقەی خۆیان داناوە و لەمەشدا مەبەستیان چاککردنی ڕەفتاری کۆمەڵایەتی بووە تا لەگەڵ بواری کردەکی

---

(٩٥٩) أبو الحسن ديلمي: سيرت, ص٢٠٣.

(٩٦٠) ابن خلكان: وفيات, ج٣, ص٣٤٥. الصفدي: الوافي, ج٢٠, ص١١٩.

(٩٦١) بڕوانە: التادفي: قلائد الجواهر, ص ص٨٠-٨١. الوتري: روضة الناظرين, ص ص٢٤-٢٧.

(٩٦٢) ميهني: أسرار التوحيد في مقامات الشيخ أبي سعيد, بتصحيح و تعليقات: محمد رضا شفيعى كدكنى, چاپ هفتم, مؤسسه انتشارات آگاه, تهران, ١٣٨٦هـ.ش, ج١, ص١١٠.

(٩٦٣) أبو الحسن ديلمي: سيرت, ص٢٠٣.

(٩٦٤) الهجويري: كشف, ج٢, ص٥٦٢.

باوەڕەکەیان بگونجێ و لە ئاستی خزمەتکردنی ئەوان دابێ. چونکە ئەگەر ئەو خەڵکە دەخوازن ئەو سۆفییانەیان لێ رازی ببێ، دەبێ لە سنووری بنەما ڕەوشتییە – ئایینییەکانی ئەواندا بمێننەوە، نەك لە نێو خراپەیی خۆیان و بەمەبەستی خۆدەرخستن ئەو پەیوەندییە دروست بکەن. هەر بۆیە - بۆ نموونە - ئەگەر کەسێك لە بنەڕەتدا لە سۆفییان بووە و لێیان جیا بۆتەوە و ئارەزووە دونیاییەکان ڕێگر بوون لەوەی بتوانێ "ئەو پەیمانەی لەگەڵ خودا هەیبووە" بیباتە سەر، ئەوا چیدی سۆفییەکان رازی نابن – وەك قەرەبووکردنەوە – خزمەتیان بکات و مەمشاد گوتەنی، لە دابینکردنی بژێوییان پشتی پێ ببەستن[965]. هەروەها کاتێك کەسانێکیش لە نەهاوەند خزمەتی سۆفییان دەکەن، بەڵام لە نێو خەڵکدا شانازی بەو کارەوە دەکەن و باسی دەکەن، ئەوا ئەم سۆفییانە لێیان دوور دەکەونەوە و ئەبولعەباسی نەهاوەندی رایدەگەیەنێ ماڵی ئەو جۆرە کەسانە لە گرۆی هەژارانی سۆفی حەرامە[966].

لەگەڵ ئەوەشدا، لەناوەندە کۆمەڵایەتییەکەدا هەر پێشوازی لەو دیاردە ئایینییە کراوە و هەوڵی بەرفرەکردنی کاریگەرییەکانی دراوە. لێرەوە دەشێ ئەمەش – تا ئەو شوێنەی زانیارییە پەرش و بڵاوەکان هاوکارمان بن – بۆ چەند خاڵێك بگێڕینەوە:

### ١- سۆفیگەری وەك ڕێگەیەکی تێگەیشتن لە ئایین:

ئەگەرچی، هەر لەسەرەتای توێژینەوەکەماندا بینیمان، سۆفیگەری وەك کایەیەکی ئایینی پڕ لە راز خۆی دەناسێنێ و لە میانەی کۆمەڵێك چەمك و دەستەواژەی ئاڵۆزەوە بنەماکانی باس دەکات و بیروباوەڕەکانی پێ دەخاتە روو، بە جۆرێك کە وەك یەك لە ئاڵۆزترین و نادیارترین و بگرە قورسترین کایە باسی دەکرێ و – تا ئەوکاتەی لە چوارچێوەی هزرییدا ماوەتەوە - کەم کەس دەتوانێ بەسەر تەواوی ئەو چەمك و دەستەواژە و بیروباوەڕانەی رابگات و بە وردی لە مەغزا دیار و نادیارەکانیان بگات. بەڵام لە رووی کردارییەوە، بە پێچەوانەی برێك لە کایە ئایینییەکانی تر، چ ئەوانەی بە ئەستەمی خۆیان بەدەستەوە دەدەن(کەلامناسیی وەك نموونە) یان ئەوانەی بە چەمك و دەستەواژەی باو و تێگەیشتراوەوە گوزارشت لە خۆیان دەکەن(وەك فیقهی ژیانی رۆژانە)، زوو توانیویەتی لە کەسی سادە و رەشەخەڵك نزیك ببێتەوە

---

(٩٦٥) ابن خميس: مناقب, ج٢, ص١٥.

(٩٦٦) الأنصاري: طبقات الصوفية, ص ص٥٠٣-٥٠٤.

و وەك ڕێبازێکی ئاسانی باوەڕداری تەماشای بکرێ و جۆرێك لە پەرۆشیی لەو ئاستە سادەیە بۆ تێگە باوەڕییەکەی هەبێ. کەسی سۆفیش، سەرباری ئەو قوڵبوونەوە ڕۆحانییەی پێی ناسراوە، هەر لەو چوارچێوە سادەیەدا جێی بۆ بکرێتەوە و سۆفیبوون لە یەك کاتدا بریتی بێ لە ئاگایی زانایانە و بێئاگایی و نەزانیی ڕەشەخەڵك.

ئەو خوێندنەوەیە لە نێوەندی سۆفیگەری کوردیدا لە دووتوێی گشتگیرکردنی وتەی بەناوبانگ" ئێوارە کورد بووم، بەیانی بووم بە عەرەب – أمسیت کردیاً و أصبحت عربیاً" روون و ئاشکرایە، تیایدا یەکانگیریی نێوان سادەیی کورد و قووڵیی حیکمەتی عیرفانی دەردەکەوێ. ئەوەبوو وتەکەمان بینی درابووە پاڵ هەریەك لە ئەبوبەکری کوڕی یەزدانیار[٩٦٧]، ئەبو عەبدوڵڵای بابویی[٩٦٨]، باباتاهیری هەمەدانی[٩٦٩] و ئەبولوەفای حولوانی[٩٧٠]، لەبارەی سێ سۆفی یەکەم لە سەرچاوەکاندا بایی ئەوەندە زانیاری نییە بەتەواوی ژیانی بەر لە بوونیان بە سۆفی دەربخات تا ماناکانی ئەو گۆڕانەمان بۆ دەربکەوێ، مەگەر سەربوردەی سۆفی چوارەم – ئەبولوەفا – نەبێ کە خەریکی ڕێگری بوو. دەشێ ئەمەش وەك بەڵگەیەك لەسەر پابەند نەبوون و ئاستی سادەی تێگەیشتن لە بابەتە شەرعییەکان سەرەدەری لەگەڵدا بکرێ.

لە پشت وتەی "أمسیت..."دا چەند گێرانەوەیەك هەیە، باوترینیان ئەوەیە کە ئێوارەیەك دەروێشێکی ساکاری کورد داوای لە چەند شاگردێکی فەقیە کردووە فێری زانستە ئایینییەکانی بکەن، ئەوانیش گاڵتەیان پێ کردووە و داوایان لێ کردووە ڕوو لە ئاسمان بکات و چەند ڕستە و دەستەواژەی بێ مانا بڵێتەوە تا ببێتە زانا! کەچی ئەو بەیانی بەڕاستی لە تەواوی زانستەکان شارەزا بووە[٩٧١]، بەمەش لە ساکاری کوردانەوە( ئاشنا نەبوون بە زانستە ئایینییەکانەوە) بۆ قوڵایی عەرەبێتی(شارەزایی لەو زانستانە، بەوپێیەی عەرەبی زمانی بنەڕەتی ئەو شارەزاییە بوو لە پانتایی ئیسلامیدا) پەڕیوەتەوە، بە دەستەواژەیەکی تر ئەو

---

(٩٦٧) محمد علي تربيت: دانشمندان, ص٤٠١, وەریگرتـوە لـە دەستنوسـی: ابـن باکوی: تلخيص الآثار في عجائب الأقطار, ص٢١.

(٩٦٨) شيرازي: تذكرة, ص٢٠٣.

(969) Edward Heron – Allen: The Lament, P.xiv-xv.

(٩٧٠) الشطنوفي: بهجة الأسرار, ص٢٠٦. التادفي: قلائد الجواهر, ص٨١.

(٩٧١) بۆ دەقی ئەو بەسەرهاتە بگەڕێوە بۆ: شيرازي: تذكرة, ص ص ٢٠٣-٢٠٧.

کوردەی تێکەڵ بە جیهانبینی سۆفییانە بووە دەشێ لە شەو و رۆژێکەوە لە سادەیی کوردانەوە بچێتە نێو قوڵایی ئایینەوە.

بێگومان بەگەڕخستنەوەی بەردەوامی وتەکە لە کولتووری سۆفیگەری و چەندپات کردنەوەی هەمان تێگەیشتن لەگەڵ هەر یەك لەو کەسە کوردانە وایکردووە ببێتە حاڵێکی سۆفییانەی جێگیر و گوزارشت لە رازێکی خودایی بکات کە ئاماژەیە بۆ ناسینی بێ پەردەی شەریعەت، هەروەها ئەو کەسەی وتەی ئاوای لە زار دێتەدەر کەسێکە بێ شارەزایی لە بنەما ئەستەمەکانی ئەو شەریعەتە رێگەی خودایی دەدۆزێتەوە، بۆیە بۆ سۆفییان بە گشتی پێویستە لەو رازی گۆڕانەی کوردان تێ بگەن، ئەمە رێك ئەو بۆچوونەیە کە مەولانا جەلالەدینی رۆمی بۆ وتەکەی هەیە، وەك لە مەثنەوی دەڵێ:

| | |
|---|---|
| گفت پیغمبر که هست از امتم | کو بود هم گوهر هم همتم |
| مر مرا ز آن نور بیند جانشان | که من ایشان را همی بینم بدان |
| بی صحیحین و أحادیث و روات | بلك اندر مشرب آب حیات |
| سر أمسینا لکردیا بدان | راز اصبحنا عربیا بخوان[٩٧٢]. |

ئەگەر کوردیش لە کولتووری نوسراودا وا وێنا دەکرێن لە زانین و زانستەکان کۆڵەوارن و لە باوەڕداری لە ئاستی سادەی بیرکردنەوەدا جێگیرن و شارەزاییان لە زانستەکان زۆر کەمە[٩٧٣]، ئەوا سۆفیبوون یاخود لایەنی کەم هۆگر بوون بە شێخانی سۆفی، رەنگە لەو وێنایەیان بەدوور بگرێ و رێزێکی ئایینی بۆ خۆیان مەیسەر بکەن. لەلایەکی ترەوە دەشێ لە نێو سادەیی مرۆڤی کورددا تێگەیشتنێکی قووڵی دونیا پەنهان بێ و لەگەڵ بیروباوەڕی سۆفییانەدا خۆی دەربخات.

---

(٩٧٢) (( پێغەمبەر گوتی لە ئومەتی مندا هەن لە گەوهەر و هیممەتی مندان, ئەوانەی رۆحیان لەو نورەوە من دەبینێ کە من ئەوانی پێ دەبینم, ئەمەش بێ دوو صحیحەکە( صحیح بخاری, صحیح مسلم) و فەرموودە و گێڕەرەوانی, بەڵکو تەنیا لە سەرچاوەی ئاوی ژیاندا, بۆیە رازی "أمسیت کردیا" بزانە و هی "أصبحت عربیا" بخوێنەوە))؛ مثنوی, ص١٢١.

(٩٧٣) هەر بۆ نموونە بڕوانە: إخوان الصفا: رسائل اخوان الصفا و خلان الوفا, اعداد و تحقیق: عارف تامر, منشورات عویدات, بیروت, ١٩٩٥, ج٣,ص. الغزالي: إحیاء, ج٢, ص٣٤٢؛ج٣, ص١٧٣, ٢٤٣. الحلبی: تقریب المعارف, ص ص٢٠٦-٢٠٧

## ٢- سۆفیگەری و دارشتنەوەی هەندێك رەفتاری كۆمەڵایەتی كوردی:

وەك چۆن سۆفیگەری رێگەیەكی ئاسان بوو بۆ شارەزابوون لە ئاییندداری ناواش، تا ئەوكاتەی جەخت لەسەر چاككردنی دەروونی مرۆڤانە دەكاتەوە و خۆی وەك بوارێك بۆ بنەما رەوشتییە باڵاكان دەخاتە ڕوو، چاوەڕێی ئەوەی لێ دەكرێ رێگەیەك بێ بۆ گۆڕینی رەفتاری كۆمەڵایەتی؛ لە رەفتاری نەویستراو بە پێوەری ئایینییەوە بۆ رەفتاری ویستراو، ئەو جۆرە رەفتارەی كاریگەریی خراپی بەسەر ژیانی رۆژانەی جڤاكی ئیسلامییەوە هەبووە، بۆ ئەمەیان كە لەنێو وێنای نموونەیی ئایینی ئەو جڤاكەدا خوازراوە و پێویست بووە گرۆیە كۆمەڵایەتییە پێكهێنەر و هەمەچەشنەكانی پەیڕەوی لێ بكەن.

بەهەر حاڵ، ئەو رەفتارە كۆمەڵایەتییەی كوردان نواندوویانە و بۆتە خاڵی پێكبەستی ئەوان بە ناوەندی سۆفیگەرییەوە، جەردەیی و رێگرییە؛ كە لە كولتووری نوسراوی سەدەكانی ناوەڕاستدا وەك رەفتاری هەرە باوی كوردان وێناكراوە، كراوەتە ناسنامەی ئەو گروپە ئیتنییە و بە بۆنە و بێ بۆنە باس دەكرێ و لە خەیاڵدانی گشتیدا وەك بنەمایەكی چەسپیوو جێگیردەكرێ[٩٧٤]، بەجۆرێك كە وادێتە بەرچاو بۆتە رەفتارێكی گروپیانە ( Group behavior) و رێكخراو و ئاكامی كارتێكردنی تاكەكانی ئەو جڤاكە خودان بونیادە خێڵەكییەیە لەیەكتر و دواجار نواندنییەتی لەو كولتووره نوسراوە لەسەرووی كات و شوێنەوە[٩٧٥]. رەنگە هەر ئەمەش بێت وایكردووە بخرێتە نێو كایەی ئایینییەوە، بەجۆرێك كە دەبینین ئاراستە فیقهییەكان لەسەرووی جیاوازییەكانی خۆیانەوە، چاودێری دەكەن و لە نێو بڕیارە "شەرعییەكان"یاندا جێی دەكەنەوە[٩٧٦]، نەك هەر لەو قۆناغە بەڵكو تا درەنگانێك

---

(٩٧٤) هەر بۆ نموونە بڕوانە: الخوارزمي: مفاتيح العلوم, ص١٠٠. الآبي: نثر الدر, ج٧, ص٣٧٩-٣٨٠. ابن سيده: المحكم و المحيط الأعظم, حققه: عبد الحميد الهنداوي, دار الكتب العلمية, بيروت, ٢٠٠٠, ج٣, ص٢٦١. الزمخشري: ربيع الأبرار و نصوص الأخبار, تحقيق: عبد الأمير مهنا, مؤسسة الأعلمي للمطبوعات, بيروت, ١٩٩٢, ج٢, ص٣٤.

(٩٧٥) پێشتر ئەو نواندنەی ڕەفتاری كوردمان خستۆتەڕوو, بگەڕێوە بۆ: حيدر لشكري: الكرد, ص ص١١٧-١٢٣.

(٩٧٦) هەر بۆ نموونە تەماشای ئەم سەرچاوانە بكە: الخلال: كتاب السنة، تحقيق: عطية الزهراني، دار الراية, الرياض، ١٩٨٩، ج١، ص١٦٠-١٦١. الطوسي: تهذيب الأحكام, ج١٠, ص٢١٢.

باسکردن و نەهیکردنی کوردان لە ئەنجامدانی دەبێتە بنەمایەکی جێگیری گوتاری ئەوانەی لەم کایەی ئایینداا کار دەکەن[٩٧٧]. تەنانەت کێشەی بۆ هەندێکیان دروست کردووە و نەیانتوانییەوە بەتەواوی ئەو دژایەتییە لێکبدەنەوە کە لە نێوان "کورد" وەك باوەڕدار و "ئەهلی یەکتاپەرست – أهل التوحید"، لەگەڵ کردەی ڕێگریدا هەبووە[٩٧٨].

بەهەرحاڵ پەیوەندی سۆفیگەری لەگەڵ ڕێگری وەك ڕەفتارێکی کۆمەڵایەتی مێژووی خۆی هەیە و دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتاکانی سەرهەڵدانی دیاردەکە؛ هەر لە بەشی یەکەمەوە تێبینی ئەوەمان کرد یەکێك لە یەکەمین ئەو کوردانەی ناویان هەیە ڕێگر بووە، دیارە مەبەستمان عەکبەری کوردییە. دوای ئەویش لە شاری حولواندا ڕێگرە کوردەکان[٩٧٩]، وێنایەکی سەروو ئاسایی کەسی سۆفییان کردووە و چاوەڕێی ئەوەی لێ دەکەن کردار و گوفتاری ڕێکبێتەوە؛ گوتارێك کە تیایدا ژیانی هەژارانە و جوامێری لە یەکە پێکهێنەرەکانییەتی، بۆیە کە ڕێگری کورد ڕووبەڕووی سۆفییەك دەبێتەوە نەو پابەندییەی بە گوتارەکەی خۆیەوە نییە، سەرکۆنەی دەکات و بە گومانەوە لێی دەڕوانێ، تەنانەت بڕیاری کوشتنی دەدات، وەك هجوەیری بەسەرهاتێکی ئاوا دەگێڕێتەوە بەڵام بێ دەستنیشانکردنی کاتی ڕوودانی. بەپێی بەسەرهاتەکە سەردەستەی کوردە ڕێگرەکان خۆی بە یاوەری سۆفییان زانیوە و هەڵوێستی نادروستی یەك لەو سۆفییانەی پێ قەبوڵ نەبووە کە لە نێو ئەو کاروانە بووە کە ڕێی پێ گرتبوو، ئەو کوردە پابەندی خۆی بە گەلی سۆفییان ڕاگەیاندوە و گوتوویەتی: ((چەندان ساڵە خزمەتی ئێوە دەکەین، ڕێگەی ئێوە دەگرینە بەر، بەربەستەکانتان لەڕێ لادەبەین))[٩٨٠].

---

(٩٧٧) ابن تيمية: السياسة الشرعية في إصلاح الراعي و الرعية، تحقيق: لجنة احياء التراث العربي، دار آفاق الجديدة، بيروت، ١٩٨٣، ص٦٨.

(٩٧٨) الخلال: كتاب السنة, ص١٦٠-١٦١.

(٩٧٩) لەو شارەدا چالاکی خێڵە کوردییەکان وەك ڕێگری باسی لێوە کراوە, بەتایبەت خێڵی "شازەنگانی - شاذنجاني" , کە دواتر دەتوانن میرنشینێك لەو قەڵەمڕەوەدا دابمەزرێنن. بڕوانە: الصولي: أخبار الراضي بالله و المتقي لله, عنى بنشره: ج.هيورث. دن, مطبعة الصاوي, القاهرة, ١٩٣٥, ص١٩٢. هەروەها بڕوانە: حسام الدين علي غالب نەقشبەندی: شارەزوور, ل ل٣١٣-٣١٥.

(٩٨٠) كشف المحجوب, ج٢, ص٥٦٢.

ئەو پەیوەندییە بەهێزە لەگەڵ هەر سێ گەورە سۆفی قۆناغی درەنگ ئەبوبەکری هاواری و ئەبومحەمەدی شەنبەکی و ئەبولوەفای حولوانی دەگاتە لوتکە، کە وەك پێشتر باسمان کرد، ئەوان وەك سێ رێگری کوردی سەدەی پێنجەمی کۆچی دەناسێنرێن، کە نەك هەر بوونەتە سۆفی هەرە پێشەنگی سەردەمەکەیان، بەڵکو رێساکانی ئەو دیاردەیان بووژاندۆتەوە و لەچەند لایەنێکیدا برەویان پێداوە، راستەوخۆ و ناڕاستەوخۆش ئەو دەوروبەرە کۆمەڵایەتی و رەفتارە پێشینەیەیان رەنگدانەوەی هەبووە.

بێگومان چەندپاتبوونەوەی بوونی رێگری کورد بە سۆفی، وامان لێ دەکات بەو ئاڕاستەیە بیر بکەینەوە کە ئەم وەرچەرخانە رۆحانی – کۆمەڵایەتییە، خراوەتە نێو سیستەمێکی رەمزییەوە و گشتگیرانە ئاماژە بۆ گۆڕان و پێگەیشتنی حاڵی سۆفییانە دەکات و جەخت لەسەر مانەوەی سۆفیگەری وەك زانستێکی ئیلهامیانە و ئەزموونێکی تاکەکەسیی دەکاتەوە نەك پرۆسەیەکی پێگەیشتنی باوەڕیانەی بونیادنراو لەسەر خوێندنەوە و تێخوێندنەوەی وردی بنەماکانی شەریعەت، وەك لە پرۆسەی بوونە فەقیە یان کەلامناس یان...هتد دا بەرچاو دەکەوێ.

دەستهەڵگرتن لە رێگری و پابەندبوون بە جیهانبینی سۆفییانە، وەك کردەی زاڵبوون بەسەر دەروون و خۆتەرخانکردن بۆ بواری خودایەتی دەخوێنرێتەوە؛ کەسی رێگر نەك هەر لە ژێر ئارەزووە دەروونییەکانییەتی، بەڵکو دەروونی شەڕانی ئەو بۆتە ناسنامەی و ئەوەندە دونیاییە کە دەخوازێ دونیایی بوونی ئەوانیتریش بخاتە ژێر رکێفی خۆیەوە، ئەمە لە ناوکۆی ئەو چیرۆکی بەیەکگەیشتنەی سۆفی و کوردی رێگر لە حولوان بە ئاشکرا دەخوێندرێتەوە. کاتێکیش رێگر دەبێتە سۆفی ئەوا ئاماژەیە بۆ پرۆسەیەك کە تیایدا توانیویەتی هەم دەروونی بەرزەفت بکات، هەمیش ئارەزووە دونیاییەکانی بچەپێنێ و ئامادەبێ بۆ گرێدانی پەیوەندییەکی جیاواز لەگەڵ دەرەوەی خۆی، بەتایبەت ناوەندە کۆمەڵایەتییەکە، بۆیە دەستبەرداری دەروون و دونیا دەبێ. لە بەسەرهاتەکەی عەکبەری کوردی رەمزی ئەو گۆڕانە بریتییە لە جل دادرین و گەڕان و سوڕانی بێپەروای خۆی و یاوەرانی، ئینجا دەچێتەوە ناو خەڵکی ئاسایی تا بۆی دەربکەوێ بۆتە کەسێکی نائاساییی[٩٨١].

---

(٩٨١) المقدسي: كتاب التوابين, ص ص٢٢٢-٢٢٣. ابن صصري: الدرة المضيئة, ص ص٢٣١-٢٣٢.

لەلایەکی ترەوە، ئەگەر دەستەواژەی "أمسیت..."، ئاماژە بوو بۆ سادەیی مرۆڤی کورد لە ئاستی تێگەیشتن و پیادەکردنی باوەڕی ئاینی، ئەوا ڕێگریش بەرجەستەکردنی ئەو سادەییەیە و نواندنییەتی لە هەمان ئەو زەمینە ئایینییەی سادەییەکەی تێدا دەخرێتەگەڕ، بۆیە دەبوا لە چوارچێوەی کولتووری سۆفیگەریدا ڕەوایی بۆ ئەو پایە ڕۆحییە قووڵە بدۆزێتەوە کە ڕێگری سۆفی دەینوێنێ، تا ئاستی سادەی کەسێتی پێشووی پەردەپۆش ببێ و بەهایەکی ئەوتۆی نەمێنێ. هەر بۆیە پرۆسەی بوونە سۆفی خراوەتە نێو بازنەیەکی پەرجوویینانە، وەك لە حاڵەتی عەکبەری کوردی و هاواری دەردەکەوێ. بەهەمان شێوە لەگەڵ شەنبەکی ڕەوایی بەخشینی پەرجوویینانە خۆی لەوەدا دەبینێتەوە گوایە لە ماوەی سێ ڕۆژدا گەیشتۆتە بالاترین پایەی هەر سۆفییەك دەخوازێ پێی بگات؛ دەڵێن ئەو لەو سێ ڕۆژەی دوای تۆبەکردن لەلای هاواریدا ماوەتەوە، لە ڕۆژی یەکەمیدا دونیای جێهێشتووە (دەست هەڵگرتن لە حەز و ئارەزوو و خواستە جەستەییەکان)، لە ڕۆژی دووەمدا ئاخیرەتی جێهێشتووە( دەرچوون لە تێگەیشتنی باوی خوداپەرستی)، لە سێیەم ڕۆژیشدا جگە لە خودا هیچی تری نەویستووە( بوون بە عارف وەك بالاترین پایەی خوداناسین)[٩٨٢]. ڕۆژی دواتریش، کە چوارەم ڕۆژی دوای وازهێنانە لە جەردەیی و ترساندنی ڕێبواران، دەستی بە بانگەواز بۆ خودا کردووە و لە هەموو شوێنێکەوە – بۆ سوودمەند بوون لە پیرۆزییەکەی - خەڵك سەردانیان کردووە[٩٨٣].

تا ئێرە بۆمان دەردەکەوێ، گۆڕانی مرۆڤ لە ڕێگرەوە بۆ سۆفی، گۆڕانی پایەی کۆمەڵایەتییەتی و نواندنی ئەوانیترە بۆ ئەو پایەیە، چونکە ئەمە دۆزینەوەی ڕاستەڕێی ئاینییە و پەڕینەوەیە لە مرۆڤی پەراوێزخراو و نەویستراوەوە بۆ مرۆڤی سەنتەرگیر و ویستراو، مرۆڤێك کە ئەگەر لە گوتاری دەستەبژێردا (بەتایبەت ڕەهەندە سیاسی و ئایینییەکەیەوە) نەفرەت لێ کراوە و پەشێوی دەخاتە نێو زەمینەی کۆمەڵایەتییەوە، ئێستا پیرۆزە و ڕەوتی ڕووداوەکانی ئەو زەمینەی تێیدا دەژی بەوەوە پەیوەست دەکرێ[٩٨٤]. ئەوەی لەخودا نەدەترسا و لە دەرەوەی بنەما شەرعییەکانەوە هەڵسوکەوتی دەکرد، ئێستا بۆتە خوداناسیی پلە یەکی

---

(٩٨٢) السبكي: طبقات الأقطاب, ص ص١١٢-١١٣.

(٩٨٣) الوتري: روضة الناظرين, ص٢٦.

(٩٨٤) المقدسي: التوابين, ص ص٢٢٢-٢٢٣. الشطنوفي: بهجة الأسرار, ص١٩١, ١٩٦. السبكي: طبقات الأقطاب, ص١١٢. الشعراني: طبقات, ص ص١٩٦-١٩٧. الوتري: روضة الناظرين, ص ص٢٦-٢٧.

کوردان، وەك شێخ عەبدولقادر بە ئەبولوەفای دەگوت. لە بۆ خەڵکیش، ئەوەی تا دوێنێ مەترسی بۆ سەر ژیان و ماڵ و سامانیان هەبووە، ئەمڕۆ مرۆڤێکی خوداییە و گرفتیان چارەدەکات و ئاسوودەیی دەروونیان پێ دەبەخشێ، لەرێگەی ئەوەوە ئاشنای بنەماکانی ئایین دەبن و هەر لەسایەی ئەویشەوە پابەندیان دەبن.

ئەگەر ئەوە سۆفیگەریە دەتوانێ ئەو گۆڕانە بە ئەنجام بگەیەنێ، ئاساییە لەو ناوەندە کۆمەڵایەتییەی ئەوانی تێدایە پێشوازی لێ بکرێ و وەك نموونەی رێچکەی باوەڕداری دروست تەماشا بکرێ. بە دەستەواژەیەکی تر، بوونی ئەو چەند رێگرە بە سۆفی، مانای رازیبوونە بە رەفتاری سۆفییانە لە زەمینە کۆمەڵایەتییەکەیاندا و قەبولکردنی کەسێتیە ئایینییەکەیانە وەك رێگەیەکی ویستراوی پەشیمانی و گەڕانەوە. ئیدی رێگەی سۆفی ئەو رێگەیەیە دەشێ کەسی دەرچوو لە بنەما پەیڕەوکراوەکان بۆ خۆی هەڵیبژێرێ.

دواجار ئەمە کوردێکە بەو پرۆسە رۆحانییە تێدەپەڕێ نەك کەسێکی سەر بە جڤاکێکی تر، ئەو کوردەی لەدایکبووی سیستەمێکی کۆمەڵایەتی ئەوتۆیە "رێگری" ناونیشانییەتی و دەستبەرداری ئەو ناونیشانە لە ئاستی یەکەمدا خواستێکی هەمەگیری جڤاکی ئیسلامیە، لە ئاستی دووەمیشدا دارشتنەوەی کەسێتی کوردانەی ئەوانە، تا ئیدی لە تێڕوانینی گشتیدا دژایەتی لە نێوان کوردبوون و باوەڕداربوون(موسڵمانبوون) نەمێنێ و شوناسی ئایینی ئەو رەگەزە -- ئیتنییە لە چوارچێوە گشتیەکەدا رەوایی خۆی هەبێ.

### ٣- جڤاك لەنێوان سۆفی و دەسەڵاتی سیاسی:

بێگومان هەر هەوڵێك بۆ شرۆڤەکردنی پەیوەندیی نێوان سۆفیگەری و کایەی سیاسی، بەشێوەیەکی گشتی لەو قۆناغەی باسی لێوە دەکەین، جۆرێکە لە جەربەزەیی؛ چونکە بێکبەستنەوەی هزرێکە -- وەك بینیمان - لە کرۆکدا دوورە پەرێزی کردۆتە ناونیشانی رۆڵی کۆمەڵایەتی بەرهەمهێنەرەکانی، لەگەڵ کایەیەك کە کردەی کۆمەڵایەتی کرۆکەکەی پێکدێنێ. تەنانەت زۆر جار سۆفی ئەو کەسەیە کە لە ئاکامی ئەو کردەیەی دەسەڵاتی سیاسییەوە خۆی دوور گرتووە و لە ئاستی کۆمەڵایەتی ئەو رۆڵە پاسیڤەی هەڵبژاردووە. لەگەڵ ئەوەشدا هەرکاتێك سۆفی بیەوێ رۆڵی کۆمەڵایەتی هەبێ ناچار دەبێ سەرەدەری لەگەڵ دەسەڵاتی سیاسیدا بکات، خوێندنەوەی بۆ هەبێ و لە دووتوێی هزری خۆیدا رووخسارەکانی دەستنیشان بکات، لەوەش گرنگتر دەبێ بتوانێ هاوسەنگییەك لەنێوان ئەو دەسەڵاتە

کردەکییە لەگەڵ دەسەڵاتی ڕەمزی خۆی بەسەر مورید و ئەو گەلە خەڵکە دروست بکات کە باوەڕیان پێیەتی و کەوتوونەتە ژێر هەژموونی کەسایەتی ڕۆحانی – پیرۆزی ئەودا.

لە نێو سۆفییانی کوردستاندا بە کەمی قسە لەسەر دەسەڵاتی سیاسی کراوە و تێز و بۆچوونی سۆفیان لەم بوارەدا لەبەردەستدا نییە، بێگومان جەختکردنەوەی زۆربەی سۆفییەکانی ئەوێ لەسەر دوورەپەرێزی و مانەوەی سۆفیگەری لە سنووری بەرهەمهێنانی هزر و نەپەڕینەوەی بۆ ئاستی دامەزراندنی سیستەمی ڕێکخراوەیی – تەریقەتی، وایکردووە ئەو سەرەدەرییە سنووردار بێ و لە هەندێ باریشدا ئەگەر سۆفی ڕووبەڕووی دەسەڵاتی سیاسی بۆتەوە، ئەوا زیاتر لە ناچاری بووە، نەك ئارەزوویەکی سۆفی خۆی.

لە بنەڕەتدا سۆفی لەگەڵ دەسەڵاتی سیاسیدا ڕێك نایەتەوە، بەوەی کە ئەم دەسەڵاتە کردەیەکی دونیاییە و لە زۆربەی حاڵەتدا پەیڕەوی لە تەواوی بنەماکانی ئاین ناکات، بۆیە ئەوەی بخوازێ ببێتە سۆفی دەبێ پشت لە دەسەڵاتی سیاسی بکات، ئەوەتا بینیمان دەگوترا مەمشادی دینەوەری کوڕی بنەماڵەیەکی دەسەڵاتدار بووە بەڵام وازی لە پایەکەی هێناوە و تەرکی دونیای کردووە[٩٨٥]، بێگومان ئەمەش لەو باوەڕەوە دێت کە جەخت لەسەر دابڕانی نێوان سۆفیبوون و دەسەڵاتداریی وەك حەزێکی دونیایی دەکاتەوە. ئەمە تێگەیشتنی ئەبوبەکری کوڕی یەزدانیاریشە، پێی وابوو دەسەڵاتدارێتی بە خراپەکارییەوە بەندە، لای ئەو لە کرۆك و لە ڕووخساردا دەسەڵاتدارێتی فیتنەگێڕییە، بۆیە لە ڕاڤەکردنی بۆ دەقی قورئانیش رایدەگەیەنێ داخوازیکردنی دەسەڵات دەکەوێتە دوای خواستی لێخۆشبوونەوە[٩٨٦]، بەمەش بۆ سۆفی دەسەڵاتدارێتی دوورە لەو ڕێگایانەی دەشێ بۆ ناسینی خودا پەیڕەویان لێ بکرێ.

بەڵام، وەك پێشتر بینیمان، سۆفیبوون لەخۆیدا پرۆسەیەکی دەسەڵاتدارانە بووە، ئەو هزرەی سۆفییەکان هەیانبووە لە بواری کرداری، لە نێو ئەلقەی سۆفییاندا، پایەیەکی دەسەڵاتییانەی ئاوای دەبەخشی هەم پیرۆز و هەمیش کۆنکرێتی، کە نەدەکرا بە ئاسانی سنوورەکانی ببەزێنرێن؛ پیرۆز بەو مانایەی شێخی سۆفی لەنێو موریدانی پایەدار و لەنێو جڤاکەکەیدا سەروو ئاسایی(کەرامەتنوێنی) بووە، گوێڕایەڵی بۆ کەسێکی ئاوا پابەندبوونە بە پیرۆزیی"دەسەڵاتی ڕەمزی" بە مانا گشتییەکەی نەك هێزێکی کردەکی کە دەشێ هەیبێ، لە

---

(٩٨٥) ابن تغري بردى: النجوم الزاهرة, ج٣, ص١٧٩.

(٩٨٥) السلمى: زيادات , ص١٤٦.

شێوەی ئەوەی سەرۆك خێڵ و میر و فەرمانڕەواکان لە ناوچەکەدا هەیانبووە، بەهەمان شێوە سنوورەکانیش لەو پیرۆزیەوە سەرچاوەیان دەگرت کە بریتی بوون لە ئەستەمی بوونە سۆفی و بڕینی مەقام و گەیشتن بە حاڵەکان و نواندنی کەرامەت و ...هتد.

کەواتە سۆفی لە ناوەندە کۆمەڵایەتییەکەی دەسەڵاتدارە، بەڵام لەپاڵ ئەودا دەسەڵاتداری تر هەن کە دەسەڵاتەکەیان ناونیشانیانە و هێز و توانایان وایان لێ دەکات بەسەر ئەو ناوەندە زاڵبن، بێگومان رەخنەکەی کوڕی یەزدانیاریش مانای ئەو نییە سۆفییەکانی ئەوێ ناچار نەبوونە راستەوخۆ تێکەڵ بە لۆژیکی ئەم دەسەڵاتە دونیاییە ببن، بەڵکو چاوەڕێی ئەوە دەکرێ لەنێوان هەردوو دەسەڵاتدا (کردەکی و رەمزی) بەریەککەوتن ڕوویدات، ئەگەر سۆفیش دەخوازێ لەم چەشنە بەریەککەوتنە ناسنامەی ئایینی خۆی لەدەست نەدات، دەبێ دەسەڵاتە رەمزییەکەی، کە زیاتر بەسەر مورید و گەلی سۆفییانەوە هەیبوو (چینی تایبەت — الخاصە) وەربگێڕی بۆ دەسەڵاتێکی کۆمەڵایەتی کارا، ئەمە ئەو کارایيە بوو کە حەلاج دەینواند، بەتایبەت لە هەردوو هەرێمی چیا و جەزیرە، کە توانیویەتی هەندێك لە دەسەڵاتدارانی ئەوێ بە دەسەڵاتی رەمزی خۆی رازی بکات[(٩٨٧)].

لەگەڵ ئەوەشدا لەوە دەچێ ئەوەی زیاتر کاری کردبێ بۆ وەرگێڕانی دەسەڵاتی ئایینی سۆفی بۆ دەسەڵاتێکی کۆمەڵایەتی، کۆمەڵ خۆی بووبێ، کۆمەڵێك کە پێویستی بەوەیە گوێڕایەڵی بۆ دەسەڵات رەهەندێکی باوەڕییانەی هەبێ و جێبەجێکردنی فەرمانەکانیشی ئەرکێکی پیرۆز بێ و کەڵەکەکردنی سەرمایەیەکی ئایینی پێویست بۆ ژیانی دوای مەرگ بێت. بێگومان پێکهاتەی خێڵەکی جڤاکی کوردی رێگەی بۆ ئەم پرۆسەی وەرگێڕانە خۆشکردووە، چونکە لە پێکهاتەی ناوادا — ئبن خەلدونی هزرڤان گوتەنی - ئەوکاتەی ئایین یەکانگیری دەمارگیریی دەبێت هەم قەیرانە نێوخۆییەکانی سیستەمە کۆمەڵایەتییەکە چارە دەکات و هەمیش لە بەرامبەر بە ئەویتری دەرەکیدا پتەو و بەهێزی دەکات[(٩٨٨)]، ئەمە رێك لە هەڵوێستی دوو لە سەرۆکانی کورد لە سۆفی عەلی کوڕی شیلوەیە لە سەدەی چوارەمی کۆچیدا دەردەکەوێ؛ دەڵێن ئەوان لە خۆشەویستی ئەو سۆفییە هەریەکەیان کچی خۆی و

(٩٨٧) بگەڕێوە بۆ : الأصطخري: مسالك, ص٩٠. الجيهاني: أشكال, ص١٢٣.

(٩٨٨) المقدمة, ج٢, ص ص٥٢٧-٥٢٨.

هەزاران سەرە مەڕی پێشکەش کردووە[٩٨٩]. ئەو کارەی ئەم دوو سەرۆك خێڵەش، لە چوارچێوەی ترادیسیۆنی باوی کۆمەڵایەتی، ئاماژەیە بۆ بەخشینی "سەرمایەی رەمزی - شەرەف" و "سەرمایەی ئابوری" خێڵەکانیان، ئەم دووانەش لە سەرەکیترین ئەو کۆڵەگانەن کە قەوارەی خێڵی لەسەر بونیادنراوە و دانی بەدەستی شێخی سۆفی مانای گوێڕایەڵی تەواوە بۆ ئەو کەسە و رازیبوونە بەهەر بڕیارێك کە لەو دەربچێ.

بێگومان ئەو متمانەیەی سۆفی لەنێو کۆمەڵدا دروستی کردووە، کاریگەریی هەیە بەسەر ئەو ئەرکەی بە شێخی سۆفی دەسپێردرێ، ئەویش رۆڵی نوێنەرایەتی کردنی کۆمەڵە لەبەرامبەر بە دەسەڵاتی سیاسیدا، سۆفی چاوەڕێی ئەوەی لێ دەکرێ لە هەر قەیرانێکی نێوان ئەم دوو لایەنە رۆڵی چارەسازی هەبێ، بەتایبەت پاراستنی کۆمەڵ لە جەور و ستەمی دەسەڵاتداران، بەمەش دەبێ سۆفی لە حاڵەتی رووبەڕووبوونەوەی ئەم دەسەڵاتدارانە دابێ. لە زەمینەی کوردیدا، نموونەی چەند رووبەڕووبوونەوەیەکمان لەبەردەستدایە، رەنگە هەرە دیاریان هی ئەبوبەکری کوڕی مەمشادە لەگەڵ سوپای "زەیارییەکان — الزياريون"، لە کاتی هێرشیان بۆ سەر شاری دینەوەر لە ساڵی (٣١٩ك/٩٣١ز)و ئەو کوشتار و وێرانکاریەی بەسەر شارەکەیان داهێناوە[٩٩٠]، بەپێی مەسعودی مێژوونوس(م٣٤٦ك/٩٥٧ز)، ئەو سۆفییە خۆی و قورئانەکەی دەچێتە بەردەم سوپاکە و داوایان لێ دەکات دەست لەو کوشتارە هەڵگرن[٩٩١]، بێگومان هەڵبژاردنی سۆفی وەك نوێنەری شارێك دەریدەخات چەندە پیرۆزی و سەرمایە رەمزیەکەی هەژموونی بەسەر فەزای شاردا هەبووە، وەك پێشتریش بینیمان هەمان ئەو هەژموونەی لەڕووی ئایینییەوە هەبووە و دەیتوانی بڕیار لەسەر چارەنووسی کەسانێك بدات لەگەڵ تێگەیشتنی ئەو لە سۆفیگەری رێك نەدەهاتنەوە و لە شاردا دەری دەکردنە دەرەوە[٩٩٢]، بۆیە ئەو نوێنەرایەتی کردنەش ئاماژەیە بۆ متمانەی سۆفی بە دەسەڵاتی خۆی بۆ رازی کردنی هێزێك کە رەنگە سەنگێك بۆ پیرۆزی سۆفی و دەسەڵاتەکە دانەنێ. هەرواش دەرچوو؛ بە قسەی هەمان مێژوونوس بێ کوڕەکەی مەمشاد لەلایەن زەیارییەکانەوە

---

(٩٨٩) ابو الحسن ديلمي: سيرت, ص٢٠٣. محمد معصوم شيرازي: طرائق, ج٣, ص٤٨٩.

(٩٩٠) بۆ زانیاری زیاتر لەسەر ئەم رووداوانە بگەڕێوە بۆ: الأصفهاني: تاريخ سني ملوك الأرض و الأنبيـاء, منشورات دار مكتبة الحياة, بيروت, ١٩٦١ ,ص ١٥٩. زرار صديق توفيق: الكورد, ص ص١٥٢-١٥٥.

(٩٩١) مروج, ج٤, ص٣٧٩-٣٨٠.

(٩٩٢) بگەڕێوە بۆ بەشی سێیەمی ئەو توێژینەوەیە.

سەری پەلدرا[٩٩٣]، شاریش کەوتە بەردەم هێرش و دووچاری کاولکاری و ماڵ وێرانی زۆر دەبێتەوە. لێرەوە دەتوانین بڵێین ئەگەر سۆفی توانیویەتی هەژموونی بەسەر دەسەڵاتی نێوخۆییدا هەبێ، ئەوا هێشتا نەیتوانیوە هەمان هەژموونی بەسەر دەسەڵاتی سیاسی وەك گشتێك لە زەمینەی ئیسلامی هەبێ، بەتایبەتی کە هێشتا سۆفیگەری خۆی خەسڵەتی هەمەگیری نەبوو.

بێگومان لەگەڵ برەوسەندن و بەرفرەبوونی سۆفیگەری، ئەو هەڵوێستە سیاسییەش – ئەگەر دەیویست لە زەمینە کۆمەڵایەتییەکاندا بەردەوامیی بە بوونی خۆی بدات – دەبووا بە بڕیارەکانیدا بچێتەوە و بە جۆرێك لە گوێڕایەڵییەوە سەرەدەری لەگەڵ گەورە سۆفییاندا بکات، لەگەڵ باباتاهیری هەمەدانی و یاوەرەکانی لە بەردەم ئەو هەمەگیربوونەی سۆفیگەری و هەژموونی بەسەر کایەی سیاسی گشتگیر داین، کایەیەك کە دەچێتە نێو ئەو بازنە باوەڕداریەی تێیدا شێخی سۆفی دەسەڵاتی خۆی پیادە دەکات. ڕاوەندی دەگێڕێتەوە کاتێك طوغرل بەگی سەلجوقی لە هەمەدان ڕووبەڕووی هەریەك لە باباجەعفەری هەمەدانی، شێخ حەمشا، باباتاهیر هەمەدانی بۆتەوە، دەستی ماچ کردوون و داوای نزا و پاڕانەوەی لێ کردوون، لەو کاتە باباتاهیر پرسی چۆنییەتی هەڵسوڕاندنی کاروباری جڤاکی ئیسلامی لە سوڵتان کردووە، ئەویش ڕایگەیاندوە ئەوە دەکات کە بابای سۆفی پێی بڵێ. باباتاهیریش لە چوارچێوەی دەقی قورئانییەوە ئامۆژگاری دەکات و داوای لێ دەکات بەپێی ئایەتی {خودا فەرمان بە دادپەروەری و چاکە دەکات}[٩٩٤]، فەرمانڕەوایی بکات[٩٩٥].

بێگومان ئەو بەسەرهاتە ئاماژەیە بۆ پایەی باڵای سۆفی لە دیدی سوڵتانێکی بەهێزی وەك طوغرل بەگەوە و باڵادەستیی بەسەر بڕیاربەدەستانی سیاسیدا، هەروەها ڕەنگدانەوەی ئەو تێڕوانینەیە کە سۆفی بۆ شێوەی ویستراوی دەسەڵات هەیەتی. لەلایەکی ترەوە بەکارهێنانی دەقی قورئانیی لەلایەن سۆفی وەك ئامرازێکی گوزارشتی شەرعی – وەك توێژەرێك وایلێکدەداتەوە[٩٩٦]– ئاماژەیەکی ڕوونە بۆ ئەو فەرهەنگە سیاسییە شەرعییەی هەردوولا (دەسەڵاتدار، سۆفی) لەسەری کۆکن و پێیەوە پەیوەستن، ئیدی ملکەچی دەسەڵاتدار بۆ بابا و

---

(٩٩٣) مروج, ج٤, ص٣٨٠.

(٩٩٤) { إن الله يأمر بالعدل و الإحسان}, سورة النحل, الآية(٩٠).

(٩٩٥) راحة الصدور, ص ص٩٨-٩٩.

(٩٩٦) حميد دباشي: شرايط تاريخى تصوف ايراني در عصر سلجوقي, در: ميراث تصوف, ج١, ص١٩٤-١٩٥.

بەکارهێنانی پەیڤی ئایینی وەك دەنگ و گوتەی خودایی، جیهانێکی خەیاڵیی پیرۆز دەخولقێنێ و شەرعییەتی پێ دەدات.

ئەو نموونانە بەمانای ئەوە نییە سۆفی هەموو جارێك چۆتە ژێر باری داخوازییەکانی جڤاك لە دەسەڵاتی سیاسی، بەتایبەتیش ئەوکاتەی، بە بەهانەی ئەو پابەندیەی بە دەسەڵاتی خوداییەوە هەیەتی، هەموو سەرەدەریەکی لەگەڵ دەسەڵاتی سیاسی رەتکردۆتەوە؛ بۆیە ئەگەر دەبینین خەڵك دەچنە لای کەسێکی وەك ئەبو محەمەدی شەنبەکی تا دەسەڵات رازی بکات هاوکارییان بکات، ئەو داخوازی خەڵکەکە پشتگوێ دەخات و رایدەگەیەنێ دەبێ هەر داواکارییەکی مرۆڤانە لە چوارچێوەی لۆژیکی پەیوەندیی نێوان مرۆڤ و خوداوە بێ؛ مرۆڤێك کە، بۆ پێویستیەکانی چاوی لە ئاسمانە نەك لە دەستی خەڵك و خودایەکیش کە ئاگاداری مرۆڤەکانە[٩٩٧]، ئەمە جۆرێکە لە پەیوەندی – بە پێی راڤەی باوی ئایینی – وا لە خەڵك دەکات پێویستیان بە دەسەڵاتدار نەبێ بۆ فەراهەمکردنی داواکاریە ژیانییەکانیان و پشت بە توانا و قەدەری خودایی ببەستن، ئیدی شەنبەکی سۆفییان ئامۆژگاری دەکات خۆیان لەو کەسانەش بەدوور بگرن کە حەزی دەسەڵاتیانەیان هەیە و بەو ئاراستەیە کار دەکەن[٩٩٨].

هەرچۆنێك بێت لەوە ناچێ جڤاك بەوە رازی بووبێ ئەرکی سۆفی لەبواری دەسەڵاتدارێتیدا لەچوارچێوەی نێوەندگیریدا بمێنێتەوە و تەنیا دەسەڵاتەکەی رەمزیی – ئایینی بێ، بەڵکو – کەم تا زۆر – کاری کردووە بۆ بە کرداری کردنی ئەو دەسەڵاتە، بە دەستەواژەیەکی تر ئەو پێویستییە بە دەسەڵاتی رەمزی سۆفی و نواندنی دەسەڵاتەکەی لەبەرامبەر بە دەسەڵاتی سیاسی – کردەکی، لە یادەوەری دەستەجەمعیدا جێگیردەبێ و پرۆسەی وێناکردنی سۆفی سەرکردە دەست پێدەکات، پرۆسەیەك کە هەم گەلی سۆفییان و هەمیش ئەو ناوەندە کۆمەڵایەتی و گرۆ ئایینییەی پابەندی پیرۆزیەکانیانن کار بۆ مەیسەربوونی دەکەن. بێگومان ئەو کایە ئایینییەی رێگە بەو رۆڵەی سۆفی بدات " جیهادکردن"ە، بە تایبەت ئەو رووخسارەی کە بریتییە لە جەنگان لەگەڵ دژە دینان و هەوڵی بڵاوکردنەوە و چەسپاندنی بنەماکانی ئەو دینە. بەڵام ئەو چاوەڕوانییە لە جیهادی سۆفی رووبەرووی تێزێکی بنەڕەتی

---

(٩٩٧) التادفي: قلائد الجواهر, ص ٨٠. الوتري: روضة الناظرين, ص ٢٧. النبهاني: جامع كرامات الأولياء, ضبطه و صححه: عبد الوارث محمد علي, ط ٢, دار الكتب العلمية بيروت, ٢٠٠٢, مج١, ص٣٨٨.

(٩٩٨) الشطنوفي: بهجة الأسرار, ص١٩٥.

ئەوان دەبێتەوە، کە جیهادی لە دووتوێی جەنگان و بەرەنگاربوونەوەی ئارەزووە دەروونییەکان جێ کردۆتەوە وەك لە باسی هزری بابا طاهردا بینینمان، ئیدی لەوێدا جیهادکردن شەڕی دەروونە، وەك دوژمنی سەرسەختی مرۆڤەکان و ئەو هێزە تاریکەیە کە ئەو مرۆڤانە بەرەو کوفر و لەڕێ لادان دەبات[999].

بەڵام ئەو یادەوەریەی ئاماژەمان بۆ کرد، کار دەکات بۆ گۆڕینی ماناکانی جیهاد بۆ جیهادێکی کردەکی و بەرجەستەکردنی کەسێتی "سۆفی موجاهید"، کە دەتوانێ لە بری دەسەڵاتداری سیاسی ڕێبەرێتی جڤاك بکات، تەنانەت گۆڕانی کۆمەڵایەتی – ئایینی بەرچاو جێ بکات. لە دەقە مێژووییەکانی تایبەت بە قۆناغی لێکۆڵینەوەکە شتێکی ئەوتۆمان لەسەر نموونەی سۆفی موجاهید لە پانتایی کوردیدا دەست نەکەوتووە، بەڵام دەقەکانی دواتر و لە نێو دەقە ئایینییەکاندا وێنەی لەجۆرە سۆفییانەمان هەن، وەك لە حاڵەتی پیرۆز شاە زەرین کولاە کوردی سنجانی باپیرە گەورەی شێخ صەفیەدینی ئەردەبیلیدا بینیمان، کە نەك هەر بەتەنها سۆفی بووە، بەڵکو سەرکردەی سوپای کوردەکانیشە لە شەڕکردنیان دژ بە زەردەشتیەکانی هەرێمی ئازربێجان و بە موسڵمانکردنیان[1000]، بێگومان شەڕەکانی شاەخوشین لەگەڵ چەندان گروپی لەڕێلادەر و دەرچوو لە ئایینی دروست[1001]، دەچێتە نێو هەمان چوارچێوە. لە هەردوو نموونەدا ئەوەی بەرچاو بێ مێژوویی و نامێژوویی و ڕاستی و ناڕاستی ڕووداوەکان نییە، ئەوەندەی بەهای ڕووداوەکانە لە دامەزراندنی باوەڕ لە ئاستی دەستەبژێر (سۆفی خۆیان) و کۆمەڵ ( لێرەدا پەیڕەوانی تەریقەتی صەفەوی و ئەهلی هەقەکان وەك نموونە). ئەمە جەختکردنەوەیە لەسەر ئەوەی پێی دەگوترێ ڕێبەری ڕۆحانی، کە هەر تەنها ڕێبەر و کەسایەتییەکی ئایینی نییە و باوەڕداریشی هەر بە قسە نییە، بەڵکو کار و گوفتارە. هەر ئەمەش وادەکات ببنە کەسی سەرووی شوێن و کاتەوە و لە نێو مێژووی ئایینیدا ئەو بەردەوامییەیان هەبێ.

---

(999) بۆ وردەکاری زێتری ئەو تێزەی سۆفییان لەمەڕ جیهادکردن بگەڕێوە بۆ: محمد الرحموني: الجهاد, ص ص116-121.

(1000) ابن بزاز: صفوة, ص72.

(1001) سەرئەنجام, ل19, نعمه الله جیحون آبادي: شاهنامه, ص ص279-297. و.نیڤانۆڤا: پیڕەوانی ڕاستی, ل-160-161.

### ٤- سۆفیگەری و بەرهەمهێنانی پیرۆزیی لە ئاستی میللیی:

بەخشینی ئەرکی کۆمەڵایەتی بە سۆفیگەری، بەوە ناوەستێ پەیوەندیی ناوەندە کۆمەڵایەتییەکە بەو کەسایەتییانە لە چوارچێوەی سەرسام بوون و پەیڕەوکردنی ڕێبازەکەیان لە باوەڕداری و بەکاربردنی پێگە ئایینییەکەیان وەك کردەیەکی دەسەڵاتییانە بمێنێتەوە، بەتایبەت کە تێگەیشتنی کۆمەڵایەتی هەمان ئەو تێگەیشتنە نابێ کە ئەوان بۆ خۆیان و هزرەکەیان هەی . بەشە زۆرەکەی کۆمەڵ لە ئاستی رووخساری دەرەوەی دیاردەکە دەمێنێتەوە و دەکەوێتە ژێر کاریگەریی دەرکەوتەکانی، جا چ هەڵسوکەوتی رۆژانەی سۆفی بێت، یانیش جۆری بەرهەمهێنانی بۆ پیرۆزیی و وێناکردنی پەیوەندیان بە بواری خودایەتی و نواندنی کردەکییانەی ئەو پەیوەندییە بێت.

لێرەوە ئەوان کۆمەڵێك ئەرك دەخەنە سەر شێخی سۆفی، کە ئاماژەن بۆ متمانە و چاوەڕوانی کۆمەڵایەتی لە رەهەندی پیرۆزی کەسێتییەکەی، ئەمەش زیاتر خۆی لە خوێندنەوەی میللییانەی کردەی کەرامەتنوێنی دەبینێتەوە؛ ئەو رەهەندەی نەك هەر وەك کەسێکی چاکساز و رێنیشاندەر لە بواری ئایینی — رەوشتیدا نیشانیان دەدات، بەڵکو لەو کارانەشیاندا لە کەسانی تری وەك فەقیە و واعیز جیاواز دەبن. ئەگەر سۆفی توانای نواندنی کەرامەتی بە تەنیا یانیش لە نێو بازنەی پەیڕەوکارانیدا هەیە، ئەوا دەبێ هەمان کردار لە بەرژەوەندی ناوەندە کۆمەڵایەتییەکە ئەنجام بدات، ئەوەی ناچار بەو کارەشی دەکات هەر ناوەندەکەیە؛ ئەوەتا کاتێ خەڵکی کرماشان دووچاری مەینەتی وشکەساڵی و بێ بارانی دەبنەوە، هانا دەبەنە بەر شێخێکی سۆفی تا بۆیان بپاڕێتەوە و باران ببارێ[١٠٠٢]، هەروەها دەبینین هەندێك لە شێخەکان ئەرکی نوژداریان دەخرێتە پاڵ و نەخۆش چاك دەکەنەوە[١٠٠٣]، دەشڵێن شەنبەکی هەردوو جۆری نەخۆشی دەروونی و جەستەیی چارەسەر دەکرد[١٠٠٤]. ئەمەش ئاماژەیە بۆ باوەڕی رەهای خەڵك بەو شێخانە و لە قۆناغە درەنگەکانی هزرەکەدا و تا ئێستاش چاککردنەوەی نەخۆش دەبێتە ئەرکێکی سەرەکی شێخی سۆفی، بێگومان ئەمەش لە بنەڕەتدا لەو وێنایەوە سەرچاوە دەگرێ کە سۆفی خۆی پزیشکی خۆیەتی و توانیویەتی

---

(١٠٠٢) الأنصاري: طبقات الصوفية, ص٣٧٤.

(١٠٠٣) سبط ابن الجوزي: ذيل, ص٣٨٠.

(١٠٠٤) الشطنوفي: بهجة الأسرار, ص١٩٦. الوتري: روضة الناظرين, ص٢٦.

دەروونی لە خواروخێچییەکانی دونیا دەرباز بکات، ئیدی ئەوکارەی بۆ چارەکردنی هەم دەردە کۆمەڵایەتییەکان و هەمیش نەخۆشییە فسیۆلۆژییەکان دەخرێتە گەڕ[١٠٠٥]، تا وایلێدێت باوەڕبوون بە پیرۆزیی شێخ تەواوی سنوورەکانی باوەڕداری دەبەزێنێ و ئەو پیرۆزییە هەژموونی ڕەهای بەسەر خەڵکەکەوە دەبێ و بەو شێوەیە ئاراستە دەکرێ کە ئەوان دەخوازن.

ئەرکی کەرامەتنوێنی - کۆمەڵایەتیانەی سۆفی هەر لەو قۆناغەدا نابێ کە ئەو لەژیاندایە و بە مردنی کۆتایی نایەت. بەدەستەواژەیەکی تر وەنەبێ مەرگی سۆفی دواین خاڵی مێژووی ئامادەیی ئەو بێ لە زەمینەی کۆمەڵایەتیدا، بە پێچەوانەوە دەقەکان پێمان دەڵێن لەوێوە مێژوویەکی تری ئایینی دەست پێ دەکات کە ئەو زەمینەیە ڕووداوەکانی دەستنیشانکردووە و ڕەنگدانەوەی هەمان پرۆسەی بەرهەمهێنانی پیرۆزییە لە ئاستە گشتگیرەکەیدا، ئەو ئاستەی تیایدا مەرگی سۆفی سەرەتایەکە بۆ نواندنی کەسێتی نائاسایی و پیرۆزکراوی سۆفییانە بەتایبەت توانا کەرامەتیەکانی، لە پێناو بەردەوامیدان بەو شێوە باوەڕە ئایینییەی لە ساتی زیندوو بوونی ئەودا لە ئارا بووە. بەجۆرێك کە پیرۆزیی شێخ و جێکردنەوەی لە چوارچێوەی ڕۆڵێکی دیاری کۆمەڵایەتی بەو مەرگە کردەکیە کۆتایی نایەت، بەڵکو ئەمە خاڵی دەستپێکی پەیوەندییەکی تری نێوان ناوەندە کۆمەڵایەتییەکە و یادی ئەوە.

بەر لە هەموو شتێك، مەرگی سۆفی ڕووداوێکی ئاسایی نییە؛ ئەمە مەرگی کەسێکە وا وێناکراوە بوونێکی ئەزەلیانەی هەبووە، بەومانایەی چاوەڕێی ئەوە نەدەکرا کەسێك ئەوەندە ڕۆحانی و پیرۆز بێ، وەك خەڵکێکی ئاسایی کۆتایی پێ بێ، بۆیە کە دەمرێ باوەڕی میللی دەیەوێ وەك دیاردەیەکی نائاسایی – ئایینی بیخاتەڕوو، ئەوەتا دەڵێن بە مردنی ئەبوبەکری هاواری نەك هەر مرۆڤەکان بەڵکو جنۆکەکانیش بۆی گریاون و خەڵك گوێی لە فیغانیان بووە[١٠٠٦].

بێگومان ئەستەمی قەبولکردنی مەرگی سۆفی وا دەکات ئەو شوێنەی لێشی دەنێژرێ، کە گۆڕەکەیەتی، لە هی خەڵکی تر جیاواز بێ، خەڵك دێنە سەری و ئەو سەردانەش تێکەڵ بە سرووتی کۆمەڵایەتی دەبێ؛ وەك ئەوەی دان نەنێن بە مەرگی واقیعییانەی سۆفی و هەوڵبدەن نا واقیعیانە بە زیندوویی بهێڵنەوە. لێرەوە دەبینین گۆڕی زۆربەی ئەو گەورە سۆفییانەی بە

---

(١٠٠٥) لەمبارەوە بگەڕێوە بۆ: Louis Massignon: Essai, p. 103.

(١٠٠٦) الشطنوفي: بهجة الأسرار, ص١٩٣.

درێــژایی بەشــەکانی توێژینـەوەکــە باسمــان کــردوون، لـەدوای خۆیانــدا مــەزارگای ناوەنــدە کۆمەڵایەتییەکە بوونە[1007].

ئەوەی جێگەی تێبینییە هەر خەڵکـە ئاسـاییەکە نـا، بـەڵکو لـە نێـو دەستەبژێریـشدا، بەتایبەت ئەوانەی سۆفیگەریان وەك کایەیەکی ئایینی پێ قەبوڵ بـووە، هـەمان هەڵوێـستیان لەو گۆڕانە هەبووە و سەردانیان کردوون[1008]. نەك هەر ئەمـە بـەڵکو لـە قۆنـاغی درەنگـی مێژووی سۆفیگەری، دەڵێن سۆفییەکان بەر لە مردنیان کردەی پیرۆزکردنـی گـۆڕی داهـاتووی خۆیانیان دەست پێکردووە، وەك لەلای هاواری دیارە؛ ئەو هێشتا لەژیانە رایدەگەیەنێ شوێنی ناشـتنی پیرۆزیـەکی رەهـای دەبـێ، ئـەوەی سـەردانی ئـەو شـوێنە بکـات ئـاگری دۆزەخ نایسوتێنێ[1009]. باوەڕی لەوجۆرە نەك هەر ئەرکی گۆڕ دەگۆڕێ، بەڵکو کار بۆ دامەزرانـدنی شێوەیەکی تازەباوی باوەڕداری دەکات، کە سەرباری متمانەی تەواو بە کەسی سۆفی سـنووری ئەو بازنە بەرتەسکەی شەریعەت دەوری ژیانی مرۆڤەکانی پێداوە فراوان دەکات.

راگرتنی یادی ئەو شـێخانە لـە میانـەی پیرۆزکردنـی گۆڕەکانیـان هـەر لـە چوارچـێوەی باوەڕبوون و رێزگرتن و هـەوڵی بـە نـەمری هێـشتنەوەی کردەوەکانیـان نامێنێتـەوە، بـەڵکو کۆمەڵێك ئەرکیشی دەخرێتە پاڵ، کە رەنگە لە ژیانی بەر لەمەرگیدا بۆی ئـەنجام دابـن، ئـەو ئەرکانەش جەخت لەسەر تێگەیشتنی ئەوان لە نەمری و ئامادەیی سەروو مەرگی دەکەنـەوە، لەو بارەدا هەڵوێستی خەڵکی ورمێ لە گۆڕی گەورە سۆفییەکەی شارەکەیان ئەبوبەکری کوڕی یەزدانیار نموونەیەکی گرنگە؛ سیلەفی دەگێڕێتەوە: (( لە ورمێ پیاوێکی خێزاندار هەبوو، سەد دیناری هەبوو لە شوێنێکدا شاردیەوە و سەفەری کرد. کە گەڕایـەوە شـوێنەکەی نەدۆزیەوە، بۆیە چووە لای گۆڕی شێخ ئەبوبەکری کوڕی یەزدانیار و دوو ڕکات نوێژی کـرد و دەسـتی بـە گریان و پاڕانەوە لە خودا کرد، چاوی چووە خەوەوە و لە خەوندا أبو بکری بینی پێی گوت برۆ فلانە شوێن و پارەکەت ببەوە. کابرا بەئاگا هات و چووە شوێنەکە و ئەو پارەی حەشاری دابوو دۆزیەوە))[1010].

---

(١٠٠٧) بروانە پاشكۆی ژمارە (٣).

(١٠٠٨) بۆ نموونە: السمعاني: التحبير,ج١, ص٢٣٦. السلفي: معجم, ص٣٤٢.

(١٠٠٩) التادفي: قلائد الجواهر, ص٧٨. الشعراني: طبقات, ص١٩٦.

(١٠١٠) معجم, ص١١٥.

رووی ناوەوەی ئەو گێڕانەوەیە پێمان دەڵێ مرۆڤەکان لەلای گۆڕی شێخانی سۆفییەوە، دەچنە نێو هەمان بازنەی پیرۆزی کە ئەمانی تێدایە و لە دەرەوەی ئەو تەرزەی شوێندان کە لە ژیانی رۆژانەیاندا تێیدان. گۆڕی کوڕی یەزدانیار و هاوشێوەکانی، ئەو پانتاییە شوێنییەیە کە بەسەر تەواوی شوێنە ئاساییەکان رادەگات و لە نەناسراوەوە دەیانکاتە ناسراو و پیرۆزیی خۆی بەسەریاندا دەپرژێنێ. هەر بۆیە ئەو "شوێنە — گۆڕە" دەبێتە یەکەیەکی رۆحانیی جێگیر و سەنتەرێك کە بەپێی پێداویستیی رۆژانە کارا یاخود نا کارایە، بەڵکو ئەمە شوێنی سەرەکی زانینی راستییەکانە، کە بوونێکی حەقیقەتییانەی هەیە و تەواوی شوێنەکانی تری دەوروبەری درێژبوونەوەیەکی بێ شێوەی ئەون[١٠١١].

بێگومان ئەو پیرۆزییەی شوێن دەیکاتە ئەو پانتاییەی ئەرکە کۆمەڵایەتییەکەی تێدا بە ئەنجام دەگەیەنرێ، هەروەها ئامادەیی سۆفی لەوێدا - کە ئامادەییەکی وێناکراوە - بەرجەستە دەبێ و خەسڵەتی واقیعییانە بە کردەوەی دوای مەرگی ئەو دەبەخشێ. ئیدی ئەوکاتە شوێنەکە رەهەندە زەمەنییەکە دەبەزێنێ و پەیوەست نابێ بە ماوەی کورتی پاش مردن، بەڵکو لە ماوەی درێژی مێژوویدا خەسڵەتە پیرۆزییەکەی لەدەست نادات، وەك لە هەڵوێستی شێخ صەفیەدینی ئەردەبیلی لە گۆڕی هەمان سۆفی، واتا ئەبویەکری کوڕی یەزدانیار، دوای تێپەڕبوونی نزیکەی چوار سەدە بەسەر مەرگی ئەوەی یەکەم[١٠١٢]، یان لە هەڵوێستی دەسەڵاتدارانی مەغۆلی لە گۆڕی ئەبولوەفا[١٠١٣]، بەروونی دیارە. تەنانەت مانەوەی هەندێك لەو گۆڕانە بە پیرۆزی تا ئەو رۆژگارەی ئێستامان، وەك — ئەوەندەی ئاگادار بین — گۆڕی باباتاهیری هەمەدانی لە هەمەدان[١٠١٤]، گۆڕی شێخی هەکاری لە گوندی دێرەش نزیك بە "ئامێدی — العمادیه"[١٠١٥]، گۆڕی ئەبولوەفا لە بەرامبەر بە شاری کوت لە بەری

---

(١٠١١) لەبارەی ئەو مەغزایانەی شوێنی پیرۆز، لە مێژووی ئایینی بەگشتی، بگەڕێوە بۆ: مرسیا الیاد: المقدس و المدنس، ترجمة: عبد الهادي عباس، دار دمشق، دمشق، ١٩٨٨، ص ص٢٥-٥٣.

(١٠١٢) ابن بزاز: صفوة، ص ص٧٦٣-٧٦٤.

(١٠١٣) رشيد الدين فضل الله: تاريخ مبارك غازاني - داستان غازان خان، بتصحيح و اهتمام: كارل يان، مطبعة ستيفن اوستن، هرتفورد، ١٩٤٠، ص١٤٣، ٢٠٣-٢٠٤.

(1014) V.Minorsky: Baba – Tahir, EI, Vol.I, P.841-842

(١٠١٥) أنور المائي: الأكراد، ص ٧٥-٧٦.

ڕۆژئاوای دیجلەوە[١٠١٦]، بەڵگەیەکی ڕوونە لەسەر پرۆسە پیرۆزکردنەکە بە گشتی، بە تایبەت دامەزراندنی شوێنی پیرۆز وەك نەگۆڕێکی دەرەوەی زەمەن.

دواجار، ئەو ئاڕاستەیەی خوێندنەوەی کەسێتی سۆفی، چاوەڕێی ئەوەی لێ دەکرێ کاریگەریی بەسەر جۆر و شێوەی ئەو هزرەی لەپاشی دەمێنێتەوە هەبێ، بەتایبەت لە قۆناغە درەنگەکانی مێژووی دیاردەکە، کە ئەو پابەندیە هزرییەی لەسەرەتادا هەیبووە نایمێنێ. هەر بۆیە لەم ڕوانگەیەوە دەشێ بە کۆمەڵایەتیکردنی سۆفیگەری وەك مەترسییەك بەسەر توانای کایە ئایینییەکە لە خۆبەرهەمهێنان و گەشەسەندنی ناوخۆیی و هێشتنەوەی لە سنووری رووخسارە سەرەکییەکانی ببینین، لایەنی کەم لە ڕوانگەی ئەوانەی بەتوندی پابەند بە سنوورەکانن.

لە بەرامبەردا، بە کۆمەڵایەتیبوون و رازی بوون بەو رۆڵەی لەو ئاستەدا بە سۆفی دەبەخشرێ، ڕێگە خۆشکەرە بۆ جێگیربوونی سۆفیگەری وەك شێوە باوەڕێکی هەمەگیر، بەتایبەت ئەو کاتەی زێتر رەهەندی کەرامەتنوێنی — کۆمەڵایەتی زەق دەبێتەوە و پەیوەندیی نێوان کەسێتی سۆفی و ئەرکی کۆمەڵایەتی وێنای میللیی ئەو دەباتە پلەیەکی باڵاوە. بەمەش لە قۆناغەکانی دواتر متمانەی کوردان بە شێخەکانیان دەبێتە بابەتێکی ئایینی سەرنج ڕاکێش[١٠١٧]. بێگومان ئەمەش کاریگەریی دوورمەودای لە مێژووی بیروباوەڕی کوردیدا دەبێ، لە گۆڕینی سۆفیگەری لە دیاردەیەکی ئایینییەوە بۆ ئایینێك لەخۆیدا.

---

(١٠١٦) مستەفا جەواد: هۆزی لەبیرکراوی گاوان, ل٥٠.

(١٠١٧) هەر بۆ نموونە بڕوانە: الغزالي: إحياء, ج١, ص٨٣. المناوي: فيض القدير, ج٤, ص١٨٥.

# ئەنجام

سەرهەڵدان و جێگیربوونی سۆفیگەری لە پانتایی کوردی لە چەند سەدەی یەکەمی کۆچیدا، مێژووی گەشەسەندنی ئایینی بە ئاڕاستەیەکی جیاوازدا بردووە و لە زۆر باردا تێگەیشتنی مرۆڤەکانی ئەوێی بۆ باوەڕ و باوەڕداری لە قالب داوە. بێگومان ئامادەیی ئەو دیاردە ئایینییە، کەم تا زۆر، پەیوەست بووە بەو بزاوت و ڕێبازە ئیسلامییانەی لە پانتاییەکەدا چالاك بوون، بڕێك لەو بزاوتانە لە ماوەیەکی دیاریکراوی زەمەنیدا سەرهەڵدان و سنووری تەشەنەکردنی بەرزەفت کردووە. هەندێکیشیان لەگەڵ تێگەی ئایینی خۆیاندا گونجاندویانە و لەو ڕێگەیەوە خۆیان بەیان کردووە، سۆفییەکانیشی — تا ئەو کاتەی ویستویانە لە پانتاییەکەدا ئامادەییان هەبێ — پەیوەست بوون بەو بزاوت و دەرکەوتانەوە و وەك پاشخانێکی شەریعەتیی لە گوزارشتکردنیان لەو حەقیقەتەی بانگەشەیان بۆ دەکرد، بەکاریان هێناوە.

دەستپێکی سۆفیگەری لە وڵاتەکەدا تەمومژاوی و ناڕوونە، ئەگەرچی چەند کەسایەتییەکی وڵاتەکەمان هەیە لە دەستەی یەکەمی سۆفییانی جیهانی ئیسلامی نزیك بوونە،ئەوان لەلایەك هیچ پەیوەندییەکی تەواوکاری لە نێوانیان نییە و بەرهەمە هزرییەکانیان نادیارە، کەچی لەلایەکی ترەوە هەندێکیان لە نێو یادەوەری جڤاکدا پارێزراون و بەشێك لەو خەیاڵدانەیان پێکهێناوە کە کولتووری ئایینی کوردی کاری پێ کردووە. لەگەڵ ئەوەشدا بۆمان دەرکەوت کە ئەو شوێنەی کوردستان کە بۆتە بنکەی سەرەکی سەرهەڵدانی سۆفیگەریی، ڕۆژئاوای هەرێمی چیایە، ئەوێ بە هۆی نزیکی لە بنکەکانی دەرکەوتنی سۆفیگەری لە عێراق و خوراسان، لە زووەوە پەنجەی لەگەڵ دیاردەکەدا نەرم کردووە و برەوی پێداوە. دیارە شاری دینەوەریش لە سەرووی ئەو شارانەوە دێت کە ئەو لەخۆگرتنەی سۆفیگەری تێدا دەبینرێ.

لە دینەوەر سۆفییەکی وەك مەمشاد توانیویەتی جۆرە بەرنامەیەك دابڕێژێ بۆ هاوکاری ئەو کەسانەی دەخوازن ببنە سۆفی و لە چوارچێوەی ئەو دیاردەیەدا خۆیان بناسێنن، جا چ پابەندی بێت بە شەریعەت، یاخود نواندنی ڕەفتاری دروستی سۆفییانە یانیش تێگەیشتن بێ لە چییەتی سۆفیگەری لە میانەی چڕ کردنەوەی لە چوارچێوەی خوداناسییەوە. دواجار ئەو

بیروبۆچوونانەش لە نێو شارەکەدا پەیڕەوکاریان هەبووە و لەسەر دەستی ئەودا چەندان کەس هاتوونەتە نێو ئەو بازنەیە ئەوێ تادرەنگانێك بۆتە شاری سۆفییان.

لە کرماشانیشدا، ئەگەرچی ژمارەی ئەو کەسانەی بوونەتە سۆفی کەمن، بەڵام هەریەك لە مظفر و ئیبراهیمی کوڕی شەیبان توانیویانە هزرەکە بە ئاستێکی بەرز بگەیەنن، ئەوەی یەکەمیان لە ڕێگەی جەختکردنەوە لەسەر سۆفیگەری هەژارانە و ڕەفتاری ڕۆژانەی سۆفییان و چۆنییەتی بەرزەفتکردنی دەروونی مرۆڤانە توانیویەتی مانایەکی نوێ — لە شارەکەدا — بە خوداناسیی ببەخشێ، سۆفی دووەمیش هەم برەوی بەو مانایە داوە هەمیش وەك کەسێکی خودان هزری سۆفییانە دەرکەوتووە.

لە هەندێ شاری تری هەرێمەکە (بەتایبەت نەهاوەند و حولوان)، سۆفی دەرکەوتوون، بەڵام بەبەراورد لەگەڵ دوو شارەکەی تر، لەڕووی ژمارە و بیروڕادا، کەمتر کاریگەریان جێهێشتوە

لە هەرێمی جەزیرە، کەبەشێکی بنەڕەتی کوردستانی پێکدەهێنا، سۆفیگەری بە بەراورد لەگەڵ هەرێمەکەی تردا، بەکەمی سەری هەڵداوە، ئەمەش بەکاریگەریی هەژموونی ئیسلامی خەواریجیەوە بووە، ئەو شێوە ئیسلامەی پتر ڕۆحێکی شۆڕشگێڕانەی هەبووە و کاری لەسەر بەشداری سیاسی کردووە، نەك دوورەپەرێزیی سۆفییانە. لەگەڵ ئەوەشدا — کەم تا زۆر — هەردوو شاری نصێبین و سنجار چەند سۆفییەکیان تێدا دەرکەوتووە، بەڵام کەم ناسراون و لەسەرچاوەکانیشدا بە لێڵی باسیان لێوە کراوە. خۆ ڕەوشی سۆفیگەری لە هەرێمی ئازربێجان، نزیکە لە ڕەوشی هەرێمی جەزیرە، مەگەر لە شاری ورمێ نەبێ، کە سۆفییەکی گەورەی کوردی وەك ئەبوبەکری کوڕی یەزدانیاری تێدا دەردەکەوێ و دەتوانێ، بە هۆی تایبەتمەندیی خوێندنەوەی بۆ سۆفیگەری، شار بکاتە سەنتەرێکی دیاردە ئایینییەکە.

لەڕووی بیروڕاوە، سۆفیگەری وڵاتەکە لە ڕەوتی پێشڤەچوونیدا، کەوتۆتە ژێر باری هەمان ئەو ڕەوشی پارچەپارچەیی و ڕەوتگەرایییەی تەواوی دیاردەکەی گرتۆتەوە، بۆیە ڕەوتە دانپیانراو و نەویستراوەکان لەوێدا بینراون. لەسەرووی هەمووشیانەوە ئەو ڕەوتە دێت کە مەنسوری حەلاج دامەزرێنەرێتی، کە ئەگەرچی نەیتوانیوە مەیلی تەواوی سۆفییان بۆ خۆی رابکێشێ، بەڵام لە رووی دراوە هزریەکانی و ئەو چەمك و دەستەواژانەی لە ئەزموونە ڕۆحانییەکەیەدا بەگەڕی خستبوون، دیاردەکەی بەگشتی گەیاندە ئاستێکی باڵاوە. لە زەمینەی کوردیشدا ئەو ڕەوتە توانیویەتی هەم لە ئاستی میللیی و هەمیش لە ئاستی دەستەبژێردا(هەردوو دەستەبژێری سۆفی و فیقهی) جێگەیەك بۆ خۆی بکاتەوە، نەخاسمە کە دەبینین چەندان سۆفی

وڵاتەکە، بەتایبەت لە هەر یەك لە دینەوەر و حولوان، بە تێزەکانی دامەزرێنەری ڕەوتەکە ڕازی دەبن و پەیڕەوی لێ دەکەن و لە قۆناغی دوای حەلاجیش برەوی پێ دەدەن، تەنانەت هەندێکیان — بۆ نموونە — فارسی دینەوەری وەك بانگەوازکاری پلە یەکی ڕەوتەکە دەردەکەوێ.

لە بەرامبەردا سۆفیگەلێکمان هەن، بە گومانەوە لەو ڕەوتەیان ڕوانیوە، لەوەدەچێ هەندێکیان کەوتبنە ژێر کاریگەریی هەڵوێست و تێڕوانینی فەرمی(سیاسی — ئایینی) و لەو گۆشەنیگایەوە ڕەوتەکە و تێزەکانیان ڕەتکردۆتەوە. هەندێکیش، بە تایبەت گەورەی سۆفییانی کرماشان ئیبراهیمی کوڕی شەیبان، لە چوارچێوەی تێگەیشتنی خۆی بۆ سۆفیگەری پەیوەست بە شەریعەتەوە، حەلاج و هزرەکەی هەڵسەنگاندوە و پێی وابووە تێزەکانی ئەو جۆرێکن لە بانگەشەکاری، هەروەها پەرگیری لە تێگەیشتنی حەلاج لە چەمکە سۆفییەکانی وەك فەنابوون هەیە و ئەو سنوورە ئاساییانەی بڕیوە کە دەشێ لە چوارچێوەیدا پەیوەندیی نێوان مرۆڤایەتی و خودایەتی دروست بێ.

یەکێك لە سۆفییەکانی وڵاتەکە، ویستوویەتی لە دەرەوەی ڕەوتە سەرەکی و باوەکانی سۆفیگەری خوێندنەوەی خۆی بۆ دیاردەکە هەبێ، ئەویش ئەبوبەکری کوڕی یەزدانیاری ورمێیە، ئەو سۆفییە کوردەی لە دیدێکی ڕەخنەییەوە کولتووری سۆفیگەری هەڵسەنگاندوە و پێی وابووە لە چەندان جەمسەرەوە بە ئاڕاستەی هەڵەدا ڕۆیشتووە و دەبێ جارێکی تر پەیوەندیی حەقیقەتەکەی بە شەریعەتەوە دیاری بکرێتەوە و سۆفییان لەو حاڵە ناجۆرانەی تێی کەوتوون دەربچن، کە خۆی لە هاوسەنگ نەبوونی کرداری سۆفییانە و گوتە و بۆچوونەکانیان لەلایەك و لەلایەکی ترەوە درکاندنی ڕازە خوداییەکان دەبینییەوە. ئەو خۆی بیروڕای جیاوازی لەبارەی سۆفیگەری هەبووە و کاری کردووە بۆ بڵاوکردنەوەی ئەو بیروبۆچوونانە لە کۆڕی سۆفییاندا، لەبەرامبەردا سۆفییە دیارەکانی هاوسەردەمی، بەتایبەتیش ئەبوبەکری شبلی، ڕووبەڕووی بوونەتەوە و هەردوو بواری حاڵی سۆفییانەی و تێزە هزرییەکانیان ڕەتکردۆتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا کوڕی یەزدانیار لە مێژووی هزری سۆفیگەریدا بە پەراوێز نەخراوە و پاشماوەی ئەو کولتوورەی بەرهەمی هێنابوو تا درەنگانێکی مێژووەکە بە زیندوویی ماوەتەوە.

ئەگەر سەرچاوەکان، کەم تا زۆر، هاوکارمان بووبن لە دیاری کردنی سەرەتاکانی سەرهەڵدانی سۆفیگەری و جێگیربوونی لە پانتاییەکی تا ڕادەیەك دیاریکراوی جوگرافییدا، ئەوا ئەو کاتەی هزرەکە قووڵتر و پەرش دەبێتەوە و تێکەڵ بە سیستەمی کولتووری کوردی

دەبێ و بەو ئاڕاستەیەدا دەڕوات کە جیهانبینییەکی ئایینی سەربەخۆ فەراهەم بکات، زانیارییەکانیان کورت دێنن و دووچاری قەیرانمان دەکەن لە خوێندنەوەی وردی تێزەکانی، وەك لە خوێندنەوەی پێگەی کەسانێکی وەك شاه خوشین و باباتاهیر دەردەکەوێ، هەروەها ڕەهەندی عیرفانیانەی ئایینی ئەهلی هەق - یارسان و ئامادەیی ئەوی دووەم تیایدا دەبینرێ، بە جۆرێك کە ئەو وەك کەسێکی نادیار دەردەکەوێ و پتر وێناکەی لە میانەی نواندنی لە دووتوێی ئەو کولتوورە ئایینییەدا دیارە. ئەگەرچی لە چوارچێوەی کتێبەکەی "وشە کورتەکان – الکلمات القصار"دا وەك سۆفییەکی خودان ئەزموونێکی ڕۆحانی سەربەخۆیە کە ویستوویەتی لە ژێر باری دونیایی بوون دەربچێ و عارفێکی ڕەها بێ، یان لایەنی کەم هەوڵیداوە ئەو ڕێچکەیە دەستنیشان بکات کە بەو پایەیەی دەگەیەنێ.

بەهەرحاڵ، تا ئەوکاتەی سۆفییەکان دوورەپەرێزانە کاری هزریی خۆیان ئەنجامداوە، خودان گوتارێکی جیاواز لە گوتارە ئایینییە باوەکان بوون، بەڵام گۆڕانی ڕەوشی سیاسی – ئایینی و هەژموونی ڕەوتی سوننەگەرا بەسەر پانتایی ئیسلامی، سنوورێکی بۆ ئەو جیاوازییە داناوە و پاشەکشەی بە دارشتەی هزریی کردووە و ویستویەتی لە چوارچێوەی دراوە شەریعەتییەکانەوە حەقیقەتی سۆفییانە لە قالب بدات. بۆیە سۆفییەکی وەك شێخی ئیسلامی هەکاری ئەوەندە وەك شەرعناسێك و فەرموودە گێڕەوەیەك دەناسرێ و سەرەدەری لەگەڵدا دەکرێ ئەوەندە کەسێتییە سۆفییانەکەی دەرناکەوێ، ئەو خۆشی ناچار بووە لە نێو ئەو دراوە شەریعەتییانەوە بیری خۆی بخاتە گەڕ و ئەمەش وایکردووە رووخساری ئەو حەقیقەتە سۆفییانەی هەڵگری بووە بە تەڵخی بمێنێتەوە.

لەگەڵ ئەوەشدا هەندێك سۆفی کورد، بەتایبەت هەریەك لە ئەبوبەکری هاواری و ئەبو محەمەدی شەنبەکی و ئەبولوەفای حولوانی، دەردەکەون کە هەرچەندە خودان ناسنامەیەکی کۆمەڵایەتی(ڕێگری) نەویستراو بوون و تێگەیشتنێکی سادەیان لەمەڕ شەریعەتەوە هەبووە، بەڵام توانیویانە جوڵە بخەنەوە بەر کایەی سۆفیگەری و چەمك و دەستەواژەکانی ببووژێننەوە، تەنانەت وەك سەرەتایەکی گەورەی نێو دیاردەکە دەردەکەون کە بریتییە لە پەڕینەوە بۆ قۆناغی سۆفیگەری تەریقەتیی، ئەگەرچی هیچ کامێك لەوان بەتەواوی نەبوونەتە دامەزرێنەری تەریقەتێکی سەربەخۆ، بەڵام هەریەك لە بیروبۆچوونەکانیان و کەسێتییان وەك بناغەیەك بۆ ئەو دامەزراندنە بەکار هێنراوە.

سەبارەت بە دەرکەوتە کۆمەڵایەتییەکانی سۆفیگەری ئەوا بەگشتی جەختی لەسەر دوورەپەرێزیی و ناکۆمەڵایەتیبوون دەکردەوە و سۆفییەکانی سنووریان بۆ تێکەڵبوونی کۆمەڵایەتی داناوە، بەڵام لەبەر پەرەسەندنە نێوخۆییەکانی کایەکە و پێداویستی کۆمەڵایەتی نەیانتوانیوە پارێزگاری لەو سنوورانە بکەن و هزرەکەیان بۆ ئاستی میللیی هاتۆتە خوارەوە و کەسێتی سۆفییانەیان لە ناوەندی کۆمەڵایەتی کوردیدا ئامادەیی ئایینیانەی هەبووە. تەنانەت ئەوان جیاواز لە کەسێتیە ئایینییەکانی تر(بۆ نموونە فەقیهەکان) جۆرێك لە هۆگریان بەرامبەر بە ناوەندەکە هەبووە و باوەڕی میللیی خەڵکەکەیان پێ قەبوڵ بووە و وەك بەڵگەی دەرکەوتە باوەڕییەکانی خۆیان خوێندوویانەتەوە. لەلای خۆشیەوە، جڤاکی کوردی لە چەند ئاستێکەوە سۆفیگەری لەخۆ گرتووە و لە گەڵی سۆفییان نزیك کەوتۆتەوە، بەتایبەت کە بینیویەتی دیاردەکە لەگەڵ سروشتی خۆی، لایەنی کەم لە ڕووی باوەڕهێنانەوە، دەگونجێ. هەروەها ڕێگەیەکی قەبوڵکراوی گۆڕینی چەند مرۆڤێکی کورد بووە لە کەسێتی خاوەن ڕەفتاری نەویستراوەوە(ڕێگر) بۆ کەسێتییەکی پیرۆز و چاکسازیکار(سۆفی).

زەمینە کۆمەڵایەتییەکە پێویستی ئەوەی بە سۆفی هەبووە کە ڕۆڵی پێکبەست لە نێوان ئەو و دەسەڵاتی سیاسی بگێڕێ، خەڵکەکە خواستوویانە سوود لە ڕەهەندی پیرۆزی ئەوان وەربگرن بۆ ڕاستکردنی ڕایەڵەی پەیوەندییەکانیان بە دەسەڵاتدارانەوە، سۆفییانیش لە نواندنی ئەو ڕۆڵەدا هەندێکجار سەرنەکەوتوون و تەنانەت سەریان تێچووە، هەندێکجاریش ئەو دەسەڵاتدارانەیان بە چاکەکاری لە بەرژەوەندی زەمینە گشتییەکە ڕازی کردووە. بێگومان ئەو پێداویستییە کۆمەڵایەتییە وایکردووە سۆفیەکان وەك کەسی سەرووئاسایی و پیرۆز تەماشابکرێن، کە توانای نواندنی کەرامەتیان هەیە، ئیدی باوەڕبوونی ڕەها بە سۆفی لە ژیانی و لەدوای مەرگیشی دەخزێتە نێو سیستەمی باوەڕهێنانی جڤاك و لەوێوە تا ئێستا بەردەوامیی مێژوویی و نا مێژوویی دەبێ.

## شەشەم: بابەتەکانی ئەنسایکلۆپیدیای ئیسلامی

- The Encyclopaedia of Islam، new edition، ، E. J. Brill، Leiden، 1986-2004:

E.Geoffry:

- Tarika، Vol. X

F.Rahman:

- Baka wa Fana، Vol.I

J. Chabbi:

- Khankah، Vol.IV

L. Lochart:

- Dinawar، Vol.II

Tahsin Yazici:

- Kalandar، Vol.V

V.Minorsky:

- Ahl-I Hakk، Vol.I
- Baba – Tahir، Vol.I
- Urmiya،Vol.X

## یەکەم: فەرهەنگی چەمکە سۆفییەکان

ئەوەی سەرەدەری لەگەڵ کایەی سۆفیگەریدا بکات، رووبەڕووی کۆمەڵێك چەمك و دەستەواژەی تایبەت بەو کایە دەبێتەوە، بەهۆیانەوە مانا بەو جیهانە دەبەخشن کە سۆفی بۆ خۆی وێنایکردووە. توێژەریش بۆ دەردەکەوێ ئەستەمە بتوانێ بە چەند دێڕێك و بەگەڕانەوە بۆ چەند سەرچاوەیەکی هەمەگیر پێناسەیان بکات. خۆ ئەو زمانە رەمزییەی سۆفیان پێی دەدوێن، چەندین مانای دیار و نادیار بە ووشەی ئاسایی دەبەخشێ، وادەکات درك بەوە بکەی هەر وشەیەکی بەکارهێنراو دەلالەتی جیا جیا و روانگەی هەمەچەشنی لە پشتە.

لە زۆربەی باردا دیاریکردنی سنوری ماناکان لەسەر ئەو سۆفیە دەوەستێ کە چەمك و دەستەواژەکەی بەکارهێناوە و لەدەرەوەی ناوکۆی بیرکردنەوەی ئەودا لە مانا باوەکەی و — تەنانەت هەندێك جار - لە دەلالەتە سۆفییانەکانیشی بەتاڵ بۆتەوە، بەجۆرێك وایلێهاتووە تەواو رەنگدانەوەی حاڵی سۆفییەکەن و گوزارشت لە ئەزموونە رۆحانییە بێهاوتاکەی دەکەن، بۆیە مەرج نییە ئەو مانایانە ببەخشن کە دەشێ لە چوارچێوە گشتگیرەکەی چەمکەکانەوە جێگەیان ببێتەوە.

بێگومان ئەو تایبەتمەندییە زمانەوانییە یان بابڵێین ئەو گەمە زمانەوانییەی سۆفیان، گرفتێکی گەورەی بەردەم هەر هەوڵێکی ناساندنی چەمکە بەکارهاتووەکانە لەدووتوێی توێژینەوەیەکی وەك ئەوەی ئێمە. بۆیە وەك بینیمان لە هەندێ باردا ناچار بووین بڕێکیان لەناوەڕۆکی بابەتەکە و لەو شوێنەدا بناسێنین کە قسەمان لەبارەوە کردووە. لەخوارەوەش هەوڵدەدەین مانای هەندێکی تریان بخەینەڕوو و لەناوکۆی ئەو رستانەی لە توێژینەوەکە چەمکەکانی تێدا بەکارهاتووە، پێناسەیەکیان بکەین. بۆیە رەنگە لە شوێنی تردا مانای تر ببەخشن، بەڵام ماناکانی نێو ئەو کورتە فەرهەنگە، مانای خوازراوی نێو کارەکەی ئێمەیە، لەگەڵ رەچاوکردنی فراوانترین مەرزی مانا گشتییەکانیان.

### " ئاماژە – الإشارة"

بەپێی تێگەیشتنی سۆفییانە بریتییە لە شاردنەوەی ماناکانی ئەوەی مەبەستتە بە ئەویتری بڵێی، یانیش بریتییە لەو تێزەی قسەکەر، لەبەر نازکی ماناکەی، ناتوانێ بەڕوونی باسی لێوەبکات. القشيري: عبارات الصوفية، ص٥٣. الجرجاني: كتاب التعريفات، دار إحياء التراث العربي، بيروت، ٢٠٠٣، ص٢٢.

**"بینین – المشاهدة"**

خۆبینینه بەهۆی نەمانی ڕەهای پەردە(حیجاب)ی جیاکەرەوەی مرۆڤ و خودایەتی. باوەڕهێنانە بە ئامادەیی هەق بەزاتی خۆی بۆ هەموو شتێك، کە مەبەستیش لێی بینینی شتەکانە وەك بەڵگە لەسەر یەکتایی. القاشاني: معجم، ص٣٤٧.

**"بینینی خودا – مشاهدة الحق"**

لە کولتووری سۆفییاندا بە شێوە و مانای جیاواز گوزارشتی لێ کراوە؛ بینین بە خودا: واتا بینینی شتەکان وەك بەڵگە لەسەر یەکتایی، بینین بۆ خودا: واتا بینینی خودا لە شتەکان، هەرچی بینینی خودایە ئەوا بریتییە لە لە حەقیقەتێکی بێ گومان و ڕووبەڕووبوونەوەیەکی غەیبانی و وەسف نەکراوی خودا. القشیري: عبارات الصوفیة، ص٦٦.

**"ترس – الخوف"**

بەمانای لەرزینی دڵ دێت بەهۆی ئەو گوناهانەی هەڵیگرتوە. القشیري: منشور الخطاب، ص٩٥.

**"جوامێریی – الفتوة"**

هەوڵدانە بۆ بەدەستهێنانی ڕەزامەندی خودایی لەڕێگەی دەست هەڵگرتن لە هەموو ڕەوشتێکی خراپ و دەست گرتن بە باشەکان. جوامێرییش بۆ سۆفی کات و حاڵ نییە، بەڵکو دەبێ لە هەموو بارێکدا لەبەرامبەر بە هەموو کەسێك، جوامێر بێ. السلمي: کتاب الفتوة، ضمن: مجموعة آثار، ج٢، ص ص٢٢٨-٢٢٩.

**"حاڵ و مەقام – الحال و المقام"**

ئەو دوو چەمکە دوو جومگەی بنەڕەتی هزری سۆفیگەری پێکدێنن، پێناسە و بۆچوونی جیاوازیان لەبارەوە هەیە، بەپێی تێڕوانینی هێندێك لە سۆفیان حاڵ گۆڕانی ڕەوتی خوداپەرستە بە هۆی ئەوەی لەو پرۆسەیەدا بە دڵی دادێ و تێیدا جێگیردەبێ (وەك: "خۆشەویستی – المحبة، "نزیکیی – القرب"،"ترس – الخوف"، "هۆگریی – الأنس"، "بینین – المشاهدة" و...هتد)، هەرچی مەقامە ئەوا بریتییە لە ئامادەیی مرۆڤ لەبەردەم خوداوە لە میانەی شێوە جیاوازەکانی پەرستن( وەك: "تۆبەکردن – التوبة"، "هەژاریی – الفقر"، "سەبرگرتن – الصبر" و...هتد). حاڵ گۆڕاوە و مەقام جێگیرە، سۆفی لە حالەوە دەپەڕێتەوە بۆ مەقام (هەرچەندە مەرج نییە هەموو جارێك وابێ)، کە ئەمەش گۆڕانە لە ئاستەکانی یەقین و باوەڕبووندا. (السراج: اللمع، ص ص٦٥-٦٦. السهروردي: عوارف، ج٢، ص ص٢٦٤-٢٦٨.)

**"حەقیقەت و شەریعەت – الحقیقة والشریعة"**

ئەمانەش دوو چەمکی سەرەکی فەرهەنگی سۆفیگەری پێکدێنن، بەپێی قوشەیری حەقیقەت بینینی خودایەتیی و وەستانی دروستی مرۆڤی باوەڕدارە بەرامبەر بەو خودایەی باوەڕی پێیەتی، هەر کاتێك گومانێك بکەوێتە دڵیەوە حەقیقەتەکەی لێ ون دەبێ، هەرچی شەریعەتە ئەوا فەرمانە و ئاماژەیە بۆ پابەند بوون بە بەندایەتی بۆ خودا. هەروەها لەبارەی پەیوەندییانەوە دەڵی: هەر شەریعەتێك لەلایەن حەقیقەتەوە پاڵپشتی نەکرێ قەبوڵ ناکرێ، هەر حەقیقەتێکیش بە شەریعەتەوە سنووربەند نەکرابێ قەبوڵ ناکرێ. القشیري: الرسالة، ص١٦٨. هەمان نوسەر: عبارات الصوفیه، ص٥٢. هەر چۆنێك بێت ئەو دوو چەمکە لە رووی دەستەواژەییەوە لە چوارچێوەی کولتووری سۆفیگەری دەبنە ناسنامەی گروپە ئایینییەکان، سۆفییەکان بریتی دەبن لەوانەی حەقیقەتناسن، لە بەرامبەردا فەقیە و ئوسوڵییەکان وەك شەریعەتناس و داکۆکیکار لەو چەمکە وماناکەی دەردەکەون.

**"خانەقاه- الخانقاه"**

وشەیەکی لێکدراوی فارسییە و راڤەی جیاوازی بۆ کراوە: (خانگاه، خانەگاه، خوانکاه...هتد)، زیاتریش مەیل بەلای ئەوەیە لە وشەی "خانگاه"ەوە وەرگیرابێ کە بە (شوێنی مانەوە، ماڵ، تەختی پاشا...هتد) لێکدراوەتەوە. لە رووی دەستەواژەییەوەش شوێنی تایبەت بە حەوانەوە و خوداپەرستیی سۆفییان دەگرێتەوە. EI، IV، P.1025-1026، J. Chabbi: Khankah Vol.

**"خیرقە - الخرقة"**

ئەو پۆشاکە تایبەتیەیە کە مورید لەسەر دەستی شێخەکەی دەیکاتە بەر و ئاماژەیە بۆ گوێڕایەڵی بۆ ئەو شێخە و پەیوەست بوون بە دیدە ئایینییە – سۆفیگەرییەکەیەوە. لەبارەیەوە بگەڕێوە بۆ: القاشاني: معجم، ص٨٥.

**"دەروون – النفس"**

ئەم چەمکە پێناسە و دەرکەوتەی فرەچەشنی هەیە، لە یەك لە پێناسەکاندا بە گەوهەری هەڵمین دەچوێنرێ، کە هێزی ژیان و خۆشەویستی و بزاوتی بە ویستی هەڵگرتوە. دەروون پێکبەستی نێوان دڵ و جەستەیە، هەربۆیە وا وەسفدەکرێ کە رۆحی دەسەڵاتی خودایە بەسەر گرێ دڵ، تاوەکو کڵپەکانی دامرکێنێتەوە. القشیري: عبارات الصوفیة، ص٥٨. القاشاني: معجم، ص١١٠.

**"راز – السر"**

ئەو حاڵە پەنهانانەیە کە لە نێوان "بەندە" و "خودا"دا هەیە و لە نێو دڵی مرۆڤدایە و جگە لە خوداش نابێ کەس پێی بزانێ. الرازي: حدائق الحقائق، ص٣٣٣.

**"روخسار و کرۆك – – الظاهر و الباطن"**

بەپێی تێگەیشتنی سۆفییان هەردوو چەمکی "الباطن" و "الظاهر" ئاماژەن بۆ شارەزابوون و تێگەیشتنی سۆفی لە زانست و زانینەکان، هەر کاتێك ئەو زانستانە لە نێو دڵدا بوون و نەدرکێنران ئەوا "باطن"ە، بەڵام کە هاتە سەر زار و باسی کرا ئەوە "ظاهر"ە، هەموو باوەڕێکی ئایینیش ئەو دوو چەمکەی تێدا جێ دەبێتەوە، سەبارەت بە ئیسلام "ظاهر" خۆی لە سرووتەکانی خوداپەرستیی و حوکمە شەرعییەکان دەبینێتەوە (نوێژ، رۆژوو، حەج، تەڵاق، کڕین و فرۆشتن و ...هتد)، هەرچی "باطن"ە ئەوا پەیوەستە بە دڵەوە و چەمکانێکی وەك(مەقام و حال، باوەڕ، خۆشەویستی، راستگۆیی، بیرکردنەوە و...هتد) لەخۆ دەگرێ. بڕوانە: السراج: اللمع، ص ص٤٣-٤٤.

**"رۆح – الروح"**

جونەید پێی وایە ماناکانی رۆح لای خودا خۆیەتی و بە کەسی نەگوتووە. لەگەڵ ئەوەشدا گەلی سۆفیان کۆکن کە رۆح ئەو مانا پەنهانەیە بەهۆیەوە جەستە دەژی. الکلاباذي: التعرف، ص٤٤. القشیري: الرسالة، ص١٧٥-١٧٦.

**"ریباگ - الرباط"**

بنەچەی وشەکە لە "ربط – بەستن" هاتووە و بۆچوونی جیاوازی لە بارەوە هەیە، زیاتر دەڵێن ئاماژە بوو بۆ ئەو پەتەی ئەسپی پێ دەبەسترایەوە، پاشان بەو ناوچە سنوورییانە (الثغور) دەگوترا کە خەڵکەکەی خەریکی شەڕ(جیهاد) بوون لەگەڵ غەیرە موسڵمانان، لەوێدا "رباط" وەك بنکەی سەربازی وابووە، دواتر ناوەکە تایبەت کراوە بە شوێنی نیشتەجێبوونی سۆفییانەوە. السهروردي: عوارف، ج١، ص١٨٠. هەروەها بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: محي هلال سرحان: الربط الإسلامیة، مجلة المورد، بغداد، ١٩٨٥، مج(١١)، العدد(٣)، ص ص٧٥-٧٩.

**"زانین – علم"**

باوەڕبوونی رەهایە کە تەواو لەگەڵ واقیعدا رێکدێتەوە، جێگیربوونی وێنەی شتە لە عەقڵدا. الجرجاني: التعریفات، ص١٢٦.

**"سەماع – السماع"**

تێگەیشتن لەوەی لە ئاکامی بەیانکردنەوە کەشف بووە، هەروەها پەڕینەوەیە لە وەهمەوە بۆ بینین. لە قۆناغی درەنگی مێژووی سۆفیگەری بە سترانی ئایینی تایبەت بە سۆفیان، کە زیکری پێدەکەن، دەگوترێ سەماع. بۆیە هەندێك سۆفی پێیان وایە لە روخساردا فیتنەیە و لە ناوەرۆکدا پەند و ئامۆژگاریە. چونکە ئەوەی لە ئاماژەکانی تێبگات ئەوا گوێگرتنی لە پەند و ئامۆژگارییەکانی رەوا دەبێ، ئەگەرنا رەنگە رووبەڕووی فیتنە و بەڵا ببێتەوە. القشيري: منثور الخطاب، ص١٠٤. الخركوشي: تهذيب الأسرار، ص ص٣٠١-٣٠٥.

**"شەتەحات – الشطحات"**

لە زمانی عەرەبیدا بەمانای "جووڵە – الحركة" دێت و لەلای سۆفییانیش ئاماژەیە بۆ هەر دەستەواژەیەکی نائاسایی کە وەسفی حاڵەتێکی بە هێز و رەهای "وەجد" دەکات، ئاکامەکەشی گوتەی ئەوتۆیە کە بۆ ئەو کەسەی گوێی لێ دەبێ و تەماشای پاشخانە وەجدییەکەی ناکات بە سەیر و رەنگە بە دەرچوون لە باوەڕی دروستی تێ بگات. السراج: اللمع، ص ص٤٥٣-٤٥٤.

**"فەنا و بەقا – الفناء و البقاء"**

ئەوەی یەکەمیان نەمانی سیفەتی خراپ و ئەوەی دووەمیشیان مانەوەی سیفەتی چاکە لە پەیوەندیی بە خوداوە، بەجۆرێك وەك جونەید دەڵێ: مانەوەی هەق و نەمانی هەر شتێك لە دەرەوەی ئەو بێ. الخركوشي: تهذيب، ص١٤٦. القشيري: الرسالة، ص١٤٦.

**" کۆکردنەوە و پەرتکردن- الجمع و الفرق"**

کۆکردنەوە پێچەوانەی چەمکی پەرتکردنە؛ ئەو شتەی سەرچاوەکەی خودا بێ و لەو دەربچێ، وەك مانا بەخشین و چاکە کاری، ئەوە کۆکردنەوەیە، ئەوەی مرۆڤیش لە بەجێگەیاندنی ئەرکەکانی بەندایەتی دەستی دەکەوێ و لەگەڵ حاڵی مرۆڤانە دەگونجێ، پەرتکردنە. هەندێك پێیان وایە هەردوو چەمك پێویستن، چونکە ئەوەی کۆکردنەوەی نەبێ بە حاڵەتی عیرفانیی(خوداناسین) ناگات، ئەوەی پەرتکردنیشی نەبێت لە مانای بەندایەتی بۆ خودا ناگات. القشيري: الرسالة، ص ص١٤٣-١٤٤. الرازي: حدائق الحقائق، ص٣٠٣.

**"ناسین – المعرفة"**

بریتییە لە پەی بردن بە کرۆکی شتەکان و ئاماژەیە بۆ شتێك لە خۆیدا، دیارە زیاتر مەبەست ناسینی خوداییە. کەسێکیش ئەو ناسینەی هەبێ پێی دەگوترێ "عارف"؛ ئەویش

ئەو کەسەیە کە خودا رازەکانی خۆی پێ گوتووە و ناو و خەسڵەتەکانی خودایی دەناسێ. القشيري: الرسالة، ص٤٦٨. الجرجاني: التعريفات، ص١٧٩.

**"نزیك بوونەوە- القرب"**

نزیکییە لە خودا لە رێگەی پەرستنەوە، واتا مرۆڤ لە خودا نزیك دەبێتەوە نەك بە پێچەوانە. ئەمەش کردەیەکی مرۆڤانەیە و ئاکامەکەی خۆشبەختییە بۆ خودی مرۆڤەکە، نزیـ ـنەوەش لە "حال"ە سۆفییەکانە و بۆ ئەوانەیە کە بە دڵ نزیکیی خودایيان بینیوە، کە بە شێوە ە مەچەشنەکانی پەرستن لێی نزیك بوونەتەوە. السراج: اللمع، ص٨٤. الجرجاني: التعريفات، ص١٤٢-١٤٣.

**"هەژاریی – الفقر"**

بریتییە لەدەستدانی ئەوەی کە پێویستییەکانی ژیانە، بەڵام لەدەستدانی شتە ناپێویستەکان هەژاریی نییە. الجرجاني: التعريفات، ص١٣٨.

**"وەجد – الوجد"**

حاڵەتێکی کاتییە توشی دڵ دەبێ، وەك تاسان، خەم، یان بینینی مانایەکی رەوشی ژیانی دوای مەرگ، یانیش ئاشکرا بوونی حاڵێکی نێوان "بەندە" و "خودا". الكلابادي: التعرف، ص٨١.

**"یاد – الزکر"**

لەبیرکردنی هەموو ئەوەی یادکراو(خودا) نییە، ئەو ئامرازانەیە کە بە هۆیەوە سۆفی بە هەق دەگات و هەقیش لەو ئاگادار دەبێتەوە، ئامرازەکانیش کردار و گفتار و حاڵەکان دەگرێتەوە. الكلابادي: التعرف، ص٧٣-٧٤. ابن شاهاور: منارات السائرين، ص ص٢٩٢-٤٠١.

**"یاوەری – الصحبة"**

لە کولتووری سۆفیگەریدا بەتاڵ دەبێتەوە لەو مانا زمانەوانییەی پێی بەخشراوە، لێرەدا دەبێتە چەمکێکی فرە مانا و فرە ئاست، لایەنی کەم سێ ئاستی سەرەکی هەیە، یەکەمیان: یاوەریکردنی لەخۆ گەورەتر، کە ئەمە زیاتر خزمەتکردنە، دووەمیان: یاوەری لەخۆ بچووکتر، ئەمەش وا دەخوازێ گەورە دڵ نەرم و دلۆڤان بێ و گچکەش گونجاو و بەرێز بێ، سێیەمیان: یاوەریتی هاورێیانە کە بنەماکەی پێشخستنی پەیوەندی و جوامێرییە. القشيري: الرسالة، ص٤٤٥.

### "یەقین – الیقین"

بە باوەڕی سۆفییان یەك لە مەقامەكانە، ئاكامێكی باوەڕداری زۆر و گەیشتنە بە قۆناغی گومان نەكردن و ئاشنابوونە بە بنەما غەیبانییەكان، بۆیە وەك جێگیربوونی ئەو زانینەیە لە دڵ كە نە دەگۆڕێ و نە ئاوەژوو دەبێتەوە. الخركوشي: تهذیب، ص ص٧٠-٧٥. القشیري: الرسالة، ص ص٣٠١-٣٠٦.

### "یەكتایی – التوحید"

دەبێ لە دەروونی مرۆڤدا ئەو زانینە هەبێ كەوا ئەو خودایەی دروستی كردووە، لە خودایەتییەكەیدا تاك و بێهاوتایە. یەكتایی سیفەتی هەقە و بیركردنەوەی لە فرەخودایەتی لە دەرەوەی عەقڵە. هەربۆیە یەكتایی دابڕینی كۆنە لە نوێ، بەجۆرێك كە هەرگیز بەتەواوی ئەو كۆنە(خالق) لەلایەن نوێوە(مەخلوق) پەی پێنابردرێ. الكلاباذي: التعرف، ص٤٤. رفیق العجم: موسوعة مصطلحات التصوف، ص٦-٧.

### "یەكگرتن - الإتحاد"

بەرجەستەبوونی وجودی هەقی تاكی رەهایە، كە بەهۆی ئەو وجودەوە هەموو شتێك بوونی هەقانەی هەیە. بەو پێودانگەش هەموو شتێك لەگەڵ ئەودا یەكدەگرێ، چونكە هەر هەموویان بەوەوە بوونیان هەیە و لە دەرەوەی ئەودا عەدەمن. رفیق العجم: موسوعة مصطلحات التصوف، ص٦-٧.

## دووەم: فەرهەنگی كەسایەتی و گروپ و ناوچە

### ئەبو بەكری زوقاق

"ابو بكر أحمد بن نصر الزقاق الكبیر"؛ لە گەورەی سۆفییانی وڵاتی میصرە، هاوسەردەمی جونەید بووە، زیاتر وەك شێخێكی خودان كەرامەت باسی لێ دەكرێ، ساڵی مردنی نەزانراوە. ابن الأثیر: اللباب، ج٢، ص٧٢. العمري: مسالك، ج٨، ص ص٣٦٤-٣٦٦.

## ئەبو بەکری شبلی

"ابو بکر دلف بن جحدر الشبلی"؛ لەبنەڕەتدا خوراسانییە و لە بەغدا گەورە بووە و پێگەیشتوە، یەکێکە لە یاوەرانی جونەید. لە نێو سۆفیگەریدا گرنگی بە عەشقی خودایی داوە و خۆی لەناو ئەو حاڵەتی عەشقەدا ژیاوە. لەوەدەچێ لە دوادواییەکانی ژیانی کەوتبێتە حاڵی بێئاگایی و بە شێت دانراوە و خراوەتە نەخۆشخانە، لە ساڵی (٣٣٤ك/٩٤٥ز) مردووە. ابن خمیس: مناقب، ج١، ص ص٢٨-٥٠. هەروەها بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: کاظم محمد وایقاني: شبلی - مجنون عاقل، سازمان چاپ و انتشارات، تهران، ١٣٨٣ هـ.ش، ص١٥ و بعد.

## ئەبو جەعفەری صەیدەلانی

زانیاری لەبارەوە زۆر کەمە، ئەوەندەی لەبارەوە دەزانرێ کە لە سۆفییانی بەغداد بووە، ماوەیەك لە مەککە ماوەتەوە، پاشان چۆتە میصر و لەوێ مردوە. جامی: نفحات، ص ١٧٠.

## ئەبو حەسەنی حوصەری (م٣٧١ك/٩٨١ز)

"أبو الحسن علي بن ابراهیم"؛ لە بنەڕەتدا خەڵکی بەصرایە، بەڵام لە بەغداد ژیاوە و یاوەرێتی ئەبو بەکری شبلی تێدا کردووە، پاشان بۆتە شێخی بێ هاوتای ئەوێ و هەر لەوێش مردووە. الخطیب البغدادي: أخبار الصوفیة، ص ص٢١٧-٢١٨.

## ئەبو حوسێنی نوری

"ابو الحسین احمد بن محمد النوري البغوي" (م٢٩٥ك/٩٠٨ز)؛ لە بنەڕەتدا خوراسانییە، بەڵام هەر لە بەغداد لەدایك بووە و پێگەیشتووە، لە یاوەرانی جونەیدە، دەڵێن کەس لە هاوسەردەمانی وەك ئەو خاوەن ڕێبازێکی پاکی سۆفییانە نەبووە، فەرموودەشی دەگێڕایەوە. ابن خمیس: مناقب، ج١، ص ص٣٤٩-٣٦١.

## ئەبو سەعیدی خەڕاز (م٢٧٩ك/٨٩٢ز)

"ابو سعيد احمد بن عيسى الخراز"؛ لە سۆفییە بەغدادییەکانە و یاوەری بشری کوڕی حارثی حافی و چەندانی تری کردووە. بەهۆی ئەوەی لە یەکەمین ئەو کەسانەیە کە بۆتە سۆفی، بۆیە بە ئیمامێکی سۆفییان دەژمێردرێ، دەڵێن لە سەردەستی ئەو چەندان چەمکی گرنگی نێو گوتاری سۆفیگەری گەڵاڵە بوونە، لەوانە فەنا و بەقا. لەبارەیەوە بڕوانە: ابن خميس: مناقب، ج١، ص ص٤١٩-٤٣٠.

## ئەبو عەباسی کوڕی سوڕەیج

"ابوالعباس أحمد بن عمر بن سريج"؛ یەکێك لە گەورەترین فەقیهە شافعییەکانی سەردەمی خۆی بوو، بە "شافعی بچووك – الشافعي الصغير" ناونراوە، لەنێو یاوەرانی شافعی لە هەموویان پتر لە مەزهەبەکە شارەزا بووە، لە ساڵی (٣٠٦ك/٩١٨ز) مردووە؛ السبكي: طبقات الشافعية، ج٣، ص ص٢٢-٢٥.

## ئەبو عەبدوڵڵای جەللاو

"أبو عبد الله أحمد بن يحيى الجلاء" (م٣٠٦ك/٩١٨ز)؛ بە ڕەسەن خەڵکی بەغدادە، بەڵام لە وڵاتی شام نیشتەجێ بووە، بە تایبەت لە شاری (الرملە) لە باشوری فەلەستین، بە یەکێك لە گەورە سۆفییانی سەردەمەکەی خۆی دانراوە، لە بیروباوەڕەکانیدا زیاتر جەختی لەسەر زوهدگەرایی و گۆشەگیری کردۆتەوە. ابن عساكر: تاريخ، ج٦، ص ص٨١-٩٣. المناوي: الكواكب الدرية، ج١، ص ص٥٢٢-٥٢٣.

## ئەبو عەبدوڵلا محەمەد کوڕی خەفیفی شیرازی

بە "شێخی گەورە – الشيخ الكبير" ناسراوە، خەڵکی شاری شیرازە و شێخی هەرە بەناوبانگی ئەوێ بووە لە سەردەمەکەی خۆیدا، یاوەرێتی زۆر لە گەورە شێخانی وەك جونەیدی کردووە. شارەزایی لە زانستە سۆفییەکان جێی سەرنج بووە، دوای تەمەنێکی درێژ لە ساڵی (٣٧١ك/٩٨١ز) مردووە. لە بارەیەوە بڕوانە: ابو الحسن ديلمي: سيرت شيخ كبير، ص ص٨-٢١٩. زركوب شيرازي: شيرازنامە، ص ص٩٥-٩٦.

### ئەبو عەبدوڵلای مەغریبی

"أبو عبد الله محمد بن اسماعيل المغربي"؛ سۆفییەکی گەڕۆك بووە و موریدی زۆری پێگەیاندووە، پتر جەختی لەسەر سۆفیگەری هەژارانە کردۆتەوە، لە ساڵی (٢٩٩ك/ ٩١١ز) لەسەر چیای سیناء کۆچی دوایی کردووە. السلمي: طبقات، ص ص٢٤٢-٢٤٥. ابن خميس: مناقب، ج١، ص ص٤٣١-٤٣٤.

### ئەبو عەلی روزباری

"أبو علي احمد بن محمد الروذباري"؛ دەڵێن رەچەڵەکی دەگێڕدرێتەوە سەر کیسراکان، لە بەغداد لەدایك بووە و هەر لەوێ گەورە بووە، بەڵام دواتر چۆتە میصر و لە ساڵی (٣٢٢ك/٩٣٤ز) لەوێ مردووە. یەکێك بوو لەوانەی سۆفیگەری و فیقهی لە کەسێتی خۆیدا کۆکردبۆوە، لای ئەو سۆفیگەری رێبازێکی جیددیە و ناشێ تێکەڵ بە گاڵتە و سرووتی بێ مانا بکرێ. السلمي: طبقات، ص ص٣٥٤-٣٦٠. فريد الدين عطار: تذكرة، ج٢، ص ص ٢٣٩-٢٤١.

### ئەبو قاسمی کوڕی گەچی دینەوەری

"القاضي ابو القاسم يوسف بن احمد" ناسراو بە ئیبن گەچ، قازی دینەوەر و دەوروبەری بووە، بەتایبەت لە کاتی فەرمانڕەوایی میر بەدری کوڕی حەسنەوەیی (٣٦٩-٤٠٥ك/٩٧٩-١٠١٤ز) میری بەناوبانگی میرنشینی حەسەنوەیهی کوردی ( ٣٤٨؟-٤٠٦ك/٩٥٩؟-١٠١٥ز). ئەو زانایە لە ئاکامی کوژرانی میری ناوبراو و ئەو پەشێویەی کەوتە وڵاتەوە، لەسەردەستی عەییارە قەسابەکان لە دینەوەر کوژراوە، خاوەن چەندان بەرهەمی گرنگ بووە لە رووی فیقهیەوە، بەڵام لە ئێستادا هیچ لەو بەرهەمانەی لەبەردەستدا نین. الشيرازي: طبقات الفقهاء، ص١١٨-١١٩. السمعاني: الأنساب، ج٥، ص٣٦. ابن الجوزي: المنتظم، ج١٥، ص١١٠.

**ئەشعەرییەکان**

دەگەڕێنەوە سەر ئەبولحەسەن عەلی کوڕی ئیسماعیلی ئەشعەری (٢٦٠- ٣٢٤ك/ ٨٧٤-٩٣٦ز )، کە لەسەرەتای ژیانی پەیڕەوی ڕێبازی موعتەزیلەی کردووە، بەڵام دواتر جیابۆتەوە و ڕێبازێکی تایبەتی دامەزراندوە، کە زیاتر ڕێبازێکی کەلامناسیە، بەپێی ئەشعەرییەکان خودا ئەزەلیە، هەموو دیاردەکانی دونیا تەنانەت ویستی مرۆڤیش دروستکراوی خودان. هەروەها پێیان وایە قورئانیش، وەك قسەی خودا، کۆنە و خەلق نەکراوە، ئەوان پێیان وابوو لە بابەتەکانی پەیوەست بە "بنەڕەتییەکانی ئاین - أصول الدین"، نوێنەری ڕاستەقینەی ئەهلی سوننەن. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: الشیرازي: الإشارة الی مذهب أهل الحق، تحقيق: محمد السيد الجليند، مطابع الأهرام، القاهرة، ١٩٩٩، ص ص ١٠٨- ٢٠٠. ابن عساكر: تبيين كذب المفتري.

**"ئەهلی فەرمووده - اهل الحديث":**

وا دەناسێنرێن کە خەریکی گەڕان بەدوای فەرموودە و گواستنەوەی هەواڵەکانی پێغەمبەر و بونیادنانی "بڕیارە شەرعییەکان - الأحكام الشرعية" لەسەر دەقەکان بوون، کە ئەمەش زیاتر ڕێبازی شافعی( ١٥٠-٢٠٤ك/ ٧٦٤-٨١٩ز)یە. لەبەرامبەر بەوان "ئەهلی ڕاوبۆچوون - اهل الرأي" هەن: ئەوانەی پشت بە "پێوانە – القياس" دەبەستن و مانا لە بڕیارە شەرعییەکان هەڵدەهێنجن و ڕووداوەکانی لەسەر بونیاد دەنێن و ڕاڤەیان دەکەن، ئەمەش زیاتر لایەنگرانی مەزهەبی ئەبو حەنیفە (٨٠-١٥٠ك/ ٦٩٩-٧٦٤ز) دەگرێتەوە. بڕوانە: الشهرستاني: الملل، ج١، ص ١٨٧-١٨٨.

**ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم**

"ابو اسحق ابراهيم بن ادهم بن منصور"، لە ساڵی (١٦١ - ١٦٢ك/ ٧٧٦-٧٧٧ز) مردووە، ئەفسانەی زۆر لەبارەی ژیانی هەڵبەستراوە، دەڵێن کوڕی یەکێك لە پادشاکانی بەلْخ بووە، بەڵام تەرکی دونیای کردووە و ڕێبازی زاهیدانی گرتۆتەبەر، پاشان بە جیهانی ئیسلامی گەڕاوە، بەتایبەت وڵاتی شام و هەرێمی عێراق، لەو ناوچانە گەورە زانایانی سەردەمی خۆی وەك سوفیانی ثەوری بینیوە، لەڕووی هزریەوە چەمکی زۆری خستۆتە نێو فەرهەنگی

زوهدگەری ئیسلامیەوە و فراوانی کردون، لەوانە: "مەعریفە" و "تەوەکول" و چەندانی تر. ابو نعیم: حلیة، ج٧، ص ص٣٦٧-٣٩٥. ج٨، ص ص٣-٥٨.

**ئیبراهیمی خەواص**

" أبو اسحق ابراهیم بن احمد بن اسماعیل الخواص"؛ خەڵكی سامەڕایە، هاوشانی سۆفییانی وەك جونەید بووە، چەندان كتێب و نوسینی هەبووە، لە هزری سۆفیگەریدا زیاتر گرنگی بە چەمكی تەوەكول داوە و پێی ناسراوەتەوە، لە ساڵی (٢٩١ك/٩٠٤ز) مردووە. ابن الخطیب البغدادي: أخبار الصوفیة، ص ص٢٩-٣٢. الهجویري: كشف، ج١، ص٣٦٥.

**ئیختیارێ مەرگەهێ**

ئەمە پلەی "بابێ شێخ"ە لە لای ئێزدیەكان، بەرزترین پێگەیە لە لوتكەی سیستەمی ئایینیدا و شارەزای زانستە ئایینییەكانیانە، ڕێنمایی پیاوانی ئایینی لە كارەكانیان دەكات، پەیڕەوی لە چەندان سرووت دەكات كە پەیوەستە بە پایەكەیەوە. بڕوانە: عزالدین سلیم باقسری: مەرگەه - الأیزدیة، الأصل، التسمیة، المفاهیم، الطقوس، المراسیم و النصوص الدینیة، مطبعة خبات، كوردستان، ٢٠٠٣، ص٨٧.

**بایەزیدی بسطامی**

"ابو یزید طیفور بن عیسی سروشان البسطامي"، لە بنەڕەتدا لە بنەماڵەیەكی زەردەشتیە و بوونەتە موسڵمان، ئەو ڕۆڵێكی بەرچاوی لە برەوپێدانی هزری سۆفیگەری بەتایبەت لە پەیوەندیی مرۆڤانە و خودایانە(ناسوت و لاهوت) هەبووە، لە ساڵی (٢٦١ك/٨٧٥ز) مردوە. السهلجي: النور من كلمات ابی طیفور ، ص ص٥٨-١٩٩.

**بسطام**

شارێكی گەورەیە لە قومس، لەسەر ڕێگای نیشاپورە. یاقوت: معجم، مج١، ص٤٢١. لە ئێستادا دەكەوێتە باكوری شاری "تەهران".

**بشری کوڕی حارپی حافی (م٢٢٧ك/٨٤٢ز)**

"بشر بن حارث بن علي المروزي"؛ لە دەوروبەری ساڵی (١٥٠ك/٧٦٧ز) لەدایك بووە، لە بنەڕەتدا خەڵکی شاری مەروە، بەڵام دواتر نیشتەجێی بەغداد بووە و لەوێ مردووە. لەپاڵ ئەوەی زاهیدێکی گەورە بوو، فەرموودەشی گێڕاوەتەوە. القشيري: الرسالة، ص ص٤٣-٤٧.

**بەشنەوی**

لە خێڵە کوردیە دیارەکانی هەرێمی جەزیرەن، لەدەوروبەری شاری جەزیرەی ئیبن عومەر(جەزیرەی بۆتان) دەژیان، خاوەن قەڵا و میرنشینێکی ناوخۆیی بوون لەو ناوچەیەدا. ابن الأثير: اللباب، ج١، ص١٥٧. زرار صديق توفيق: القبائل، ص ص ٤٠-٤٦.

**بونداری شیرازی**

"بندار بن الحسين بن محمد الشيرازي" (م٣٥٣ك/٩٦٤ز)؛ نیشتەجێی شاری ئەرجان بوو لە هەرێمی فارس، لە بواری حەقیقەتناسیدا شارەزایی زۆری هەبووە. السلمي: طبقات، ص٤٦٧. أبو نعيم: حلية، ج١٠، ص٣٨٤.

**پیر**

لە کۆندا وا باسکراوە کە شارۆچکەیەکی بچووك بووە لە شارەزوور، کوردەکانی بەسەر سەختی ناسراون، ياقوت: معجم، مج٢، ص٦٧.

**تەریقەتی قادری**

دەگەڕێتەوە بۆ شێخ عەبدولقادری گەیلانی، بیروبۆچوونەکانی ئەو وەك بناغەی تەریقەتەکە بەکار دەهێنرێ، زیاتر هەردوو کوڕەکەی عەبدولعەزیز (م٦٠٢ك/١٢٠٥ز) و عەبدولرەزاق (م٦٠٣ك/١٢٠٦ز) کاریان کردووە بۆ وەرگێڕانی ئەو بیروباوەڕەی باوکیان بۆ سیستەمێکی کردەکی- تەریقەتییانە، لە ئێستادا "قادری" یەکێك لە تەریقەتە هەرە ناودار و بەربڵاوەکانی جیهانی ئیسلامیە. بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: Termingham: The Sufi Orders، pp.

### تەریقەتی رفاعی

دەگەڕێتەوە بۆ "شیخ أبو العباس أحمد بن علی بن احمد " ناسراو بە "أبو العلمین"، کە لە هۆزی "الرفاعە"ی عەرەبی بووە، لە ساڵی (٥١٢ك/ ١١١٨ز) لە ناوچەکانی "البطائح" لە دایك بووە و لە ساڵی (٥٧٨ك/١١٨٢ز) هەر لەوێ مردوە. ئەو کەسە سۆفیگەری کردە سیستەمێکی دامەزراو لەسەر دابەشکردنی چینایەتی موریدان، کە هەر گروپە موریدێك شێخ و خەلیفەی خۆی هەبووە. لەدوای "شیخ احمد"، لەسەدەی حەوتەمی کۆچییەوە، بەتایبەت لە وڵاتی میصر، ئەم سیستەمە بووە تەریقەتێکی سەربەخۆ کە "الرفاعیة"یە. الرافعي: سواد العینین، ص ص. عامر النجار: الطرق الصوفیة في مصر، ط ٥، دار المعارف، القاهرة، د.ت، ص ص٦٣-٧٤.

### "تەقیە – التقیة"

بنەمایەکی چەسپیوی نێو باوەڕی شیعییە، کە بەمانای شاردنەوەی راستی ئەو باوەڕەی مرۆڤ هەیەتی دێت، تەنانەت پێیان وایە هەر کەسێك تەقیەی نەبێ بە بێ دین دادەنرێ. الكلیني: الكافي، ج٢، ص٢١٧.

### جاوانی

خێڵێکی بەناوبانگی کوردییە کە چەندان تیرەی لێکەوتۆتەوە، لەسەرەتادا نیشتەجێی ناوچە چیاییەکان بوون، دواتر خزاونەتە نێو هەندێك ئاوایی، وەك مەندەلی و دەسکەرە و نوعمانییە و ناوچەکانی تری دەوروبەریان. رۆڵیان هەبووە لەمەزراندنی شاری حیللە، چەندان میری ناوداریان هەبووە کە میرنشینێکیان بۆخۆیان دامەزراندووە. مستەفا جەواد: هۆزی لەبیرکراوی گاوان. زرار صدیق توفیق: القبائل، ص ص ٥٤-٦٩.

### جەعفەری خولدی

"ابو محمد جعفر بن محمد بن نصیر الخواص"؛ لە سۆفییانی شاری بەغدادە، یەکێك بووە لە یاوەرانی جونەید، گرنگی زۆری بە بەرهەمی سۆفییان و نوسراو و بەسەرهاتیان داوە. لەوەدەچێ دوای تەمەنێکی درێژ لە ساڵی (٣٤٨ك/ ٩٥٩ز) مردبێ. ابو نعیم: حلیە، ج١٠، ص٣٨١.

### جەعفەری صادق

"جعفر بن محمد بن علي بن حسين بن علي"، لەبەر راستگۆیی بە "الصادق" ناسراوە، یەکێك لە گەورەترین ئیمامەکانی شیعەیە، بە تایبەت لە رووی شارەزابوونی لە زانستە شەرعییەکانەوە کە تەنانەت زانایانی سەر بە رەوتی سوننیش سودیان لەو زانستەی وی وەرگرتووە، رۆڵێکی مەزنی هەبووە لە دامەزراندنی گوتاری فیقهی شیعی، لە ساڵی (١٤٨ك/٧٦٥ز) کۆچی دوایی کردووە. السمعاني: الأنساب، ج٣، ص٥٠٧-٥٠٨. الصفدي: الوافي، ج١١، ص٩٨-١٠٠.

### جەلالەدینی رۆمی

"محمد بن محمد بن احمد البلخي"(٦٠٤-٦٧٢ك/١٢٠٧-١٢٧٣ز)؛ گەورەی عارف و شاعیرانی فارسە لە سەدەی حەوتەمی کۆچی/سێزدەی زایینی ، نازناوی "مەولانا" ی هەبوو، هەروەها بە "مەولەوی" ناسراوە، خەڵکی شاری بەلخە لە خوراسان، بەڵام دواتر لە شاری قۆنیە لە ئاسیای بچوك جێگیر بووە و خۆی و جێنشینەکانی تەریقەتی مەولەویان دامەزراندووە. جگە لە کتێبی بەناوبانگی "مثنوی"، چەندان بەرهەمی تری هەیە لەوانە: " فیه ما فیه" و "دیوان شمس تبریزی". لەبارەی بگەڕێوە بۆ: الأفلاكي: مناقب، ج١، ص ص٧٢-٥٦٣. ج٢، ص ص٥٧٨-٦١٣.

### جونەیدی بەغدادی (م ٢٩٨ك/٩١٠ز)

"أبوالقاسم جنيد محمد بن جنيد الخراز"؛ لە بنەڕەتدا خەڵکی شاری نهاوەندی کوردستانە، بەڵام لە بەغداد لەدایك بووە و پێگەیشتووە، بەکاریگەریی خاڵی سڕی کوڕی موغلسی سەقەطی"(م٢٥١ك/٨٦٥ز) بۆتە سۆفی. بەتێگەیشتنی جونەید سۆفیگەری هەم حاڵە( گۆشەگیری و خۆبرسیکردن) تا پەیوەندیی مرۆڤ بە خودا لەسەر پاکێتی دابمەزرێ، هەمیش کردەی گەڕانە بەدوای هەقیقەتی خودایی لەرێگەی پابەندبوون بە بنەماکانی شەریعەتەوە. ئەو سەرباری ئەوەی سۆفییەکی گەورە و وەك دامەزرێنەرێکی هزرەکە دەناسێنرێ، فەقیهێکی سوننەش بووە و شارەزایی لە زانستە شەرعییەکان هەبووە، بۆیەشە بە کۆڵەگەیەکی سۆفیگەری سوننی دادەنرێ. لەبارەیەوە بڕوانە: السلمي: طبقات، ص ص١٥٥-١٦٣. ابو نعيم: حلية، ج١٠، ص ص٢٥٥-٢٨٧. الخطيب البغدادي: أخبار الصوفية، ص ص١١٩-١٢٦.

### حلولییەکان

ئەمانە گروپێکن کە ئەگەرچی لە سەرچاوە فەرمیەکاندا بنەماکانی بیروباوەڕەکەیان بە وردی و بێ لایەنانە نەخراونەتە روو، بەڵام پێناسەی جیاجیایان بۆ کراوە لەوانە: ئەوانەن کە پێیان وایە بەشێکی خودایی لە مرۆڤدا هەیە، ئەگەر مرۆڤیش دەست لە ئارەزووە دەروونییەکان هەڵبگرێ، تەواوی خودا لە نێو مرۆڤەکەدا بەرجەستە دەبێ. هەروەها دەڵێن حلولییەکان باوەڕیان بە پاك بوونەوەی دڵە لە سیفەتە خراپەکانی و بەتاڵبوونی لە هەر شت و کەسێك، تا ببێتەماڵی خودا و تێیدا نیشتەجێ ببێ. بڕوانە: بلخی: بیان الأدیان، ص٨٨. مجهول: هفتاد و سه ملت یا اعتقادات مذاهب، با اهتمام و تصحیح: محمد جواد مشکور، مؤسسة مطبوعات عطایی، تهران،١٣٤١، ص٢٥.

### حەسەنی بەصری ( (٢١ك/٦٤٢ز - ١١٠ك/٧٣٨ز)

"ابو سعید حسن بن ابو الحسن"؛ لە مەوالییەکانە و لە بنەماڵەی پێغەمبەر نزیك بووە، بە یەکێك لە زانا گەورەکان و لە "التابعین" دادەنرێ، رۆڵی بەرچاوی لە دارشتنی بنەماکانی فیقهی ئیسلامی هەبووە، لە ژیانیدا کەسێکی زاهید بووە، زوهدێك کە زێتر لەسەر بنەمای ترس و هەستکردن بە تاوان بەرامبەر بە خودا دامەزرابوو. ابن الجوزي: آداب حسن البصري و زهده و مواعظه، تحقیق: سلیمان الحرشي، دار الصدیق، دمشق، ٢٠٠٥، ص ٢٣ بەدواوە. المقدسي: من اخبار الحسن البصري: تحقیق: محمد عبد الرحمن النابلسي، دار النمیر و دار الفرائد، دمشق، ١٩٩٦، ص ص١٩-٣٦.

### حوسێنی کوڕی مەنصوری حەلاج

سەربوردەی ژیانی ئەو سۆفییە زۆر باس کراوە، ئەوەی لێرە جێگەی ئاماژە پێدان بێت ئەوەیە، کە لە شاری بەیضائی هەرێمی فارس، لە نزیك بە زۆمی کوردانی ئەوێ لە بنەماڵەیەکی بە رەسەن زەردەشتی لە دەوروبەری ساڵی (٢٤٤ك/٨٥٧ز) لە دایك بووە، لەسەر دەستی گەورەی سۆفییانی ناوچەکە سەهلی کوڕی عەبدوڵڵای توشتەری (م٢٩٤ك/٩٠٦ز) ئاشنایەتی لەگەڵ سۆفیگەری پەیدا کردووە، دواتر دەستی بە گەڕان و سوڕان کردووە، سەرەتا

له پانتایی ئیسلامی و دواتریش لەدەرەوەی ئەو پانتاییە( بەتایبەت هیند و چین و "وڵاتی ئەودیو رووبار - بلاد ما وراء النهر"، تورکستان و...هتد). پاش گەڕانەوەی بۆ نێو جیهانی ئیسلامی بانگەوازی بۆ بیروبۆچوونەکانی کردووە، دواجار دەستگیر دەکرێ و پاش دادگایی کردنی لەلایەن قازییە شەرعییەکانی سەردەمەکەی، لەساڵی (٣٠٩ك/٩٢٢ز) لە بەغدا لەدوای ئەشکەنجەدانێکی زۆر لە دار دەدرێ. الخطيب البغدادي: أخبار الصوفية، ص ص١٣٩-١٦٣. ابن الساعي: أخبار الحلاج، ص ص١١-١٠٤. لويس ماسينيون: المنحنى الشخصي لحياة الحلاج.

### دونبلی

یەکێکە لە خێڵە کوردییەکانی سەدەکانی ناوەڕاست، لە زۆر شوێنی کوردستان (بەتایبەت دەوروبەری موسڵ) و دەرەوەی وڵاتەکە دەژیان، لە بواری رۆشنبیری و سیاسی رۆڵی بەرچاویان هەبووە. الزبيدي: تاج العروس، ج٢٨، ص٥٠٦. زرار صديق توفيق: القبائل، ص ص٩٤-٩٧.

### دێرەش

گوندێکە لە باشوری رۆژهەڵاتی ئامێدی، نزیکەی حەوت کیلۆ مەترێك لێیەوە دوورە و تا ئێستا ئاوەدانە.

### ژەنونی میصری

"ابو الفيض ذو النون بن ابراهيم المصري"؛ لە بنەڕەتدا خەڵکی ناوچەی "النوبە"یە، بە یەك لە یەکەمین ئەو کەسانە دەژمێردرێ کە بە سۆفی ناسراون. لە دەوروبەری ساڵی (٢٤٦ك/٨٦٠ز) مردوە. الماليني: الأربعون، ص ص٩١-٩٨. ابن الجوزي: صفة الصفوة، ج٤، ص ص١٨٣-١٨٨.

### زەیارییەکان

دەگەڕێنەوە بۆ مەرداویجی کوڕی زەیار، کە یەکێکە لە سەرکردەکانی دەیلەم، توانی لەماوەیەکی کەمدا، لە دەوروبەری ساڵی (٣١٥ك/٩٢٨ز) دەست بەسەر ناوچەکانی قەزوین و

طەبەرستان دابگرێ و بونیادی دەسەڵاتدارێتی خۆی لەوێ و لە ناوچەکانی دەوروبەر دابمەزرێنێ.

### سەمنونی موحیب

"ابو الحسين سمنون بن حمزة الخواص"؛ لە دوای ساڵی (٢٩٧ك/٩١٠ز) کۆچی دوایی کردووە، لە گەورە سۆفییانی عێراقە، لە سۆفیگەریدا زیاتر کاری لە سەر واتاکانی خۆشەویستی کردووە، وەك عارفێکی شێت خۆی نواندووە. النيسابوري: عقلاء المجانين، تحقيق: عمر الأسعد، دار النفائس، بيروت، ١٩٨٧، ص ص٢٣١-٢٤٠. السلمي: طبقات، ص ص١٩٥-١٩٩.

### سەمەرقەند

یەك لە شارە هەرە دیارەکانی "وڵاتی ئەودیو رووبار - بلاد ما وراء النهر"ە، بەوە ناسرابوو کە خودان سروشتێکی جوان بووە. القزويني: آثار البلاد، ص ص٥٣٥-٥٣٧.

### سوفیانی پهوری (م ١٦١ك/٧٧٨ز)

"ابو عبد الله سفيان بن مسروق الثوري"، لە ساڵی (٩٥ك/ ٧١٤ز) یان (٩٧ك/٧١٦ز) لە شاری کوفە لەدایك بووە و لە بەصرا کۆچی دوایی کردووە، زاهیدێکی بەناوبانگ و فەقیهێکی ناسراوی سەردەمی خۆیەتی، بۆتە ئیمامی مەزهەبێکی پەیرەوکراوی جیهانی ئیسلامی، خاڵی سەرنج راکێشی ژیانی سوفیان هەڵوێستی توندی بوو لەدەسەڵاتداران، بانگەشەی سەربەخۆیی زانستە ئایینییەکانی دەکرد تا لە دەستێوەردانی دەسەڵاتداران بەدوور بێت. ابن خلكان: وفيات، ج٤،.ص٨٧-٩٤. بۆ زانیاری زیاتر بگەڕێوە بۆ: سوسن فريد فلاحة: الإمام سفيان الثوري و آراؤه الفقهية مقارنة بالمذاهب الأخرى، الرياض، ١٤٢٨هـ/٢٠٠٧م.

### سوهرەوەرد

شارۆچکەیەکی نزیك بە شاری زەنجان بوو لە هەرێمی چیا، هەندێك پێیان وایە ناوەکەی لە سورەوەرد هاتووە کە بەمانای خاکی سوور دێت. ياقوت الحموي: معجم، مج٣، ص٢٨٩.

**شیعەی ئیسماعیلی**

ئەو گروپەن کە لەدوای مردنی جەعفەری صادق، لە ساڵی(١٤٨ك/ ٧٦٥ز) دەرکەوتن و پێیان وابوو دوای ئەو ئیسماعیلی کوڕە گەورەکەی جێگەی گرتۆتەوە، نەك موسای کوڕی کە بە موسای کاظم ( م١٨٣ك/ ٧٩٩ز) ناسراوە و شیعەی ئیمامی وا بانگەشە دەکەن، دواتریش بە ناڕاستەیەکی باطنی ڕۆیشتوون و ئەمە بۆتە یەکێك لە ناوە باوەکانیان. النوبختي: فرق الشيعة، حققه: عبدالمنعم الحفني، دار الرشد، القاهرة، ١٩٩٢، ص٨٩.

**شیعەی ئیمامی**

دوانزە ئیمامیشیان پێ دەگوترێ، ئەمەش بەپێی ئەو دوانزە ئیمامەی پەیڕەوی لە باوەڕیان دەکەن، لەو باوەڕەشدا ئەو پێشەوایانە بێ هەڵەن – عصمەتیان هەیە و پەیڕەوکارانیان دەبێ ملکەچی بیروباوەڕەکانیان بن. هەندێك جار بەم ڕێبازەی شیعە دەگوترێ "جەعفەریی"، ئەمەش لە ناوی جەعفەری صادقەوە هاتووە، چونکە ئەو بە دامەزرێنەری بنەڕەتی گوتاری فیقهی ئەوان دادەنرێ. بڕوانە : النوبختي: فرق الشيعة، ص ص١٠٥-١٠٨. سعد رستم: الفرق و المذاهب الإسلامية، ط ٤، دار الأوائل، دمشق، ٢٠٠٦، ص ص ٢١٦- ٢١٨.

**شیعەی زەیدی**

ئەم ڕێبازەی شیعە دەگەڕێتەوە بۆ زەیدی کوڕی عەلی کوڕی حوسێن (٨٠ – ١٢١ك/ ٦٩٩- ٧٣٩ز)، لەسەردەمی خەلیفەی ئومەوی هیشامی کوڕی عەبدولمەلیك (١٠٥-١٢٥ك/ ٧٢٣- ٧٤٣ز) دا بزووتنەوەیەکی چەکداری هەڵگیرساند کە لە ئاکامیدا خۆی تیاچووە، زەیدییەکان لە ڕووی باوەڕەوە لە گروپە شیعییەکانی تر پتر لە ڕێبازی سوننی نزیکن، بە تایبەت لە مەسەلەی ئیمامەتدا. ئەم ڕێبازەی شیعە تا ئێستا پاشماوەیان ماوە، بەتایبەت لەوڵاتی یەمەن. لەبارەی هزر و باوەڕیان بڕوانە: الصاحب بن عباد: الزيدية، حققه: ناجي حسن، الدار العربية للموسوعات، بيروت، ١٩٨٦، ص ٢٧ و مابعدها.

**صەفیەدینی ئەردەبیلی**

"شيخ صفي الدين اسحاق بن جبرائيل الأردبيلي"، لە تەمەنێکی بچوکەوە تێکەڵ بە ڕێبازی سۆفیان بووە، باوەڕێتی زاهید و شێخی ناوداری سەردەمی مەغۆلی ئیبراهیمی گەیلانی (م٧٠٠ك/١٣٠١ز) کردووە. دواتر موریدی زۆری لەدەورە کۆبۆتەوە، بە دامەزرێنەری

تەریقەتی صەفەوی دادەنرێ، بەتایبەت لە قۆناغی بەر لە بوونی بنەماڵەکەی بە شیعە و دامەزراندنی دەوڵەتی صەفەوی لە ئێراندا، شێخ صەفی لە ساڵی(٧٣٥ك/١٣٣٤ز) مردووە. بۆ زانیاری پتر لەبارەی ئەم کەسایەتییە بگەڕێوە بۆ: ابن بزاز: صفوة، ص٧٠ بەدواوە.

### عەبدولقادری گەیلانی

"عبد القادر بن موسی ابو صالح جنگی دوست"، لە ساڵی (٤٧٠ك/١٠٧٧ز) لە ناوچەی گەیلان لەدایك بووە، دواتر هاتۆتە بەغداد و تێکەڵ بە ئەلقەی فیقهی ئەوێ، بەتایبەت ڕێبازی حەنبەلی بووە، پاشان مەیلی بەلای سۆفیگەریدا چووە و نزیکەی بیست ساڵێکی تەمەنی زاهیدانە ژیاوە، لەسەر دەستی سۆفییانی سەردەمەکەی شارەزایی لەو کایە ئایینییەدا پەیدا کردووە، هەر لە بەغداد تا مردنی لە( ٥٦١ك/ ١١٦٦ز) لە قوتابخانەکەی خۆیدا خەریکی یادی خودایی و وانە وتنەوە بووە. ابن الجوزي: المنتظم، ج١٨، ص١٧٣. الشطنوفي: بهجة الأسرار، ص ص ٣-١٨٩.

### عەلی کوڕی شیلویە

خەڵکی شاری "اصطخر"ە ، لە یاوەرانی ئەبو عەبدوڵڵا محەمەد کوڕی خەفیفی شیرازی یە، بەوە دەناسرێ کە شەتەحاتی سۆفییانەی هەبووە. روزبهان بقلی: شرح شطحيات، ص٧١، ٢٥٤. جامی: نفحات، ص٢٤٩-٢٥٠.

### عەلی کوڕی عەبدولرەحیمی قەنناد

"ابو الحسن علي بن عبد الرحيم الواسطي القناد"؛ ساڵی مردنی دیار نییە، زیاتر سۆفییەکی گەڕۆك بووە، یەکێکە لەو سۆفییانەی وتەکانی حەلاجی لێ گێڕدراوەتەوە. السمعاني: الأنساب، ج٤، ص٥٤٥.

### عەمری کوڕی عوسمانی مەککی(م٢٩٧ك/٩١٠ز)

" ابو عبد الله عمرو بن عثمان المكي"؛ یەکێکە لە یاوەرانی جونەید، تا مردنی هەر لە بەغداد ماوەتەوە، جگە لە سۆفیگەری، لە زانستە شەرعییەکانیشدا شارەزایی هەبووە،

چەندان بەرهەمی لە بواری سۆفیگەریدا داناوە. الخطيب البغدادي: أخبار الصوفية، ص ص۲۲۸-۲۳۱.

### عەینولقچاتی هەمەدانی

" عبد الله بن محمد بن الحسن الميانجي" (٤٩٢-٥٢٥ك/١٠٩٩-١١٣١ز) ، ناسراو بە "عين القضاة"، خەڵکی هەمەدانە، یەك لە یاوەرانی سۆفی گەورە شێخ ئەحمەدی غەزالی(م٥٢٠ك/ ١١٢٦ز)یە ، لە هەردوو بواری فیقهی شافعی و سۆفیگەریدا شارەزایی زۆری هەبووە، بە تۆمەتی دەرچوون لە ئایین هەر لە هەمەدان لە دار دراوە. الصفدی: الوافی، ج١٧، ص٢٩١. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: نصر الله پورجوادی: عين القضاة و استادان او، انتشارات اساطير، تهران، ١٣٧٤هـ.ش، ص٩ و بعد.

### فاگمە لوڕە

زانیاریی مێژوویی لەسەر ئەو کەسایەتییە نییە، ئەوەیش کە هەیە دژ بەیەکە، ئەوەتا ناوەکەی بە شێوەی جیاواز تۆمار کراوە وەك: "فاطمه لوڕه"، "فاطمه لەره"، "بی بی فاطمه"، زانیارییەکان سەبارەت بە پەیوەندیی بە باباتاهیریش هەر وایە: ئەگەر هەندێك بە دۆستی ئەوی دەزانن، ئەوا هەندێکی تر بە خوشکی دادەنێن، بەڵام ئەوەی لەسەری کۆکن خۆشەویستی لەڕادەبەدەری باباتاهیرە بۆی و هەبوونی گۆڕێکە بەناوی ئەو لەنزیك بە گۆڕەکەی باباتاهیر لە هەمەدان. لەم بارەوە بڕوانە:

V.Minorsky: Baba – Tahir، EI، Vol.I، P.841-842; C. J. Edmonds: The Beliefs، Vol. 7، p. 93.

### قەلەندەری

بۆچوونی جیاواز لە بارەی سەرچاوەی ئەو وشەیە هەیە) گریکی، فارسی...هتد)، لە رووی دەستەواژەییەوە ئاماژەیە بۆ رەوشت و شێوازێکی ژیانی سۆفییانە، کە پەیوەستە بە گەڕان و سوڕان و بەرجەستەکردنی ژیانێکی هەژارانە. دواتر بەتایبەت لە سەدەی حەوتەمی

کۆچی/ سێزدەی زایینی بەدواوە بۆتە ناوی تەریقەتێکی سۆفیگەری و لە ئاسیای ناوەڕاستدا بڵاوبۆتەوە و "قەلەندەریە"یان پێ گوتووە. لە بارەیەوە بڕوانە:

Tahsin Yazici: Kalandar ،EI ،Vol.v ،pp. 472-473. Ahmet T. Kara Mustafa: Sufism ،pp164-166.

## مەیمونی کوڕی دەیصانی قەداح

دەڵێن لە بنەڕەتدا خەڵکی ناوچەی "خوزستان – الأهواز"ە، لەلایەن نەیارانییەوە بەوە تۆمەتبار دەکرێ لەسەر باوەڕی باردەیصان (١٥٤-٢٢٢ز) بووە، کە یەکێك بوو لە دامەزرێنەرانی رێبازی "گنۆسی – عیرفانی" لە هەرێمی جەزیرە بەر لە ئیسلام. هەرچۆنێك بێت مەیمون خۆی مەولای جەعفەری صادق و هاورێی ئیسماعیلی کوڕی بووە. کە ئیسماعیل لە ساڵی (١٣٣ك/٧٥٠ز) دەمرێ، مەیمون گروپێك پێکدێنێ و بانگەشەی مەهدی بوونی ئیسماعیلی دەکرد لە جیهانی ئیسلامیدا. ابن النديم: الفهرست، ص٢٧٨. کاشانی: زبدة التواريخ – بخش فاطميان و نزاريان، به کوشش: محمد تقی دانش پژوه، چاپ دوم، مؤسسة مطالعات و تحقيقات فرهنگی، تهران، ١٣٦٦، ص ص ٤٠-٤٢.

## نیشاپور

یەکێکە لە شارەکانی دەڤەری خوراسان، وەك ناوەندێکی گەورەی بازرگانی ناسرابوو، چەندین قوتابخانە و مزگەوت و بەدەیان زانای لێ دەرکەوتووە. یاقوت: معجم ، مج٥، ص ص٣٣١-٣٣٣. حمد الله مستوفی: نزهة، ص١٠٤. لە ئێستادا کەوتۆتە نزیك شاری مەشهەد لە باکوری رۆژهەڵاتی ئێران.

## هەکاری

ناوچەیەکی بەرفراوانی هەرێمی جەزیرە بوو لە سەرووی موسڵ، چەندان گوند و شارۆچکەی لەخۆوە گرتبوو، کە لە ئێستادا زیاتر دەڤەری بادینان دەگرێتەوە. یاقوت: معجم

البلدان،مج٥،ص ٤٠٣. درويش يوسف حسن هروري: بلاد هكاري ( ٩٤٥- ١٣٣٦م) – دراسة سياسية حضارية، دار سپيريز، دهوك، ٢٠٠٥، ص ص١٧-١٩.

**"ونبونى بچووك – الغيبة الصغرى"**

بەپێی باوەڕی شیعەی ئیمامی دوایین ئیمامیان محەمەدی كوڕی حەسەنی عەسكەرییە، كە لەدوای مەرگی باوكی( م٢٦٠ك/٨٩٠ز) بۆتە ئیمام. محەمەدیش ئەو فریادرەسە چاوەڕوانكراوە(المهدي المنتظر)یە كە ونبووە و بە نەمری و نادیاری دەمێنێتەوە تا بەر لە قیامەت دەردەكەوێ بۆ بەرپاكردنی دادپەروەری لە جیهاندا، بە باوەڕی ئەوان محەمەدی مەهدی دووجار ونبوە: ونبونی بچووك لە (٢٦٠ك/٨٩٠ز) تا (٣٢٩ك/٩٦١ز)، ونبونی گەورەش لەو ساڵەوە دەست پێ دەكات و تا نوكە بەردەوامە. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: النعماني: كتاب الغيبة، ص١٧١بەدواوە.

## پاشكۆی ژماره (١)

### بەسەرهاتی عەكبەری كوردی

(( عن بشر بن الحارث الحافي انه قال: اعترضت عكبر الكردي فقلت له: أيش كان أصل رجوعك إلى الله تعالى؟ فقال: كنت أقطع الطريق ورأيت ثلاث نخلات نخلة منهن لا تحمل وإذا بعصفور يأخذ من حمل النخلة التي تحمل رطبة فيدعها في التي لا تحمل فلم أزل أعد عليه عشر مرار فخطر بقلبي: قم وانظر! فنهضت فإذا في رأس النخلة حية عمياء - يعني وهو يضع الرطبات في فيها. فبكيت وقلت: سيدي! هذه حية قد أمر نبيك بقتلها أعميتها وأقمت لها عصفوراً يقوم لها بالكفاية وأنا عبدك أقر بأنك واحد أقمتني لقطع الطريق وإخافة السبيل؟! فوقع في قلبي: يا عكبر! بابي مفتوح. فكسرت سيفي ووضعت التراب على رأسي وصحت: الإقالة! الإقالة! فإذا بهاتف يقول: قد أقلناك! قد أقلناك! فانتبه رفقائي فقالوا: ما لك؟ قد أزعجتنا! فقلت: كنت مهجوراً وقد صولحت فقالوا: ونحن أيضاً كنا مهجورين وقد صولحنا فرمينا ثيابنا وأحرمنا كلنا فما زلنا كذلك ثلاثة أيام نصيح ونبكي ونحن سكارى حيارى فوردنا اليوم الثالث على قرية وإذا بامرأة عمياء جالسة على باب القرية فقالت: فيكم عكبر الكردي؟ فقال أحدنا: نعم لك حاجة؟ قالت: نعم لي ثلاث ليال أرى النبي صلى الله عليه وسلم في النوم وهو يقول: أعط عكبر الكردي ما خلفه ولدك فأخرجت لنا ستين شقة فائتزرنا ببعضها ودخلنا البادية إلى أن أتينا البيت الحرام.)) [١٠١٨]

(١٠١٨) المقدسي: كتاب التوابين، ص٢٢٢-٢٢٣. ابن صصري: الدرة المضيئة, ص٢٣١-٢٣٢

## پاشكۆی ژماره (٢)

### پەیامی "الكردي الصوفي الأرموي – ئەبوبەكری كوڕی یەزدانیار" بۆ یەكێك لە یاوەرانی

((منحك الله بما به منحك، وحماك عن طويات الصفات بالإنابة لمن رتب الروايات، وحماك عنك، بشاهد ما فيه بدأك، وعظيم ما به ابتدأك، وأحلك في محل التجلية لما أراد ولما به اريد، وأظلهم واقع براءة التسليم(التي) تحوي اسرارهم لمن يفاني، فتسرى هومهم لمن يعاني، قد باشروا منه ما له استبشروا، و في ميادين محبته انتشروا، ألما نهم سواطع أنوار التوحيد، ولوامع التجريد، باينين عما له و به بانوا، فهُمْ كالذي كانوا.))[1019]

---

(١٠١٩) السراج: اللمع, ص٣١٦.

## پاشکۆی ژماره ( ٣)
## ئەو سۆفییانەی گۆڕەکانیان بۆتە مەزارگا و پیرۆزکراون

| ژ | ناوی سۆفی بەپێی مەرگیان | شوێنی گۆڕەکەی | سەرچاوە |
|---|---|---|---|
| ١. | مەمشادی دینەوەری (م٢٩٩ک/٩١١ز) | دینەوەر | السلفي: معجم السفر، ص٣٤٢. |
| ٢. | ئەبوبەکری کوڕی یەزدانیار (م ٣٣٣ک/٩٤٤ز) | ورمێ | السلفي: معجم السفر، ص١١٥. ابن بزاز: صفوة الصفا، ص٧٦٣-٧٦٤. |
| ٣. | ئیبراهیمی کوڕی شەیبانی کرماشانی (م٣٣٧ک/٩٤٨ز) | کرماشان | ابن عساكر: تاريخ مدينة دمشق، ج٦، ص٤٤٣. |
| ٤. | فارس کوڕی عیسای دینەوەری (م. ٣٤٥ک/ ٩٥٦ز) | نیشاپور | السمعاني: التحبير، ج١، ص٢٣٦. |
| ٥. | شێخ ئەحمەد سیاه ئەسوەدی دینەوەری | تەپۆڵکەیەك لە دینەوەر | السلفي: معجم السفر، ص٣٤٢. |
| ٦. | عیسای قەصاری دینەوەری | تەپۆڵکەیەك لە دینەوەر | السلفي: معجم السفر، ص٣٤٢. |
| ٧. | ئەبو عەبدوڵڵای بابویی (م٣٧٤ک/٩٨٤ز) | گەڕەکی سەرپەلك/ شیراز | شيرازي: تذكرة هزار مزار، ص ٢٠٧. |
| ٨. | بابا طاهری هەمەدانی (م.دوای ٤٤٧ک/١٠٥٥ز) | هەمەدان | مستوفي قزويني: نزهة القلوب، ص٧١ |
| ٩. | شێخ ئەبولحەسەن عەلی | هەکاری (گوندی | أنور المائي: الأكراد في بهدينان، |

| | | | |
|---|---|---|---|
| | هەكاری (م ٤٨٦ك/ ١٠٩٣ز) | دێرەش) | ص ٧٥-٧٦. |
| ١٠. | ئەبوبەكری هاواری | البطائح | الشطنوفي: بهجة الأسرار، ص١٩٣. |
| ١١. | ئەبو محەمەدی شەنبەكی (م. ٤٩١ك/١٠٩٨ز) | گوندی الحداديه/نزيك واسط | الوتري: روضة الناظرين، ص٢٧. |
| ١٢. | ئەبولوەفای حولوانی (م. ٥٠١ك/١١٠٧ز) | شارۆچكەی قلمينيا/ نزيك الكوت | مستەفا جەواد: هۆزی لەبیركراوی گاوان، ل٥٠. |

